# وادەمان فیردەوس بێت





## کۆمەڵێک چیرۆک و بەسەرهاتی شەیدایانی فەخری کائینات




عەلی موحەممەد غەریب

# وادەمان فیردەوس بێت

## کۆمەڵێک چیرۆک و بەسەرهاتی شەیدایانی فەخری کائینات صلی الله علیه وسلم

ئامادەکردنی

عەلا موحەممەد غەریب

# پێشکه‌ش بێت..

له‌پاش سوپاس و ستایشی په‌روه‌ردگار..الله ﷻ ئه‌م کتێبه‌پێشکه‌ش ده‌که‌م به‌:

❁ ڕۆحی پاکی رســـــول الله (صلى الله عليه وسلم) وه‌فا و عه‌شـــقی نێو دڵم.

❁ هـه‌موو ئـه‌وانه‌ی له‌خه‌می گه‌یاندنی په‌یامی پیرۆزی ئیسلامدا بوون و ده‌بن.

❁ ئـه‌و بـابـه‌حـه‌مـه‌ خـۆپـارێـزه‌ی، هـه‌ر زوو جێی هـێـشـتـین و..

ئـه‌و دایـه‌فـاتـمـه‌خـه‌م سـپـییه‌ی، ته‌مـه‌نی گه‌نجی خـۆی پێشـــکه‌ش کردین.

❁ پـێشـــه‌نگانی چـاکه‌م، خـوشـك و بـرا.. ئـازیـزه‌کانم.

❁ دلکـه‌شـــی خـۆشـه‌ویـسـت و هـاوده‌مـی غـه‌م و خـۆشـــیم.

❁ هـه‌مـوو ئـه‌و مامۆســتایانه‌ی زانســت و وانـه‌ی ژیانیان لێوه‌ فـێربـووم.

❁ هـه‌موو ئـه‌و چـاکانه‌ی له‌م کتێبه‌دا نـاویان هـاتووه‌ و..

هـه‌موو ئـه‌و چـاکانه‌ش که‌ نـاویان نه‌هـاتووه‌ (ڕۆحیان شــادبێت).

❁ خـزم و ناســیاو و دۆســت و هـاوڕێ و.. سـه‌رجـه‌م مـرۆڤـایـه‌تی.

❁ هـه‌مـوو ئه‌وانه‌ش که‌به‌خـراپه‌کار ناسـراون، به‌و ئومێده‌ی که‌بگه‌ڕێنه‌وه‌ و..

خـــودای میهره‌بـان له‌ئێمه‌یـش و له‌ئـه‌وانیـش خـۆش ببێت و..

واده‌مان فیرده‌وس بێت.



قالَ تَعالَى:

﴿لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾[1]

﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾[2]

﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴾[3]

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾[4]

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[5]

﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾[1]

---

(١) (يوسف: ١١١)
(٢) (البقرة: ٢٥٧)
(٣) (آل عمران/٣١)
(٤) (الأحزاب /٧٠ ـ ٧١)
(٥) (الذاريات: ٥٦)

﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ * الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ * لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾[٢]

﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴾[٣]

---

(٦) (الأنعام: ١٢٢)

(١) (يونس/٦٢ـ٦٤)

(٢) (التوبة: ٢٤)

# قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم :

كُلُّ أُمَّتي يَدخُلونَ الجَنَّة الا مَنْ أَبى. قالُوا: وَمَنْ يَأْبى يا رَسولَ الله؟!
قالَ (ﷺ): مَنْ أَطاعَني دَخَلَ الجَنَّة، وَمَنْ عَصاني فَقَدْ أَبى.[١]

عَنْ أَبي هُرَيرةَ (رضي الله عنه) قالَ: قالَ رَسولُ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسلَمَ: إنَّ اللهَ قالَ: مَنْ عادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنتُهُ بِالحَربِ وَما تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدي بِشيءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمّا إفتَرَضتُهُ عَلَيهِ، وَلا يَزالُ عَبدي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَوافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإذا أَحْبَبْتُهُ كُنتُ سَمْعَهُ الّذي يَسمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الّذي يُبصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الّتي يَبطِش بِها، وَرِجْلَهُ الّتي يَمْشي بِها، وَإِنْ سأَلَني لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِن استَعاذَني لأُعِيذَنَّهُ، وَما تَرَدَّدْتُ عَنْ شيءٍ أَنا فاعِلُهُ، تَرَدُّدِي عَنْ نَفس المؤمِنِ يَكرهُ الموتَ وَأَنا أَكرهُ مَسَاءَتَهُ.[٢]

وَقالَ (ﷺ): مالِي وَلِلدُنيا، وَما لِلدُنيا وَما لِي! وَالَّذِي نَفْسي بِيَدِهِ، ما مَثَلِي وَمثَلُ الدُنيا، إلا كراكِبٍ سارَ في يَومٍ صائِفٍ، فَاستَظَلَّ تحتَ شجَرَةٍ ساعَةً مِنْ نَهارٍ، ثُمَ راحَ وَتَرَكَها.[٣]

وَقالَ (ﷺ): مِنْ أَشَدِّ أُمَتي لِي حُبّاً ناسٌ يَكونُونَ بَعْدِي يَوَدُّ أَحَدُهُم أَنَّهُ لَو رَآني بِأَهْلِهِ وَمالِهِ.[٤]

وَقالَ (ﷺ): إنَّ مِنْ عِبادِ اللهِ مَنْ لَو أَقْسَمَ عَلى اللهِ لأَبرَّهُ.[٥]

---

(١) (البخاري (٧٢٨٠) ).
(٢) (البخاري (٦٥٠٢) ).
(٣) (صحيح: رواه احمد في مسنده والحاكم في المستدرك وصححه الألباني في الصحيحة/٤٣٩ وصحيح الجامع/١٠٧٧ )
(٤) (مسلم (٢٨٣٢) ).
(٥) (البخاري (٢٧٠٣) ومسلم (١٦٧٥) ).

## چەند وتەیەکی خوداناسان و زانایان:

❁ چیرۆکی چاکان، سەربازێکە لە سەربازەکانی خودا. "جونەیدی بەغدادی"

❁ کەسانێکی مردوو هەن بە یادکردنەوەیان دڵ زیندوو دەبێتەوە و کەسانێکی زیندوویش هەن، دیتنیان دڵان دەمرێنێت. "بیشری کوڕی حاریس"

❁ کەسێك بەندەیەکی چاکی خودای خۆش بوێت، وەك ئەوە وایە خودای خۆش ویستبێت. "مەکحولی شامی"

❁ ئەو دەمەی یادی بەندە چاکەکان دەکرێت، ڕەحمەت دەبارێت.

" سوفیانی کوڕی عویەینە"

❁ ئەوەی زۆر پێبکەنێت لە هەیبەتی کەم دەبێتەوە، وە ئەوەی گاڵتەوگەپی زۆر بێت پێی سووك دەبێت، وە هەرکەس هەر خوویەکی زۆرتر بوو بەوە دەناسرێت، وە هەر کەس قسەی زۆر بکات هەڵەی زۆر دەکات، ئەوەش کە هەڵەی زۆر بکات شەرمی کەم دەبێت، ئەو کەسەش کە شەرمی کەم بێت خۆپارێزی و خواپەرستی کەم دەبێت، ئەو کاتە دڵی دەمرێت.
"عومەری کوڕی خەطاب"

❁ ئاگاداربە..!! حەڵاڵەکانی دنیا لێپرسینەوەیان بەدواوەیە و حەرامەکانیشی، ئاگر. "عەلی کوڕی ئەبوطالب"

❁ بەڵا بریکاری قسەکانە، ئەگەر گاڵتە بە سەگێك بکەم دەترسم ببمە سەگ و هەمان گاڵتەم پێ بکرێتەوە. "عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود"

❁ ئەگەر دنیا هەمووی هی ئێمە بووایە، لەوەی کە هەمانە زیاترمان نەئەویست بۆ خۆمان. "عەبادەی کوڕی صامت"

❀ هـه‌ر كه‌س به‌ هـه‌ق له‌ خـوا بترسـێت، ئـه‌وا هـه‌موو شـتێك لێی ده‌ترسـێت، وه‌ هـه‌ر كـه‌س له‌ غـه‌یـری خـوا بترسـێت، ئـه‌وا لـه‌ هـه‌مـوو شـتێك ده‌ترسـێت.

"فـوزه‌یلی كوڕی عه‌یاز"

❀ بـه‌ كـرده‌وه‌كـانـت ئـامـۆژگاری خـه‌ڵكی بكه‌، نـه‌وه‌ك بـه‌ قـسـه‌كانت.

"حـه‌سـه‌نی بـه‌سـری"

❀ داوای لێخـۆشـبـوون له‌ په‌روه‌ردگارم ده‌كـه‌م، بـۆ كـه‌م ڕاستگـۆییم لـه‌ وتنی (أستغفر الله)دا. "ڕابیعه‌ی عه‌ده‌وی"

❀ هـه‌رگیز ناتوانیت هـه‌مـوو خـه‌ڵك له‌ خـۆت ڕازی بكه‌یت، ئیـدی نێـوان خـۆت و خـودا بـاش بكه‌، پاشـان گـویٚ مـه‌ده‌یـه‌ كێ لێت ڕازییه‌ و كێ لێت نـاڕازییه‌.

"ئیمامی شـافعی"

❀ ئایا شـه‌رم نـاكـه‌ن لـه‌و هـه‌مـوو بێ شـه‌رمییه‌تان بـه‌رامـبه‌ر بـه‌ په‌روه‌ردگار؟!

"سـیڕی سـه‌قه‌تی"

❀ نه‌فسـم داوه‌ت كـرد بـۆ خـزمـه‌ت په‌روه‌ردگار، وه‌لێ نـه‌یـویـسـت و ملی نـه‌دا بـۆم، ئیدی وازم له‌ نـه‌فسـم هێنـا و خـۆم كـه‌وتـمه‌ی ڕێ بـۆ خـزمـه‌تی پـه‌روه‌ردگارم. "ئـه‌بایه‌زیدی بـوسـتامی"

❀ نـه‌فـسـت پـه‌روه‌رده‌ بكـه‌ و خـۆت فـێری ئـه‌ده‌ب بكه‌، بـه‌ر لـه‌وه‌ی كه‌ بـه‌ شـوێن زانـسـتدا بگـه‌ڕێـیت. "مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س"

❀ كـه‌سێك پێی خـۆش بێت كـه‌ خـه‌ڵكی بیناسـن، ئـه‌و كه‌سـه‌ لـه‌ززه‌تی ئـاخـیره‌ت نـادۆزێـته‌وه‌. "بیشـری كوڕی حاریس"

❀ زۆر هـاوڕێتی تـۆبـه‌كـاران بكـه‌ن، چـونكه‌ ئـه‌وان دڵـناسـكـترینن.

"عومه‌ری كوڕی خه‌طاب"

❀ مـه‌نـواره‌ بـۆ بچوكی گـوناهـه‌كانت، به‌ڵكو بزانه‌ تـۆ سـه‌رپێچی كێت كـردووه‌؟!

"بیلالی كوڕی سـه‌عد"

❀ ڕه‌فتاره‌ خـراپـه‌كان ده‌ردن و زانایانیـش هـه‌تـوانن، ده‌ی ئـه‌گـه‌ر زانـایان بـه‌دخـوو بن، ئیدی كێ شـیفای ده‌رده‌كان بدات؟! "سـوفیانی سـه‌وری"

❀ ئـه‌گـه‌ر نه‌فسـت سـه‌رقاڵ نه‌كه‌یت به‌ هـه‌ق و ڕاسـتییه‌وه‌، ئـه‌و سـه‌رقاڵت ده‌كات به‌ كاری ناڕه‌واوه‌. "حه‌سـه‌نی به‌سـری"

❀ واتای شـوكـر ئـه‌وه‌یه‌: كه‌ به‌ نیعمه‌ته‌كانی خـوداوه‌، سـه‌رپێچی خـودا نه‌كه‌یت.

"جونه‌یدی به‌غدادی"

❁ گریان دە جۆرە: نۆیان بۆ غەیری خودایە و تەنها دانەیەکیان بۆ خودایە، سا ئەگەر ئەوەیان کە بۆ خودایە لە ساڵێکدا جارێك بێت، ئەوە هێشتا زۆرە! "سوفیانی سەوری"

❁ ئەگەر توانای نوێژی شەوان و ڕۆژوو گرتنت نەبوو، ئەوا بزانە کە تۆ بێ بەشێکی کۆتکراوی، گوناهەکانت کۆتیان کردوویت. "فوزەیلی کوڕی عەیاز"

❁ سەرەتای شەوەکەم دەخەوم و کۆتاییەکەی هەڵدەستم، ئیدی وەك چۆن چاوەڕێی پاداشتی هەستانەکەمم، ئاوەهاش چاوەڕێی پاداشتی خەوتنەکەمم، چونکە خەوتن و هەستانم بۆ خودایە.
"مەعازی کوڕی جەبەل"

❁ گەڕاین بە شوێن زانستدا بۆ دنیا، کەچی زانست ئاماژەی پێداین کە واز لە دنیا بهێنین. "عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك"

❁ پێم خۆشبوو هەموو کەس ئەم زانستەی منیان بزانیبا، ئیدی تەنیا یەك پیتی نەدرایەتە پاڵ من. "ئیمامی شافعی"

❁ هاوڕێتی خەڵکی بکە وەك چۆن هاوڕێتی ئاگر دەکەیت، سودی لێ وەربگرە و وریابە.. نەتسوتێنێت! "شەقیقی بەلخی"

❁ ئەگەر پیاوێك لە گوێیەکمەوە قسەم پێ بڵێت و لە گوێکەی ترمەوە داوای لێ بوردنم لێ بکات، لێی دەبوورم. "حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالب"

❁ ئەگەر بینیت پیاوێك بەربەرەکانێی دنیاییت دەکات، ئەوا تۆ بەربەرەکانێی ئاخیرەتی لەگەڵدا بکە. "حەسەنی بەسری"

❁ براکەت ئەو کەسەیە کە لە کەموکورتییەکانت ئاگادارت دەکاتەوە، هاوڕێکەشت ئەو کەسەیە کە دوورت دەخاتەوە لە گوناه.
" یەحیای کوڕی مەعازی ڕازی"

❁ ئەگەر کەسێك بە شتێك مەدحی کردیت کە ئەو شتە لە تۆدا بوونی نەبوو، ئەوا دڵنیا مەبە لێی، چونکە پێدەچێت بە شتێك زەمت بکات کە ئەو شتە لە تۆدا بوونی نەبێت. "وەهبی کوڕی مونەبیە"

❁ ئەگەر کەسێك خراپەیەکی لە برایەکی بینی و بە ڕوویەوە پێکەنی، ئەوە خیانەتی لە براکەی کردووە. "فوزەیلی کوڕی عەیاز"

❁ دنیا هەمووی تاریکییە، مەجلیسی زانایان نەبێت. "حەسەنی بەسری"

❁ ئەی نەوەی ئادەم.. وەڵڵاهی ئەگەر قورئانت خوێند و ئیمانی تەواوت پێی

هێنا، ئەوا لە دنیادا.. دڵتەنگیت تووڵ دەکێشێت و ترست زیاد دەبێت و گریانت زۆر دەبێت. "حەسەنی بەسری"

❀ مرۆڤ خۆی بە گەورە دەزانێت.. هەتا خۆی نەناسێت.

" ئەبو سولەیمانی دارانی"

❀ ئەو کەسە ڕازییە بە بەشی خوا، کە خۆزگە بە هیچ حاڵ و گوزەرانێك نەخوازێت، ئەو حاڵەی خۆی نەبێت. "سوفیانی کوڕی عویەینە"

❀ ئەوەی ڕاستگۆ نییە، با خۆی ماندوو نەکات، چونکە تەنها ڕاستگۆکان ڕزگاریان دەبێت و سەردەکەون. "مالیکی کوڕی دینار"

❀ ئەشێ نیەت هێنان کارێکی بچووك گەورە بکات، وەك چۆن ئەشێ نیەت هێنان کارێکی زۆر گەورە بچووك بکاتەوە. "عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك"

❀ خۆشبەختی کەسێك لەوە دایە کە بەتەواوەتی دەست بەسەر نەفسیدا بگرێت، بەدبەختیش لەوەدایە کە نەفسی دەست بەسەر ئەودا بگرێت. "ئیمامی غەزالی"

❀ ترسی وەرنەگیرانی کارەکان، ناڕەحەتترە لە ئەنجامدانیان. "مالیکی کوڕی دینار"

❀ زاناکان هەتا کار بەزانستەکەیان نەکەن.. هێشتا هەر نەفامن.
"فوزەیلی کوڕی عەیاز"

❀ هەرکەس نزا بۆمانەوەی زاڵمان بکا.. ئەو کەسە پێی خۆشە کە سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکرێت. "سوفیانی سەوری"

❀ زانستیش جەور و ستەمی هەیە! وەك چۆن بەهۆی سەروەت و سامانەوە ستەم دەکرێت. "وەهبی کوڕی مونەبیهـ"

❀ ئەگەر باسی کەسێك بکەیت بە خراپە، واتە تۆ خۆت لەو کەسە بەباشتر دەزانیت. "ئەوزاعی"
❀ ئەوەی قسە لە شتێکدا بکات کە پەیوەندی بەوەوە نەبێت، ڕاستگۆیی لەدەست دەدات. "سەهلی توستەری"

❀ مرۆڤەکان لە ژێر زمانیاندا خۆیان حەشار داوە، کە قسەیان کرد دەردەکەون. "ئیمامی عەلی"
❀ ئەوەی تەماعی زۆر بێت و زوو توڕە بێت، لە ئەهلی تەقوا نیە.
"بەکری کوڕی عەبدوڵڵا"

❀ خەڵکی کەم بناسە.. با غەیبەت کردنت کەم بێتەوە. "سوفیانی سەوری"

❁شاهێدی بۆ زاهید بوونی کەس مەدە، چونکە زوهد شتێکە لە دڵ دایە.
"ئەبو سولەیمانی دارانی"

❁ نەفسی خۆت باش بکە، خوای عزوجل خەڵکت بۆ باش دەکات.
"ئەبو بەکری صدیق"

❁ ئەگەر ویستت قەدری نیعمەتەکانی خوا بزانیت.. چاوەکانت بنوقێنە.
"بەکری کوڕی عەبدوڵڵا"

❁ ئەگەر ئەو کەسەی کە نازانێت.. بێدەنگ بێت، ئەوا ناکۆکی نێوان خەڵکی کەم دەبێتەوە. "ئیمامی غەزالی"

❁ زانست ئەوەیە کە سوودی هەبێت، نەوەك تەنها دەرخ بکرێت و بەس. "ئیمامی شافعی"

❁ شەڕ لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانتان بکەن، وەك چۆن شەڕ لەگەڵ دوژمنەکانتان دەکەن. "مالیکی کوڕی دینار"

❁ بوونی هاورێی زۆر و بۆر.. بەهۆی کزی و لاوازی دینی مرۆڤەکانەوەیە.
"سوفیانی سەوری"

❁ ئەگەر دەتانزانی ئەدەب چەندە گرانە، ئەوا لە جێی ڕزق و ڕۆزی.. داوای ئەدەبتان دەکرد لە پەروەردگار. "ئیمامی عەلی"

❁ ئەگەر هیچ شتێك نەدۆزمەوە، ئەوا بە کراسەکەی بەرم گوناهکار دادەپۆشم.
"ئەبو بەکری صدیق"

❁ ئارامگرتنی جوان ئەوەیە، کە هیچ گلەو گازاندەیەکی حاڵت بۆ کەس نەکەیت. "بیشری کوڕی حاریس"
❁ پێم خۆشە لەهەموو شتێکدا نیەت بهێنم، تەنانەت لە خواردن و خەوتنیشدا. "زوبەیدی یامی"
❁ مرۆڤی چاکەکار ناکەوێت، چونکە ئەگەر کەوتیش.. پشت و پەنای هەیە.
"عەبدوڵڵای کوڕی عەباس"

❁ خەفەتی دنیا تاریکییە بۆ دڵ، غەمی ئاخیرەتیش ڕووناکییە بۆ دڵ.
"عوسمانی کوڕی عەففان"

❁ ڕەحمەت لەو کەسە بێت کە ناتەواوییەکانمان وەك دیارییەك پێدەبەخشێت.
"عومەری کوڕی خەتتاب"

❁ باش بزانە کە تۆ خوات خۆش ناوێت، ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوات پێ خۆش نەبێت. "حەسەنی بەسری"

❁ زۆر سه‌یر کردنی کاره ناڕه‌واکان، ناسینه‌وه‌ی کاره ڕه‌واکان له دڵدا ناهێڵێت. "ئیبراهیمی کوڕی ئه‌دهه‌م"

❁ کرده‌وه باشه‌کانتان که‌مه‌ن، ده‌ی دڵسۆزانه ئه‌و که‌مانه ئه‌نجام بده‌ن. "مه‌یمونی کوڕی مهران"

بسم الله الرحمن الرحيم

اَلحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمينَ.. المَلِك الحَق المُبين، وَالصَلاةُ وَالسـلامُ عَـلى سـيِّدنـا مُحَمَّـدٍ الذي تَلَقّى القُرآنَ مِن لَدُن حَكيمٍ عَليم، الفاتِحِ لِما أُغلِق، وَالخاتِمِ لِما سـبَق، والمُعلِنِ الحَقِّ بِالحَقِ، وَالدامِغِ لجَيشـاتِ الأَباطيل، وَعَـلى آلِ بَيتِـهِ الطَيبـينَ الطّـاهِرين، وَعَـلى الصَحابَةِ وَالتّابَعين، وَمَنْ تَبِعَهُم بِاحسـانٍ إلى يَومِ الدّين.

فەخـری عـالەم (صلى الله عليه وآله وسلم) خـۆرێکە.. دنیـا بە بـوونی ئـەو ڕۆشـن و قەشـەنگ و زیندوو و پڕ مانایە، ناحەزان و نەیارانیشـی چەند پارچە هـەورێکی تـەنك و چـڵکن و پـەرش و بڵاو و نەزۆکـن، هـەر زۆر زوو دەڕەونەوە و هـەرگیز بەری خـۆریان پێ ناگیرێت، یاران و هـاوەڵانیشـی مانگ و ئـەسـتێرە و هـەسـارە بـوون، کاتێك ئـازیز (صلى الله عليه وسلم) کاری خـۆی تەواو کـرد و پەیـامەکەی پەروەردگـاری بە تەواوەتی گەیاند و بە جەسـتەی پیرۆزی بەجێی هێشـتین، مانـگ و ئـەسـتێرە و هـەسـارەکان دەرکەوتن و شـەوی ئـەنگوسـتەچاوی پاش کۆچی خـۆریان کـردە چراخان و بە نوری وەرگیراوی حـەزرەتی خـۆرەوە، دنیایان ڕووناك کـردەوە و بەیەك دەنـگ لە دوای مانگەوە گوتیـان: خـۆری ئێمـە هـەرگیز ئـاوا نـابێت، ئـەگـەر مـوحەممـەدیش بمـرێ، ئـەوا خـودای مـوحەممـەد زینـدووە و هـەرگیز نـامـرێ، هیـچ شـتێکیش هـەرگیز نـاتـوانـێ شـوێن پـێ پیرۆزەکـانی مـوحەممـەد گیـان (صلى الله عليه وسلم) بسـڕێتـەوە.

ئـەوان (هـاوەڵان و شـوێنکـەوتووان و چـاکان) داوای هیچیـان لە کەس نەدەکـرد، تەنهـا پـەروەردگـار نەبێت، بەڵکـو لە شـەرمان نەیانـدەتوانی داوایەکـی دنیـاییش لە پـەروەردگـار بکـەن..!! چـونکە ڕازی بـوون بەوەی کە خـودا پێـی بەخشـیبوون.

ئـەگـەر یەکێکیان ڕەشوی وڵاخەکەی لە دەسـت بکەوتایە خوارێ، خـۆی لەسـەر وڵاخەکـەی دادەبەزی و هەڵـی دەگـرتەوە، کەسـانی دەور و بەری دەیـانگوت: ڕەحمەتی خـودات لـێ بێـت، بـۆ دابەزیـت؟! قسـەت بکـردبا ئێمـە دەماندایەوە دەستت، ئـەویش بە ڕێـزێکەوە دەیگـوت: ئاخـر خـۆشـەویسـتم ئـاوەهـا فێـری

کـردووم. نـەفسـی خـۆیان بەرز و گـەورە و پڕ شکـۆ بـوو لە ناو خەڵکیـدا و.. زەلیـل و مـــلکەچ بـــوون بـــۆ پەروەردگـــار، ئیـــتر.. فـــڕێ ئـــەدرانە نـــاو ئـــاگرەوە و.. نەدەســوتان!! بەســـــەر ئـاودا بە پـێ دەڕۆشـــتن و.. نـوقم نەدەبــوون!! ژەهریـان دەخـــواردەوە و.. نەدەمـــردن!! شـــــەوان لە خەڵـــوەتی یـــاردا نەدەخەوتـــن بـــۆ پەرســـتش و.. ســـبەی لـە هـەمـووان تەیـارتر و ئـازاتر بـوون بـۆ غـەزا!! یەکێکیـان دەیگـوت: ئـەگـەر هـەژاران نەبـوونایە، ئـەوا من بازرگانیم نەدەکـرد!! یەکێکـی دی، قووتی ئـەمـڕۆی دەدایە مـوحتاجـان و دەیگـوت: خـودایا نـیەتم هـەیە ئـەمـڕۆ بەڕۆژوو دەبم. ماڵیان چۆڵ و هۆڵ! غـەریبەیەك دەیگـوت: ئـەی کەل و پەلەکانتـان لە کوێیە؟! ئـەویش دەیگـوت: بەر لە خـۆمان، ناردمان بـۆ مـاڵەکەی ترمـان. ئـەوان عاشـقبـوون و.. شـەرمیان دەهـاتێ بڵێن: ئێمە عاشـقی تـۆین ئـەی پەروەردگـار.. ئێمە شـەیدای تـۆین ئـەی خـۆشـەویسـتی خـودا (ﷺ).

یەك لەوان زۆر حـەزی لـە ســـێوەکەی نـاو دەســـتی خـۆی بـوو، ســـەیری دەکـــرد و پـــێی دەوت: ئـــەی ســـێو..!! ئـەگـــەر بتخـــۆم دەڕۆیـــت، ئـەگـــەر بتبەخشـــم ئـەوا دەمێنێیتەوە بـۆم. دەرۆزەکەرێك دەهـاتە بەردەرگا، خـاوەن مـاڵ دەیگـوت: هـانێ ئـەمەی پـێ ببەخشـــن چـونکە مـن زۆر ئـارەزووم لێیەتـی!! کە خێرێکـی بـــۆ دەهـــات، دەیگـــوت: بیـدەن بە دراوســـێ مـاڵەکەم ئـەو لە مـن هـەژارترە!! یەکێکیان دوکانەکەی دەکـردەوە و نرخی شـت و مەکەکانی دەنووسـی و خـۆی لە پەنـایەکەوە دەســـتی دەکـرد بە نوێــژ کــردن، ئـەوان وەك هــەموو مرۆڤێك مەعســـوم نەبـوون لە هــەڵە و گوناهــ بەڵام وەك خـۆیان یەکراســـت پەشـــیمان دەبـوونەوە و بـۆ هـــەر هـــەڵەیەك کە دەیانکـرد، ســـزایەکی قورســـی خـــۆیانیان دەدا، بـــۆ هـــەر ســـوێندێکی ڕاســـت (نەك درۆ) پـارەیەکی زۆریـان دەبەخشـــی، کەسێك ئـازاری یەکێکیـانی دەدا و قســـەی پـێ دەوت، ئـەویـش بە دڵێکـی فراوانـــەوە هـــەوڵی دەدا لـە بـری قـــسەی ناشـــیرین پێویســـتییەکی بـــۆ ئـەنجـام بدات! ســاڵەهـــای ســـاڵ گریـاوە و ئیســـتیغفاری کـــردووە، بـۆ ئـــەوەی لەحـزەیێك لە تاو خـۆشـــی خـۆی، ناخـۆشـــی کەسانی تـری بیـر نەمـاوە!! خـــەم دایدەگرێت و دەڵێت: باش دەزانـم ئـــەم قەرزارییەی لە کـۆڵم نـابێتەوە، بـــۆ ئـــەو گـاڵتە پــێ کـــردنەم دەگـەڕێـــتەوە، کە بەر لە چـــل ســـاڵ بە قـــەرزارێکم کـــرد!! قســـــەیەك لە زاری دەردەچێـــت کە پەیوەنـــدی بەوەوە نیـــیە، لـــوت و بـــزوت بە ســـــەدان ڕۆژ، ڕۆژووگـــرتن دەکـاتە ســـزای نەفســـی خـــۆی و ناهێڵێـت زمـانی.. خـۆشـــــییەکانی دنیـا بچێژێـت!! تەنیـا جارێـك دەنـگ بە ســـــەر دایکـیدا بـــەرز دەکـــاتەوە، خێـرا دەڕوات دوو بەنـدە دەکـــڕێت و ئـازادیـــان دەکـات!! ئـەمـانـــە و چـەندەهـا هـەڵوێستی ئیمانی نـاوازەی پڕ مـانـا لەم کتێبەدا دەخـــوێنیتەوە، کە دوور نیـیە بە هـۆی ئیمانـی لاوازی خـــۆمانەوە، بە هـــەندێ لە ڕووداوەکـان بڵێـین: ئـــەمە تەنهـــا خەیـاڵێکە و.. هیچـی تـر!! بەڵام زۆربەی ئـــەم بەســـــەرهـــاتانە نەك

تەنهــا لە لایەن کەسـێکەوە، بەڵکـو لە لایەن چەنـد کەسـێکی باوەڕپێکــراو و ڕاســتگۆوە باسـکــراون و پاشــان ئــەم کــردەوانەش بــۆ چــاکان و خۆشــەویستانی خودا زۆر ئـاســایی و ســانایە، چونکە بە هۆی دڵسـۆزی و پەرستشـیانەوە، هــەرچییەکیان بـوێت خــودای باڵادەسـت بـۆیان مسـۆگـەر دەکات و دۆعایان ڕەد کردنەوەی نییە، لە فەرموودەی قودسـیدا هـاتووە:

عَنْ أَبِي هُرَيرةَ (ﷺ) قالَ: قالَ رَسـولُ اللهِ صَلَى اللهُ عَلَيـهِ وَسـلَمَ: إنَّ اللهَ قـالَ: مَـنْ عـادَى لِي وَلـيّاً فَـقَدْ آذَنـتُهُ بِالحَـربِ وَما تَـقَرَّبَ إلَيَّ عَـبْدي بِشـيءٍ أَحَـبَ إلَيَّ ممّا إفـتَرَضتُ عَلَيه، وَمـا يَـزالُ عَـبدي يَتَـقَرَّبُ إلَيَّ بالنَـوافِلِ حَـتَّى أُحِبَّهُ فَـإذا أَحْبَبْـتُهُ كُـنتُ سـمعَهُ الَّذي يَسـمَعُ بِهِ وَبَـصَرَهُ الَّـذي يُـبصِرُ بِـهِ وَيَـدَهُ الَّتي يَبطِـش بِهـا وَرِجْـلَهُ الَّتي يَمْشـي بِهـا وَإنْ سـأَلَني لأُعْـطِيَنَّهُ وَلَـئِن اسـتَـعاذَني لأُعِـذَنَّـهُ وَمـا تَـرَدَدْتُ عَـنْ شـيءٍ أنا فاعِلُهُ تَـرَدُدِي عَـنْ نَـفس المُؤمِـنِ يَكرهُ المَـوتَ وَأَنـا أَكـرهُ مَـسـاءَتَـهُ. (رواه البخاري).

ئیـدی هـیچ گــومانێك نیـیە لەو بەســەرهــات و کەراماتـانەی کە لە بەنـدە چاکەکـانی خــوداوە بـاس دەکـرێن، بە مـەرجـێك ئــەو بــەندەی باســی لێـوە دەکـرێت بە هیچ شـێوەیەك لە شـێوەکان لە شــەرعی پـەروەردگار لای نەدابێت و نهێنییەکانی لە ئـاشــکراکانی نایابـتر بێـت و هـەمـوو گـوفـتار و ڕەفـتاری بـۆ ڕەزامـەندی زاتـی اللّٰه ﷻ بێـت و بەس، وە ئـەو کەســەش کە بەســەرهــاتەکە دەگـێڕێـتەوە مـەرجـە ڕاسـتگۆ و بـاوەڕپـێکـراو بێت.

هــەموو چــاکەیەکی ئـوممەتیش لە بچـوکترینییەوە تـا گــەورەترینی، لە پـاش خـودای باڵادەسـت، پشـکی شـێری فەزڵەکەی بـۆ مـوحەممەدی ئازیزمـانە (ﷺ) کە سـەروەری مرۆڤایەتییە و ڕێنیشـاندەر و ڕۆشــنکەرەوەی ڕێگـای ژیـانی پەری و ئـادەمیيانە.

زۆرجــار دەبیســـتین.. کە گـوایــا نـاکـرێت گـوفـتــار و ڕەفـتـاری ئــەوان، بکـرێـتە پـێـوەرێك و ئێمەی پێ پێـوانە بکرێت!! چونکە ئـەوان لە (عَصرُ السـعادَة) و (خَيرُ القُرون) دا ژیاون و دنیای ئێمەش ســەردەمی فیتنەی ئـاخر زەمـانە، من بــۆ خــۆم لەگەڵ ئــەو ڕاســتییەدام، کە ئێــمە بەم حاڵەمـانەوە نـاتوانین کەمـتر لە بەشـێکی ئێجگار کەمـی ئــەو پەرسـتش و عیبادەتەی ئــەوان ئـەنجـام بــدەین، ئــەوەش بـە هۆی ســستی و لاوازی ئـیمانی خـۆمانەوەیە، نــەوەك مەحاڵبــوونی ئــەو عیبادەتـانەی کە ئــەوان ئـەنجـامـیان داوە، چـونکە ئـەگــەر مەحـاڵ بــووایە ئــەوانیش نەیانـدەتوانی هـەسـتن بەو پەرستشــانە، وە ئـەگـەر خــۆمان لە گێلـی نەدەین.. ئـەوا زۆر باش دەزانین کە ئــەوانیش وەك ئـێمە مـرۆڤ بــوون و خـاوەنی هـەوا و ئـارەزوو بـوون، زۆرێکیان سـەرمایەدار و خاوەن هـەموو ئـەو خـۆشــییانە بــوون کە دەتـوانێ مـرۆڤ لە خشـــتە بەرێـت، هــەژار و نەدارەکانیشــیان پـاش

گـوزەراندنی سـەردەمانێکی سـەخت، بـوونەتە خـاوەنی خۆشگـوزەرانی و سـەروەت و سـامانێك کە پێشـتر خەونیشـیان پێوە نەبینـی بـوو!! بەڵام ئـەوان وەك ئیمانداریکی دڵسـۆز.. هـەواو ئارەزووی نـەفـسی ئـەممارەیـان، نەیـتوانی لە خـشـتەیان بـەرێت و هـەمـوو ئـەو خـۆشـیانەیان بـۆ ڕەزامەنـدی پەروەردگار بەکار هێنا.

بەڕاسـتی ئیبـراهیمی تەیمی (رحمه الله) بەراوردێکی زۆر جوان دەکات و دەڵێت: ئـەوان دنیا ڕووی تـێ کـردن و لـێی هـەڵـهاتـن، بـەڵام ئـێـوە دنیـا پشـتی تـێ کـردوون و بە شـوێـنـیدا ڕادەکـەن!!

ئـەوان ئاوەهـا بـوون و چـوار دەوریشـیان خـاڵی نەبـوو لە خراپەکـاری و فەسـاد، بەڵێ ئێمە فەسـاد تەنگی پـێ هـەڵچنیوین و دڵسـۆزانە ئیمانداربـوون وەك هـەڵگرتنی پشـکۆیەك وایە لە نێو لەپی دەسـتەکانماندا، بەڵام ئـەگـەر ئـێمە نەگەڕێینەوە بـۆ خـوێندنەوەی ژیانی ئـەوان و لە بەسـەرهـاتەکانیاندا ڕێگەچـارە بـۆ دەربـاز بـوونمان نەدۆزیـنەوە و ئـەوان نەکەیـن بە پێشـەنگ بـۆ خـۆمان و هـەوڵنەدەین شـوێن پێکانیان بگرینە بەر، ئیدی پێم ناڵێـت: دەبـێت کـاری ئـێمە چی بێت؟!! و دەبێـت چ کەسـانێك بکەیـن بە پێشـەنگ؟!! ئەوەتـا کـاری میللەت بـووەتە شـوێنکەوتنی مـۆدەی بێگـانە، کەسـانی بێبـاوەڕ و نەیـارانی ئیسـلامیش لە هـەموو بـوارەکاندا، وەك گـورگێك لە پێسـتی مەڕدا، خـۆیان کـردۆتە دڵسـۆز و ڕزگـارکەر و مافپـارێزی مرۆڤـایەتی!! ئـێمەش دەسـتەوسـان تەماشـادەکەین و ئـەگـەر کەسێك باسـێکی ئـەوانمان بـۆ بکـات، بە چەندەهـا بیـانوو خـۆمان لە ئـەوان جیادەکەینەوە و خێرا دەڵێین: بابە ئـەوان لە کوێ و ئێمە لە کـوێ؟! ! ئیـدی دان بەو ڕاسـتییەدا نـانێین کە ئـەوان خەریکـی خـواپەرسـتی بـوون و ئـێمەش سـەرقاڵی دنیاپەرسـتین!! و نامـانەوێ لە دەریـای گـوناهـ و تاوانـدا بێینە دەرێ، هـەتا نغرۆ دەبین و دەخنکێین!! ئـەوان ڕاسـتگۆیانە خـودایان پەرسـت و خـوداش هـەموو شـتێکی بـۆ دەسـتەمۆ کـردن، ئێمەش بـووینەتە بەنـدەی دنیـا و دنیـاش بـێجگە لە خەم و نائومێـدی و لەززەتێکـی کەم لەسـەر حیسـابی کەسـانێکی دی، هیچی پێنەبەخشـین و پێمان نابـەخشـێت!!

بەڕاسـتی ئـەو قسـانەش زیـاتر خەمسـاردمان دەکـات لە ئاسـت ئـەرکەکەماندا کە خـواپەرسـتییە، دەتـۆ سـەیرێکی مسـتێك لە خەرمـانی حـاڵی خـۆمان بکە.. کە چـۆن دڵان تەنـگ دەکـات و غەمـان دەهێنێـت و ئـەگـەر فریـای خـۆمان نەکەویـن، چـۆن ڕەنـج بە بادمـان ئـەکات؟! ! تەماشـاکە چـۆن؟! پەروەردگارێـك لە یـاد ئـەکەین، کە هـەمیشـە ئـێمەی لە یـادە و بە دووی شـەیتانێکەوەین.. کە بە درۆکانی فریومان دەدات و لەگەڵ خـۆیدا دەمانبـات بـۆ نـاو ئـاگر! خاوەنی پەیامی (إقرأ) ین، کەچی کتێب و زانسـتمان واز لـێ هێنـاوە و وەك توتی خەریکی وتنەوەی چەند وشـەیەکی سـواوی بێگانەین!! یاخود دوو سێ

پەرتووك دەخوێنینەوە، ئیدی خۆمان بە زانا و پیتۆڵ دەزانین! بەڵام لە ڕاستیدا ساویلکە و نەفام و نەزانین بەوەی کە بەر لە زانست وەك هەوا و ئاو.. وەك خۆراك و خەو، پێویستمان بە پەروەردەی نەفس هەیە، کە خەسڵەتی پێغەمبەران و چاکان و خۆشەویستانی خوایە، تەمەنێکی ئەبەدی واز لێ دەهێنین بۆ چاوتروکانێکی کەمی دنیا،ماڵێك کە دەمێنێتەوە و فەنا نابێت، کاری بۆ ناکەین و خۆمان کوشتووە بە دەست دوو هۆدەوە، کە ڕەنگە بڕوخێ بە سەرماندا، یاخود جێی بهێڵین بۆ کەسانێك کە هەر نەمانناسن! هەر خەریکین لێرە دنیا کۆ دەکەینەوە و بەر لە ڕۆشتنمان، تفاقێك بۆ ئەوێ ڕەوانە ناکەین و توێشوویەك زەخیرە ناکەین بۆ ڕێی دوور، بەڕاستی سەیرە..!

سەلەمەی کوڕی دینار (رحمه الله) دەڵێت: سەیرم لە قەومێك دێت!! کار بۆ ماڵێك دەکەن، کە ڕۆژانە قۆناغێك لێی دوور دەکەونەوە و، واز لە کارکردن دەهێنن بۆ ماڵێك، کە ڕۆژانە قۆناغێك لێی نزیك دەبنەوە!!

نوێژ دەخوێنین، بەڵام ئایا نوێژەکانمان دوورمان دەخاتەوە لە هەڵە و پەڵە؟! ئایا دەتوانین خەیاڵی ناو نوێژەکانمان بگێڕینەوە و لە تاو باسکردنیان شەرمەزار و خەجاڵەت نەبین؟! خۆمان بیر چۆتەوە و خزمەتی کەسانێکی تر دەکەین، کە پێدەچێت هیچ سودێکیان نەبێت بۆمان، ئەگەرچی نزیکترین کەسانی خۆشمان بن!! بووینەتە کۆیلەی هەوا و ئارەزووەکانمان و بە خەیاڵماندا نایەت بۆ کوێمان دەبەن؟! دەزانین بە زۆرخۆری لە سوننەتی ئازیز (ﷺ) دەردەچین و هەر لەم دنیا کەمخایەنەدا خۆمان گیرۆدەی چەندین دەرد و ئازار دەکەین و.. سبەی لە نێو گۆڕی تار، دەبینە ژەمێکی خۆش بۆ کرم و مار!! کەچی هێشتا بەم دەست و بەو دەست فریای ورگمان ناکەوین!! شەوانە.. نە دەخەوین، نە پەرستش دەکەین، بەڵکو بە دیار درۆی دنیا و فرت و فێڵی تەکنۆلۆژیاوە، لەسەر شمشێری تیژی کات دا، چەپڵە بۆ غەفڵەتی یەکدی لێ ئەدەین..!! لایکێك بۆ درۆ دەکەین و.. کۆمێنتێك بۆ ڕیا دەنووسین، گۆشتی بۆگەنی یەکتر دەخۆین و دەتریقێینەوە، ئەگەر کەسێکیش ئامۆژگاریمان بکات، خۆمان لەو بە شارەزاتر دەزانین و بە هەموو ئاوەزێکمانەوە دەڵێین: دەی دوو قسەی خۆش نەکەین چی بکەین؟! گرفتەکە ئەمەیە.. کە ئێمە (قسەی حەرام) و (قسەی خۆش) لێکتر جیا ناکەینەوە!

فوزەیلی کوڕی عەیاز (رحمه الله) دەڵێت: مرۆڤی باوەڕدار قسەی کەمە و کردەوەی زۆرە، بەڵام مرۆڤی دووڕوو قسەی زۆرە و کردەوەی کەمە. کەچی قسەی لوس و لەفزی شیرین، کە یەکپارچە بۆنی ڕیا و درۆی لێ دێت، ئەمڕۆ بازاڕی خۆیەتی و سەودا و مامەڵەی گەرمە، وای لێهاتووە کە قسەی زۆرت کرد (ئەگەرچی کردەوەشی لەگەڵدا نەبێت) ماشەڵڵا چەندە زانا و شارەزا و کەسێکی کۆمەڵایەتیت!! ساتێکیش بێدەنگ بیت (ئەگەرچی لە

بیرکردنەوەشدابیت) چەندە نەفام و ساویلکەیت! بەڵام سبەی ئۆخەی بۆ خۆت، چەندە لێپرسینەوەت سوکترە لە زۆر بڵێیانی کەم کردەوە! بە هەزاران هاوڕێی مۆدێرنەی هەوایمان هەیە، وەلێ حەیفێ..!! زۆربەیان باری قورسی ڕێگای سەختی قیامەتمان کەمێك بۆ سووك ناکەن، ئەگەر قورستری نەکەن! تۆ چەندە ئاسوودەیت کە هاوڕێت کەمە! هاوڕێیەك، هاوڕاتە لەوەی بەدڵیەتی و جیاڕاتە لەوەی پێی ناخۆشە!! هاوڕێیەك، خودات بیر ناخاتەوە کە غافڵ بوویت لێی!! ڕاستت ناکاتەوە بە بێ شکان ئەگەر هەڵەت کرد!! کاتێك غەیبەت و درۆ و بوهتان و زەمی ئەم و ئەوی بۆ دەگێڕیتەوە.. ئەو خۆشحاڵ دەبێت و بۆت پێدەکەنێت!! بەڵام کە ڕاستییەکی تاڵی پێ دەڵێیت، لێت زیز دەبێت و پشتت تێدەکات! لە یەك ناپرسینەوە و، حەسرەتی ماڵ و موڵکی یەکتر، دڵی پڕ کردووین لە ئومێدی گەشتن بە زیاتر و بێ ئاگاین لەوەی، لەپڕ فریای هیچ ناکەوین و.. دەمرین!! دەی ئەگەر بڕیار بێت، ئێمە فریادڕەسی یەکدی نەبین لە ئاگری دۆزەخ، ئیدی پێم ناڵێی چ پێویستییەکمان بە یەکتر هەیە؟! بۆ قسەی بێسوود و قڵلەی پێکەنین و غەیبەت و لاسایی کردنەوە و درۆ و گاڵتەجاڕی و فرت و فێڵ و دڵشکانی یەکدی و باسی ناموسی ئەم و ئەو و غافڵ بوون و کات کوشتن و.. چەندەها شتی بێسوودی دیکە، نەبێت..!!

هەر ئەم گوناهانەی باوی ناو خەڵکی وایکردووە.. کە بە درێژایی مێژوو تا بە ئەمڕۆ، چاکانی خودا هەستییان بە غەریبیەکی سەخت کردووە و لە ناو خەڵکیدا نامۆ بوون و دەبن، بە غەریبی دێن و هەر بە غەریبیش دەڕۆنەوە! ئەگەرچی لەناو کەس و کار و خاك و نیشتمانی خۆشیاندا بن.

ئیدی قوسورمان لە ئاست فەخری عالەمدا (ﷺ) مایەی ئەوپەڕی شەرمەزارییە، کە بێ ئەوەی پشوویەك بدات، دوێنێ ڕێی بۆ ڕۆشن کردینەوە و ئەمڕۆ دڵی لامانە و.. سبەینێش لە حوزوری یاردا و سەر لە کڕنووشدا.. "ئومەتەکەم.. ئومەتەکەم" خەمی ئێمەیەتی و بۆمان دەپارێتەوە!

دەی من و تۆی بەڕێز، چەند جار هەستمان بە تەنگبوونی دڵمان کردووە بۆی؟! چەند جار دڵسۆزی و میهرەبانییەکەی، گریاندووینی؟! چەند جار دەنکە گێلاسێکی جوانت گرتووە بە دەستتەوە و حەزت کردووە خزمەتکاری بوویتایە و بە دەستەکانی خۆت بتخستبایە نێو دەمی موبارەکی؟! چەند جار لە نێو پێخەفی گەرم و نەرمی ژووری نووستنە گرانبەهاکەتدا، خانووە قوڕین و چۆڵ و هۆڵەکەیت کەوتۆتە یاد و.. ئیتر جێگاکەت جێ هێڵاوە و دەستت کردووە بە شەونوێژ، وەك چۆن ئەو بەردەوام خەریك دەبوو تا قاچی موبارەکی دەئاوسا؟! چەند کردەوەت هەیە شانازییان پێوە بکەیت؟! و بڵێیت: ئەمە

خۆشەویستەکەم فێری کردووم..!! وازت لە چەند خۆشی دنیا هێناوە لەبەر فەرمانی ئەو؟! چەند جار دەستەکانت بەرز کردۆتەوە بۆ پەروەردگار و تکات لێکردووە، تا لەبری ئێمە پاداشتی چاکە بێ پایانەکانی بداتەوە؟! چەند جار ئامادە و تەیار بوویت، تا شتە تایبەتییەکانت بخەیتە بەر دەستی موبارەکی و لە تاو خراپییان، خەجاڵەتی نەتگرێت؟! !

با ئەم پرسیارانە و چەندەها پرسیاری تری لەم شێوە بکەینە پێوەرێك بۆ زانینی ڕێژەی خۆشەویستییەکەمان بۆ پێغەمبەر گیان ( عليه الصلاة والسلام ) ئەو کاتە دەزانین کە ئایا خۆشەویستییەکەمان ڕاستەقینەیە، یان تەنیا زارەکییە و هیچی تر؟!! خوا پەنامان بدات.

**خوێنەری بەڕێز:** ڕووداوگەلی ناو ئەم کتێبە بەسەرهاتی پڕ مانای ژیانی هەندێك لە عاشقانی خودا و ئەویندارانی موحەممەد گیانن ( عليه الصلاة والسلام ) کە لە کتێب گەلێکدا دەرمهێناون و لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەمانەتپارێزی واتا و چۆنێتی ڕووداوەکان، بە زمانێکی سادە وەرم گێڕاونەتە سەر زمانە شیرینەکەی کوردی، هەرچەندە نەمتوانی ئەو شەرەفە بە خۆم ببەخشم کە لە سەرەتاوە چەند بەسەرهاتێك لە موحەممەدی پێشەنگی چاکانەوە ( عليه الصلاة والسلام ) بنووسم، بەڵام دڵخۆشی خۆمم بەوە دایەوە کە ئەوانەی من بەسەرهاتەکانیان دەنووسم، هەموو شوێنکەوتە و شاگرد و خزمەتکار و عاشقی فەخری کائیناتن (ﷺ).

لە کۆتاییدا.. داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار دەکەم، ئەگەر بەهۆی نەزانین و بێ ئاگاییمەوە شتێکم بەهەڵە تۆمار کردبێت، أستغفرالله العظيم وأتوب إليه...

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم.**

عەلی شێخ موحەممەد غەریبی خەرپانی

ڕەمەزانی ١٤٣٥ ی کۆچی
پووشپەڕی ٢٧١٤ ی کوردی
تەمموزی ٢٠١٤ ی زاینی

## باڵندە بەسـەر سـەریانەوە ڕاوەسـتاوە!

ئـەنـەس دەگـێـڕێـتەوە و دەڵێت: رسـول اللە (ﷺ) دەهـاتە دەرەوە بـۆ نـاو هـاوەڵەکانی لە کۆچەرییـان و پشـتیوانان.. ئـەوان دانیشـتبوون و ئـەبـوبەکـر و عومەریان لە نـێواندا بـوو (ﭫ) وەك ئـەدەب و شـــەرمێـك.. کەسیان چاویان بەرز نە ئـەکـردەوە تا رسـول اللە ببینن (ﷺ) بێجگە لە ئـەبـوبەکـر و عـومەر.. ئـەوان ســـەیری پێغەمبەریـان دەکـرد و ئـەویش ســـەیری دەکـردن، ئـەوان زەردەخەنەیان بـۆ ئـەکـرد و ئـەویش زەردەخەنەی بـۆ ئـەکـردن..!!

هـەروەهـا ئوسـامەی کوڕی شـەریك دەڵێت: هـاتمە خزمـەتی پێغـەمبەر (ﷺ) هـاوەڵەکانی لە دەوری بـوون، دەتگوت باڵـندە بە ســەر ســەریانەوە ڕاوەسـتاوە!! هێندە بە ئـەدەب بـوون لە حوزوری خـۆشـەویسـتەکەیاندا.

هـەروەهـا بـەڕائی کـوڕی عـازب دەڵێـت: ویسـتم لە بـارەی شـتێکەوە لە رسـول اللە (ﷺ) بپرسـم، بـەڵام لـەبـەر ڕێـز و هـەیبەتی پێغەمـبەر (ﷺ) دوو سـاڵم پێ چـوو، هـەتا لێم پرسـی..!![1]

## نیگایـەك بە کامی دڵ

عەمروی کـوڕی عـاص (ﭬ) دەڵێـت: پـێغـەمـبەر (ﷺ) هێـنـدە شـکـۆدار بـوو لـەلام.. نـەمدەتـوانی بـە کـامی دڵ و بـە چـاوەکـانـم نیگـای بکـەم، وە ئـەگـەر پرسـیارم لێبکەن کـە وەسـفی بکـەم.. نـاتـوانـم! چـونکـە نـەمتوانـیوە هـێنـدە تـەمـاشـای بکـەم هـەتـا بـتوانـم وەسـفی بکـەم.

✍... قـابیلی قـوربی یـار نییە، کز و مـاتـە و بێ قـەرار

خامۆشـە ڕۆح و چـاو بە ئەسـرینە وەك هـەوری بەهـار

ئەحـواڵی تـەنیا سـاتێکە، دڵ لـەبێ مـەیلی لـەیلی

بەندی غـەم و حـەسرەتە لە کـونجی سینەی تـەنـگ و تـار

(١) (حياة الصحابة ٢/٢٤ـ٢٥)

## لەوە زیاتر پێغەمبەری دڵخۆش دەکرد

ڕۆژی فەتحی مەککە بوو.. ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کە نابینا بوو، موسڵمان بوونەکەی درەنگ کەوت تا ئەو ڕۆژە، ئەبوبەکری گەورەمان باوکی برد بۆ خزمەتی رسول الله (ﷺ) بۆ ئەوەی کە بەیعەتی پێبدات.. پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر نەدەبوو ئەزیەتی باوکت نەدەیت و ئێمە بڕۆشتینایە بۆ لای؟! ئەبوبەکر وتی: هاتن بۆ خزمەتی تۆ هەقترە یارسول الله (ﷺ).

ئەبوقوحافە موسوڵمان بوو و ئەبوبەکری صدیق گریا..!! پێیان وت: ئەمە ڕۆژی شادیە، باوکت موسوڵمان بووە و لە ئاگر ڕزگاری بووە، ئیتر چشتێك دەتگرێنێ؟! !

ئەبوبەکری تەواوە لە ئەوین و خۆشەویستی موستەفادا (ﷺ) وتی: پێم خۆش بوو ئەوەی ئێستا موسوڵمان دەبێت، باوکم نەبووایە..!!! بەڵکو ئەبوطالبی مامی پێغەمبەر بووایە، چونکە ئەوە زیاتر پێغەمبەری دڵخۆش دەکرد..!![1]

## زیکری یار.. گاڵتە و گەپ نییە

ئیمام مالیك (رحمه الله) دەڵێت: جەعفەری کوڕی موحەممەد (عليه السلام) زۆر دەم بە پێکەنین بوو، وە حەزی لە گاڵتە و سوعبەت بوو، بەڵام کاتێك باسی پێغەمبەر (ﷺ) دەکرا.. یەکسەر ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕا، وە هەروەها بەبێ دەستنوێژ باسی خۆشەویستی نەدەکرد.

(١) (حياة الصحابة ٣١/٣)

## تۆ کام دەست ڕادەموسیت؟!

جەمیلەی خزمەتکاری ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: هەر کاتێك سابتی بونانی دەهات، ئەنەس (رضي الله عنه) پێی دەوتم: ئەی جەمیلە عەترێکم بۆ بهێنە با بیدەم لە دەستم!! چونکە سابت.. ڕازی نابێ هەتا دەستم ماچ نەکات و، دەڵێت: ئەم دەستە بەر دەستی رسول الله کەوتووە (ﷺ)..!![1]

هەروەها جارێك سەهلی کوڕی عەبدوڵلای توستەری دەچێتە خزمەت ئەبو داوودی سیجستانی (رحمه الله) ئەبو داوود پێشوازی لێدەکات و دایدەنیشێنێت، سەهل دەڵێت: ئەی ئەبا داوود.. کارێکم پێت هەیە؟

ئەویش دەڵێت: بڵێ بزانم کارەکەت چییە؟

سەهل دەڵێت: پێت ناڵێم تا بە پێی توانا بەڵێنی جێ بەجێکردنیم پێنەدەیت. ئەبو داوود دەڵێت: بەڵێ بە پێی توانا بەڵێنت دەدەمێ.

سەهل پێی دەڵێت: ئەو زمانەت بهێنە دەرێ، کە فەرمودەی رسول الله ی (ﷺ) پێ دەگێڕیتەوە، تا ماچی بکەم..!!

ئیتر ئەبو داوود زمانی دەردەهێنێت و.. سەهل ماچی دەکات.[2]

## ئارەقت گوڵە

ئەنەس (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هێنایە لامان، سەرخەوێکی شکاند و ئارەقەی کرد، دایکم قاپێکی هێنا و ئارەقەکەی تێکرد، پێغەمبەر خەبەری بۆوە و فەرمووی: ئەی ئوم سولەیم.. ئەوە چی دەکەیت؟! دایکم وتی: ئەوە ئارەقەی پیرۆزی تۆیە، دەیکەینە ناو عەترەکانمانەوە، چونکە خۆشترین بۆنی هەیە.

(١) (حلية ألاولياء٢/٣٢٧)
(٢) (أبوداوود الامام الحافظ الفقيه/٣٠)

## پۆشاکەکەت کوانێ لەی لەبو بەکر؟!!

پاش ئازار چەشتنێکی زۆری خۆی و هاوەڵەکانی.. حەزرەتی فەخری کائینات (ﷺ) فەرمانی پەروەردگاری بۆ هات، کە خۆشەویسترین شوێنی دنیا لە دڵیدا کە (مەککە) بوو، بەجێی بهێڵێت و بڕوات بۆ یەسرب، بە نهێنی لەگەڵ خۆشەویسترین هاوڕێیدا کۆچی کرد، شەوەکەی گەشتنە ئەشکەوتی حیراء، ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) بۆ پاراستنی پێغەمبەر (ﷺ) هەموو ڕێیەکی دەگرتە بەر بۆیە مۆڵەتی لە پێغەمبەر وەرگرت یەکەمجار خۆی بچێتە ناو ئەشکەوتەکە، تا ئەگەر مارێك، یاخود شتێك هەبێت ئازارەکەی بۆ ئەم بێت نەك بۆ رسول الله (ﷺ) ئەبوبەکر کراسەکەی بەری پارچە پارچە کرد و هەموو ئەو کونانەی پێ گرت کە لەناو ئەشکەوتەکەدا هەبوون بۆ دوور خستنەوەی ئازار لە خۆشەویستەکەی، تەنیا کونێك مایەوە.. ئەویشی بە پاژنەی پێی گرت!!

ئەوجا وتی: خۆم و دایك و باوکم بە قوربانت بین، ئێستا تەشریف بهێنە، فەخری عالەم (ﷺ) تەشریفی دەچێتە ناو ئەشکەوتەکە، کە ڕۆژ دەبێتەوە و هاوەڵە خۆشەویستەکەی بەو شێوە دەبینێ، پێی دەفەرمووێ: ئەی پۆشاکەکەت کوانێ؟!! ئەویش بۆی باس دەکات، ئیدی پێغەمبەر دەستی بەرز دەکاتەوە و دەفەرمووێ: پەروەردگارا لە بەهەشتیشدا ئەبوبەکر هاوەڵ و هاودەمم بێت و لەپلەی مندا بێت[1].

## خۆشەویستییەکی ناوازە!!

ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) دەڵێت: لە ڕێگەماندا بووین بۆ مەدینە، زۆر تینووم بوو، ڕۆشتم شیرێکی پاك و تازەم هێنا بۆ رسول الله (ﷺ) کاتێك پێغەمبەرم بینی شیرەکەی خواردەوە.. من تینوێتیم شکا!!

(١) (صفة الصفوة/٩٥)



## شـيفای دەردان

ئيمام ئـەبـو عەبدوڵڵای بـوصيری (رحمه الله) دەڵێت: لايەكی جەسـتەم لە جـووڵە كەوتبـوو، پزيشـكەكان نەيانتوانی يارمـەتيدەری چـاكبـوونـەوەم بـن، جـارێك بـەر لە نـووسـتن، سـەد سـەڵاواتم نـارد بـۆ ڕۆحـی رسـول الله (ﷺ) پاشـان خـەوتـم و لايـەكم تـەواو سـڕ و بێ جـووڵـە بـوو، لـە خـەونمدا بينيم رسـول الله (ﷺ) بـوردەكـەی لـە بـەری خـۆی لابـرد و منـی پێداپـۆشـی و فـەرمـووی: مـوژدەی شـيفات لـێ بێـت لە لايـەن خـوداوە. ئيـدی لـە خـەوەكـەم بـێدار بـوومـەوە و بينيم.. وەهـا چـاك بـوومـەتـەوە وەك بڵێـی پێشـتر هـەرگيز تـووشـی ئـەو نـەخـۆشـييە نـەهـاتبم.

ئـيدی ئـيمام بـوصيری پـاش ديـداری حـەزرەت و چـاكبـوونەوەی لە نەخـۆشـييەكەی كتێبـی (بـردة المـديح) دەنووسـێت، كە سـەڵاوات دانە لەسـەر ڕۆحی رسـول الله (ﷺ).[1]

## كێـت خۆشـدەوێـت؟!

ئـەنـەس دەڵـێت: پـياوێـك پـرسـی لـە رسـول الله (ﷺ): كـەی ڕۆژی دوايـی دێـت؟! فـەرمـووی: ئـەی تـۆ چـيت بـۆ ئـەو ڕۆژە ئـامادە كـردووە؟

پياوەكە وتی: هيچ شـتێك (بێ گـومان بـێجگە لە فەرزەكـان) تەنيـا ئـەوەيە كە خـودا و پێغەمبەرم (ﷺ) خـۆشـدەوێت..!!

ئـازيز فەرمووی: تـۆ لـەگـەڵ ئـەو كەسـەدايـت كـە خـۆشـت ئـەوێـت.

ئـەنەس دەڵێت: هيچ شـتێك بە ئـەندازەی ئـەو فـەرموودەيـەی پێغەمـبەر (ﷺ) دڵخـۆشـی نەكـردين، كە فـەرمـووی: تـۆ لەگەڵ ئـەو كەسـەدايت كە خـۆشـت ئـەوێت. وە من پێغـەمـبەر و ئـەبـوبـەكـر و عـومەرم خـۆشـدەوێت و ڕجـام وايە بەم خـۆشـەويسـتييەم بـۆيـان، ڕۆژی دوايـی لەگەڵ ئـەواندا بـم، ئـەگـەرچی هـەمـان كـردەوەی ئـەوانيشـم نەبێت.[2]

---

(١) (أنيس المؤمنين/١٠١)

(٢) ( روضة المحبين/٤١٤)

## ئایا لەگوماندایت؟!

عومەری فاروق (رضي الله عنه) دەچێتە ژووری بۆ خزمەتی خۆشەویست و دەبینێت، پێغەمبەر (ﷺ) دوور لە خێزانەکانی لە ژوورەکەیدا، لەسەر حەسیرێك ڕاکشاوە و شوێنەواری حەسیرەکە بە ڕوخساری پیرۆزییەوە دیارە..!! عومەر تەماشای ماڵە زۆر سادە و فەقیرانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات و ئیدی بەرگە ناگرێت و فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوار و دەگریەت!!

خۆشەویست دەفەرمووێ: ئەوە چیتە ئەی کوڕی خەطاب؟

عومەر دەڵێت: یارسول الله (ﷺ) کیسرا و قەیسەر کە دوژمنی خوان، لەو ناز و نیعمەتەدان کە خۆت دەزانیت، بەڵام تۆ پەیامبەر و خۆشەویستی خوایت و، ئەمە حاڵ و گوزەرانتە؟!!

خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێت: ئایا تۆ لە گوماندایت، ئەی کوڕی خەطاب؟ ئایا ڕازی نابیت دنیا بۆ ئەوان بێت و ئاخیرەت بۆ ئێمە بێت؟!

ئیدی ئەم وتە شیرینانە.. بەجۆرێك دڵنەوایی عومەر دەدەنەوە و، ئەو گڕ و تینەی پێ دەبەخشن، کە لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا، گەنجی کیسرا و پاشاکانی کەوتە بەردەست، بەڵام ئەو نەیویست و ڕێبازی مامۆستاکەی ون نەکرد!!

## خۆشەویستی ئاوەها دەبێت

عائیشەی دایکی ئیمانداران دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە.. کەسە نزیکەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر خۆشەویسترن لە لام هەتا کەسە نزیکەکانی خۆم.

## له حوزوری خۆشه‌ویستدا

له جه‌نگی ئوحوددا.. ئافره‌تێکی ئه‌نساری له به‌نی دینار، مێرده‌که‌ی و براکه‌ی و باوکی له‌یه‌ك ڕۆژدا له ده‌ست ئه‌دات و کاتێك ده‌برێته سه‌ر ته‌رمه‌کانیان، ده‌پرسێت: ئه‌ی رسول الله (ﷺ) چی لێ به‌سه‌رهاتووه؟!! پێی ده‌ڵێن: وه‌ك تۆ پێت خۆشه، سه‌لامه‌ته. به‌ڵام ئه‌و دڵی ئارام نابێته‌وه و، ده‌ڵێت: له کوێیه با ببینم؟! ئیدی ئاماژه‌ی بۆ ده‌که‌ن و پیشانی ده‌ده‌ن، ئافره‌ته‌که‌ش ڕوو له پێغه‌مبه‌ره خۆشه‌ویسته‌که‌ی ده‌کات و ده‌ڵێت: به حوزوری تۆ هه‌موو موسیبه‌تێك سوك و ئاسانه، یارسول الله (ﷺ)..!![1]

## دڵته‌نگ و بێتاقه‌تت بووم!

سه‌وبانی خزمه‌تکار و عاشقی رسول الله (ﷺ) نه‌یده‌توانی که‌مێك له خۆشه‌ویسته‌که‌ی دوور بکه‌وێته‌وه!! چونکه دڵ و گیان و ژیانی یه‌کپارچه ئه‌وینی ئه‌و بوو، وه‌ها بیری ده‌کرده‌وه که هه‌رگیز ناتوانێت تا کۆتایی له خزمه‌تی مه‌عشوقه‌که‌یدا بێت و، ڕۆژێك دێته پێشه‌وه، که جودایی خاڵێك له نێوانیاندا داده‌نێت و ناڵه‌ی جودایی، ژانی ناسۆری دووری پێ ده‌چێژێت..!!

سه‌وبان (ﷺ) زۆر پێغه‌مبه‌ری خۆشده‌ویست و دووری ئازیزه‌که‌ی که‌م ئارام و بێتاقه‌تی ده‌کرد، ڕۆژێك هاته خزمه‌تی خۆشه‌ویست.. ڕه‌نگی تێك چوو بوو، جه‌سته‌ی له‌ڕ و لاواز بوو، دڵته‌نگی به ڕوخسارییه‌وه دیار بوو..!! رسول الله (ﷺ) پێی فه‌رموو: ئه‌ی سه‌وبان.. ئه‌وه چشتێك ڕه‌نگ و ڕوخساری شێواندووی؟! ! سه‌وبان وتی: یارسول الله (ﷺ) نه نه‌خۆشم، نه ئازارێکم هه‌یه!! هێنده هه‌یه که ساتێك ناتبینم، زۆر تامه‌زرۆ و بێتاقه‌تت ده‌بم و ئارامم له‌لا نامێنێت، تا به دیدارت ده‌گه‌م!! پاشان بیری ئه‌و دنیام کرده‌وه، بۆیه زۆر ئه‌ترسم که له‌وێ به دیدارت شاد نه‌بم، چونکه ده‌زانم تۆ له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌راندا پله‌ت به‌رز ده‌کرێته‌وه و من ئه‌گه‌ر بێمه به‌هه‌شتیش ئه‌وا له پله‌یه‌کی نزمتردام و ناتوانم هه‌میشه بتبینم، وه ئه‌گه‌ر نه‌یه‌مه به‌هه‌شتیشه‌وه، ئیدی ئه‌وه هه‌رگیز به دیدارت ناگه‌مه‌وه..!![2]

---

(١) (السيرة لابن هشام ٤٣/٣)

(٢) (مختصر تاريخ دمشق لابن عساكر ٣٤٨/٥)

خـوای گەورەش ئـەم ئـایەتەی ناردە خـوارەوە، کە دەفەرمووێ:

﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا ﴾[1]

واتە: وە هـەر کەسێك گـوێـڕایەڵی خــودا و پێغەمـبەر بکـات، جـا ئـەوانە لەگەڵ کەســـانێکن کە خـــودا بەهــــرەی ڕشــــتووە بە ســــەریاندا، لە پێغەمـــبەران و ڕاســتگــۆیان و شــــەهیدان و پـیاوچــاکان، وە ئـەوانــە چ هــاوڕێ و هــاوەڵێکی چـاکن.[2]

... هـەرچی خۆڵ و خاشــاکی دنیا هـەیە، بە ســەری مـن
هــەرچی دڕك و خــاری ســارا هـەیـە، کاڵای بـەری مــن
گـەر ویسـاڵت ڕێگـا نـەبێت بــۆ مـەنـزڵی یــارەکـەم..!
تیـاچێت دڵـەی خوێنـڕژاوی، پــڕ دەرد و کەسـەری مـن

## فـەرمـوودە بـەراورد ناکـرێت

پیاوێـك پـرسـیارێـك ئـاڕاسـتەی عـەبـدوڵڵای کـوڕی عـەبـاس (رضي الله عنهما) دەکات و ئـەویــش بــە فـەرمـوودەیــەکی رســـول الله (ﷺ) وەڵامـی دەداتــەوە، دیــارە پـیاوەکــەش وەڵامـەکــەی بـــەدڵ نـابــێت، بـۆیــە دەڵــێت: ئـەبـوبـەکــر و عـومـەریـش ئـاوەهـا دەڵێن. ئـیـبن عـەباس تـوڕە دەبـێـت و دەڵـێـت: نــزیکـە بــەرد بــەسـەرتـانـا ببارێـت..!! مــن دەڵـێم: پـێـغـەمـبەر (صلى الله عليه وسلم) وەهـــای فــەرمـوو، ئـێوەش دەڵـێن: ئــەبـوبـەکـر و عـومـەر وەهـایـان وت!!

(١) (النسـاء/٦٩)
(٢) (پوختەی تەفسیری قورئان/٨٩)

## ڕێك بوه‌ســته‌.. ســـه‌واد

له جه‌نگی بـه‌دردا بـوو.. رسـول الله (عليه الصلاة والسلام) ڕیـزی هـاوه‌ڵه‌كانی ڕێـك ده‌كـرد، كاتێـك گـه‌شـــته لای ســـه‌وادی كـوڕی غـوزیه (رضي الله عنه) كه له ڕیـــزی ســـوپای موســـڵمانه‌كان تـرازا بـــوو و هـاتبـــووه پێشـــه‌وه، پێغه‌مـــبه‌ر (عليه الصلاة والسلام) به هێواشـــی دای له ســـكی ســـه‌واد و پێـی فـه‌رمـوو: ڕێـك بـووه‌ســته‌.. ئـه‌ی ســـه‌واد

ســـه‌واد وتی: ئـازارت دام، ئـه‌ی رسـول الله (ﷺ) خـوداش تـۆی بـۆ هـه‌ق و دادپـه‌روه‌ری نـاردووه، هـه‌قی خـۆمـم بـده‌وه..!! ئیـدی پـێـغـه‌مـبـه‌ری ئـازیــز و میـهره‌بـان (عليه الصلاة والسلام) ســـكی پیـرۆزی خـۆیی بـۆ ده‌رخســـت و، فـه‌رمـووی: هـــه‌قی خـــۆت وه‌رگـــره‌وه. ســـه‌وادیش ده‌ســـت به‌جـێ ســـكی پیـــرۆزی پێغه‌مبـه‌ری له ئـامێز گرت و ده‌سـتی كـرد به ماچكـردنی..!!

پێغه‌مبه‌ر (عليه الصلاة والسلام) پێی فه‌رموو: چـی وای لێكـردیت ئـــه‌م كـاره بكه‌یـت، ئـه‌ی ســـه‌واد؟! ســـه‌واد وتی: ئـه‌ی رســـول الله (ﷺ) وه‌ك ده‌بینـی ئـــه‌م ڕۆژه هـاتـۆته پێش، بـۆیـه پێم خـۆش بـوو كه دواهـــه‌مین به‌ڵـێنم بـۆ تـۆ به‌ركه‌وتنـی جه‌ســـته‌م و جه‌ســـته‌ی پـیرۆزت بێـت!! ئیـدی رســـول الله (عليه الصلاة والسلام) نـــزای خێـری بـۆ كـرد.[1]

## ســكت دیـارفـه بـا مـاچی كـه‌م

عـومـه‌یــری كــوڕی ئیســـحاق ده‌ڵێـت: له ڕێگـاكـانی مـه‌دینـه‌دا، لـه‌گـه‌ڵ حـه‌ســـــه‌نی كــــوڕی عـــه‌لیدا (عليه السلام) ده‌ڕۆشـــــتم، ئـه‌بـوهـوره‌یـره‌مـــان پێگـه‌شـــت و، وتی به حـه‌ســـه‌ن: ســكـتـم بـــۆ ده‌رخـــه، مـن بـــه فـیـدای تـــۆبـم..!! هـه‌تا ئـه‌و شـوێـنه مـــاچ بكـه‌م، كـه رســـول الله م بیـنـی (ﷺ) مـاچـی ده‌كـرد..!! حـه‌ســـه‌نیش ســكی بـــۆ ده‌رخســـت و ئـه‌بـوهـــوره‌یـره نـــاوكـی مـاچكـرد.[2]

---

(١) (حياة الصحابة ٣/ ٣٣)
(٢) أبـوهريرة راوية ألاســلام/٢٠٣)

## چی لەم کراسەی پێ لەبەر کردیت؟!

جارێکیان رسـول الله (ﷺ) کراسێکی جوان و نوێ دەپۆشێت، کە زۆر لێی دێت و هاوەڵان زۆر دڵخۆش دەبن بەوەی کە ئازیز کراسی نوێی پۆشیوە، پیاوێك لە هەژاران کە هەمیشە لە تەکبیرەتول ئیحرامدا لە پشت پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئامادە دەبێت.. داوا دەکات لە ئازیز کە ئەو بەرگە نوێیەی پێ ببەخشێت، هەرچەندە هاوەڵان ئەو کارەیان زۆر پێ ناڕەحەت دەبێت و لۆمەی دەکەن، بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست دڵی هەژارەکە ناشکێنێت، کراسەکە لەبەر خۆی دادەکەنێت و دەیکاتە بەری هەژارەکە!!

پیاوە هەژارەکە بە دڵ خۆشییەکی زۆرەوە دەڕواتەوە بۆ ماڵ، ژنەکەی کە دەزانێت ئەوە کراسەکەی رسـول الله یە (ﷺ) پێی دەڵێت: ئایا رۆشتوویت شکاتی خوات کردووە لای پێغەمبەرەکەی؟! ! پیاوەکە دەڵێت: سوێند بە خودا.. وام نەکردووە. ژنەکەی دەڵێت: ئەی چی ئەم کراسەی رسـول الله ی (ﷺ) پێ لەبەر کردیت؟! پیاوەکە دەڵێت: وەڵلاهی تەنیا بۆ ئەوە داوام کرد.. کە کاتێك مردم بیکەنە کفنم!!

... جەستەم نەدارییە کالای بۆ بڕیوە

وەلێ دڵم ئەوینی تۆ دایپۆشیوە

شەوقی لیقای جانانە حەسرەتی دڵم

خوفی فیراقی تۆیە وا ڕەنگم پەڕیوە

## عەشقی ئیلاهی

ئەبایەزیدی بوستامی (رحمه الله) دەڵێت: ئەی ئیلاهی.. سەیر نییە کە من تۆم خۆشدەوێت، چونکە من بەندەیەکی بێ هێز و بێ دەسەڵاتم و موحتاجی ڕەحم و کەرەمی تۆم، سەیر لەوەدایە کە تۆ منت خۆشدەوێت! لە کاتێکدا تۆ مەلیکێکیت توانات لەسەروو هەموو شتێکەوەیە و هەموو شتێکیش ئاتاجی بە تۆیە!![1]

---

(١) (حلیة الأولیاء:١٠/٣٤)

## خۆشەویسترین ڕۆژ

عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنها) دەڵێت: لە کاتی سەرەمەرگدا ئەبوبەکر وتی: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ پێیان وت: ڕۆژی دوو شەممەیە. ئەبوبەکر وتی: ئەگەر ئەمڕۆ مردم، زوو کفن و دفنم بکەن و مەمخەنە سبەینێ، چونکە خۆشەویسترین شەو و ڕۆژی من، نزیکترینیانە لە رسول الله وە (علیه الصلاة والسلام) کە ڕۆژی دوو شەممەیە.

## دوور لە کۆڕی خۆشەویستەکەی!

یەکێك بوو لە ئەویندارانی رسول الله (ﷺ) پەیوەندییەکی بەتینی خۆشەویست، جامی ژیانی پڕ کردبوو لە ئومێد، بەڵام لەپڕ ئەم ئەویندارە بەڕێزە سابتی کوڕی قەیسی ئەنساری (رضي الله عنه) خۆی دوور گرت لە کۆڕ و دانیشتنەکانی خۆشەویستەکەی و لە ماڵەوە مایەوە، بێجگە لە نوێژە فەرزەکان، ئیدی مەگەر چۆنها بهاتبایە دەر!!
پێغەمبەر (ﷺ) غەریبی کرد و فەرمووی: کێ هەواڵێکی سابتم بۆ دێنێت؟ پیاوێکی ئەنساری وتی: من یارسول الله (ﷺ).
پیاوەکە ڕۆشت و دیتی سابت لە ماڵەوە.. دڵتەنگ دانیشتووە و سەری دانەواندووە، پێی وت: ئەوە چیتە ئەی ئەبا موحەممەد؟ وتی: حاڵم خراپە..!! پیاوەکە وتی: لەبەر چی؟! وتی: تۆ دەزانیت من پیاوێکی دەنگ بەرزم و، زۆر کات دەنگم بە سەر دەنگی رسول الله دا (ﷺ) بەرز دەبێتەوە، خودای گەورەش دەفەرمووێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾[1]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، دەنگتان بەرز مەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ) وە بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵ مەکەن، وەك دەنگ

(١) (الحجرات/٢)



بەرز کــردنەوەتان لەگەڵ یەکـتری، نەوەکــو کــردەوەکانتان بەتــاڵ بێــتەوە و خۆشــتان هــەســتی پێ نەکەن.[1]

بەمەش مـن ڕەنـجم بە فــیڕۆ دەڕوات و یەکێـك دەبـم لە ئــەهلی ئـاگــر..!! پیاوەکە هـاتەوە خزمـەت رســول الله (ﷺ) و ئــەوەی بینـی و بیســتی، عەرزی کـرد. خۆشــەویسـتیش (ﷺ) فـەرمــووی: بــڕۆ بــۆ لای و پێی بڵـێ: تــۆ لــە ئـەهلی ئـاگــر نیت، بـەڵکو تــۆ لـە ئـەهلی بـەهـەشـتیت.

ئـەمـەش مـوژدەیەکی گــەورە بــوو بــۆ ســابت، کە بـەردەوام تەمـەننای خێری دەکـرد لە ژیـانیدا.[2]

... کـز و بێـدەنـگ، بـە ئــومـێـدی ڕمزای تــۆم
بـۆ یـادت، دەچـێ لـە یــادم نـەفـسـی خـۆم
حـەرامـە لێم، گـەشـت و سـەیـران و خۆشـی
بێ ویـســاڵـت ڕۆژی ڕوون تــاریـکـە بــۆم!!

## ســێوێك.. لـەمما چ ســێوێك؟! !

بە درێــژایی تەمـــەنی دڵتەنــگ و بە داخــەوە بــــوو..!! بــۆ ئــەوەی ئــەو چانســـەی نـەبــوو کـە بـە دیدار و خزمــەتی رســول الله (ﷺ) بگـات، بــۆیە هـەمـیشــە ڕەفیعـی کـوڕی مهران (رحمه الله) دەیویســـت خــۆی لــەو هـاوەڵــە بــەڕێـزانە نـزیك بکـاتـەوە، کـە پــەیـوەندیـیەکی گــەرم و بــە تـیـنـیان هـەبـــوو لـەگــــەڵ فـەخـــری عـالــــەم دا (ﷺ) ئــیدی زۆر ڕێـــزی لــێ دەگــرتن و خۆشــیدەویســتن و ئــەوانیش ڕێــزیـان لێ دەگـرت و خـۆشــیاندەویســت.

جارێــك ئـەنەســی خزمــەتکاری رســول الله (ﷺ) ســێوێکی بە دەســـتەوە دەبـێت و دەیکـاتــە دیاریـیەك بــۆ ڕەفـیـع، ڕەفیعـیش ســێوەکە وەردەگــرێت و دەســت دەکـات بـە مـاچ کـردنی و دەڵێت: ئـەمــە ســێوێکە و بــەر دەسـتێـك کەوتــووە.. کە بەر دەسـتی رســول الله (ﷺ) کـەوتــووە!! ئەمە ســێوێکە و بەر دەسـتێکی بەخـتـەوەر کـەوتـووە، کە بەر دەسـتی رسـول الله (ﷺ) کەوتووە!![3]

---

(١) (پوختەی تەفسیری قورئان / ٥١٥)
(٢) (صور من حياة الصحابة /٤٥٨ ـ ٤٥٩)
(٣) (صور من حياة التابعين/ ٤٥٢ ـ ٤٥٣)

## بەیادی کێوە دەنوویت؟!

خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) کاتێك دەچووە جێگای نووستنەکەیەوە هەتا خەو دەیبردەوە، یادی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی دەکرد و دەیگوت: خودایا.. دڵم لە دووریان دەکوڵێ و شەوقم بۆ دیداریان تووڵی کێشا، خودایا.. زوو مەرگم خەڵات بکە و بمبەوە بۆ دیداریان.

## وەی بە حاڵمان چ کارێکمان کرد؟! !

کاتێك رسول الله ( عليه الصلاة والسلام ) گەشتە مەدینە .. و لە ماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنساری دابەزی.. تا مزگەوت و حوجرەکەی بکرێنەوە، ئەبو ئەیوب داوای کرد کە خۆشەویست تەشریف بباتە قاتی سەرەوە، بەڵام پێغەمبەری ئازیز ( عليه الصلاة والسلام ) بە هۆی میوانی زۆرەوە، وای بە باش زانی کە لە قاتی خوارەوە بێت، یەکەم شەو.. کاتێك ئەبو ئەیوب و خێزانەکەی (ﷺ) چوونە سەرەوە، وتی: وەی بە حاڵمان چ کارێکی خراپمان کرد؟!! پێغەمبەری ئازیز (ﷺ) لە خوارەوە بێت و ئێمەش لە سەرووی ئەوەوە بێین و بچین؟!! وە ئێمە بکەوینە نێوان پێغەمبەر و وەحی ئاسمانییەوە؟!! بەڕاستی ئێمە تیا چووین.

ئیدی ئەو شەوە نەیاندەزانی چی بکەن؟! ئارامیان نەمابوو! ناچار خزانە کەنارێکەوە کە نەدەکەوتە سەر ئەو ئاستەی رسول اللەی (ﷺ) تێدابوو، وە بە قەراغی ژوورەکەدا هاتوچۆیان دەکرد و خۆیان لە ناوەڕاستی ژوورەکە بە دوور دەگرت، هەر چۆنێك بوو رۆژ بوویەوە، ئەبو ئەیوب چووە خزمەت خۆشەویست (ﷺ) و عەرزی کرد: وەڵلاهی ئەمشەو من و ئوم ئەیوب پێڵوی چاومان لێك نەناوە بۆ نووستن..!! خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: لەبەر چی ئەی ئەبا ئەیوب؟! ئەبو ئەیوب وتی: بیری ئەوەم دەکردەوە کە من لە سەرووی تۆوەم، ئەگەر بجوڵێمەوە خۆڵ و غوبار دەوەرێت و ئازارت دەدات و.. وە من کەوتوومەتە نێوان وەحی ئاسمانی و تۆوە..!! خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی: کەمێك ئارامبە و ئاسایی وەری بگرە، ئەی ئەبا ئەیوب، خوارەوە بۆ ئێمە باشترە بە هۆی زۆری ئەو کەسانەی دێنە لامان.

ئەبو ئەیوب دەڵێت: ئیدی تەسلیمی فەرمانی رسول الله (ﷺ) بووین، هەتا شەوێکی سارد.. گۆزەیەکی ئاومان کەوت و ئاوەکەی ڕژا، ئیدی دەست بەجێ من و ئوم ئەیوب بە قەیفەیەك، کە تەنیا ئەوەمان هەبوو وەك

لێفە خۆمان پێدادەپۆشـی.. ئاوەکەمان پێ وشـك کـردەوە، لە ترسـی ئـەوەی نـەوەك ئاوەکە بچۆڕێتە خوارێ و ئـازاری خۆشـەویسـت بـدات (ﷺ)!! کە ڕۆژ بـوویـەوە ڕووداوەکەی شـەوم بـۆ گـێڕایـەوە و عـەرزم کـرد: خـۆم و دایك و باوکـم بە فـیدات بـین.. یارسـول الله (ﷺ) مـن پێـم ناخـۆشـە لە سـەرەوەبم و تـۆش لە خـوارەوە. ئـیتر ڕازی بـوو ئـێمـە بێـینە خـوارەوە و ئـەوان تەشـریف ببەنـە سـەرەوە.[1]

## هەقی خۆت بکەوە.. لەی ئوسەید

ئوسـەیدی کوڕی حـوزەیر زۆر تەمـەنناى ئـەوەی بـوو کە جـەسـتەی بـەر جـەسـتەی پـیرۆزی رسـول الله (ﷺ) بکـەوێـت و تـێر مـاچـی بکـات..!! خـوای گـەورە جـارێك ئـەوەی بـۆ ڕێکخسـت و ئـەویش لە دەسـتی نـەدا، ڕۆژێـك ئـوسـەیـد (رضي الله عنه) قـسـەی خـۆشـی بـۆ خـەڵکی دەکـرد، خۆشـەویـست (ﷺ) بـەسـووکـی کـوتـایـە کـەمـەری، وەك بڵێـی قـسـەکەی پـێ خـۆش بـوو، ئوسـەید وتی: ئـازارت پـێگـەیـانـدم، یارسـول الله (ﷺ).

خـۆشـەویسـت فـەرمـووی: هـەقـی خـۆتـم لێ بکـەوە، ئـەی ئـوسـەیـد.

وتی: تـۆ کراسـت لەبەر دایە، من کەمەرم دیار بـوو کاتێك دەسـتت لێدام. ئیتر خۆشـەویسـت (ﷺ) کـراسـەکەی خـۆی بەرز کـردەوە، بـۆ ئـەوەی ئوسـەید بە دڵی خـۆی هـەقی خـۆی لـێ بکـاتەوە، ئـوسـەیدیش هـەلەکەی قـۆسـتەوە، باوەشـی کـرد بە خـۆشـەویسـتدا و دەسـتی کـرد بە مـاچکـردنی نـێوان بـن بـاڵ و کـەمـەری پـیرۆزی و، دەیـوت: خـۆم و دایبابـم بـە فـیدات بـین، یارسـول الله (ﷺ) ئـەوە تـەنها ئـاواتی مـن بـوو لـەو سـاتـەوەی کـە تـۆم ناسـیوە، ئـەوەتا ئـێسـتا پێی دەگـەم!![2]

✍... بـۆ لـەمسـی شـتێ، بەرکـەوتـەی بـەدەنت بێ شـێـتم

بـۆ گـەردی بـەر پـێت، بێ قـەرار و عـەودالی ڕێتم

بۆ قوببە سـەر سـەوزەکـەی مەدینەت، سـەر سپی بـوو

جـەرگ بـڕاو و دڵتەنگ و گـوشـراوی مـەیلی نوێتم

(١) (صور من حياة الصحابة/٦٦ـ٦٧)
(٢) ( صور من حياة الصحابة/١٧٠)



## فێرایی گوێڕایەڵی

ڕۆژێك رسـول الله (ﷺ) لە مـزگـەوتەكەیـدا.. وتاری بـۆ هاوەڵەكانی ئـەدا، عەبـدوڵڵای كـوڕی ڕەواحە (ﷺ) لە ڕێگـەدا بـوو بـۆ خزمـەتی خۆشـەویستەكەی، بەر لەوەی بگاتە مـزگـەوت، گـوێی لە حـەزرەت بـوو بە هـاوەڵەكانی دەفـەرمـوو: دانیشـن. ئیـدی عەبـدوڵڵا دەسـتبەجێ لە دەرەوەی مـزگـەوت و لە شـوێنی خـۆیدا یەكسـەر دانیشـت، هـەتا پێغـەمـبەر لـە وتارەكەی بـوویـەوە..!! كاتێك هـەواڵـەكە گـەشـت بـە پێغـەمـبەر (ﷺ) بـە عـەبدوڵڵای فـەرمـوو: خـوای گـەورە زیـاتـر سـوورت بكات لە سـەر گـوێڕایـەڵی خـودا و پێغـەمبەرەكـەی.[1]

## جـودایی

ڕۆژێك عـومـەری كـوڕی خـەطاب (ﷺ) لە تەنیشـت گـۆڕی رسـول الله دا وەسـتا و، وتی: السلام علیك یارسـول الله (ﷺ) لەسـەر بنەدارخـورمـایـەكـدا وتـارت بـۆ ئـەدایـن، كاتـێك مینبەرمـان بـۆ دروسـت كـردیـت و بنەدارخـورمـاكەت جێهێشـت، گـوێمـان لـە نـاڵـەی بـنەدارخـورمـاكـەوە بـوو، كـە چـوون نـاڵـەی كـۆسـت كـەوتـوویـەك وەهـابـوو..!! دەی ئـەگـەر بـنەدارخـورمـایـەك بـناڵـێنێـت بـۆ جـودایـیـت.. ئـەبـێ ئـێمـە چـۆن بـین بـۆ جـودایـیـت، یـارسـول الله (ﷺ)..!![2]

✍... نـاڵەی جـوداییت، ئـەسرینی نەهێشـت لە چـاوما، یارسـول الله
دەمسـوتێنێ شـەوقی جـەماڵت لـە هـەنـاوما، یارسـول الله
شـادی نـەبینێ گـەر نـەكا یادی یار هـەموو سات، دڵەی تـەنگم
غـەم و نـاسـاغی جـەم بێ لـە جـەرگـی بڕاوما، یارسـول الله

---

(١) (حیاة الصحابة: ج٣/٦٦)
(٢) ( أنیس المؤمنین/٢٧)

## كڵاوه‌كه‌م بۆ بدۆزنه‌وه‌!

هه‌ركه‌س ڕووبه‌ڕووی ده‌بوویه‌وه ده‌یبه‌زاند و تێكی ده‌شكاند..!! جه‌نگی یه‌رموك بوو، خالدی كوڕی وه‌لید (رضي الله عنه) كڵاوه جه‌نگییه‌كه‌ی سه‌ری لێ كه‌وت، ئیدی وه‌ك سه‌روه‌تێكی گه‌وره‌ی له‌ ده‌ست دابێت، هاواری ده‌كرد و ده‌یوت: كڵاوه‌كه‌م.. كڵاوه‌كه‌م !! گه‌ڕان و نه‌یاندۆزیه‌وه‌، دووباره‌ وتی: كڵاوه‌كه‌م بۆ بدۆزنه‌وه‌..!! له‌ ئاكامدا كڵاوه‌كه‌یان بۆ دۆزیه‌وه‌ و پێیان وت: سه‌یره‌ ئه‌ی ئه‌با سوله‌یمان..!! تۆ له‌ گه‌رمه‌ی جه‌نگدایت، بۆ هێنده‌ داوای كڵاوه‌كه‌ت ده‌كه‌یت؟!!

خالد وتی: ئه‌م كڵاوه‌ چه‌ند تاڵه‌ موویه‌كی سه‌ری پیرۆزی پێغه‌مبه‌ری خوای تێدایه‌، كه‌ به‌ هۆی به‌ره‌كه‌تی پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ (ﷺ) ڕووبه‌ڕووی هه‌ركه‌س بوومه‌ته‌وه‌ سه‌ركه‌وتنم خه‌ڵات كراوه‌.[1]

## له‌ پاش مه‌رگت!

خه‌ڵكی گریان بۆ مه‌رگی رسول الله (ﷺ) و ده‌یانوت: وه‌ڵڵاهی.. پێمان خۆشبوو، ئێمه‌ به‌ر له‌ مه‌رگی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بمردینایه‌، ده‌ترسین له‌ پاش مه‌رگی تووشی فیتنه‌ ببین! به‌ڵام مه‌عنی كوڕی عه‌دی (رضي الله عنه) ده‌یوت: وه‌ڵڵاهی.. من پێم خۆش نییه‌، به‌ر له‌ پێغه‌مبه‌ر بمردبام..!! بۆ ئه‌وه‌ی له‌ پاش مه‌رگی رسول الله (ﷺ) شاهێدی ڕاستگۆیی بۆ بده‌م، وه‌ك چۆن شاهێدیم بۆدا كاتێك له‌ ژیاندا بوو.[2]

(١) (طبقات إبن سعد: ج٣٤/٥)
(٢) (حياة الصحابة: ٥٣/٣ـ ٥٤)

## خۆشەویستنی فاتمەی زەهرا.. ؑ

ئەسلەم دەگێرێتەوە و دەڵێت: عومەری کوڕی خەطاب ڕۆشتە لای فاتمەی کچی رسول الله (ﷺ) و پێی وت: ئەی فاتمە.. وەڵڵاهی کەسم نەدیوە لە تۆ خۆشەویستر بێت لە لای رسول الله (ﷺ) دەی سوێند بەخوا لە دوای باوکت کەسێك نییە لە تۆ خۆشەویستر بێت لە لای من.[1]

## چ کوڕێکی هەیە؟!

ئیبن عائیشە دەڵێت: پیاوێکی خەڵکی شام وتی: ڕۆشتمە مەدینە، پیاوێکم بینی لەسەر ئێسترێك، کە لەو جوانتر و پاك و تەمیزترم نەدیبوو..!! بۆیە حەزمکرد بیناسم، پرسیارم دەربارەی کرد، وتیان: ئەوە حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالبە (عَلَيْهِ السَّلَامُ) منیش دڵم پڕ لە ڕق و کین بوو بەرامبەری، وە ئیرەییم بە عەلی برد کە ئاوەها کوڕێکی هەیە..!! بەرەو ڕووی ڕۆشتم و، پێم وت: تۆ کوڕی عەلی کوڕی ئەبوطالبی؟ وتی: بەڵێ.. من کوڕی عەلیم. ئیتر خۆی و عەلی باوکیم پڕ جنێو کرد، بەڵام حەسەن لە بەرامبەر هەموو قسە ناشیرینەکانمدا، بە ئارامییەوە، وتی: غەریبە دیاریت؟! وتم: بەڵێ. حەسەن وتی: ئەگەر خانووت پێویستە، خانووت دەدەینێ، ئەگەر پارەت لازمە پێت دەبەخشین، هەر پێویستییەکت هەیە، ئێمە هاوکارت دەبین.

پیاوەکە وتی: ئیتر ڕۆشتم و لەسەر زەوی کەسم لەو زیاتر خۆشنەدەویست، بیرم کردەوە کە من چیم گوت و ئەویش چ ڕەفتارێکی جوانی نواند بەرامبەرم؟! بۆیە سوپاسم کرد و خۆمم شەرمەزار کرد.

(١) (حياة الصحابة: ٣/٢٤)

## شــەرمی باســکردنی خۆشــەویــســت

کاتێــك عەبـدولڕەحمانی کـوڕی ئەبـوبەکر (رضي الله عنهما) باسـی پێغەمـبەری (ﷺ) دەکرد، لە هـەیبەتی دا.. ڕەنگ و ڕووی وا دەگـۆڕا، دەتـگوت خــوێنێکی زۆری لـێ ڕۆشـتــووە! وە دەم و زمــانی بە جـۆرێــك وشــك دەبـوویـــەوە، بە زەحــمەت قــسـەی بـۆ دەکـرا!!

## دراوســێـیـەك بـۆ فـرۆشــتـن!!

موحەممەدی کوڕی جەهم بانگەوازی کـرد بـۆ ئـەوەی مــاڵەکەی بفرۆشـێت بە پەنــجا هـــەزار درهــەم، کاتێــك کــڕیارەکان هــاتن، وتــی: ئــەی دراوســـێیەتی (ســەعیدی کوڕی عاص)م بە چەند لێدەکـڕن؟

کـڕیارەکان وتیان: دەی دراوســێ دەفـرۆشـرێت؟!

مـوحەممەد وتـی: ئــەی بــۆ نـا، دراوســـێیەك.. ئـەگــەر داوای لێبکەیـت، پێـت ببەخشــێت و.. ئـەگـەر بێدەنگ بیت لێی، ئـەو دەســتپێشــخەر و هـەواڵپرســت بێت و، ئـەگـەر خراپ بـوویت بـۆی، ئـەو چـاکەت بەرامـبەر بنوێنێت..!!

ئـەم وتوێـژە گەشــتەوە بە ســـەعیدی کـوڕی عـاص (رضي الله عنه) ســـەعید ســـەد هـەزار درهـەمی دا بە موحەممـەد و پێی وت: بیگـرە.. مــاڵەکەت بـۆ خـۆت و لە دراوســـێتی خـۆت بێبەشـــمـان مەکە.[1]

## لـەدەب و ژیـری قـســەکـردن

پـرســیار دەکـەن لـە عـەبـاسـی کــوڕی عــەبدولموتەلیب و پــێی دەڵــێن: ئـایـا تــۆ گـەورەتـریـت یاخـود پـێـغـەمـبەر (ﷺ)؟ لـە وەڵامـدا دەڵـێت: ئــەو لــە مـن گــەورەتـرە، بـەڵام مــن پــێـش ئــەو لــە دایك بـــووم.

(١) (الف قصة و قصة/٢٧٣)



## چ موسیبه‌تێك له‌مه‌ گه‌وره‌تره‌؟!

میسعه‌ری كوڕی كیدام ده‌ڵێت: ڕۆژێك له‌گه‌ڵ سوفیانی سه‌وریدا ده‌ڕۆشتین پیاوێكی سواڵكه‌ر هات و داوای خێرێكی لێكرد، به‌ڵام سوفیان هیچی پێنه‌بوو بیداتێ، بۆیه‌ سوفیان ده‌ستی كرد به‌ گریان..!! پێم وت: چی ده‌تگریێنێ؟! سوفیان ( ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت ) وتی: چ موسیبه‌تێك له‌مه‌ گه‌وره‌تره‌؟! كه‌ پیاوێك ئومێدی چاكه‌یه‌كی پێت هه‌بێت، به‌ڵام له‌ لای تۆ ده‌ستی نه‌كه‌وێت..!![1]

## خۆم به‌ خۆمم كرد

ئیبراهیمی كوڕی ئه‌دهه‌م ( ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت ) بانگهێشتی ئاهه‌نگێك كرا، ئه‌ویش ئاماده‌ی داوه‌ته‌كه‌ بوو، له‌وێ باسی پیاوێكیان كرد كه‌ نه‌هاتبوو بۆ داوه‌ته‌كه‌ و، پێیان وت: به‌ڕاستی پیاوێكی ئێسك گرانه‌! ئیبراهیم وتی: ئه‌وه‌ من بووم كه‌ ئه‌مه‌م به‌ سه‌ر خۆمدا هێنا، كاتێ ئاماده‌ی شوێنێك بووم كه‌ غه‌یبه‌تی خه‌ڵكی تیا ده‌كرێت. ئیدی ئیبراهیم شوێنه‌كه‌ی جێ هێشت و تا سێ ڕۆژ نانی نه‌خوارد!![2]

## دڵی زیندوو

فه‌تحی موسڵی ( ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت ) نه‌خۆش ده‌كه‌وێت و خه‌ڵكان ده‌چنه‌ عیاده‌ی، فه‌تح ده‌ڵێت به‌ یه‌كێك له‌ میوانه‌كانی: ئایا مرۆڤه‌كان نان و ئاو نه‌خۆن.. نامرن؟! میوانه‌كه‌ ده‌ڵێت: به‌ڵێ. فه‌تح ده‌ڵێت: ده‌ی دڵیش وه‌هایه‌.. ئه‌گه‌ر له‌ یادی خوا دابڕێت، ده‌مرێت.[3]

---

(١) ( ألف قصة و قصة/٣٧٧)
(٢) (حرمة أهل العلم/٧٩)
(٣) (مجموعة رسائل ابن الجوزي/٢٤٨)

## سێ ساڵ ئیستیغفار!!

سیــری ســەقەتی ( رحمه الله ) کە لە زەمــانی خــۆیدا، کەم وێــنە بــوو بــۆ خـوداپەرسـتی و زانسـتی یەکتاپەرسـتی، دەڵێـت: مـاوەی سـێ سـاڵ مـن لە تەوبــە و ئیســتغـفاردا بــووم، بــۆ وتنـی (الحمـد لله) یــەك. پێـی دەڵـێن: ئــەی هـۆکارەکەی چی بــوو؟! !

ســیری دەڵێت: ئـاگرێك کـەوتــەوە لە بـەغـداد، کەسێــك هــاتە لام و پێـی وتــم: حــانوتــەکەی تــۆ نەســووتــاوە! منـیش وتــم: الحمـد لله..!! ئــیتر لــەو کاتــەوە من پەشــیمانم لەوتنی ئـەو (الحمد لله) یە، چــونکە بـەدەر لە خەڵکانی تـر مـن چــاکەم بــۆ خــۆم ویســـت و لەو لەحــزەدا ناخـۆشـــی ئـەوانــم لە بــیر نـەبـوو!!

پاشـان سـیری.. هـەمـوو کەل و پـەلی نـاو دوکانــەکەی دەبـەخـشـێتەوە.[1]

## تامی گۆشـت ناکەی!

گــرانی و نـارەحەتییەك ڕوویکــردە مـوســڵمانان، لە ســـەردەمی خەلافەتـی عـومەری کوڕی خەطاب دا (رضي الله عنه) لەو ڕۆژگـارەدا بــەردەوام خــواردنی عـومەری ئـەمیری ئیمانداران نانی وشـك و زەیت بــوو!! هـەتا ئـەو ڕوخســاره جـوانــەی کە وەك مــاهی تـابـان وەهـــا بـــوو.. زەرد هـەڵگـەڕا!! وە هــەر کـات ســکی قــۆڕەی دەهــات، عـومـەر دەیکێـشــا بە ســکیدا و، پێی دەوت: هــەتا دەتــوانی بقـۆڕێـنە، تامـی گـۆشــت ناکەیت، هــەتا مـنداڵی موســوڵمانان تێـر دەبـن..!![2]

(١) (الف قصة و قصة/١٦١)
(٢) (أنيس المؤمنين/١٢٤)

## له بێ ئه‌ده‌بیم ببوره.. مامۆستاكه‌م

ئـیمام ئـه‌بـوحه‌نیفه (رحمه الله) ده‌ڵێـت: له نێـوان مـاڵی مـن و حه‌مـادی مامۆسـتامدا حه‌وت شـه‌قام هه‌بـوو، له‌گه‌ڵ ئـه‌وه‌شـدا هـه‌رگیز بـه‌ره‌و ڕووی ماڵه‌كه‌ی قـاچم ڕانـه‌كێشـاوه..!! وه‌ك ڕێزێـك بـۆ مـامـۆسـتاكـه‌م، وه‌ له‌وه‌تـی حه‌مـاد مـردووه هـه‌مـوو كات لـه‌گـه‌ڵ دایك و باوكمـدا داوای لـێ خـۆشـبـوونم بـۆ كـردووه له په‌روه‌ردگار، وه‌ من داوای لـێ خـۆشـبـوون ده‌كـه‌م بـۆ هـه‌مـوو ئـه‌وانـه‌ی لێیانـه‌وه فێـر بـووم، یاخـود زانسـتێكیان فێر كـردووم.[1]

پێویسـته فێرخـواز به چـاوی ڕێـز و گـه‌وره‌ییه‌وه بـڕوانێـته مامـۆسـتاكـه‌ی، چونكه ئـه‌وه نـزیكتری ده‌كاتـه‌وه له سـود وه‌رگـرتن، وه‌ هـه‌ندێك له فێرخـوازانی سـه‌لـه‌ف كـه ده‌ڕۆشـت بـۆ خزمـه‌تی مامۆسـتاكـه‌ی، شـتێكی ده‌كـرده خـێر و ده‌یـوت: پـه‌روه‌ردگارم.. كه‌مـوكـورتییه‌كانی مامـۆسـتاكـه‌مم لێ بشـاره‌وه و بێ بـه‌شـم مـه‌كـه له بـه‌ره‌كـه‌تی زانسـته‌كـه‌ی.[2]

## كـوره‌ی عه‌شـقی یـار!

ڕۆژێـك، عه‌لی كـوڕی حوسـه‌ینی كـوڕی عه‌لـی كـوڕی ئـه‌بـوطالـب (عليهم السلام) له مـاڵێكدا، سـه‌ری له سـوجده‌دا بـوو، ئـاگـر بـه‌ر بـوویه مـاڵه‌كه..!! خه‌ڵكـی هاواریان لێ كرد: ئه‌ی كوڕی رسول الله (ﷺ) ئاگر.. ئاگر..!!

**بـه‌ڵام عـه‌لی دڵ و ڕۆحی.. بـۆتـه كوره‌ی عه‌شـقی یـار، ئیدی چۆن بزانێت جه‌سـته‌ی غـه‌ریـقی ئـاوه، یان پـووش و پـه‌ڵاشی ده‌م ئـار؟!!**

بـۆیه عه‌لـی زه‌ینولعابـدین له كـوڕنوشـدا ده‌مێـنێته‌وه، تـا ئاگره‌كـه ده‌كـوژێـته‌وه، به‌سه‌لامـه‌تی دێـته ده‌ر و لێـی ده‌پـرسـن: ئـه‌رێ ئـه‌وه تـۆ.. چ شـتێـك لـه‌و ئاگره بێ ئـاگـای كـردیـت؟!! زه‌ینـولـعابدین، وه‌ڵامیـان ده‌داتـه‌وه و ده‌ڵێت: ئـاگـری دۆزه‌خ.. بێ ئـاگای كـردبـووم له ئـاگـری دنـیا!![3]

---

(١) (حرمة أهل العلم: ١٩٥)
(٢) (حرمة أهل العلم: ٢٠٢)
(٣) (صفة الصفوة/٣٢٤)

## تۆ له‌به‌رتری بۆ چاکه

له نێوان حوسه‌ینی کوڕی عه‌لی کوڕی ئه‌بوطالب و.. موحه‌ممه‌دی کوڕی عه‌لی کوڕی ئه‌بوطالبی برایدا (عليهما السلام) گفتوگۆیه‌ك كراو به لێك زیزبوون جیابوونه‌وه، کاتێك موحه‌ممه‌دی کوڕی عه‌لی گه‌شته‌وه ماڵه‌که‌ی خۆی، ده‌ستی کرد به نووسینی نامه‌یه‌ك بۆ حوسه‌ینی برای..

**بسم الله الرحمن الرحيم**

له موحه‌ممه‌دی کوڕی عه‌لی کوڕی ئه‌بوطالبه‌وه، بۆ حوسه‌ینی کوڕی عه‌لی کوڕی ئه‌بوطالب، له پاشان..

به‌ڕاستی تۆ پله‌یه‌کت هه‌یه له ڕێز و چاکه‌دا، که من پێی ناگه‌م، ئه‌گه‌ر ئه‌م نووسراوه‌مت پێ گه‌شت و خوێندته‌وه، لوت وبزوت.. کراسه‌که‌ت له‌به‌ر بکه و نه‌عله‌کانت له پێ بکه و بکه‌وه ڕێ بۆ لام و.. وه‌ره ئاشتم بکه‌وه، نه‌که‌یت من پێشت بکه‌وم بۆ ئه‌و چاکه‌یه‌ی که تۆ له‌به‌رتری بۆی، نه‌ك من..!!

**والسلام عليكم ورحمة الله.**

کاتێك حوسه‌ین نامه‌ی براکه‌ی خوێنده‌وه، خێرا ڕۆشت بۆ ماڵی موحه‌ممه‌دی برای و ئاشتی کرده‌وه.[1]

## عه‌ده‌م

عه‌بدوڵڵای کوڕی عامر ده‌ڵێت: عومه‌ری کوڕی خه‌طابم بینی (رضي الله عنه) پووشێکی هه‌ڵگرت له زه‌وی و، وتی: خۆزگه من ئه‌م پووشه بوومایا!! خۆزگه نه‌خولقێندرابام!! خۆزگه دایکم منی نه‌ده‌بوو!! خۆزگه هیچ شتێك نه‌بوومایا!! خۆزگه له‌بیرچوویکی باسنه‌کراوبام!![2]

(١) (أنيس المؤمنين/١٢٨)
(٢) (الف قصة و قصة/١١٩ـ١٢٠)



## به پاره‌كانمان شت ده‌كڕین

خالدی كوڕی ده‌ریك ده‌ڵێت: عه‌بدوڵڵای كوڕی موحه‌یریز (ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێت) ڕۆشته دوكانی كوتاڵفرۆشێك بۆ ئه‌وه‌ی پۆشاكێكی لێ بكڕێت، كوتاڵفرۆشه‌كه ئه‌وی نه‌ده‌ناسی، به‌ڵام پیاوێك له‌وێ ئاماده بوو ده‌یناسی، ئیبن موحه‌یریز به دوكانداره‌كه‌ی وت: ئه‌م پۆشاكه نرخی چه‌نده؟ دوكانداره‌كه وتی: نرخه‌كه‌ی هێنده‌یه. ئه‌و پیاوه‌ش كه ده‌یناسی به دوكانداره‌كه‌ی وت: ئه‌وه ئیبن موحه‌یریزه خاتری بگره و جوان مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ بكه..!! ئیبن موحه‌یریز وتی: من هاتووم تا به پاره‌كانم شت بكڕم نه‌وه‌ك به دینه‌كه‌م. ئیتر دوكانه‌كه‌ی جێ هێشت و هیچی نه‌كڕی!![1]

## پارچه‌یه‌ك له‌ جه‌سته‌م

ئه‌یوبی سختیانی (ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێت) ده‌ڵێت: كه هه‌واڵی مه‌رگی یه‌كێك له ئه‌هلی سوننه‌م پێده‌گات، وا هه‌ست ده‌كه‌م كه پارچه‌یه‌ك له جه‌سته‌م له ده‌ست ئه‌ده‌م.

## ده‌یده‌مه ده‌ستی تۆ

ئه‌بو عه‌لی ده‌قاق (ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێت) ده‌ڵێت: پیاوێك میراتییه‌كی زۆری بۆ جێما، پاڕایه‌وه له په‌روه‌ردگار و وتی: ئیلاهی.. من نازانم به باشی ئه‌م درهه‌مانه بپارێزم، ده‌یده‌مه ده‌ستی تۆ، هه‌ر كاتێك ئاتاجم پێی بوو پێم ببه‌خشه‌وه. پاشان هه‌موو میراتییه‌كه‌ی به‌خشی به‌سه‌ر نه‌داران و هه‌ژاراندا، دوای ئه‌وه هه‌موو ته‌مه‌نی موحتاجی ڕووی تێ نه‌كردووه، هه‌ر كاتێك شتێكی بویستایه، هه‌مان سات خوای گه‌وره ده‌رگای خێری بۆ ده‌كرده‌وه![2]

---

(١) (تهذيب حلية ألاولياء: ج٢/١٦٦)
(٢) (مجموعة رسائل: ٢٥٢)

## دەبوو جیاوازیت نەکردبا!

عەلی کوڕی ئەبوطالب لای عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنهما) دانیشتبوو، پیاوێك هات و شکاتی لە دەست عەلی کرد، عومەری ئەمیری باوەڕداران سەیرێکی عەلی کرد و، وتی: هەستە ئەی ئەبا حەسەن، وەرە لە تەنیشت نەیارەکەتەوە دابنیشە. عەلی لە تەنیشت نەیارەکەیەوە دانیشت و پاش چەند ساتێك گرفتەکە چارەسەر کرا، پیاوەکە ڕۆشت و عەلی ڕۆشتەوە شوێنەکەی خۆی.

عومەر لە ڕەنگ و ڕوخساری عەلیدا هەستی بە گۆڕانێك کرد، بۆیە پێی وت: چییە ئەی ئەبا حەسەن.. بە دڵت نەبوو ئەوەی کە ڕوویدا؟!

عەلی وتی: بەڵێ. بە دڵم نەبوو!! عومەر وتی: لەبەر چی؟! عەلی وتی: بە ئامادەبوونی نەیارەکەم، منت بە نازناوەکەمەوە بانگ کرد و وتت: ئەی ئەباحەسەن، بەڵام دەبوو جیاوازیت نەکردبا و بتوتبا: ئەی عەلی.

عومەر هەستا، باوەشی کرد بە عەلیدا و نێوچاوانی ماچکرد و، وتی: بە خۆم و بابمەوە بە قوربانتان بین، بە هۆی ئێوەوە خودا هیدایەتی داین و لە تاریکییەوە بردینی بەرەو ڕووناکی!![1]

## تا خاوەنەکەی دێتەوە

ئەبوحەنیفە ( رحمه الله ) دەڵێت: جارێکیان ئافرەتێك فێڵی لێکردم..!! ئافرەتەکە ئاماژەیدا بە کیسێکی کەوتوو لە ڕێگادا، منیش وامزانی کیسەکە هی ئافرەتەکەیە و دەیەوێت بیدەمەوە دەستی، کاتێك کیسەکەم هەڵگرت بیدەمەوە، ئافرەتەکە وتی: لای خۆت بیپارێزە تا خاوەنەکەی دێتەوە بۆی. دواتر بۆم دەرکەوت کە ئافرەتەکە نەیویستووە ئەمانەتەکە لای ئەو بێت، بۆیە سەپاندی بەسەر مندا.[2]

---

(١) (الف قصة وقصة/٤٤)
(٢) (الف قصة وقصة/١٥)

## گەنجێکی خاوەن بەڵێن

حوتەیت ئەلزەیات (رحمه الله) هێنرایە بەردەم حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، حەججاج وتی: تۆ حوتەیتیت؟ وتی: بەڵێ، چیت بە خەیاڵدا دێت بپرسە، چونکە من لە (مقام) دا، بەڵێنم بە خوا داوە لەسەر سێ شت، ئەگەر پرسیارم لێبکەن.. ڕاستگۆبم، ئەگەر بەڵا و ناخۆشیم بەسەردابێت.. ئارام بگرم، وە ئەگەر تەندروستبم.. سوپاسگوزاربم.

حەججاج وتی: چی دەڵێی دەربارەی من؟ وتی: تۆ یەکێکیت لە دوژمنەکانی خودا لەسەر زەوی، حورمەتی ئابڕووداران دەبەیت و.. لەسەر گومان خەڵکی دەکوژیت! حەججاج وتی: ئەی بۆ خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان چی دەڵێیت؟ حوتەیت وتی: ئەو لە تۆ گەورەترە لە تاواندا، تۆش یەکێکیت لە تاوانەکانی ئەو. حەججاج وتی: ئازاری بدەن. ئیدی هێندە ئازار درا تا کار گەشتە ئەوەی کە قامیشیان دەقڵیشاند و دەیان کرد بە گۆشتەکەیدا و بە گوریس ڕایاندەکێشا، بەڵام ئەو هیچی نەدەگوت. پاشان وتیان بە حەججاج: ئەوەتا حوتەیت لە گیانەڵڵادایە..!! وتی: دەریکەن و فڕێیدەنە بازاڕەوە. حوتەیت لە سەرە مەرگدا بوو.. دوو هاوڕێی لێی نزیکبوونەوە و پێیان وت: ئەی حوتەیت.. چ پێویستییەکت هەیە هەتا بۆتی ئەنجام بدەین؟

وتی: قومێك ئاوم پێ بدەن.

ئاوەکەیان بۆ هێنا و.. مرد، هێشتا لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو!![1]

## دڕندەیەکی برسی!!

دەڵێن بە بەکری کوڕی عەبدوڵڵای موزنی (رحمه الله): بۆچی هێندە بێدەنگییەکەت تووڵ دەکێشێت و قسە ناکەیت؟! بەکر دەڵێت: زمانم شێرێکە.. ئەگەر بەری بدەم دەمخوات![2]

---

(١) (الف قصة وقصة/ ٥١)

(٢) (موسوعة الأحزان ج٢/١٣٥)

## پەیوەندی بەمنەوە نەبێت

موعەللای کوڕی زیاد دەڵێت: موەرقی عجلی (رحمه الله) وتی: شتێك هەیە بیست ساڵە من لە تەڵەبیدام و هێشتا توانام بە سەریدا نەشكاوە، وە هەرگیز واز لە داواكردنیشی ناهێنم! وتیان: ئەوە چییە ئەی ئەبا موعتەمەر؟! وتی: بێدەنگ بوون لەسەر شتێك كە پەیوەندی بە منەوە نەبێت.[1]

## ورگت.. دەریایەكە لە دەریاكان!

وەهبی كوڕی مونەبیهـ دەڵێت بە عەتای خوراسانی (رحمهما الله): هاوار لە دەستی تۆ ئەی عەتا!! پێم نەوتیت كە تۆ زانستەكەت دەبەیتە بەر دەرگای پاشاكان و كوڕانی دنیا؟! هاوار لە دەستی تۆ ئەی عەتا..!! دەچیتە بەردەم كەسێك، كە دەرگات لێدادەخات، هەژاری خۆیت بۆ دەردەخات و دەوڵەمەندی خۆی دەشارێتەوە لێت، لەولاشەوە واز لە كەسێك دەهێنیت، كە دەرگاكەی هەمیشە كراوەیە و دەوڵەمەندییەكەیت پیشاندەدات و دەفەرمووێ:

﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾[2] واتە: لێم بپاڕێنەوە، بەدەم داواكەتانەوە دێم.

ئەی عەتا.. ڕازیبە بە نزمی لە دنیادا، بەڵام لەگەڵ داناییدا، وە ڕازی مەبە بە گەورەیی لە دنیادا بە بێ دانایی، ئەی عەتا.. ئەگەر بەوەی بەشت دەكات، خۆت بە دەوڵەمەند دەزانیت، ئەوا نزمترین و كەمترین شت لە دنیادا بەشتدەكات!! وە ئەگەر خۆت بە دەوڵەمەند نازانیت بەوەی كە بەشت دەكات، ئەوە لە دنیادا هیچ شتێك نییە كە بەشت بكات،

ئاگاداربە ئەی عەتا..!

ورگت دەریایەكە لە دەریاكان،

دۆڵێكە لە دۆڵەكان،

هیچ شتێك پڕی ناكاتەوە، تەنیا خاك نەبێت!![3]

---

(١) (صفة الصفوة/٦٣٣)

(٢) (الغافر/٦٠)

(٣) (الف قصة وقصة/٥١-٥٢)

## پشت بەستن بە پەروەردگار

موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی سەروەتێکی باشی چنگ کەوت، پێیان وت: هەندێك پاشەکەوت بکە بۆ کوڕەکەت. موحەممەد (رحمه الله) وتی: نەخێر.. بەڵکو دەیبەخشم و لای پەروەردگارم زەخیرەی دەکەم بۆ خۆم، کوڕەکەشم جێدەهێڵم بۆ پەروەردگارم، کە خالق و ڕۆزیدەری هەموو بوونەوەرانە.[1]

## چ نیعمەتێك لەمە مەزنترە؟!

ڕۆژێك، ئەبو زەڕی غەفاری (رضي الله عنه) کراسێکی کۆنی لە بەردا بوو، هاوڕێیەکی پێی وت: جگە لەمە هیچ کراسێکی دیکەت نییە؟! خۆ هەر لەم ڕۆژانەدا بوو، دوو کراسی نوێم لە لات بینی!!

ئەبوزەڕ پێی وت: ئەی برازای شیرینم.. ڕاست دەکەیت، بەخشینم بە کەسانێك کە لە من زیاتر پێویستیان پێی بوو.

هاوڕێکەی وتی: سوێند بە خودا تۆش پێویستت پێیانە.

ئەبوزەڕ وتی: خودایە لێمان خۆش ببە.. بەڕاستی تۆ دنیا زۆر بە گەورە دەگریت، ئەم عابایە بە سەر شانمەوە نابینیت؟! دانەیەکی دیکەشم هەیە بۆ نوێژی هەینی، بزنێکیشم هەیە دەیدۆشم و لە خێر و بێرەکەی دەخۆم، گوێدرێژێکیشم هەیە پێی دەڕۆم، دەباشە ئیتر چ نیعمەتێك لەمە مەزنترە، کە ئێمەی تێداین؟![2]

---

(١) (من روائع اقوال الصالحين: ج١/٦٨)
(٢) (رجال حول الرسـول: خالد محمد خالد)



## لە چاکەکانی خۆتت بۆ ناردووم

حوســـەینی کـوڕی عەلـی (عليه السلام) قـســانی پـیاوێکی پێگەشـــتەوە، کە بــە دڵی نـەبــوو (باســی حوســـەینی کـرد بـوو بە خراپە)، لە بەرامبەردا حوســـەین هـەسـتا قـاپێکی پـڕ لە خـورمـای جوانی بـرد و چـــوو بـــۆ مـــاڵی پیـاوەکە..!! تەقـولبابی کـرد و.. پیـاوەکە هـــات دەرگـاکـــەی کـردەوە، کە حوســـەینی بـینی قـاپێـك خـورمـای جـوانی پێیە، بەســـەرســوڕمـانـەوە وتی: ئـەمـە چـییە؟! ئـەی کچەزای رسـول الله (ﷺ).

حوســـەین وتی: بیگـرە.. پێم گەشـــتووە کە تـۆ لە کـردەوە چـاکەکانی خـۆتت بە دیـــاری بـــۆ نـــاردووم.. منـیش لـــە بـەرامـــبەر ئـــەو کـــارەتدا ئـــەم قـاپــە خـورمـایـەم بـۆ هێنـاویت!![1]

## خزمـانی ماســتاوچی!!

هـــەرەمی کـــوڕی حەیـــان (رحمه الله) یەکێـــك بـــوو لە کاربـەدەســـتەکانی خەلافـەتی عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه).

مالیکی کوڕی دینار دەڵێت: هـەرەمی کوڕی حەیان کـرایە کاربەدەســت، ئیـدی گـومـانی بـرد کە هـۆزەکەی دێنە ســـەردانی، بـۆیە فـەرمـانی دا کە ئـاگـرێـك بکـرێتەوە لە نـێوان خـۆی و ئـەو خزمـانـەی کە ســـەردانی دەکەن..!! خزمـانی هـــاتن و لە دوورەوە ســـڵاویان لـێ کـــرد! هـــەرەم پێـی وتـــن: ســـەلام لـــە هـۆزەکـــەم، لـــە دوورەوە مـەوەســـتن فـەرمـــوون نـزیـك بـبنەوە ..!! وتیـان: وەڵڵاهی نـاتـوانین لێت نـزیك ببینەوە، ئـاگـر نـێوانمانی گـرتـووە! هـەرەمی کوڕی حەیان وتی: ئێوەش دەتانـەوێ بەم نزیـك بـوونەوەتان فـڕێم بـدەنـە نـاو ئـاگرەوە، ئـەویش چ ئـاگـرێـك؟! ئـاگری دۆزەخ!

ئیدی هـــۆزەکەی (بە نائـومـێدی و بە دەســتی خـاڵی) گـەڕانەوە.[2]

(١) (أنيس المؤمنين/١٢٥)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء: ج١/ ٣١٢_ ٣١٣)



## دێنە ناو گۆڕەکەتەوە!

پیاوێك دەڵێت بە ئەبوبەکری گەورەمان: وەڵڵاهی.. جنێو گەلێکت پێ دەدەم، لە بیرت نەچێتەوە هەتا لەگەڵتا دێنە گۆڕەکەشتەوە! ئەبوبەکر (ﷺ) پێی دەڵێت: من قسەی ناشیرینت پێنالێم و سوێند بە خوا.. جنێوەکانیشت دێنە ناو گۆڕەکەی خۆتەوە.

## تەلەفۆنێکی ڕۆحیت کردووە؟!

عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) سوپایەکی نارد بۆ جیهاد، کەسێکی کردە ئەمیریان کە ناوی (ساریە) بوو، سوپاکە ڕۆشتن و کەوتنە جەنگەوە، ڕۆژێکی هەینی.. عومەر لە مەدینە چووە سەر مینبەر و خوتبەی دەدا بۆ موسوڵمانان، لەپڕ لە وتارەکەیدا هاواریکرد: ئەی ساریە.. شاخەکە.. شاخەکە..!!

دانیشتووان هیچ لەم هاوارەی عومەر تێ نەگەشتن!! دوای تەواوبوونی وتار و نوێژەکەیان، عەلی کوڕی ئەبوطالب وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. تۆ دەزانی ساریە لە وڵاتی فارسە، بەڵام گوێمان لێبوو تۆ هاوارت لە ساریە دەکرد!! عومەر وتی: ئەی عەلی.. بینیم دوژمن خەریکە دەوری موسوڵمانەکان دەگرێت، منیش هاوارم کرد لە ساریە کە پشتیان بکەنە شاخەکە تاخودا بیان پارێزێت!!

کاتێك ساریە گەشتەوە مەدینە.. نەیانهێڵا بە سەرهاتەکەی عومەر بزانێت و پێشتر پرسیاری جەنگەکەی لێکرا، ئەویش وتی: کاتێك ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە.. ویستیان چواردەورمان بگرن، لەو کاتەدا گوێم لە دەنگێکەوە بوو، کە لە دەنگی عومەری ئەمیری ئیمانداران دەچوو!! هاواری لێکردم (ئەی ساریە.. شاخەکە.. شاخەکە!!) ئیدی ئێمەش پشتمان دایە شاخەکە و خوای گەورە ڕزگاری کردین.[1]

---

(١) (أنيس المؤمنين/٣٤)

## فۆڕاگری کیژی باوەڕدار

کاتێك بتپەرستەکان ئازاری زەنیرەیان دەدا (ﷺ) بۆ ئەوەی پاشگەز بێتەوە لە دینی ئیسلام، هیچ سوودی نەبوو، چونکە خۆشەویستی خوا هەموو گیانی داگیر کرد بوو، هێندە ئازار درا تا بینایی چاوەکانی لە دەستدا و بێباوەڕەکان وتیان: ئەوە لات و عوززا.. بیناییان لێسەندەوە!!
زەنیرەش وتی: نا سوێند بە خودا..!! ئەوانە ناتوانن هیچ زیانێکم پێبگەیەنن. ئیدی خودای باڵا دەست بینایی بۆ زەنیرە گەڕاندەوە.[1]

## شەوێکی زۆر سارد

پیاوێك چووە لای مەعروفی کەرخی (ﷺ) لە شەوێکی زۆر سارد دا، دیتی تەنیا کراسێکی لە بەردایە و گیانی لە تاو سەرما دەلەرزێت..!! پیاوەکە وتی: ئەی مەعروف.. بۆچی بەهۆی سەرماوە دەلەرزیت، لە کاتێکدا هێندە بەرگت هەیە، کە بیپۆشیت و سەرمات نەبێت؟! مەعروف وتی: حاڵی هەژارانم هاتەوە بیر و.. منیش هێندە جلوبەرگم نییە کە بیبەخشم، ئیدی لەمە زیاترم پێنەکرا کە بەشداری ئەوان بم لە سەرماکەدا!![2]

## یادی گوناه

عەبدولواحیدی کوڕی زەید (ﷺ) لە ڕۆژێکی بارانـاوی و سەرما و سۆڵەی مەیدانی قەسابەکاندا، عوتبەی غوڵامی پێگەشت، ئارەقێکی زۆری کرد بوو!! عەبدولواحید سەلامی لێکرد و پێی وت: لە ڕۆژێکی وەها سارد و باراناویدا ئەم هەموو ئارەقە چییە کردووتە؟! وتی: خێرە. عەبدولواحید وتی: دەی پێم بڵێ، بزانم چیتە؟! عوتبە بەهەمان شێوەی پێشوو وەڵامی

(١) ( الف قصة وقصة/٥٩)
(٢) (أنيس المؤمنين/١٢٥)

دایــەوە، عەبدولواحیـد وتـی: لەبـەر ئـەو خـۆشـەویسـتی و برایـەتییەی لە نێوانماندا هەیە پێم بڵێ چیتە؟!

عـوتبـە (رحمه الله) وتـی: سـوێند بە خـودا گوناهێکم بـیر کـەوتـەوە، کە لە هەمان شـوێندا ئەنجامم دابـوو، ئیتر ئەمە حـاڵی منە بـۆ ئـەو گوناهـە، کە دەیبینی!![1]

## پاقلەم دەست نەکەوت

حەسـەنی مەسوحی دەڵێت: سـیری سـەقەتی (رحمه الله) پارەیەکی پێدام و پێی وتـم: لای پیاوێـك پاقـلەم بـۆ بکڕە، کە قـابلەمـەکەی لـەو دیـو دەرگاکـەوە بێت!! منیش ڕۆشـتم هـەمـوو کەرخ[2] گـەڕام، هـەرچی پاقلەم بینی لە دەرەوەی حانـوتـەکان دانـرا بـوو، بـۆیـە گـەڕامـەوە بۆ لای و پێم وت: پارەکـەت بگـرە، چونکە پاقلەم دەسـت ناکەوێت، تـەنها لـەو حـانـوتـانـە نـەبێت کـە قـابلـەمـەی پاقـلـەکەیان لـە دەرەوەی حـانـوتـەکـە دانـاوە.[3]

## لە دیداری موحەممەد صەڵاوات.. ﷺ

زوهـەیر دەڵێت: یونسـی کـوڕی عوبەیـد (رحمه الله) ئاوریشـم فـرۆش بـوو، پیاوێـك هـاتە لای داوای پۆشـاکی کـرد، یـونس وتـی بە غـوڵامـەکەی: تـۆپـە قـوماشـەکە بڵاو بـکەوە بـۆ ئـەوەی کـڕیـارەکە بـیبینێت، غوڵامـەکە کاتێـك تـۆپـەکەی بڵاو کـردەوە، دەسـتێکی کێشـا بە تـۆپـە قـومـاشـەکەدا و، وتـی: صَلَّى اللهُ عَلى مُحَمَّد.

یونس وتی بە غوڵامـەکەی: قـوماشـەکە هـەڵگـرەوە..!!

ئیتر یونس ڕازی نەبـوو قـوماشـەکە بفـرۆشـێت بە پیاوەکە، چونکە تـرسـی ئـەوەی هـەبـوو کە غوڵامـەکەی بە وتنی سـەڵاواتەکەی.. بە قـومـاشـەکەیدا هـەڵدابێت و وەسـفی کـردبێت، تا لای کـڕیـارەکە بە نـرخ بێت..!![4]

---

(١) (تهذيب حلية ألاولياء: ج٢/٣٢٥)
(٢) (کەرخ: ناوچەیەکە دەکەوێتە بەشی باشووری خۆرئاوای شاری بەغداد)
(٣) (صفة الصفوة/٤٤٦)
(٤) (صفة الصفوة/٦٥٨)

## لە بیاباندا گیرت کردووە؟!

تاوسی کوڕی کەیسان ( رحمه الله ) پیاوێکی هەژاری، چاوکزی، پیس و پۆخڵ دەبینێت و پێی دەڵێت: باشە وتمان کە هەژاری لە لای پەروەردگارەوەیە، ئەی ئایا ئاوت دەست ناکەوێت، هەتا خۆت پاکوخاوێن ڕابگریت؟!![1]

## داوای هیچ لە کەس مەکەن

پێغەمبەری ئازیز ( عليه الصلاة والسلام ) فەرمووی: کێ دەستەبەری ئەوە دەبێت کە داوای هیچ شتێك لە کەس نەکات، لە بەرامبەریدا من زامنی دەبم کە خودا بیخاتە بەهەشت؟ سەوبانی خزمەتکار و عاشقی رسول الله ( عليه الصلاة والسلام ) وتی: من.

ئیدی هەموو دەیانزانی کە سەوبان (رضي الله عنه) داوای هیچ شتێك لە کەس ناکات، جاری وا هەبوو بە سەر وڵاخەکەیەوە بوو، عەساکەی دەستی یاخود قامچییەکەی لێ دەکەوتە خوارێ، خۆی لە وڵاخەکەی دادەبەزی و هەڵیدەگرتەوە و داوای لە کەس نەدەکرد کە بیداتەوە دەستی.

## لەگەر گوناه بۆنی هەبووایە!

موحەممەدی کوڕی واسیع ( رحمه الله ) هەر کاتێك گوێبیستی سەنای خەڵك بووایە، یاخود.. مەدحی خوداپەرستی و خۆپارێزییان بکردبا، پێی دەوتن: ئەگەر گوناهەکان.. بۆنیان هەبووایە، ئەوا کەستان توانای نزیك بوونەوەتان نەبوو لێم، بە هۆی بۆنی ناخۆشی گوناهانی زۆرمەوە، ئیتر مەدحی چیم دەکەن؟! ! سەناخوانی چ شتێکمن؟!![2]

(١) (تهذيب حلية الأولياء:ج٢/٣١)
(٢) (صفة الصفوة/٦٤٢)

## چۆن دڵتان هات؟!

کاتێـک جەســتەی پـیرۆزی رســول الله (ﷺ) ئەسپـەردەی خـــاك کـــرا، فـاتمـەی زەهــرا (عليها السلام) وتی بە ئەنـەسـی کـوڕی مالیـك: ئـەی ئـەنـەس.. چــۆن دڵـــتان هــــات، کە رســـول الله تـــان (ﷺ) کـــرد بـــە ژێـــر خـاکـــەوە و گــەڕانـەوە؟!![1]

حەمـاد دەڵێت: هــەر کـاتـێـك سـابتی بـونـانی ئــەم باســـەی دەگـێڕایــەوە، هـێنده دەگـریـا..!! دەتـگـوت هـەر ئـێـســتا پــەراســووەکـانی تێکـەڵ دەبــن بـەیـەکدا.

## بڕۆ لەوا لێت خۆشــبووم

ئیــبن ســـەمماك (رحمه الله) دەڵێــت: باســی پیاوێکیــان بـۆ کـــردم لە گـــەورە خواپەرســتان، چــووم بـــۆ زیـــارەتی، وتـی: بـۆچی هـاتـــوویت؟ وتـم: زانـیم تـــۆ کێیت، بـۆیـە هـــاتـــووم هــەتا ســـوودێکت لێ وەربگـــرم. وتـی: ئــەوەی پێـی وتـــوویت، فـریـویداویت..!! من خـۆم نەفســم باشـــتر دەناســـم لە کەسـانی تـر. کە گـوێم لە قســـەکانی بـــوو گـــریام، پاشـــان پـێم وت: هـیچ پێویســـتییەکت هـەیە، تا من شــەرەفمەند بکەیت بە جێبەجێ کـردنی؟ وتـی: هــەرکەس بە هــەق مەشـــغوڵی یادی خـوابێت، هیچ پێویســـتییەکی بە کەس نییە، خـودا نەبێت. وتـــم: ســـوێندت دەدەم بە خـودا، چیت پێخـۆشـــە لە دنیـا و ئـــاخیرەتدا پـێم بڵـێ؟ بـــە گـریانـەوە وتی: وەڵڵاهی ئـەگـەر ســـوێندت نەدابـام پـێم نەدەوتیـت!! ئــەوەی لە دنیادا پێم خـۆشــە هێـز و توانـایە بـۆ گـوێـڕایەڵی کـردنی خـوا و نەفســـێکی دوور لە هـــەوا و ئـــارەزوو و دڵێکـی ئـــاوێتە بە تـرس و ئومێـد، ئــەوەش کە لە دواڕۆژدا پێمخـۆشــە، بیســـتنی دەنگی گـەورەکـەمــە، کە پـێم بڵێـت: ئـــەی بـەندەکـــەم.. بـــڕۆ ئـــەوا لـێت خـــۆشـــبووم.[2]

---

(١) (حياة الصحابة:ج٣/٥٤)
(٢) (الف قصة و قصة /٢٧٨)

## لەوە باشترینی سێ هەیڤەکەتە

عائیشەی دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها) لە خەونیدا سێ مانگ دەبینێت کە دەکەونە ناو ژوورەکەیەوە..!! خەونەکەی بۆ ئەبوبەکری باوکی دەگێڕێتەوە کە شارەزا بوو لە لێکدانەوەی خەوندا، ئەبوبەکر دەڵێت: ئەگەر ئەم خەونەت راست بێت، ئەوا سێ کەس لە ژوورەکەتدا بە خاك دەسپێردرێن، کە باشترینی خەڵکانی سەر زەوین. کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد و لە ژوورەکەی عائیشەدا بە خاك سپێردرا.. ئەبوبەکر بە عائیشەی وت: ئەمە یەکێك لە سێ هەیڤەکەت کە پێغەمبەرە (ﷺ) وەباشترینی سێ هەیڤەکەتە.[1]

دوو مانگەکەی تر و.. دوو باشترینەکەی تری دنیا، خودی ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب بوون (رضي الله عنهما) کە لە هەمان ژووردا و لە خزمەتی رسول الله دا (ﷺ) یەك لە دوای یەك بە خاك سپێردران.

## هیچم نییە بۆ وتن!!

ئەبو سەعید دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کوللە دایە بێستانێکی رابیعەی عەدەویە، رابیعە (رحمها الله) چووە ناو بێستانەکە و تەماشایەکی کرد و وتی: ئەی پەروەردگارم.. ئەگەر ئەم زەرعاتە بە نسیبی نەیار و دوژمنەکانتی دەکەیت، یاخود بە نسیبی دۆست و خۆشەویستەکانت، من هیچم نییە بۆ وتن، چونکە رۆزی هەمووومان هەر لە خزمەت تۆوەیە.

ئیدی هەرچی کوللە هەبوو لە بێستانەکەیدا، فڕی و رۆشت.[2]

(١) (أبوبكر الصديق/٣٣٢)
(٢) (مجموعة رسائل ابن الجوزي/٢٤٣ ـ ٢٤٤)

## داوه‌تێك بۆ ورده‌نان خواردن

ئـــــه‌وان كـۆمـه‌ڵێـك هــه‌ژار بـــــوون، له‌و هـه‌ژارانـــــه‌ی كه له‌ســــه‌ر ڕێگاكاندا ســواڵ له خـــه‌ڵكی ده‌كـه‌ن، پێكـه‌وه له‌ســــه‌ر خـۆڵ دانیشـــتبـوون و خـه‌ریكی خــواردنی ورده‌نـــان بــــوون، ورده‌نـــانێـك.. كـه له‌ســــه‌ر ڕێگـا كـــــۆیان كـردبـۆوه.

حه‌سـه‌نی كـوڕی عه‌لـی (عليه السلام) بــه سـه‌ر هـێسـتره‌كـه‌یـه‌وه بـه لایـاندا گوزه‌ری كـرد و ســڵاوی لێ كـردن، ئـــــه‌وانیش وه‌ڵامیان دایـــــــه‌وه و، پـێـیان وت: فـه‌رمــــوو خــواردن بخـۆ ئـــــه‌ی كـوڕی رســـول الله (ﷺ).

حه‌ســــه‌ن داوه‌تــه‌كـه‌ی قبـوڵ كـرد وتی: خـوا كـه‌ســــانێكی خـۆش نـاوێت كـه خـۆیان بـه گـه‌وره ده‌زانــن. پاشــــان دابـه‌زی و له‌ســــه‌ر زه‌وی لـه‌گـه‌ڵ هـه‌ژاره‌كان دانیشـــت و ده‌سـتی كـرد بــه ورده‌نـــان خــواردن، دواتــــر كـه له خواردنــه‌كـه بـــــوونــــــه‌وه، حه‌ســــه‌ن ســواری هێسـتره‌كه‌ی بـــــــوو و ڕۆشـــت.[1]

پاشــان حه‌ســــه‌ن.. هـه‌ژاره‌كــان داوه‌ت ده‌كـات بـــۆ ماڵــه‌كـه‌ی خـــۆی، مـیوانداریان ده‌كـات و نــــــــان و بــــــه‌رگیان پێ ده‌به‌خشـێت.

## ئاماده‌كردنی ده‌سـتی ڕاسـت

عه‌بدوڵڵای كوڕی موسلیمی كوڕی یه‌سار ده‌ڵێت: بـاوكم (رحمه الله) بـــه بـاشـی نـه‌ده‌زانــی و پـێی نـاخــۆش بــوو.. بـه ده‌سـتی ڕاسـتی زه‌كـه‌ری بگـرێـت، وه ده‌یگـوت: ئـومێد ئه‌كه‌م ڕۆژی دوایی به ده‌سـتی ڕاسـتم كـتـێبه‌كه‌م وه‌ربگـرم.[2]

وه عوسـمانی كـوڕی عه‌فـان (رضي الله عنه) ده‌ڵێت: لـه‌و كـاتــه‌وه‌ی كـه ده‌سـتم خسـتـۆتـه نـاو ده‌سـتی پـیرۆزی رســـول الله (ﷺ) بــۆ بــه‌یعــه‌ت كــردن، هـێشـتا ده‌سـتی ڕاسـتم نـه‌داوه لـه زه‌كـه‌رم.

(١) (إحياء علوم الدين ١٧٨/٥)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين: ج١/٧٤)



## بۆ نزاكانمان گیرا نابێت

شەقیقی كوڕی ئیبراهیم دەڵێت: ئیبراهیمی كوڕی ئەدهەم (رحمه الله) بە بازاڕەكانی شاری بەسرەدا تێدەپەڕی، خەڵكی لە دەوری كۆ بوونەوە و پێیان وت: ئەی ئەبا ئیسحاق.. خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿أُدْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾[1] واتە: لێم بپاڕێنەوە، منیش نزاكانتان لێ وەردەگرم. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە زەمەنێكە لێی دەپاڕێینەوە، بەڵام نزاكانمان لێ وەرناگیرێت!

ئیبراهیم وتی: ئەی ئەهلی بەسرە.. ئێوە دڵتان مردووە لە ( دە ) شت دا، بۆیە نزاكانتان وەرناگیرێت:

یەكەم: خوداتان ناسی و. هەقی خۆیتان پێ نەدا.

دووەم: كتێبەكەی خوداتان خوێندەوە و.. كارتان پێ نەكرد.

سێیەم: بانگەشەی خۆشەویستی رسول الله تان كرد (ﷺ) بەڵام سونەتەكانیتان واز لێ هێنا و كارتان پێ نەكرد.

چوارەم: بانگەشەی دژایەتی كردنی شەیتانتان كرد و بە كردەوە هاوڕای بوون.

پێنجەم: وتتان ئارەزوومان لە بەهەشتە و.. كارتان بۆ نەكرد.

شەشەم: وتتان ترسی ئاگری دۆزەخمان هەیە و نەفسی خۆتان بە بارمتە بۆ داناوە.

حەوتەم: دڵنیا بوون لەوەی كە مردن هەقە و.. خۆتان بۆ ئامادە نەكرد.

هەشتەم: سەرگەرمی عەیبەكانی براكانتان بوون و، ناتەواوییەكانی خۆتانتان فەرامۆش كرد.

نۆیەم: نیعمەتەكانی پەروەردگارتان خوارد و.. سوپاسیتان نەكرد.

دەیەم: مردووەكانتان خستنە ناو گۆڕەوە و.. هیچ پەندێكتان لێ وەرنەگرتن.[2]

---

(١) (الغافر/٦٠)

(٢) (تهذیب حلیة ألاولیاء: ج٢/٤٨٢)

## لەی قووتی حەڵاڵ.. لە کوێی تۆ؟! !

ئەبوبەکری صدیق (ﷺ) خزمەتکارێکی هەبوو.. هەرکاتێك خواردنێکی دەهێنایەوە، ئەبوبەکر لێی دەپرسی: ئەو خواردنەت چۆن پەیدا کرد؟ ئەگەر وەڵامی خزمەتکارەکەی بە دڵ بووایە، لێی دەخوارد، ئەگەر نا.. نەیدەخوارد.
شەوێکیان بیری چوو لە سەرچاوەی خواردنەکە بپرسێت و لوقمەیەکی لێ خوارد، خزمەتکارەکەش پێی وت: چیتە وا ئەم شەو وەك شەوەکانی دی لە سەرچاوەی خواردنەکەت نەپرسی؟! وتی: برسێتی ئەم کارەی پێ کردم، ئێستا پێم بڵێ خواردنەکەت لە کوێ هێنا؟ خزمەتکارەکەی وتی: لە سەردەمی نەفامیدا، نوشتە و فاڵم بۆ کەسانێك گرتەوە، ئەمڕۆ بە لایاندا تێپەڕ بووم، شایی و زەماوەندیان هەبوو، ئیدی بانگیان کردم و ئەم خواردنەیان پێدام. ئەبوبەکر وتی: ئای لە دەستی تۆ..!! خەریك بوو بە هەلاکەتما ببەیت! ئیدی ئەبوبەکر دەستیکرد بە قوڕگیدا هەتا خۆی بڕشێنێتەوە، بەڵام خواردنەکە دەر نەئەهات، پێیان وت: ئەوە تەنیا بە ئاو دێتە دەرێ. ئەبوبەکر داوای ئاوی کرد، لێی خواردەوە و خۆی ڕشاندەوە تا خواردنەکەی فڕێدایە دەرێ، پێیان وت: ڕەحمەتی خودات لێ بێت، ئەم هەموو زەحمەتە تەنیا بۆ یەك لوقمە؟! ئەبوبەکر وتی: ئەو لوقمە ئەگەر تەنیا لەگەڵ ڕۆحمدا دەربهاتبایە، ئەوا لەگەڵ ڕۆحمدا دەرم دەهێنا!! چونکە گوێم لێ بوو رسول الله (ﷺ) دەیفەرموو: هەموو بەدەنێك حەرامی دەرخوارد بدرێت، ئەوا ئەو بەدەنە ئاگر لەبەرترە بۆی. منیش ترسام بەدەنم لەو لوقمە خواردنە سوود وەربگرێت.[1]

## چۆنیت؟!

ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) سەلامی کرد لە پیاوێك، پیاوەکەش وەڵامی دایەوە، عومەر پێی وت: تۆ چۆنیت؟ پیاوەکە وتی: الحمد لله. عومەر وتی: منیش هەر ئەوەم ویست لە تۆ کە بڵێیت: الحمد لله.[2]

(١) (صفة الصفوة/٩٨)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين/١١٦)

## فەمی میوانت نەبێت!

شــەقیقی بەڵخــی ( رحمه الله ) دەڵێــت: هــیچ شتێــك ئــەندازەی مــیوان خۆشــەویســت نیــیە لە لام، چــونکە ڕۆزیــیەکەی لە خزمــەت پــەروەردگارە و پاداشتەکەی بۆ مـنە.[1]

## تا زیاتر بفوات، کاری زیاتر دەکات!!

شــەوێکیان ســوفیانی ســەوری ( رحمه الله ) هــێندەی خــوارد هــەتــا تــێر بــوو، دواتـر وتـی: کاتێـك گـوێدرێــژ عـەلـەفــی زیـاتــری پێدەدرێــت، کـاری زیـاتــر دەکــات. ئــیتر ســوفیان شــەوەکــەی زینــدوو کــردەوە بە خـواپـەرســتی و نەخـەوت هـەتا بەیانی.[2]

## ڕەوشــتی هاوڕێ ناوازەکان

پیاوێــك دەچێــتە ســەردانی حەســەنی بەســری ( رحمه الله ) دەبینێـت حەســەن خـەوتـووە و لە پـاڵ ســەریدا زەمبیلەیـەك دانــراوە و مـیوەی تێدایە، پیاوەکـەش زەمبـیلەکە دەهێـنێت و دادەنـیشـێت.. دەســت دەکـات بە خــواردنی مـیــوە، کاتێك حـەسـەن بەئـاگـا دێـتەوە و دەبــینێت هــاوڕێکــەی خــەریکی خـواردنــە، پێی دەڵێت: ئــەی ڕەحمـەتی خــوات لێ بێت.. وەڵڵاهـی ئـەمـە ڕەوشـتی کـەسـە نـاوازەکـانـە.[3]

---

(١) (منجد الخطيب:ج١٢٧/٢)
(٢) (التصنيف الموضوعی لتاريخ بغداد/٥٣٧)
(٣) (من روائع اقوال الصالحين: ج١٨٦/١)



# گەڵا و گوڵی بێ دڕك

ئەبـو موسـلیمی خەولانـی (رحمه الله) دەڵێـت: خـەڵکی ئەوسـا.. گـەڵا و گـوڵی بێ دڕك بوون، بەڕاسـتی ئەمڕۆ دڕك و خـاری بێ گـەڵا و گـوڵـن! ئەگـەر قسـەیـان پـێ بڵێیـت.. قسـەت پـێ دەڵێنـەوە، ئەگـەر ڕەخنەیـان لێبگـریـت.. ڕەخنـەت لێدەگـرنەوە، وە ئەگـەر وازیـان لـێ بهێنیت.. ئەوان وازت لێ ناهێنن!

عوسـمانی کوڕی عەتا دەڵێت: باوکم وتی: کاتێـك ئەبـو موسـلیمی خەولانی لە مزگەوتەوە دەڕۆشـتەوە بـۆ مـاڵ، لەبەر دەرگاکەیدا (الله اکبر) ی دەکـرد و ژنەکەیشی لە ژوورەوە (الله اکبر) ی بـۆ دەوتـەوە، کە دەگەشـتە حەوشـەکەی بە هـەمـان شـێوەیان دەکـرد، کە دەچـووە ژوورەوە ژنـەکـەی عەباکـەی و نەعلەکانی لێدەگـرت و خـواردنی بـۆ دەهـێنا.

شـەوێکیان.. لە مزگـەوت هـاتەوە و لـەبـەر دەرگـاکـەیدا (الله اکبر) ی کـرد و هـیچ وەڵامێکی نەبیسـت!! لە حەوشەکەشدا بە هـەمان شـێوە.. تـا چـووە ژوورەوە، دەبینێ چـرای مـاڵـەکەی دانەگیرسـاوە و ژنەکەی دانیشـتووە..!! ئەبـو موسـلیم وتی: ئـەوە چیتە لەو تاریکییەدا، کـز و مـات دانیشـتوویت؟!

ژنەکەی وتی: تـۆ لەلای معاویەی کـوڕی ئەبـو سـوفیان، ڕێـزێکت هـەیە. ئەگـەر داوای خزمـەتکارێکی لێبکەیت تـا خزمـەتمان بکـات و شـتێکیشـمان پێ ببەخشـێت، سـوودی هـەبێت و گوزەرانمان باش بکات، ئەمـە حـاڵ نییە ئێمەی تێدایـن!!

ئەبـو موسـلیم وتی: خـودایە ئـەوەی ژنەکەمـی خـراپ کـردووە. چـاوەکانی کوێـر بکە!! (تـومـەز ئـەمە پێشـتر ژنێـك هـاتـووە و ژنـەکەی ئـەبـوو موسـلیمی بەم قسـانە پـڕ کـردووە).

دەڵێت: ئـافـرەتەکە لە مـاڵی خـۆیدا، لە ناکـاو بینـایی چـاوەکـانی نامێنێـت و کـوێـراییان دادێ، ژنـەکە دەڵێت: ئـەوە چـرای ژوورەکە کـوژاوەتەوە؟!

دەڵێن: نـەخێر.. چـراکـە نـەکـوژاوەتـەوە!!

ئیدی ئافرەتەکە دەزانێت کە چاوی کوێـر بـووە و بـە نـزای ئەبـو موسـلیم وای لێهـاتـووە، بـۆیە دەچێتە لای ئەبـو موسـلیم و بـە گـریـانـەوە پـۆزشـتی بـۆ دەهێنێتەوە و داوای لـێ دەکـات کە نـزای بـۆ بکـات، هـەتا پـەروەردگار چاوانی چـاك بکاتـەوە، ئیدی ئەبومـوسلیم بـەزەیی پـیا دێتەوە و نـزای بـۆ دەکـات، هـەتـا چـاوەکانی چـاك دەبـنەوە.(١)

(١) (من عجائب الدعاء/٥٧)

## گومان لە عومەر دەکەیت؟!!

نیوە شەو بوو.. دنیا تاریك و ئەنگوستەچاو، عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) لەماڵ هاتە دەر و تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ئاگای لێ بوو، عومەر ڕۆشت و چووە ماڵێك، دواتر هاتە دەر و ڕۆشتە ماڵێکی دیکە، بۆ سبەی کە ڕۆژ بوویەوە.. تەڵحە ڕۆشت بۆ ماڵەکە، دەبینێ پیرەژنێکی نابینای پەککەوتەی لێیە..!! تەڵحە (رضي الله عنه) لێی پرسی: ئەو پیاوە کاری چییە کە شەوانە دێتە لات؟! وتی: ئەوە مودەتێکە دێتە لام، کاروبارەکانم بۆ ئەنجام دەدات، شەخەڵ و پیسایەکانم بۆ دەڕژێت و لێم دوور دەخاتەوە.

تەڵحە بە خۆی دەڵێت: دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات ئەی تەڵحە.. شوێن جێ پێکانی عومەر دەکەویت و گومانی لێ دەکەیت؟!![1]

## چی دەچێتە گەدەت؟!

وەهبی کوڕی مونەبیهـ (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر وەك پایەکەی مزگەوت، بەردەوام بوەستیت و نوێژ بکەیت، سوودت پێناگەیەنێت، هەتا دڵنیا نەبیت لە حەلاڵ بوونی خواردنەکەت.[2]

## بێ پێچ و پەنا

موحەممەدی کوڕی حەفصی دراوسێی بیشری حافی (رحمه الله) دەڵێت: بیشر نەخۆش کەوت و بە سەردان چووینە خزمەتی، پیاوێك کە دیار بوو زۆر دانیشتبوو، پێی وت: ئەی بیشر.. ئامۆژگارییەکم بکە.

بیشر وتی: کە چوویتە سەردانی نەخۆش، زۆر مەمێنەوە!![3]

(١) (تهذيب حلية الاولياء: ج١/٦٩)
(٢) (روضة الزاهدين/٨٦)
(٣) (الف قصة وقصة/٤٠)

## مافی هه‌موو خاوه‌ن مافێك بده‌

پێغه‌مبه‌ر (عليه الصلاة والسلام) سه‌لمانی فارسی و ئه‌بوده‌ردائی كرده‌ برای یه‌كتر، دوای ئه‌وه‌ی كه‌ بوونه‌ برا، سه‌لمان ده‌چێته‌ سه‌ردانی براكه‌ی و.. ئوم ده‌ردائی براژنی به‌ په‌ڕپووتی و شپرزه‌یی ده‌بینێت..!! لێی ده‌پرسێت: خێره‌ ئاوا ده‌تبینم؟! ئه‌ویش ده‌ڵێت: ئه‌بوده‌ردائی برات هیچ كاری به‌ دنیاوه‌ نه‌ماوه‌ و ده‌ستی لێ شتووه‌!! ڕۆژه‌كه‌ی به‌ ڕۆژووه‌ و شه‌وه‌كه‌یشی به‌ خواپه‌رستی به‌ سه‌ر ده‌بات. ئه‌بوده‌رداء هاته‌وه‌ بۆ ماڵ، خواردنیان هێنا و سه‌لمان پێی وت: فه‌رمووو بخۆ. ئه‌بوده‌رداء وتی: ناخۆم، به‌ڕۆژووم. سه‌لمان وتی: ده‌ی منیش ناخۆم هه‌تا تۆ نه‌خۆیت. ئیدی پێكه‌وه‌ نانیان خوارد، كاتێك كه‌ شه‌و داهات، ئه‌بوده‌رداء هه‌ستا بۆ شه‌ونوێژ.. سه‌لمان پێی وت: بخه‌وه‌. ئه‌ویش خه‌وت، پاشان هه‌ستایه‌وه‌ و دووباره‌ سه‌لمان پێی وته‌وه‌: بخه‌وه‌. ئه‌ویش خه‌وته‌وه‌، كات گه‌شته‌ كۆتا به‌شی شه‌و..!! له‌و ده‌مه‌دا سه‌لمان وتی: ده‌ی ئێستا هه‌سته‌. ئیدی هه‌ردوكیان هه‌ستان و كۆتا به‌شی شه‌وه‌كه‌یان زیندوو كرده‌وه‌ به‌ شه‌ونوێژ و عیباده‌ت، پاشان سه‌لمان به‌ ئه‌بوده‌ردائی وت: په‌روه‌ردگارت مافی هه‌یه‌ به‌سه‌رته‌وه‌ و.. نه‌فست مافی هه‌یه‌ به‌ سه‌رته‌وه‌ و.. خاوخێزانیشت مافیان هه‌یه‌ به‌ سه‌رته‌وه‌، كه‌واته‌ تۆش پێویسته‌ له‌سه‌رت مافی هه‌موو خاوه‌ن مافێك بده‌یت.

دواتر ئه‌بوده‌رداء ده‌چێته‌ خزمه‌تی رسول الله (ﷺ) و به‌سه‌رهاتی سه‌ردانه‌كه‌ی سه‌لمانی بۆ ده‌گێڕێته‌وه‌، فه‌خری عاله‌میش (ﷺ) پێی ده‌فه‌رمووێت: سه‌لمان ڕاستی وتووه‌.[1]

## یادی مه‌رگ

ڕه‌جای كوڕی حه‌یوه‌ (رحمه الله) ده‌ڵێت: ئه‌وه‌ی زۆر یادی مردن بكات.. واز له‌ ئیره‌یی بردن و دڵخۆشبوونی دنیایی، ده‌هێنێت.[2]

(١) (الجليس الصالح و الجليس السوء/٨٥ ـ ٨٦)
(٢) (روضة الزاهدين/٧١)

## فەڵکان ڕۆشتن و.. من ڕووم کردە تۆ!

یەحیای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئامادەی نوێژی ڕۆژی جەژن بووم لەگەڵ عەبدولڕەحمانی کوڕی قاسمدا، کاتێك خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد.. ئیبن قاسم ( رحمه الله ) ڕۆشتە مزگەوت و دەستی کرد بە نوێژکردن، پاشان کاتێکی زۆر لە سوجدەدا مایەوە، منیش خەمی ئەوەم بوو، کە خواردنەکەم لە کیس بچێت لەگەڵ خانەوادەکەمدا، بۆیە لێی نزیك بوومەوە و گوێم لێ بوو دەیگوت: ئیلاهی.. بەندەکانت ڕوویان کردە ئەوەی کە بۆ ئەم ڕۆژەیان ئامادە کردووە، عەبدولڕەحمانیش ڕووی کردە تۆ.. تکای لێخۆشبوونت لێدەکات لەم ڕۆژە گەورەدا، ئیدی ئەگەر لێم خۆش ببیت، ئەوا أَللَّهُ.. أَللَّهُ.. چ خۆش بەختم من..!! وە ئەگەر لێم خۆش نەبیت ئەوا شیوەن و حەسرەت و عەزاب بەشم بێت.

یەحیا دەڵێت: شتێکم بە جلەکانییەوە نیشانە کرد و کەوتمەڕێ بۆ لای خانەوادەکەم.. لە ماڵەوە نانم خوارد و کاری سەرجێییم کرد و خەوتم، پاشان هاتمەوە بۆ مزگەوت، دەبینم وەك چۆن جێم هێشتبوو. بەهەمانشێوە لە سوجدەکەیدا ماوەتەوە!![1]

## فتورەی بەخشینیم کرد!

ڕۆژێك ئەباحەسەنی بوشەنجی ( رحمه الله ) لە تواليت دەبێت.. یەکێك لە قوتابییەکانی بانگ دەکات و پێی دەڵێت: ئەم کراسەی بەرم لابە و بیبە بیدە بە فڵان کەس..!! قوتابییەکەیشی دەڵێت: ئایا ناوەستیت، هەتا بێیتە دەرەوە؟! ئەباحەسەن دەڵێت: بڕوام بە نەفسی خۆم نییە، تا من بێمە دەر ئەو بڕیارەکەی خۆی نەگۆڕێت، وە من فتورەی بەخشینیم کردووە و سیفەتی ڕژدیش لە مرۆڤدا لەناو ناچێت بە بەخشین نەبێت.[2]

---

(١) (ترتيب المدارك ج٣/٢٥٥)
(٢) (إحياء علوم الدين ٣/٢٦٢)

## ته‌نها هاوسه‌ره‌كه‌م!

موحه‌ممه‌دی كوڕی سیرین (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) ده‌ڵێت: بێجگه‌ له‌ هاوسه‌ره‌كه‌م نه‌چـووه‌ته‌ لای هیچ ئافره‌تێك نه‌ له‌ بێداریم و نه‌ له‌ خه‌ونمدا، وه‌ كاتێك له‌ خه‌ونمدا ئافره‌تێك ده‌بینم و ده‌زانم حه‌ڵاڵم نییه‌، خێرا چاوم وه‌رده‌گێڕم و ته‌ماشای ناكه‌م!

## دایكه‌.. مه‌ڕ دۆشه‌كه‌ هات

یه‌كێك له‌ كرده‌ خاكییه‌كانی ئه‌بوبه‌كر (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) ئه‌وه‌ بووه‌ كه‌ به‌رده‌وام خزمه‌تكردنی كه‌سانی تری پێخۆشبووه‌، ئه‌بوبه‌كر ده‌ڕۆشت مه‌ڕی بۆ هه‌ندێك له‌ ماڵان ده‌دۆشی، كاتێك كه‌ بوویه‌ جێنشینی رسول الله (ﷺ) ئافره‌تێك وتی: تازه‌ ئه‌بوبه‌كر ئێمه‌ی بیر ده‌چێته‌وه‌ و نایه‌ت مه‌ڕه‌كه‌مان بۆ بدۆشێت. به‌ڵام ئه‌بوبه‌كر ئه‌و كاته‌ زیاتر خۆی به‌ خزمه‌تكاری ئوممه‌ت ده‌زانی، كه‌ بوو به‌ سه‌رۆك و گه‌وره‌یان، بۆیه‌ وازی له‌و كاره‌ باشانه‌ نه‌هێنا كه‌ به‌ر له‌ خه‌لافه‌ت ئه‌نجامی ده‌دان!! ئه‌بوبه‌كر ده‌ڕوات بۆ مه‌ڕدۆشین و له‌ ده‌رگای ماڵی ئافره‌ته‌كه‌ ده‌دات، منداڵێك ده‌رگا ده‌كاته‌وه‌ و هاوار ده‌كات: دایكه‌.. مه‌ڕدۆشه‌كه‌ هات..!! ئافره‌ته‌كه‌ دێت و كه‌ ئه‌بوبه‌كر ده‌بینێت، به‌ شه‌رمه‌زارییه‌كه‌وه‌ به‌ منداڵه‌كه‌ی ده‌ڵێت: ڕۆڵه‌ گیان ئه‌وه‌ جێنشینی رسول الله‌ یه‌ (عَلَيْهِ ٱلصَّلَاةُ وَٱلسَّلَامُ)!![1]

## هاوڕێی گریان!

هه‌ركات ڕۆژی هه‌ینی ده‌هات.. زیراری كوڕی مورڕه‌ و موحه‌ممه‌دی كوڕی سوقه‌ (رَحِمَهُمَا ٱللَّهُ) ده‌ڕۆشتن به‌ شوێن یه‌كتردا، ئه‌و ده‌مه‌ی یه‌كیان ده‌گرت.. داده‌نیشتن و ده‌ستیان ده‌كرد به‌ گریان..!! گریان بۆ ئه‌و ڕۆژه‌ی كه‌ كه‌س فریای كه‌س ناكه‌وێت.[2]

---

(١) (خلفاء الرسول/٧٠ـ ٧١)
(٢) (صفة الصفوة/٥٦٨)

## خۆڵ و خاك بخۆ!

ڕۆژێکیان له سه‌لمانی فارسی ده‌پرسن: چشتێکه وه‌هات لێ ده‌کات که ئه‌میری و گه‌وره‌ییت پێ باش نییه؟! ! سه‌لمان له وه‌ڵامدا ده‌ڵێت: شیرینی سه‌ره‌تاکه‌ی و.. تاڵی کۆتاییه‌که‌ی!!

عه‌بدولقه‌یس ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ سه‌لمانی فارسی دا بووم (رضي الله عنه) که ئه‌میری سریه‌یه‌ك بوو، به لای کۆمه‌ڵه گه‌نجێکی سه‌ربازدا تێپه‌ڕین، گه‌نجه‌کان ده‌ستیانکرد به پێکه‌نین و، به توانجێکه‌وه وتیان: ئه‌مه ئه‌میره‌که‌تانه؟!

وتم: ئه‌ی ئه‌باعه‌بدوڵڵا.. نابینی ئه‌مانه چی ده‌ڵێن؟!

سه‌لمان وتی: وازیان لێ بهێنه.. خێر و شه‌ڕ له‌مڕۆ به دواوه‌یه، ئه‌گه‌ر توانیت خۆڵ و خاك بخۆیت.. ئه‌وا بیخۆ و خۆت مه‌که‌ره ئه‌میری ته‌نانه‌ت دوو که‌س!! وه خۆت بپارێزه له دۆعای مه‌زلوم و بێ ده‌ره‌تانه‌کان.. چونکه هیچ شتێك ناکه‌وێته نێوان دۆعاکانیان و په‌روه‌ردگاره‌وه.[1]

## باسی دنیا له گۆڕستان

ئیبراهیمی نه‌خه‌عی (رحمه الله) ده‌ڵێت: ئێمه کاتێك ئاماده‌ی به خاك سپاردنی مردوویه‌کمان ده‌بووین، یاخود ده‌مانبیست که یه‌کێك مردووه، بۆ چه‌ندین ڕۆژ ماته‌مینیمان پێوه دیار بوو، چونکه دڵنیا بووین له‌وه‌ی که مردن کاری مرۆڤه‌کان یه‌کلا ده‌کاته‌وه.. یان بۆ به‌هه‌شت یان بۆ دۆزه‌خ!! به‌ڵام ئێوه له ئه‌سپه‌رده‌کردنی مردووه‌کانتانا، قسه و باسی دنیا ده‌که‌ن!![2]

(١) (حياة الصحابة ٣/ ٣٤٧ ـ ٣٤٨)
(٢) (صفة الصفوة/٥٥٤)

## ژیـــانـەوە

عــەمروی کــوڕی دینـار دەڵێـت: عــەلی کــوڕی حوســەینی شــەهید (عليه السلام) ڕۆشــتە ســەردانی مـوحەممەدی کـوڕی ئـوسـامـەی کـوڕی زەید (رضي الله عنه) لـە کـۆتـا نـەخـۆشـیدا، مـوحەممـەد دەگـریــا!! عــەلی پێـی وت: بــۆ دەگـریــەیت؟ وتـی: قــەرزارم. عـەلی وتی: قــەرزەکـەت چـەنـدە؟ وتی: پــازدە هــەزار دیـنارە! عـەلی وتی: خـەم مــەخــۆ.. مـن دەیـدەمـەوە.[1]

## ســەرۆك.. لە بـازاڕ دەچـێت!

عومەری کوڕی عەبـدولعەزیز (رحمه الله) دەڵێـت: ســەرۆکی وڵات وەك بـازاڕێــك وەهـایـە، ئـەو شــتەی بـۆ دەڕوات کە خـواستی لـەسـەرە.

عەبـدوڵڵای کــوڕی زیــادی کــوڕی ئــەنعومی ئیفریقـی (رحمه الله) لە دەســت جـەوری کاربـەدەســتان، شـــار جێدەهێـڵێت و دەکـەوێـتە ڕێ بــۆ لای خــەلیفە ئـەبـوجەعفــەری مـەنســـور، لەوێ چـــەند مــانگێــك چـــاوەڕێ دەکــات، هــەتا دەچـێـتە لای خـەلیفە!! ئەبـوجەعفەر پێی دەڵێت: چـی تــۆی هـێـناوە بــۆ ئـێـرە؟

ئـیبن ئـەنعـوم پێی دەڵێت: جـەور و ســتەمی کاربـەدەســتان منی هێنا، منیـش وامـزانی بـە هـۆی دووری وڵاتـەکـەمـانـەوەیــە لــە جەنـابــتەوە، بــۆیــە هــاتــم ئـاگـادارت بکەمـەوە، بەڵام هـەتا نـزیکتر دەبــوومـەوە لە پایتەخـتەکـەت، جـەور و ســتەمی گـەورەتــرم دەبــینی، کــە گـەشــتمە ئـێــرەش دەبــینم ســتەم لــە دەرگــاکـەی جـەنـابــتەوە دێـتە دەر.

ئیدی ئـەبـوجـەعفەر تــوڕە دەبـێت و دەیکـاتـە دەرەوە.[2]

(١) (من روائع اقوال الصالحين ج١/١٨٩)
(٢) (مواقف ايمانية/١٤٣)

## له تۆ باشـــتر داوه‌تى كـردووم

ســـه‌عیدى كوڕى ئـه‌بى عروبه ده‌ڵێـت: جـارێكیان حه‌جاجى كـوڕى یوســـفى ســـه‌قه‌فى حه‌جى ده‌كـرد، بـه نێوان مه‌ككه و مـه‌دینه‌دا تێپه‌ڕ بـوو، كاتى پـشوودان خـواردنیان بـۆ هێنا، به بـه‌رده‌ســـته‌كه‌ى وت: بـڕۆ كه‌سێـك بهێـنه بـا له‌گه‌ڵمـدا نـان بـخـوات. به‌رده‌ســته‌كه‌ى ڕۆشـــت، دیتى ده‌شـــته‌كییه‌ك نـووســـتووه، به قـاچ لێیدا و پێى وت: هـه‌ســـته.. ئـه‌میر بانگـت ده‌كـات. ده‌شـــته‌كییه‌كه له خه‌و هـه‌ســـتا و چـوو، حه‌جاج پێى وت: ده‌ســته‌كانت بشـۆ و نـانى نیوه‌ڕۆم له‌گه‌ڵ بخـۆ.

ده‌شـــته‌كییه‌كه وتى: له تـۆ باشـــتر داوه‌تى كـردووم..!!

حه‌جاج وتى: ئـه‌و كه‌ســـه كێیه؟

وتى: خواى (عزوجل) داوه‌تـى كـردووم بـۆ ڕۆژووگـرتن و منـیش به‌ده‌م داواكه‌یه‌وه ڕۆشـتووم. حه‌جـاج وتـى: ئـاله‌م گـه‌رمـا زۆر به تیـنه‌دا؟! وتـى: بـه‌ڵێ.. ڕۆژووم گـرت بـۆ ڕۆژێكى زۆر له‌مـه گـه‌رمـتر!! حه‌جاج وتى: بیشـــكێنه و ســـبه‌ى ڕۆژوو بگـــره. وتـى: باشـــه ده‌یشـــكێنم، بـــه‌ڵام ده‌بێ زامنـى مـانـــه‌وه‌م بیـت هـــه‌تا ســـبه‌ى!! حه‌جاج وتى: ئـه‌وه بـه ده‌ســـت من نییه. ده‌شـــته‌كییه‌كه وتـى: ئـه‌دى چـۆن داواى كـارێكى ئێســـتام لێـده‌كه‌یت، بـــه كـارێكى دواتـــر كه تـوانـات بـــه ســـه‌ریدا نـییه؟! حه‌جاج وتى: خـواردنه‌كه‌مـان زۆر بـــه تـامـه. ده‌شـــته‌كییه‌كه وتـى: نـــه تـــۆ و نـــه چێشـــتلێنه‌ره‌كه‌ت تـــامتان خـــۆش نـه‌كـــردووه، بـــه‌ڵكو ته‌ندروســـتى باش، تامى خـواردنـه‌كـه‌ى خـۆشـــكـردووه كـــه خـــواى گـــه‌وره پێـى بـه‌خشـــیوون.

حه‌جـاج هـــه‌رچییه‌كى ده‌پرســـى ده‌شـــته‌كییه‌كه به حـیكمه‌ته‌وه وه‌ڵامـى ده‌دایـــه‌وه، بـــۆیـه وازى لێهێنا.[1]

## گـومـانى بـاش

مه‌سروق (رحمه الله) ده‌ڵێت: كاتێك له ماڵه‌وه پێم ده‌ڵێن: نه خـواردنێكمان هه‌یه، نه درهه‌مێك. ئه‌وه ئه‌و كاته‌یه كه من باشـترین گومانم به خـواى (عزوجل) هه‌یه.[2]

(١) (أنيس المؤمنين/١١٨-١١٩)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين: ج١/٧٥)

## مه‌لێكی دوو باڵ شــكاو!

له مه‌ككه‌ی پیرۆز شــه‌قیقی به‌ڵخـی و ئیبـراهیمی كـوڕی ئـه‌دهه‌م (رحمهما الله) به‌یه‌ك ده‌گـه‌ن، ئیبـراهیم به شــه‌قیق ده‌ڵێت: ئـه‌و ســـه‌ره‌تایـه‌ت چـۆن بـوو كه گه‌یاندیتیه ئـه‌م حـاڵه‌ی ئێسـتات؟
شـــه‌قیق ده‌ڵێـت: به هـه‌ندێــك له ده‌شـــتاییه‌كاندا ده‌گه‌ڕام، له بیابانێكـدا مـه‌لێكم دیت كه هـه‌ردوو بـاڵی شــكا بـوو، له دڵی خـۆمـدا وتـم: ده‌وه‌سـتم تـا بـزانـم ئـه‌مـه له كـوێـوه خـۆراكی بـۆ دێت!! بینیم باڵنده‌یێكی دیكه كـولله‌یێكی به ده‌مـه‌وه‌یـه، هـات و كـولله‌كه‌ی خســته نـاو ده‌نــووكی بـاڵ شــكاوه‌كه‌وه، ئـیدی تێگـه‌شـــتم كــه ڕزق و ڕۆزی. خــودا خــۆی ده‌ینــێرێت، بـۆیــه وازم له كـه‌سـابـه‌ت هێـنا و ده‌سـتم كـرد بـه عـیـبـاده‌ت.
ئیبـراهیم پێی ده‌ڵێت: ئـه‌ی بـۆچی تـۆ نـه‌بـیته ئـه‌و بـاڵـنده‌یه‌ی كه خـۆراكی هـێنا بـۆ بـاڵ شــكـاوه‌كه، هــه‌تا پـله‌ت له‌و به‌رزتر و به‌ڕێـزتـر بـێت؟! ئـه‌ی نه‌تبیسـتووه كه پێغه‌مبــه‌ر (علیه الصلاة والسلام) فـه‌رمـوویه‌تی:
**( أَليَدُ العُليا خَيرٌ مِنَ اليَدِ السُّـفلى )**[1].
واته: ئــه‌و ده‌ســته‌ی كه ده‌به‌خـشـێت بــه‌رز و به‌ڕێـزتــره له‌و ده‌ســته‌ی كه چاوه‌ڕێی ده‌سته‌كانی دیكه‌یه. وه نیشـــانه‌ی بـاوه‌ڕداریـش ئـه‌وه‌یه كه له هـه‌مـوو كاره‌كانیدا له ته‌ڵه‌بی مــه‌قـامـه بڵنده‌كاندا بێت، هـه‌تا ده‌گـاته پله‌ی چـاكـه‌كـاران!!
ئـیدی شـــه‌قیق ده‌ســتی ئیبـراهیم ده‌گـرێت، مـاچی ده‌كـات و پێـی ده‌ڵێـت: بـه‌ڕاستی تــۆ مــامــۆســتای ئـێـمـه‌یت !![2]

## یـادێك یـان دینارێك؟!

بیلالی كوڕی سـه‌عد (رحمه الله) ده‌ڵێت: بـرایـه‌ك.. هـه‌ر كات بتبینێت خـوات بـیر بخـاتــه‌وه، باشــتره بـۆت له بـرایــه‌ك كه هــه‌ر كـات بتبینێـت دینارێــك بخـاتــه ده‌ستت.[3]

---

(١) (متفق عليه)
(٢) (طبقات الأولياء: ١٥)
(٣) (أين نحن من هؤلاء:ج٤/٢٥)

## چاونەترسی منداڵێك

عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) بە ڕێدا دەڕۆشت.. کۆمەڵێك منداڵ یارییان دەکرد، کە عومەریان دیت ڕایانکرد، تەنیا عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ڕاینەکرد و لە شوێن خۆیدا وەستا..!! عومەر پێی وت: چۆن لەگەڵ هاوڕێکانتا هەڵنەهاتی؟! عەبدوڵلا وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. نە تاوانێکم کردووە لێی بترسم و.. نە ڕێگاکەش تەنگە هەتا فراوانی بکەم بۆت.[1]

## خۆشەویستی دنیا

عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: ڕۆژێك وتم بە ئەبوحازم سەلەمەی کوڕی دینار (ﷺ): شتێك زۆر دڵتەنگم دەکات. وتی: ئەی برازاکەم.. پێم بڵێ ئەو شتە چییە؟ وتم: خۆشەویستی دنیا..! ئەبو حازم پێی وتم: ئەی برازاکەم.. ئەوە بزانە، من لۆمەی نەفسی خۆم ناکەم لە خۆشەویستنی شتێك کە خوای گەورە خۆشەویستی کردووە لە لامان، بەڵکو با لە شتێکی دیکەدا لۆمەی خۆمان بکەین، کە نەهێڵین خۆشەویستی دنیا وامان لێ بکات.. شتێك ببەین کە خوا پێی ناخۆشە و ڕێگری لە شتێکیش بکەین کە خوا پێی خۆشە، سا ئەگەر ئێمە وازمان لەوە هێنا کە خوا پێی ناخۆشە و ئەوەمان ویست کە خوا پێی خۆشە. ئەو کاتە خۆشەویستی دنیا هیچ زیانێکی نابێت بۆمان.[2]

## دڵ سەرگەردانی خەیاڵاتە!

ئەبودەرداء (ﷺ) دەڵێت: پەنا بگرن بە خوا لە خشوعی دووڕوویی. پێی دەڵێن: خشوعی دووڕوویی کامەیە؟! دەڵێت: ئەوەیە کە بە جەستە خشوعت هەبێت و.. لەولاوە دڵت سەرگەردانی خەیاڵاتی دنیا بێت!

(١) (الف قصة و قصة/٩٢-٩٣)
(٢) (تهذیب حلیة الاولیاء: ج٥٢٨/١)

## كه‌سێك له‌به‌ر دڵت گران بوو

ئه‌بوبه‌كری كه‌تانی ( رَحِمَهُ اللهُ ) ده‌ڵێت: پیاوێك خۆشیده‌ویستم و ئه‌و زۆر له‌به‌ر دڵم گران بوو، ئیدی شتێكم پێبه‌خشی بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و گرانییه‌ی نه‌مێنێت له‌ دڵمدا، به‌ڵام هه‌ر وه‌ك خۆی مایه‌وه! پاشان ڕۆژێك له‌ خه‌ڵوه‌تێكدا پێم وت: قاچت بخه‌ره‌ سه‌ر كوڵمم! به‌ڵام ئه‌و ڕازی نه‌بوو، پێم وت: هه‌ر ده‌بێت وا بكه‌یت. ئه‌ویش وای كرد، ئیتر دوای ئه‌وه‌، ئه‌و بارگرانییه‌ی كه‌ له‌سه‌ر دڵم دروست بوو به‌رامبه‌ری.. نه‌ما.[1]

## ترسی فسته‌ دڵیانه‌وه!!

حه‌ججاجی كوڕی یوسفی سه‌قه‌فی بانگی حه‌سه‌نی به‌سری كرد بۆ ئه‌وه‌ی به‌ توندی له‌گه‌ڵیدا بجوڵێته‌وه‌ و سزای بدات، حه‌سه‌ن ( رَحِمَهُ اللهُ ) كاتێك له‌ ڕێگه‌دا بوو ده‌ستی كرد به‌ پاڕانه‌وه‌ له‌ په‌روه‌ردگار به‌ ناوه‌ جوانه‌كانی.. په‌روه‌ردگاریش دڵی حه‌ججاجی گۆڕی و به‌ جۆرێك ترسێكی خسته‌ دڵییه‌وه‌، كه‌ كاتێك حه‌سه‌ن گه‌شت.. حه‌ججاج به‌ پێچه‌وانه‌ی ویستی خۆی، به‌ مه‌به‌ستی پێشوازی لێ كردنی، هه‌تا لای ده‌رگاكه‌ ڕۆشت به‌ ده‌میه‌وه‌ و له‌ جێگاكه‌ی خۆیدا داینیشاند. بۆنی خۆشی ده‌دا له‌ ڕیشی و زۆر به‌ سۆزه‌وه‌ وتوویژی له‌گه‌ڵدا ده‌كرد و به‌ میهره‌بانییه‌وه‌ له‌گه‌ڵیدا ده‌جووڵایه‌وه‌، له‌ كاتێكدا بۆ ئه‌وه‌ بانگی كردبوو كه‌ سزایه‌كی سه‌ختی بدات یان بیكوژێت..!![2]

## وته‌یه‌ك بۆ غه‌می پاره‌كان

سیڕی سه‌قه‌تی ( رَحِمَهُ اللهُ ) ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر غه‌مبار بوویت بۆ ئه‌و بڕه‌ پاره‌یه‌ی كه‌ له‌ سه‌روه‌ته‌كه‌ت كه‌م ده‌كات، ئه‌وا بگریه‌ بۆ ئه‌و كاتانه‌یش كه‌ له‌ ته‌مه‌نت كه‌م ده‌كات

(١) (موسوعة الأخلاق ج٢/٢٥١)
(٢) (من عجائب الدعاء/٥٥)

## لە دەستیاندا.. چرا دەگرێت

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: شەوێکی زۆر سارد و تاریك بوو..!! ئوسەیدی کوڕی حوزەیر و عەبادی کوڕی بیشر (رضي الله عنهما) لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتنە دەرێ، ڕۆشتن و لە نێوان دەستەکانیاندا.. عەسای یەکێکیان وەك چرا دەگرا و ڕێگاکەی بۆ ڕۆشن دەکردنەوە..!! کاتێك لێك ترازان، هەر کەسە و عەساکەی خۆی ڕێگای بۆ ڕۆشن دەکردەوە.. هەتا گەشتنەوە ماڵەکانیان!![1]

## بە بێ تووڕە بوون

عەبدوڵڵای کوڕی موسلیمی کوڕی یەسار دەڵێت: کاتێك موسلیمی کوڕی یەسار (رحمه الله) دەهاتەوە بۆ ماڵ، خاوخێزانی بێدەنگ دەبوون و قسەیان نەدەکرد!! بەڵام کاتێك هەڵدەستا و.. نوێژی دادەبەست، ئەوان دەستیان دەکرد بە قسەکردن و پێکەنین..! چونکە موسلیم لە کاتی نوێژەکانیدا، ئاگای لە هیچ نەدەما!![2]

## لەحزەیەك لە غەفڵەت

جونەیدی بەغدادی (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر بەندەیەکی ڕاستگۆ.. هەزار هەزار ساڵ لە عیبادەت و یادی (عز وجل) دا بێت، پاشان تەنها بۆ یەك لەحزە پشتی تێبکات، ئەوەی لەو لەحزەدا لە دەستی دەرچووە، زۆرترە لەوەی لەو ساڵانەدا دەستی کەوتووە.[3]

(١) (أنيس المؤمنين/٦٣)
(٢) (صفة الصفوة/٦٢٧)
(٣) (صفة الصفوة/٤٦٧)

## پۆشاکەکەی دا بە سەریدا و.. ڕۆشت

ئەبو یەحیا دەڵێت: مالیکی کوڕی دینارم بینی (رحمه الله) سەروپێیەکی کوڵاوی پێبوو، سات نا ساتێك بۆنی دەکرد، پاشان پیاوێکی پیری هەژار لەسەر ڕێگاکەدا سواڵی دەکرد، مالیك پێی وت: لالۆ.. هانێ ئەوە بخۆ. پیاوەکەش وەری گرت، ئیدی مالیك دەستی سەری و پۆشاکەکەی دا بە سەریدا و ڕۆشت، دواتر هاوڕێیەکی مالیکم بینی و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەوە دەمێکە حەزی لێیەتی، بەڵام نەفسی بە باشی نەزانیوە کە بیخوات، هەر بۆیە کردوویەتی بەخێر.[1]

## فەوێکی خۆش گەورەم

یونسی کوڕی عوبەید دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پرسیار کرا لە حەسەنی بەسری دەربارەی ئەوانەی کە لە مزگەوتدا نیوەڕۆخەویان دەکرد؟ حەسەن (رحمه الله) وتی: بینیم ئەمیری ئیمانداران عوسمانی کوڕی عەفان (رضي الله عنه) لە مزگەوتدا نیوەڕۆخەوی کرد، کاتێك هەستا. جێگەی وردەبەرد و زیخ بە ڕوخسارییەوە دیار بوو..!! چونکە لە سەر زەوی خەوتبوو بە بێ هیچ ڕاخەرێك، خەڵکانیش دەیانگوت: ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە.. ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە!![2]

## چشتێك سەرسوڕهێنەرە؟!

حوسەینی کوڕی ئەحمەد دەڵێت: پرسیار کرا لە ئەبوبەکری شیبلی: چشتێك بە لاتەوە سەرسوڕهێنەرە؟ ئەبوبەکر (رحمه الله) وتی: دڵێك خوا بناسێت و پاشان سەرپێچی فەرمانەکانی بکات!![3]

---

(١) (حلية الاولياء ٣٦٦/٢)
(٢) (تهذيب حلية الاولياء ٧٨/١)
(٣) (صفة الصفوة/٤٨٧)

## هاوسه‌رگیری باوه‌ڕدارانه

سه‌عیدی کوڕی موسه‌یب (رحمه الله) که زانایه‌کی گه‌وره‌ی تابیعینه، کچێکی ڕه‌فتارباش و ڕوخسار جوانی هه‌بوو، زۆر زانا بوو به قورئان و سوننه‌تی رسول الله (علیه الصلاة والسلام) عه‌بدوملەلیکی کوڕی مه‌روان داخوازی کچه‌که‌ی کرد بۆ وه‌لیدی کوڕی، به‌ڵام سه‌عید دوودڵ نه‌بوو له ڕه‌دکردنه‌وه‌ی ئه‌و داخوازییه شاهانه‌یه، و ڕازی نه‌بوو کچه‌که‌ی بچێته ماڵه پاشایان، چونکه ده‌یزانی که وه‌لید به درۆ و قسه‌ی ناشیرین و بێ ئابڕوویی و خراپه‌کاری ناسراوه و شایانی کچه‌که‌ی ئه‌م نییه، ئه‌گه‌رچی کوڕه پاشایه‌کیشه، عه‌بدوملەلیك له‌سه‌ر داواکه‌ی سوور بوو، به‌ڵام هێشتا سه‌عید هه‌ر ڕازی نه‌ده‌بوو، بۆیه سه‌د قامچی له سه‌عید درا..!!

سه‌عید گه‌ڕایه‌وه بۆ شاری مه‌دینه و عه‌بدوڵڵای کوڕی ئه‌بی وه‌داعه‌ی بینی، که یه‌کێك بوو له قوتابییه‌کانی خۆی، عه‌بدوڵڵا پێشتر هاوسه‌ره‌که‌ی مرد بوو، بۆیه سه‌عید پێی وت: ئاخۆ ژنێکی دیکه‌ت نه‌هێناوه؟

عه‌بدوڵڵا وتی: خودا ڕه‌حمت پێ بکات کێ ژنم ده‌داتێ؟!! من که دوو یان سێ درهه‌م زیاترم نییه. سه‌عید ده‌یزانی که عه‌بدوڵڵا خاوه‌ن باوه‌ڕه و ڕه‌فتاری باشه، بۆیه کچه‌که‌ی خۆی لێ ماره‌بڕی له‌سه‌ر ئه‌و دوو یان سێ درهه‌مه‌ی که هه‌یبوو، به‌و شێوه‌یه سه‌عید له خوازبێنکاری هه‌ژاری هه‌ڵبژارد به سه‌ر کوڕه پاشایه‌کی جێگره‌وه و ده‌وڵه‌مه‌ند دا..!!

عه‌بدوڵڵا خۆی ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: پاش ئه‌وه که کچه‌که‌ی لێ ماره بڕیم، نه‌مده‌زانی چیبکه‌م له خۆشیدا؟!! بیرم ده‌کرده‌وه له کێ وه‌رگرم و له کێ قه‌رز بکه‌م؟ ئێواره داهات، نوێژی شێوانم کرد و گه‌ڕامه‌وه بۆ ماڵه‌که‌م، چراکه‌م داگیرساند و نان و زه‌یتم هێنا بۆ ئه‌وه‌ی ڕۆژووه‌که‌می پێ بشکێنم.. له‌و کاته‌دا بوو که له ده‌رگا درا..! وتم: کێیه له ده‌رگا ئه‌دات؟

وتی: سه‌عیدم.

له‌و ساته‌دا بیرم له هه‌موو مرۆڤێك کرده‌وه که ناوی سه‌عید بوو، بێجگه له سه‌عیدی کوڕی موسه‌یب، چونکه سه‌عید ماوه‌ی چل ساڵه له نێوان ماڵه‌که‌ی خۆی و مزگه‌وتدا نه‌بێت نه‌بینراوه، چوومه ده‌رێ ده‌بینم ئه‌وه سه‌عیدی کوڕی موسه‌یبه!! وتم: ئه‌ی ئه‌با موحه‌ممه‌د ئه‌گه‌ر بتناردبا به شوێنمدا ئه‌وا من ده‌هاتمه خزمه‌تت.

وتی: نه‌خێر. تۆ شایانتری من بێمه لات.

وتم: فه‌رمانت به چییه؟

وتی: تۆ پیاوێکی سه‌ڵت بوویت و ژنت هێنا، پێم باش نه‌بوو که ئه‌م

شه‌و خۆت به‌ ته‌نهابیت، ئه‌مه‌ ژنه‌که‌ته‌. پاشان ده‌ستی کچه‌که‌ی گرت و به‌ره‌ و ده‌رگاکه‌ ڕه‌وانه‌ی کرد، کچه‌که‌ هێنده‌ به‌ شه‌رمه‌وه‌ هاته‌ ژووری.. که‌وت!! سه‌عید کچه‌که‌ی لای من جێهێلا و خۆی گه‌ڕایه‌وه‌، منیش به‌ره‌و ئه‌و قاپه‌ ڕۆشتم که‌ نان و زه‌یته‌که‌ی له‌سه‌ر بوو، خستمه‌ په‌نای سێبه‌ری چراکه‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی کچه‌که‌ نه‌یبینێت، پاشان چوومه‌ سه‌ربان و بانگی دراوسێکانم کرد و هاتن، به‌سه‌رهاته‌که‌م بۆ گێڕانه‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی ئاگاداربن، به‌ زوویی هه‌واڵه‌که‌ گه‌شته‌ دایکم، هات و پێی وتم: ڕووم له‌ ڕووت حه‌رام بێت ئه‌گه‌ر ده‌ست له‌م بووکه‌ بده‌یت، هه‌تا سێ ڕۆژان تێده‌په‌ڕن و بووکه‌که‌ ئاماده‌ ده‌بێت.

سێ ڕۆژه‌که‌ گوزه‌شت.. له‌ خێزانه‌که‌م نزیك بوومه‌وه‌، ده‌بینم ئه‌مه‌ له‌ جوانترینی ئافره‌تانه‌!! له‌ هه‌موویان زیاتر قورئانی ده‌رخه‌ و زاناترینیانه‌ به‌ سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) و شاره‌زاترینیانه‌ به‌ مافی مێرد!!

ماوه‌ی مانگێك له‌ لام مایه‌وه‌، له‌و ماوه‌دا نه‌ من چوومه‌ لای سه‌عید و نه‌ سه‌عید هاته‌ لای من، پاشان ڕۆشتم بۆ لای له‌ مزگه‌وتدا خه‌ریکی ده‌رس وتنه‌وه‌ بوو، سه‌لامم کرد و وه‌ڵامی دامه‌وه‌، ئیتر هیچی نه‌وت تا لامان چۆڵ بوو، ئه‌و کاته‌ وتی: حاڵی کچه‌که‌م چۆنه‌؟

وتم: زۆرباشه‌ ئه‌ی ئه‌با موحه‌مه‌د، ئه‌وه‌یه‌ که‌ هاوڕێ پێی خۆشه‌ و دوژمن به‌ دڵی نییه‌.

ئیدی ڕۆشتمه‌وه‌ بۆ ماڵ و.. بیست هه‌زار درهه‌میشی بۆ ناردم!![1]

## پێداویستییه‌کان

سیری سه‌قه‌تی (رحمه الله) ده‌ڵێت: هه‌مووی دنیا هی تۆ بێت، بێ که‌ڵکه‌.. ئه‌گه‌ر له‌م پێنج شته‌ زیاتر بۆ خۆت بهێڵیته‌وه‌: نانێك تێرت بکات، ئاوێك تینوێتیت بشکێنێت، پۆشاکێك داتبپۆشێت، ماڵێك تێیدا نیشته‌جێ ببیت و.. زانستێك کاری پێ بکه‌یت.[2]

(١) (الف قصة و قصة/٧٧ـ٧٩)
(٢) (صفة الصفوة/٤٤٧)

## ئەم لاوە لەمن ئاقڵتر بوو

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (رضي الله عنهما) دەڵێت: کاتێـک کە پێـغەمبەر (علـيه الصلاة والسلام) وەفـاتی کـرد.. وتم بە یەکێ لە ئـەنسـارەکان: وەرە با پرسـیار لەهـاوەڵان بکەین، چونکە ئـەمڕۆ ئـەوان زۆرن. وتی: کارت سـەیرە..! وادەزانیـت کە خەڵـك پێویسـتیان بە تـۆ دەبێت، کاتێـك هـاوەڵانی پێغەمبەریان لەنـاودایە؟!

ئیدی وازم لێ هێنـاو دەسـتم کـرد بە پرسـیارکردن لە هـاوەڵان، هـەواڵی هـەر پیاوێکم پێ گەشـتبا، دەڕۆشـتمە بـەردەرگاکەی، ئـەگـەر خەوتبـا، پۆشـاکێکم دادەخسـت و لەبەر دەرگـاکەی دادەنیشـتم تـا بێـدار دەبـوویەوە، " بـا " تـۆز و خـۆڵی دەکـرد بە سـەر و چاومدا، کاتێـك پیـاوەکە بێـدار دەبـوویەوە و دەهـاتە دەرێ و بەو حـاڵەوە دەیبینیم.. دەیـوت: ئـەی ئـامـۆزای رسـول الله (ﷺ) چـی تـۆی هێنـاوە بـۆ ئـێرە؟ بتناردبـا بەشـوێنمدا مـن دەهـاتمە خزمـەتت. منـیش دەمـگوت: شـتی وا نـابێت.. ڕەواتـرە مـن بێمـە خزمـەتت. پاشـان پرسـیاری فـەرمـوودەکـەم لێدەکـرد و زانسـتەکـەم لێ وەردەگـرت، ڕۆژان تـێـپەڕین و پـیاوە ئـەنسـارییەکە ژیـا، هـەتا منی دی خـەڵکی لێم کـۆ بـوو بـوونـەوە و پرسـیاریان لێدەکـردم، ئـەوکـات پیاوەکـە وتی: بـەڕاستی ئـەم لاوە لـە مـن ئـاقڵتر بـوو.[1]

## تاریکی شـەوان

خەلەفی کوڕی سـالم (رحمه الله) دەڵێـت: لە مـەککە.. کەسـێك هـەبـوو کە بە شـێتیان لە قـەڵـەم دەدا، پێم وت: تـۆ کاتێـك شـەوانە دەچـیتە گـۆڕسـتان، لە تـاریکی ناتـرسیت؟! وتی: ئـەگـەر بـترسـم بـیری تـاریکی و سـەختی نـاو گـۆڕ دەکـەمـەوە. وتـم: ئـەی ئـەگـەر شـتێـکت بـینی و تـرسـانـدیتی؟! وتـی: تـرسـی ئـاخـیرەت.. تـرسی دنیام بـیر دەبـاتـەوە.[2]

(١) (الف قصة و قصة/٨٣)
(٢) (مجموعة رسائل ابن الجوزی/٢٤٤)



## تەنیا پەنجەیەکت!

ئیبن سـیریـن دەڵێـت: لە گومـەزێکی ئەبـو عوبـەیدەی کـوڕی ئـەبی حـوزەیفـە دانیشـتبوویـن، ئـاگردانێـك لەبـەر دەسـتیدا بـوو، پیاوێـك هـات بـۆ لای و لـەسـەر فـەرشـەکـەیـدا لـە تەنیشـتییەوە دانیشـت، بـە چپـەوە شـتێکی پێوت ئـێمە نـەمـانـزانی چـی بـوو؟! ئەبـو عوبـەیدە پێـی وت: پـەنجـەیـەکتم بـۆ بخە سـەر ئـەم ئـاگـرە!! پیاوەکـە وتـی: سـبحان الله..!! فـەرمانـم پێدەدەیت پـەنجـەیـەکم بخەمە سـەر ئەم ئـاگـرە؟! ! ئـەبـو عوبـەیـدەش ( رَحِمَهُ اللهُ ) وتـی: تـۆ ئـەوەنـدە ڕژدیـت کـە پـەنجـەیـەکـت نـاسـوتێنی بـۆمن بـە ئـاگـری دنیا، بـەڵام لـەولاشـەوە داوام لێدەکـەیـت کـە مـن هـەمـوو جـەسـتەم بخـەمـە ئـاگـری دۆزەخـەوە بـۆ تـۆ.. بـەڕاسـتی سـەیـرە!!

مـوحەممەد دەڵێـت: هـەستم کـرد کـە داوای حـوکـمـدانـێکی لێکـردبێ، دادوەرانە نـەبـووبێـت.[١]

## پەرژینی پایتەخت

یـەکێـك لـە والییەکان نـامـەیـەك دەنـێرێـت بـۆ خـەلیفـە عـومـەری کـوڕی عـەبدولعەزیـز و داوای لێدەکـات پارەی بـۆ بـنێرێـت، بـۆ ئـەوەی شـوورایـەك بـە دەوری پـایـتەختی ویـلایـەتـەکـەیدا دروسـت بکـات، عـومـەر ( رَحِمَهُ اللهُ ) لـە وەڵامیـدا دەڵـێت: دەی شـوورا سـوودی چـییە؟! بـە دادپـەروەری پـەرژینی پـایـتەختـەکـەت بکـە و ڕێگـاکـانی لـە زوڵـم پـاك بکـەوە.

## نـیەتی قسـەکـردن!!

عەمـری کـوڕی زەڕ دەڵێـت: جـاری وا هـەبـوو دەیانـوت بە ئیبراهیـی تەیمـی: قسـەمـان بـۆ بکە. ئیبراهیم ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەیـوت: نـیەتی قسـەکـردنم نـەهێـناوە.[٢]

---

(١) (ألف قصة و قصة/٨٤)

(٢) (من روائع اقوال الصالحين:ج٢٩/١).



## خودایا دڵخۆشیان بکه

ئیبراهیمی کوڕی ئه‌تره‌ش ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: مه‌عروفی که‌رخی له که‌نار ڕووباری دیجله دانیشتبوو، کۆمه‌ڵێکی تازه پێگه‌شتوو له‌ناو به‌له‌مێکدا به به‌رده‌مماندا تێپه‌ڕیان کرد، ڕایانده‌بوارد و شه‌رابیان ده‌خوارده‌وه، هاوه‌ڵه‌کانی پێیان وت: نابینی ئه‌وانه له‌ناو ئاوه‌که‌دا سه‌رپێچی خودا ده‌که‌ن؟ دۆعایان لێ بکه!

مه‌عروف (رَحِمَهُ اللَّهُ) ده‌ستی به‌رز کرده‌وه بۆ ئاسمان و وتی: ئیلاهی، ئه‌ی گه‌وره‌م.. داوات لێ ده‌که‌م وه‌ك چۆن له‌م دنیادا دڵخۆشت کردوون، ئاوه‌هاش له به‌هه‌شتا دڵخۆشیان بکه‌یت!!

هاوه‌ڵه‌کانی پێیان وت: ئێمه پێمان وتیت دۆعایان لێ بکه، نه‌ك دۆعایان بۆ بکه!! مه‌عروف وتی: ئه‌گه‌ر له ئاخیره‌تا خوا دڵخۆشیان بکات، واته هه‌ر له دنیادا تۆبه ده‌که‌ن و خوا لێیان خۆش ده‌بێت، ئه‌وه‌ش هیچ زیانێك به ئێوه ناگه‌یه‌نێت.[1]

## دڵنیا مه‌به له خۆت

ئه‌بوبه‌کری شیبلی (رَحِمَهُ اللَّهُ) ده‌ڵێت: هیچ وه‌خت له نه‌فسی خۆت دڵنیا مه‌به، ئه‌گه‌ر به پیاده به‌سه‌ر ئاویشدا بڕۆیت..!! هه‌تا له دنیای غروره‌وه سه‌فه‌ری ئه‌به‌دی نه‌که‌یت بۆ دنیای ئه‌مان.

## مه‌حه‌به‌ت

یه‌حیای کوڕی مه‌عاز (رَحِمَهُ اللَّهُ) ده‌ڵێت: هه‌قیقه‌تی مه‌حه‌به‌ت.. نه به‌هۆی چاکه‌ی مه‌حبوبه‌وه زیاد ئه‌کات و نه به‌هۆی سزاکانیشیه‌وه که‌م ده‌کات.

---

(١) (صفة الصفوة/٤٢٤)

## جێگای پاره‌کانم ده‌زانن!

خه‌بابی کوڕی ئه‌ره‌ت (ﷺ) پاش ته‌مه‌نێك له‌ هه‌ژاری.. له‌ کۆتاییه‌کانی ته‌مه‌نیدا ده‌وڵه‌مه‌ندی و خۆشگوزه‌رانی ڕووی تێ کرد و بوویه‌ خاوه‌نی ئاڵتون و زیوێك که‌ پێشتر خه‌ونیشی پێوه‌ نه‌بینی بوو..!! به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا به‌ شێوازێك به‌کاری ده‌هێنا که‌ به‌ خه‌یاڵی که‌سدا نه‌یه‌ت..!!

خه‌باب درهه‌م و دیناره‌کانی له‌ شوێنێکی ماڵه‌که‌یدا دانا بوو، که‌ ئه‌وانه‌ی پێویستیان پێی بوو له‌ هه‌ژاران و نه‌داران، ده‌یانزانی له‌ کوێدایه‌..!! شوێنێك بوو.. نه‌ شاراوه‌ بوو، نه‌ قوفڵێکی بۆ دانرا بوو.

هه‌ژاره‌کان کاتێك پێویستیان به‌ پاره‌ هه‌بووایه‌، ده‌چوونه‌ ماڵه‌که‌ی خه‌باب و چه‌ندیان بویستایه‌ ده‌یانبرد، به‌بێ هیچ پرس و مۆڵه‌تێك..!! له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا خه‌باب له‌ ترسی ئه‌وه‌دا بوو، که‌ لێپرسینه‌وه‌یه‌کی سه‌ختی ئه‌و سه‌روه‌ته‌ی لێ بکرێت و به‌ هۆیه‌وه‌ ئازار بچێژێت.

له‌ کاتی سه‌ره‌مه‌رگیدا کۆمه‌ڵێك له‌ هاوه‌ڵه‌کانی چوونه‌ سه‌ردانی، خه‌باب پێی وتن: ئا ئه‌و شوێنه‌.. هه‌شتا هه‌زار درهه‌می تێدایه‌، سوێندبێت به‌ خوا هه‌رگیز نه‌ شاردوومه‌ته‌وه‌، نه‌ ده‌رۆزه‌که‌رێکم لێ بێبه‌ش کردووه‌، پاشان ده‌ستی کرد به‌ گریان..!! پێیان وت: بۆچی ده‌گریه‌یت؟!

وتی: بۆ ئه‌وه‌ ده‌گریه‌م.. چونکه‌ هاوه‌ڵه‌کانم ڕۆشتن و له‌م دنیایه‌دا هیچ پاداشتێکیان وه‌ر نه‌گرت بۆ کاره‌کانیان، منیش مامه‌وه‌ و ئه‌م سه‌روه‌ته‌م ده‌ست که‌وت، ده‌ترسم پاداشتێك بێت بۆ کرده‌وه‌کانم..!![1]

## شکۆی نه‌فس

ئیمامی شافیعی (رحمه الله) ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر بمزانیبا ئاوی سارد له‌ شکۆمه‌ندی و جوامێریم که‌مده‌کاته‌وه‌.. نه‌مده‌خوارده‌وه‌.[2]

(١) (صور من حياة الصحابة/٤١٧ ـ ٤١٨)
(٢) (أين نحن من هؤلاء: ج٣/١٦١)

## چی لە ماڵی دنیا دەکەن؟!

ئەیوبی کوڕی وائلی ڕاسبی دەڵێت: چوومە مەدینە، دراوسێیەکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ﷺ) هەواڵی پێدام کە: ڕۆژێکیان عەبدوڵڵا لە لایەن معاویەوە چوار هەزار و.. لە لایەن کەسێکی دیکەوە چوار هەزاری تر و.. لە لایەن کەسێکی ترەوە دوو هەزار و قوماشێکی قەیفەی بۆ هات، بۆ ڕۆژی دواتر عەبدوڵڵام بینی لە بازاڕ ئالیکی بۆ وڵاخەکەی دەکڕی بە قەرز..!! منیش دەمزانی کە چی بۆ هاتووە، بۆیە چووم بۆ لای خێزانەکەی و پێم وت: دەمەوێ پرسیاری شتێکت لێ بکەم و پێم خۆشە ڕاستییەکەیم پێ بڵێیت. وتی: فەرموو بپرسە.

وتم: باشە ئایا ئەبا عەبدولڕەحمان لە لایەن معاویەوە چوار هەزار و.. لە لایەن کەسێکی دیکەوە چوار هەزاری تر و.. لە لایەن کەسێکی ترەوە دوو هەزار و قوماشێکی قەیفەی بۆ نەهات؟! وتی: بەڵێ وابوو. وتم: دەی ئەمڕۆ لە بازاڕ بینیم ئالیکی بۆ وڵاخەکەی دەکڕی، بە درهەمێکی قەرز! خێزانەکەی وتی: ئەو نەخەوت هەتا هەموو پارەکەی بەخشییەوە، دواتر قەیفەکەی دا بەشانیدا و ڕۆشتە دەر، بەخشی بە هەژارێك و پاشان گەڕایەوە..!

منیش وتم: ئەی دەستەی بازرگانان.. ئەوە ئێوە چی لە دنیا دەکەن؟!! ئەوە ئیبن عومەرە دە هەزار درهەمی بۆ دێت و شەو ناخەوێت تا دەیبەخشێتەوە، بۆ بەیانییەکەشی بایی درهەمێکی قەرز.. ئالیك بۆ وڵاخەکەی دەکڕێت..!![1]

## گریان لە مزگەوت

موحەممەدی کوڕی زیاد دەڵێت: بینیم پیاوێك لە مزگەوت، لە سوجدەدا دەگریا و دەپاڕایەوە، ئەبو ئومامەی باهلی (ﷺ) هات و بە پیاوەکەی وت: ئەگەر ئەم گریان و ئەحواڵەت لە ماڵەوە بووایە زۆر باشتر بوو بۆت.[2]

---

(١) (عبدالله بن عمر/١٩٥ ـ ١٩٦)
(٢) (منجد الخطيب: ج١١/١)



## مردووێک خانوویەکی لە مردووێک کڕی!

پیاوێک هاتە خزمەتی ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبو طالب (عليه السلام) و پێی وت: خانوویەکم کڕیوە و دەمەوێ بە دەست و خەتی خۆت گرێبەستی کڕینەکەم بۆ بنووسیت.

ئیمامی عەلی سەیرێکی ڕوخساری پیاوەکەی کرد و بینی دنیا چوار مشقی لەسەر عەرشی دڵی پیاوەکە دانیشتووە، بۆیە ئیمامی عەلی ویستی دەرسێکی بدات و خوای گەورەی بیر بخاتەوە، قەڵەمی گرت بە دەستییەوە و نووسی:

بِسمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم..

مردووێک خانوویەکی لە مردووێک کڕی..!! کە دەکەوێتە شاری گوناهباران و ڕێگای غافلان و چوار سنوری هەیە.. سنوری یەکەمی بە مردن کۆتایی دێت!! سنوری دووەمی بە گۆڕی تار کۆتایی دێت!! سنوری سێیەمی بە لێپرسینەوە کۆتایی دێت!! سنوری چوارەمیشی یاخود بە بەهەشت، یاخود بە دۆزەخ کۆتایی دێت!![1]

## بەخشین بەر لە داواکردن

مەهدی کوڕی سابق دەڵێت: ڕۆژێک برازایەکی موحەممەدی کوڕی سوقە ( رحمه الله ) هات و داوای شتێکی لێکرد، موحەممەد دەستی کرد بەگریان..!! برازاکەی پێی وت: مامە گیان.. وەڵڵاهی بم زانیبا داواکردنەکەم دەتگریێنێت داوام لێ نەدەکردیت. موحەممەد وتی: بۆ داوا کردنەکەت ناگریەم.. بەڵکو بۆ ئەوە دەگریەم کە بەر لەوەی تۆ بێیت و داوای بکەیت، من بێ ئاگا بووم و دەست پێشخەریم نەکرد تا پێت ببەخشم!![2]

(١) (أنيس المؤمنين/٤٦)
(٢) (صفة الصفوة/٥٦٩)

## ئایا بۆ مێشێك بجوڵێمەوە؟!

پرسیاریان کرد لە خەلەفی کوڕی ئەیوب ( رحمه الله ) ئایا مێش ئەزیەتت ناکات لە نوێژەکانتا، وا دەریان ناکەیت؟! خەلەف وتی: نامەوێت خوو بە شتێکەوە بگرم کە نوێژەکەم لێ بشێوێنێت. وتیان: ئەدی چۆن ئارام دەگریت لە سەری؟! وتی: پێم گەشتووە کە دووڕووەکان لەژێر قامچی سوڵتانەکاندا ئارام دەگرن، ئیدی بە شانازی پێوە کردنەوە دەڵێن: بەڕاستی فلان کەس خۆڕاگرە! دەی منیش لە بەردەم پەروەردگاردا دەوەستم، ئیتر چۆن بۆ ئەزیەتی مێشێك بجوڵێمەوە!![1]

## لەمڕۆ دڵت مەشغوڵ کردم!!

هارونی کوڕی عەبدوڵڵای حەممال، دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ( رحمه الله ) هاتە سەردانم، تەقولبابی کرد و وتم: ئەوە کێیە؟

وتی: منم ئەحمەد. ئیدی خێرا ڕۆشتمە دەرێ بۆ خزمەتی و سەلاممان لە یەکدی کرد و پێم وت: ئەی ئەبا عەبدوڵڵا.. فەرمان بکە، من لە خزمەتی تۆدام. وتی: ئەمڕۆ دڵت مەشغوڵ کردم..!! وتم: بە چشتێك ئەی ئەبا عەبدوڵڵا؟! وتی: ئەمڕۆ تێپەڕم کرد بە لاتا، خۆت لە سێبەردا دانیشتبوویت فەرمووودەت ئەگێڕایەوە بۆ خەڵك و، خەڵکەکەیش لەبەر هەتاوەکەدا دانیشتبوون و دەفتەر و قەڵەمیان بە دەستەوە بوو، جارێکی دیکە ئەو کارە مەکە، ئەگەر دانیشتیت.. لەگەڵ خەڵکیدا دابنیشە و خۆت جیا مەکەوە.[2]

(١) (والثمن الجنة/٤٠)
(٢) (التصنيف الموضوعي لتاريخ بغداد/٥٥٤)

## له ڕێگەتا کێت بینی؟!

وتیان بە عەبدولواحیدی کوڕی زەید: لەم ڕۆژگارەی خۆتا پیاوێك دەناسیت، که سەرقاڵ بوون بە حاڵی خۆیەوە، خەڵکی بیر بردبێتەوە؟!
عەبدولواحید وتی: کەس ناناسم.. پیاوێك نەبێت، ئێستا دێته لاتان! ئیدی زۆری نەبرد، هەتا.. عوتبەی غولام (رحمه الله) هاته ژوورەوە، عەبدولواحید لێی پرسی: له کوێوه هاتیت ئەی عوتبه؟
عوتبه وتی: له فڵان ڕێوه هاتم. (که ڕێگایەك بوو به ناو قەرەباڵغی بازاڕدا لێوەی هاتبوو) عەبدولواحید پێی وت: کێت بینی له ڕێگەتا؟ عوتبه وتی: کەسم نەبینی!![1]

## هێشویەك ترێ و.. سواڵکەرێك

نافع دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) نەخۆش کەوت.. ئارەزووی ترێی کرد و بایی درهەمێك ترێیان بۆ کڕی، هەژارێك هاته بەر دەرگاکەی، عەبدوڵڵا وتی: هانێ ترێکەی بدەنێ..!! پێیان دا، کەسێك ڕۆشت ترێکەی له هەژارەکە کڕییەوە بە درهەمێك و بۆی هێنایەوە، هەمدیس هەژارەکە هاتەوە بۆ سواڵکردن، عەبدوڵڵا دووبارە وتی: هانێ ترێکەی بۆ بەرن!! جارێکی دیکە کەسێك ڕۆشتەوە ترێکەی له سواڵکەرەکە کڕییەوە به درهەمێك، سواڵکەرەکە ویستی ئەمجاریش بگەڕێتەوە بەڵام نەیانهێڵا، وە ئەگەر عەبدوڵڵا بیزانیبا سواڵکەرەکەیان گەڕاندۆتەوە، ئەوا تامی ترێکەی نەدەکرد.[2]

(١) (إحياء علوم الدين ٣٩٩/٤)
(٢) (صفة الصفوة/٢٠٧)

## لە یادم نەچووە!!

وتیان بە جونەید (رحمه الله): بڵێ: لا إله إلا الله.
جونەید وتی: لە یادم نەچووە.. تا یادی بکەم.
جەریری دەڵێت: جونەید لە کاتی سەرەمەرگیدا قورئانی دەخوێند، منیش بە ڕاسەریەوە وەستا بووم و پێم وت: کەمێک بەزەییت بە خۆتا بێتەوە.
جونەید وتی: ئەی ئەبا موحەمەد. ئایا کەسێکت بینیوە لەم وەختەدا لە من زیاتر پێویستی بە قورئان هەبێت، ها ئەوەتا خەریکە نامەی کردەوەکانم دەپێچرێتەوە. جونەید خەتمی قورئانی کرد و پاشان دەستی کردەوە بە خوێندنی سورەتی (البقرة) حەفتا ئایەتی خوێند و.. نەفس و ڕۆحی پاکی گەڕایەوە بۆ خزمەت گەورەکەی.[1]

## کەسێك زیاتری پێداوم!

ڕۆژێك هەزار وشتری بارکراو گەشتە مەدینە..!! کە خورما و زەیت و مێوژی پێ بوو، خاوەنی بارەکەش عوسمانی کوڕی عەفان بوو (رضي الله عنه) بازرگانە گەورەکان هاتن بۆ کڕینی بارەکە و بۆ هەر درهەمێك دوو درهەم خێریان پێدا.. بەڵام عوسمان وتی: لەوە زیاتریان پێداوم.
وتیان: باشە بۆ درهەمێك پێنج درهەم خێرت دەدەینێ. عوسمان وتی: کەسێکی تر بۆ هەر درهەمێك دە درهەم خێری پێداوم..!! بازرگانەکان وتیان: مەدینە لە ئێمە زیاتر بازرگانی لێ نییە، دەی ئەو کەسە کێ یە؟! عوسمان پێی وتن: من هەموو بارەکەم فرۆشت بە خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە لای خوداش هەر چاکەیەك، یەك بە دە خێری هەیە!![2]

---

(١) (موسوعة الأحزان ج٢/٣٥٠ ـ ٣٥١)
(٢) (أنيس المؤمنين/٤٤)

## یەك ڕکات هەتا بەیانی

ئەبو بیشر دەڵێت: مەنسوری کوڕی موعتەمەر ( رحمه الله ) دراوسێیەکی ئافرەتی هەبوو، دوو کچی هەبوو، شەوان کە خەڵکی دەخەوتن ئەوان دەهاتنە سەربان، دوای مردنی مەنسور، شەوێك لە شەوان یەکێك لە کچەکان دەڵێت بە دایکی: دایە گیان.. ئەو کۆڵەکە چی لێهات کە لە سەربانی فڵان کەس دەمبینی؟! دایکیشی پێی دەڵێت: کچی شیرینم ئەوە کۆڵەکە نەبوو، بەڵکو ئەوە مەنسور بوو هەموو شەوەکەی لە ڕکاتێکدا زیندوو دەکردەوە!![1]

## شێخێك شانێکی لێدام!

فەتحی کوڕی شەخرەف دەڵێت: پیاوێکی کەڵەگەت، پەلاماری ئافرەتێکی دا و باوەشی پیاکرد..!! چەقۆیەکی بە دەستەوە بوو، هەر کەس لێوەی نزیك دەکەوتەوە بریندارى دەکرد، ئافرەتەکەش لە دەستی هاواری دەکرد..!! لەو کاتەدا بیشری حافی ( رحمه الله ) بەو ناوەدا تێپەڕی، لە پیاوەکە نزیك بوویەوە و شانی دا لە شانی پیاوەکە.. ئیدی پیاوەکە کەوتە سەر زەوی و بیشر ڕۆشت!! خەڵکەکە نزیك بوونەوە لێی، دەبینن پیاوەکە خەریکە ئارەقێکی زۆر دەکات، ئافرەتەکەش ڕزگاری بوو و، ڕۆشت بە دەم کاری خۆیەوە. لە پیاوەکەیان پرسی: حاڵت چۆنە؟! وتی: نازانم..! بەڵام شێخێك هات، شانێکی لێدام و پێی وتم: وریابە خودا سەیری خۆت و کردەوەکانت دەکات. ئیدی ئەو قسەیە قاچەکانی بێ هێز کردم و ترسێکی زۆر هاتە دڵمەوە، ناشزانم ئەو شێخە کێ بوو؟! وتیان: ئەوە بیشری کوڕی حاریس بوو. پیاوەکە وتی: وای لە حاڵی خراپم! ئیدی لەمڕۆ بەدواوە چۆن سەیری بکەم؟!

ئیدی هەر لەو ڕۆژەدا پیاوەکە تووشی لەرزوتاییێك هات و لە ڕۆژی حەوتەمدا.. کۆچی دوایی کرد.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٥٦٧)

(٢) (إحياء علوم الدين ٢/٣٣٥)

# گەوهەری بەنرخ

ڕۆژێــك مــوحەممەدی كــوڕی ئیســـماعیل ناســـراو بە ئیمامــی بــوخاری لە ســـــەردەمی گەڕانـــی بە دوای فەرمـــوودەی رســـول الله دا (ﷺ) ســـــواری كەشـــتییەك بــوو، كیســــەیەكی پــڕ لە پــارەی پــێ بــوو، كە هـــەزار دینـاری تێـدا بــــوو، یەكێـــك لە پیـاوانی كەشــــتییەكە هـــات بـــۆ لای ئـــیمام و ســــۆز و خۆشـــەویســتی خــۆی بــۆ دەربــڕی، وە زۆر خــۆی لێ نــزیك كــردەوە و كاتــەكانی لەگەڵـدا بەســــەر دەبــرد، كاتێــك ئــیمام بوخـاری ســــۆز و خــۆشـــەویســـتی پیـاوەكەی بینـی.. ئـەمیش ســـۆزی بـــۆی جـوڵاو حەزی بە هـــاوڕێتی كــرد، كـار گەشــــتە ئـــەوەی كە لە دوای چەنـد دانیشـــتنێكیان، پیـاوەكە بـــوویـــە جێـــی متمانەی ئیمام و باســی هــەزار دینارەكەی بــۆ كـرد.

ڕۆژێكیان هـاوەڵەكەی كاتێـك لەخەو بێـدار بـوویەوە، دەســتی كـرد بە گـــریان و هـــاوار!! بـــەرگی خـــۆی دەدڕی و لە ڕوخســـاری خـــۆی ئـــەدا!! كاتێــك خەڵكـی پیاوەكەیـان بەوشـــێوەیە بینـی زۆر ســـــەریان ســـوڕما..!! وە دەســـتیان كــرد بە پرســـیاركـردن لێی دەربارەی ئـەو حـاڵە لە نـاكـاوەی، تـا هێـنایانە قســــەكـردن و وتی: من كیســــەیەكم هـەبـوو هـەزار دیــناری تێدا بــوو، ئێســتا دیـار نەمـــاوە و وون بـــووە!

ئیدی خـەڵكی دەسـتیان كـرد بـە گــەڕان بــەنـاو كـەشـتیـیـەكـەدا و یـــەك لـەدوای یــەك هـەمـــوو ســــەرنشـــینەكـانـیان دەپشـــكنی بـــۆ دۆزیـــنەوەی هــــەزار دیـنارەكـــە، لــەو كـاتـــەدا ئیمـــام بـوخـــاری ( رحمه الله ) كــە لــە نـــیازی خـــراپی پـیاوەكـــە تـێدەگـــات، نـاهـێڵــێت كـــەس پێـی بـزانــێت كیســــــەی پـــارەكـــــانی دەردەهـێـنـێــــت و فـــــڕێی دەداتـــــە نـــــاو دەریـــــــاكـــــەوە!! پـشـــكنەرەكـان گـەشـــتنە لای ئـیمام و بـە جـوانی پـشـــكنییان، ئـــەو دەمــەی كـــە ئـــیمام بـــوخـــاری و هـەمـــوو ســــەرنشـــینـەكـانی كەشـــتییەكـەیـــان پـشـــكنی و هیچـیان نـــەدۆزیـــیەوە، گـــەڕانـــەوە لای پیاوەكـــە و بـــە تـــوندی لـــۆمـــە و ســــەركـــۆنـــەیان كـرد.

گـەشـــتەكە كـــۆتـایی هـات و خـەڵكەكـە لـە كەشـــتییەكە دابـــەزیـن، پیـاوەكە هـاتـە لای ئیمام بـــوخـاری و پـرســـیاری لـێ كــرد كە چـی كــردووە بـــە هـــــەزار دینارەكـەی؟! ئـیمام پێی وت: فـڕێـم دایـە نـاو دەریـاكـەوە!!

پیاوەكە وتی: دەی چـــۆن بـەرگـــەی لـەدەســـتدانی ئـــەو بـــــڕە پـــارە زۆرەت گـــرت؟! ! ئـیمام پێی وت: ئـەی نـــەفام..!! ئـایا نـازانی مـــن هـەمـــوو تـەمـەنـم لـــە پـێـنـاو كـــۆكـردنـــەوەی فـەرمـــوودەی رســـول الله دا (علیه الصلاة والسلام)

بەسەر بردووە؟! وە بوومەتە جێی متمانە و بڕوای هەموو خەڵکی؟! ئیدی چۆن خۆم ڕووبەڕووی تۆمەتی دزیکردن دەکەمەوە، وە ئایا ئەو گەوهەرە بەنرخەی "متمانە و دادپەروەری" کە لەتەمەنمدا بە دەستم هێناوە، بۆ چەند دینارێك لە دەستی خۆمی ئەدەم؟! ! هەرگیز!![1]

## چ دڵ خۆشییەك؟!

ڕۆژێك دەڵێن بە عوسمانی كوڕی عەفان (رضي الله عنه): لە فڵان شوێن كۆمەڵێك دانیشتوون و خەریکی مەشروب خواردنەوەن، بڕۆ فریایان بکەوە. ئەویش لەگەڵ کەسانێکدا دەڕوات، کاتێك دەگاتە شوێنەکە، دەبینێت مەشروب خۆرەکان لەوێ نەماون، ئیدی ئیمامی عوسمان زۆر دڵ خۆش دەبێت بەوەی کە لەوێ نەماون! زۆر دڵ خۆش دەبێت بەوەی کە خوای گەورە ئابڕووی نەبردوون و گوناهەکەی پەردەپۆش کردوون، هەر بەو بۆنەیەوە بەندەیەك ئازاد دەکات.

## وادەمان فیردەوس بێت!

عەونی کوڕی جەریر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوێم لە باوکم بوو دەیگوت: سەلەمەی کوڕی دینار (رحمه الله) کاتێك میوەی دەبینی، هەرچەندە حەزیشی لێ دەکرد، بەڵام نەیدەخوارد و بە میوەکەی دەگوت: وادەمان فیردەوس بێت.[2]

(١) (ألامام البخاري أستاذ ألأستاذين/ ٦٩ ــ ٧٠)
(٢) (صفة الصفوة/٣٥٥)

## له‌ی خوا له کوێیه‌؟!!

عه‌بدوڵڵای کوڕی دینار ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ردا ڕۆشتینه ده‌رێ به‌ره‌و شاری مه‌ککه.. شه‌وێکی دره‌نگ کوڵ و بارمان خست بۆ پشوودان، شوانێك له شاخێکه‌وه ڕوو به ئێمه هاته خواره‌وه.

عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر (رضي الله عنهما) پێی وت: تۆ شوانیت؟ وتی: به‌ڵێ.

عه‌بدوڵڵا وتی: له‌م مه‌ڕوماڵاته، بزنێکم پێ بفرۆشه. شوانه‌که وتی: من به‌نده‌م و ئه‌م مه‌ڕوماڵاته‌ش هی گه‌وره‌که‌مه.

عه‌بدوڵڵا ویستی له خۆپارێزی شوانه‌که ئاگادار بێت، بۆیه پێی وت: ئێ باشه بڵێ به گه‌وره‌که‌ت، گورگ بزنه‌که‌ی خوارد.

شوانه‌که وتی: ئه‌ی خوا له کوێیه؟! !

عه‌بدوڵڵاش وتی: ئه‌ی خوا له کوێیه؟! !

پاشان عه‌بدوڵڵا ده‌ستی کرد به‌گریان، دواتر ڕۆشت شوانه‌که‌ی له گه‌وره‌که‌ی کڕی و ئازادی کرد، وه مه‌ڕوماڵاته‌که‌شی بۆ کڕی و پێی به‌خشی.[١]

## خۆپارێزی مامۆستا

شه‌قیقی به‌ڵخی ده‌ڵێت: پۆشاکێکم به دیاری پێشکه‌شی سوفیانی سه‌وری کرد، به‌ڵام لێی وه‌ر نه‌گرتم! منیش پێم وت: ئه‌ی ئه‌با عه‌بدوڵڵا. خۆ من له‌وانه نیم که فه‌رمووده‌ت لێوه فێر ده‌بن، ئیتر بۆچی لێم وه‌رناگریت؟!

سوفیان (رحمه الله) وتی: ئه‌وه ده‌زانم، به‌ڵام بیرت نه‌چێت براکه‌ت یه‌کێکه له فێرخوازه‌کانم، بۆیه ده‌ترسم دیارییه‌که‌ت لێ وه‌رگرم و له‌ناو هاوکاره‌کانیدا زیاتر دڵم نه‌رم ببێت بۆ براکه‌ت..!![٢]

(١) (مواقف بكى فيها الرسـول/ ٦٥)
(٢) (إحياء علوم الدين ٣/٣٣٣)



## خۆشترین چێژی دنیا

وتیان بە خالدی کوڕی وەلید: گەورەترین و خۆشترین چێژی دنیات کامەیە؟ خالد (ﷺ) وتی: وەڵلاهی خۆشترین چێژ لەلام شەوێك بوو لە یەرمووك.. کاتێك هەموو سوپاکە بە هۆی ماندوێتی و هیلاکییەوە خەویان لێکەوتبوو، ڕۆشتم ژنەکەمم بێدار کردەوە و پێم وت: ئایا شەوێکت دەوێت لە شەوەکانی بەهەشت؟! ژنەکەم وتی: بەڵێ.

وتم: دەی هەستە با ئێشکی ئەم سوپایە بگرین!! ئیدی هەستا و دەستنوێژمان گرت لە شەوێکی زستاناویدا، بێجگە لە خودا کەس نازانێت چەندە سارد بووە؟!! خەڵکی هەموو خۆیان داپۆشیبوو، پاشان هەستام پاسەوانی سوپاکەم کرد و، ئاسمان ڕەحمەتی بۆ دەباراندین، منیش لەو کاتەدا هەندێ لە هاوەڵانم دادەپۆشی کە جوان خۆیان دانەپۆشی بوو، دەسا بە خودا لەو شەوە خۆشترم نییە، لە چێژ و لەزەتی دنیادا!!

## هەر چییەکی بوێ هەر لەوە دەکات!

چوونە خزمەت ئەبوبەکری صدیق (ﷺ) ئەو دەمەی لە گیانەڵلادا بوو، پێیان وت: ئەی خەلیفەی رسول الله (ﷺ) سکاڵا لە دەست چی دەکەیت؟

وتی: لە گوناهەکانم.

وتیان: چیت دەوێ؟

وتی: لێخۆشبوونم دەوێ.

وتیان: دەڵێی چی پزیشکت بۆ بانگ بکەین؟

وتی: پزیشکم بینی.

وتیان: ئەی چی گوت؟

وتی: پزیشکەکەم فەرمووی: من هەر چییەکم بوێت، هەر ئەوە دەکەم![1]

(١) (أنیس المؤمنین/٣١)

## گەشـتێك بۆ باخەكانی خوراسـان

جەعفەری كوڕی سـولەیمان دەڵێت: سـابتی بونانی ( رحمه الله ) هێندە گـریا لە ترسـی خـوا، تـا بینـایی چـاوێكی لە دەسـت دا، پـزیشـكێكیان بـۆ هێنـا تـا چارەسـەری بكات، پزیشـكەكە وتی: چـارەسـەری چاوت دەكەم بـە مەرجێك گـوێڕایەڵـم بیـت. سـابت وتـی: ڕێنماییەكانـت چـین؟ پزیشـكەكە وتـی: نابێـت چیدی بگـریـەیت. سـابت وتـی: دەی چـاوەكانـم چ خـێرێكیـان هـەیـە ئەگـەر ئـەسـرین نـەڕێـژن؟!! ئیدی چارەسـەرەكەی وەرنـەگـرت.[1]

وە خـانـەوادەكـەی پێیان وت: دەتبەین بـۆ گەشـتێـك بە نـاو دارسـتانەكانی خـوراسـاندا، بەڵكو كە سـەوزایی و.. ئـاو دەبینیـت، بیناییـت بـۆ بگەڕێـتەوە. بـردیان.. باغـاتە چـڕ و پـڕ و دەوڵەمـەندەكانی خـوراسـانی دیـت، بێسـتان و بـاخچەی نـاوازە و جـوان، ئـاوی سـازگار و لەبـەر ڕۆشـتوو.. بـەڵام هـەر دیمەنێكـی قەشـەنگ و دڵـڕفێنی دەبینـی.. یـادێكی بەهـەشـتی دەكـرد و دەگـریـا! كاتێـك هـاتـنەوە بـۆ بەسـرە، وتیـان: گەشـتەكەت بە لاوە چـۆن بـوو؟

وتی: وەڵڵاهی هـیچ شـتێـك سـەرنـجی ڕانـەكێشـام لە گەشـتەكـەمـدا.. پـیرێـك نـەبێت، كە دیتم دووڕكات نـوێـژی چێشـتەنگاو دەكات..!!!

## دواسـاتەكان و.. گـومانی باش

مـوعتەمەری كـوڕی سـولەیمانی تەیمـی ( رحمه الله ) دەڵێـت: بـاوكم لە سـەرە مـەرگیدا وتی: ئـەی مـوعتەمەر.. باسـی كـردەوە باشـەكانم بـۆ بـكە، بـەڵكو بـە گـومانی باشـەوە بگـەم بـە خـزمـەتی پـەروەردگـارم.

ئـەوان پـێیان باشبوو كە.. ئـەو كەسـەی لە كـاتی گیانـەڵڵادایـە، باسـی ئـەو كـردەوە باشـانـەی بـۆ بكرێت كە كـردوونی، بـۆ ئـەوەی لـە دواسـاتـەكانـیدا گـومـانی باشـی بە خـوا هـەبێت.[2]

(١) (تهذيب حلية ألاولياء: ج١/٤٠٥)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/٧٨)



## لە شەرمان.. سەردانت ناکەن!

قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عەبادە (رضي الله عنهما) نەخۆش دەکەوێت و برا موسوڵمانەکانی دیار نابن سەردانی بکەن، قەیس هەواڵیان دەپرسێت، پێی دەڵێن: بە هۆی ئەو قەرزانەی کە داوتە بە لایانەوە، شەرم دەکەن بێنە سەردانت..!!

قەیس دەڵێت: خودا ئەو پارە ڕیسوا بکات.. کە ناهێڵێت براکانم بێنە سەردانم. پاشان فەرمان دەدات، جارچییەك جاڕی بۆ بدات و بڵێت: ئەوەی قەرزی قەیسی کوڕی سەعدی لەلایە.. گەردنی ئازادبێت. ئیدی تا ئێوارە پلەی نەخۆشییەکەی دادەبەزێت.. هێندە برایانی دەچنە سەردانی.[1]

## سەروەتەکەم غەمی پێداوم

سەعدی دەڵێت: تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (رضي الله عنه) هاتە لام، بینیم دڵتەنگ و غەمبارە، لێم پرسی: ئەوە چیتە؟! وتی: پارەکانم زۆر بوون و.. تووشی غەمیان کردووم. وتم: ئێ تۆ چیت لەسەرە؟ بیبەخشەوە! ئیدی تەڵحە پارەکانی بەخشییەوە، تایەك درهەمی لێنەمایەوە!!

وە تەڵحەی کوڕی یەحیاش دەڵێت: پرسیارم کرد لە خەزنەدارەکەی تەڵحە و پێم وت: پارەکەی چەند بوو؟ خەزنەدارەکەی وتی: پارەکەی تەڵحە (٤٠٠،٠٠٠) چوار سەد هەزار دینار بوو..!![2]

## بۆچوونی بەرامبەر

حاتەمی ئەصەم (رحمه الله) دەڵێت: دڵخۆش دەبم کاتێك ئەوەی گفتوگۆم لەگەڵدا دەکات بۆچوونەکانی ڕاست و دروست بن، وە دڵتەنگ دەبم کاتێك هەڵە دەکات.

---

(١) (إحياء علوم الدين ٣/٢٥٠)
(٢) (صفة الصفوة/١٢٥)

## سه‌رخۆشی یان پیرۆزبایی؟!

صیله‌تی کوڕی ئه‌شیه‌م (رحمه الله) خۆی و کوڕه‌که‌ی له‌ غه‌زایه‌کدا ده‌بن.. صیله‌ت به‌ کوڕه‌که‌ی ده‌ڵێت: ئه‌ی کوڕی شیرینم پێشکه‌وه‌ و بجه‌نگه‌، هه‌تا ئه‌گه‌ر شه‌هید بوویت له‌سه‌رت ئارام بگرم!! ئیدی کوڕه‌که‌ی به‌ دیار چاویه‌وه‌ ده‌جه‌نگێت هه‌تا شه‌هید ده‌بێت، پاشان صیله‌ت خۆیشی ده‌ڕواته‌ پێشه‌وه‌ و ده‌جه‌نگێت هه‌تا شه‌هید ده‌کرێت!! له‌ ماڵه‌وه‌ ئافره‌تان کۆده‌بنه‌وه‌ و ده‌چنه‌ لای مه‌عازه‌ی عه‌ده‌ویه‌ (خێزانه‌که‌ی صیله‌ت) بۆ پرسه‌ی کوڕه‌که‌ی و مێرده‌که‌ی، مه‌عازه‌ (رحمها الله) پێیان ده‌ڵێت: سڵاوتان لێ بێت، ئه‌گه‌ر بۆ پیرۆزبایی لێکردنم هاتوون ئه‌وا به‌خێربێن..!! وه‌ ئه‌گه‌ر بۆ شتێکی دیکه‌ی بێ له‌ پیرۆزبایی هاتوون، ئه‌وا بگه‌ڕێنه‌وه‌!![1]

## له‌وه‌ تۆ چی ده‌که‌یت؟!

عه‌مروی کوڕی موهاجر ده‌ڵێت: عومه‌ری کوڕی عه‌بدولعه‌زیز (رحمه الله) پێی وتم: ئه‌گه‌ر بینیمت یه‌ك تۆز له‌ حه‌ق لامداوه‌، وه‌ره‌ یه‌خه‌ی کراسه‌که‌م بگره‌ و توند ڕامبوه‌شێنه‌ و پێم بڵێ: ئه‌ی عومه‌ر.. ئه‌وه‌ تۆ خه‌ریکیت چی ده‌که‌یت؟![2]

## بۆ خوای (عزوجل) نه‌وه‌ك بۆ ئاره‌زوو

ده‌ڵێن به‌ بیشری کوڕی حاریس (رحمه الله): ئایا تۆ فه‌رمووده‌ ناگێڕیته‌وه‌؟ بیشر ده‌ڵێت: زۆر حه‌زم لێیه‌ که‌ فه‌رمووده‌ بگێڕمه‌وه‌، به‌ڵام من حه‌زم له‌ هه‌ر شتێك بوو.. وازی لێده‌هێنم!![3]

---

(١) (إصبر واحتسب/٩١)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/٤١)
(٣) (منجد الخطيب: ج١/٢٢)

## چاکە لە کامیاندایە؟!

پرسیاریان کرد لە ئیمامی شافیعی (رحمه الله) دەربارەی بابەتێک، شافیعی بێدەنگ بوو..!! پێیان وت: ڕەحمەتی خودات لێ بێت ئایا وەڵام نادەیتەوە؟! شافیعی وتی: بێدەنگم بۆ ئەوەی بزانم چاکە لە بێدەنگیمدایە، یاخود لە وەڵام دانەوەمدا.[1]

## بڕۆ کەسێکی تر فریو بدە

ئیبن تەییاح دەچێتە خزمەت عەلی کوڕی ئەبوطالب و پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. بەیتولماڵ پڕ بووە لە زەرد و سپی. (واتە: ئاڵتون و زیو) ئیمامی عەلی (عليه السلام) دەڵێت: (الله اكبر).. (الله اكبر)..!! پاشان ئیبن تەییاح یارمەتی دەدات هەتا هەڵدەستێت و دەچێتە بەیتولماڵ و دەڵێت: ئەمە کۆکراوەی منە و باشترینیشی تێدایە، وە هەموو ئەوانەی کۆ دەکەنەوە.. دەستیان بۆ دەمیانە، بەڵام من دەستی پڕم بۆ دەمی هەژارانە.

دواتر دەڵێت: ئەی ئیبن تەییاح.. پیرانی کوفەم بۆ بانگ بکە. بانگەوازی خەڵك دەکرێت و هەرچی لە بەیتولماڵدا دەبێت دابەشدەکرێت و ئیمامی عەلی دەڵێت: ئەی زەرد.. ئەی سپی، من نا، بڕۆ کەسێکی تر فریو بدە. بەو شێوەیە ئیمامی عەلی یەك دینار لە بەیتولماڵدا ناهێڵێت و، پاشان فەرماندەدات بەیتولماڵ دەشۆرن و دوو ڕکات نوێژی تێدا دەخوێنێت!![2]

## نیشانەکانی خۆشەویستی

بیشری کوڕی سیری (رحمه الله) دەڵێت: لە نیشانەکانی خۆشەویستی نییە.. کە تۆ شتێکت خۆشبووێت کە خۆشەویستەکەت پێی خۆش نەبێت.[3]

(١) (إحياء علوم الدين ٢٥/١)
(٢) (الف قصة و قصة/١٢٠)
(٣) (حلية الأولياء:ج٨/٣٠٠)

## دوای مردنیش ڕیابازه

عه‌مروی کوڕی موسا ده‌ڵێت: بیشری حافی (رحمه الله) وتی: پیاو هه‌یه له دنیادا ڕیابازه و دوای مردنیشی هه‌ر ڕیابازه! پێیان وت: چۆن دوای مردنیشی هه‌ر ڕیابازه؟! بیشر- وتی: ئه‌وه‌ی پێی خۆشه خه‌ڵکێکی زۆر له پرسه‌که‌یدا ئاماده بێت، ئه‌وه دوای مردنیشی هه‌ر ڕیابازه![1]

## به‌ڵێ ڕاستگۆ!

عوروه‌ی کوڕی عه‌بدوڵلا ده‌ڵێت: پرسیارم کرد له موحه‌مه‌دی کوڕی عه‌لی کوڕی حوسه‌ین (علیه السلام): ده‌رباره‌ی خشڵ پێوه‌کردن و ڕازاندنه‌وه‌ی شمشێر؟ وتی: هیچ گرفتێك له‌و بابه‌ته‌دا نییه و. ئه‌بوبه‌کری صدیق (رضي الله عنه) شمشێره‌که‌ی ڕازاندۆته‌وه. پێم وت: ده‌ڵێی ئه‌بوبه‌کری ڕاستگۆ؟! موحه‌مه‌دی کوڕی عه‌لی ڕاپه‌ڕینێك ڕاپه‌ڕی و ڕووی کرده قیبله و وتی: به‌ڵێ ڕاستگۆ.. به‌ڵێ ڕاستگۆ.. به‌ڵێ ڕاستگۆ.. چونکه هه‌رکه‌س نه‌ڵێت ڕاستگۆ، ئه‌وا خوای گه‌وره له دنیا و له ئاخیره‌تدا هیچ وته‌یه‌کی به‌ڕاست وه‌رناگرێت.[2]

## دواکه‌وتنی به‌رد باران!

جه‌عفه‌ری کوڕی سوله‌یمان ده‌ڵێت: هه‌وره‌کان ده‌هاتن و ده‌چوون و باران نه‌ده‌باری و مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) ده‌یگوت: ئێوه ده‌ڵێن: باران دواکه‌وت، منیش ده‌ڵێم: به‌رد بارین دواکه‌وت..!! هه‌تا به‌رد نه‌بارێ ئێمه باشین.[3]

---

(١) (صفة الصفوة/٤٢٩)
(٢) (صفة الصفوة/٣٣٢)
(٣) (صفة الصفوة/٦٤٩)

## تینوێتی سەر کێوی نور

عەبدولواحیدی کوڕی زەید دەڵێت: لەگەڵ ئەیوبی کوڕی ئەبی تەمیمەی سختیانی دا بووم (رەحمەتی خوای لێبێت) لە ئەشکەوتی حیراء، تینوێتی هێندە زۆری بۆ هێنام، هەتا لە ڕوخسارمدا هەستی پێکرد و وتی: ئەوە چییە دەیبینم لە ڕوخسارتا؟ وتم: تینوێتییەکی زۆرە و، دەترسم بەرگەی نەگرم. وتی: باسم ناکەیت. وتم: بەڵێ.. دڵنیابە باست ناکەم. وتی: سوێندم بۆ بخۆ. منیش سوێندم بۆ خوارد هەتا ئەو لە ژیاندا بێت باسی نەکەم، ئیدی ئەیوب قاچی هێنا بە حیرائدا و ئاو هەڵقوڵا، لێم خواردەوە و ئاوم لێهەڵگرت..!! ئەم ڕووداوەشم بۆ کەس نەگێڕایەوە، تا دوای مردنی ئەیوبی سختیانی.[1]

## ئەگەر کەسێک مرد!

ئیسبەغی کوڕی زەید دەڵێت: وەیسی قەرەنی (رەحمەتی خوای لێبێت) کاتێک ئێوارەی لێدەهات، دەیگوت: ئەمشەو شەوی سوجدەبردنە. ئیدی سوجدەی دەبرد تا بەیانی، وە هەرچی لە ماڵەکەیدا بوو، لە خواردن و خواردنەوە.. دەیبەخشییەوە و، دەیگوت: پەروەردگارا..

ئەگەر کەسێك لە برسێتییا بمرێت، لێم مەگرە!!
ئەگەر کەسێك لە بێبەرگییا بمرێت، لێم مەگرە!!

وە هەروەها وەیسی قەرەنی دەڵێت: پەروەردگارا.. لەبری هەموو گەدەیەکی خاڵی و.. جەستەیەکی ڕووت، من داوای لێبووردنت لێدەکەم، چونکە لە ماڵەکەمدا هیچ خواردن نییە، بێجگە لەوەی لە سکمدایە، وە هیچ شتێکی دنیاییم نییە، بێجگە لەوەی بە کۆڵمەوەیە.

" لەو کاتەشدا تەنها سیپاڵێکی بە سەر شانەوە دەبێت".[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٦٥٤-٦٥٥)
(٢) (صفة الصفوة/٥٣٩)

## له‌ خوار ده‌ستی فه‌قیره‌وه‌

ئه‌بوعه‌لی ڕوزباری (رحمه الله) ده‌ڵێت: ئه‌وه‌نده‌ و ئه‌وه‌نده‌ هه‌زار دینارم به‌خشیوه‌ به‌ هه‌ژاران، به‌ ده‌ستی خۆم یه‌ك دیناریانم نه‌خستۆته‌ ده‌ستیان..!! به‌ڵكو ده‌ستم له‌ خواره‌وه‌ ڕاده‌گرت و هه‌ژاره‌كان خۆیان پاره‌كه‌یان هه‌ڵده‌گرت، بۆ ئه‌وه‌ی ده‌ستم له‌ سه‌رووی.. ده‌ستی هه‌ژارانه‌وه‌ نه‌بێت.[1]

## كلیلی مسجد الاقصی

له‌ ساڵی (١٥) ی كۆچیدا.. سه‌ركرده‌كانی سوپای ئیسلامی، داوای وه‌رگرتنی كلیلی شاری قودسیان كرد، له‌ حاكمی شاره‌كه‌ كه‌ ناوی (به‌تریارك سه‌قریوس) بوو، به‌ڵام حاكمه‌كه‌ كلیله‌كانی نه‌دا به‌ عه‌مروی كوڕی عاص و شه‌رحه‌بیلی كوڕی حه‌سه‌نه‌ و ئه‌بو عوبه‌یده‌ی جه‌ڕاح (رضي الله عنهم) وه‌ پێی وتن: ئێمه‌ له‌ كتێبه‌كانماندا وه‌سفی ئه‌و كه‌سه‌مان بۆ كراوه‌ كه‌ كلیله‌كه‌ وه‌رده‌گرێت، وه‌ هیچ یه‌ك له‌ ئێوه‌ ئه‌و كه‌سه‌ نییه‌!! ئیدی هه‌واڵه‌كه‌یان نارده‌وه‌ بۆ عومه‌ری كوڕی خه‌طاب (رضي الله عنه) و وتیان: ئێمه‌ نامانه‌وێت بكه‌وینه‌ جه‌نگی ئه‌و حاكمه‌وه‌، هه‌تا خۆت فه‌رمانمان بۆ ده‌نێریت. عومه‌ر سواری وڵاخ بوو.. به‌ هاوڕێتی غوڵامه‌كه‌ی كه‌وتنه‌ ڕێ به‌ره‌و قودس، له‌ ڕێگادا عومه‌ر سوار ده‌بوو، پاش ماوه‌یه‌ك عومه‌ر داده‌به‌زی و به‌ پێ ده‌ڕۆشت، غوڵامه‌كه‌ی سوار ده‌بوو، پاش ماوه‌یه‌ك غوڵامه‌كه‌ش داده‌به‌زی و، وڵاخه‌كه‌ به‌ ته‌نێ ڕێی ده‌كرد، بۆ ئه‌وه‌ی پشوویه‌ك بدات به‌ پشتی، به‌مشێوه‌یه‌ به‌رده‌وام بوون تا نزیكی سنوری شام، له‌وێ قوڕاوێك ڕێی لێ سه‌خت كردن، عومه‌ر دابه‌زی و به‌ناو قوڕه‌كه‌دا به‌ پێی په‌تی ده‌ڕۆشت..!!

ئه‌بوعوبه‌یده‌ی جه‌ڕاح پێی وت: ئایا به‌ ناو قوڕه‌كه‌دا به‌ پێ ده‌ڕۆی؟!

عومه‌ر وتی: به‌ڵی به‌ پێ به‌ ناو قوڕه‌كه‌دا ده‌ڕۆم، ئێمه‌ زه‌لیل بووین و خودا به‌ ئیسلام شكۆمه‌ندی كردین، ئه‌گه‌ر له‌ غه‌یری ئیسلامدا بۆ شكۆمه‌ندی بگه‌ڕێین، ئه‌وا خوا زه‌لیلمان ده‌كاته‌وه‌!!

[1] () (صفة الصفوة/٤٨٢)

ئـەمیرەکان خـۆزگەیان دەخـواسـت لە کـاتی هـاتنە نـاو قـودسـدا نـۆبـەی عومەر بێت کە بە سـواری وڵاخـەکـەوە بێت، بەڵام پێچەوانەی خـواسـتی ئـەوان بـوو، کە هـاتنە نـاو شـار.. غوڵامەکە بە سـوار وڵاخەکەوە بـوو، و عـومەر بە پێ دەڕۆشـت..!!

کاتێـك گەشـتن حـاکمەکە سـەیرێکی پـۆشـاکەکەی عـومەری کـرد و کلیلەکـانی پێدا و، وتـی: تـۆ ئـەو کەسـەی.. کە لـە کتێبەکانمـاندا وەسـفـیمان خـوێندۆتـەوە، بـە پـیادە دێـتە نـاو شـار و غـوڵامەکەی بە سـواری، وە لـە پـۆشـاکـەکـەیدا حـەڤدە پینەی پێوەیە.

عومەر کلیلەکـانی وەرگـرت و کـڕنـوشـی بـرد بـۆ خـودا، وە شـەوەکەی بەگـریان بەڕێکـرد و فـرمێسـکەکانی وشـك نەدەبـوونـەوە، کاتێـك وتیـان: هـۆکاری ئـەم گـریانـەت چییە؟! ! عومـەر وتـی: بـۆیـە دەگـریـەم، چونکـە دەترسـم دنـیا بـە ڕووتانـا بکـرێـتەوە و یـەکـتری پەسـەند نـەکـەن، ئـەو کـاتـەش ئـەهـلی ئـاسـمان ئـێوە پەسـەند نـەکـەن!![1]

## شـوکـری چـاوەکـان

پیاوێـك پرسـیاری کـرد لـە سەلەمـەی کـوڕی دینـار و وتـی: چـۆن بـتوانم شـوکـری ئـەم دوو چـاوەم بکەم کـە خـوا پێی بـەخـشیووم؟!

ئەبـو حـازم (رحمه الله) وتـی: ئـەگـەر بـەو چـاوانـەت خێـر و چـاکـەیـەکت بـینی، بـاسی بکە بـۆ خـەڵکی، وە ئـەگـەر خراپـەیـەکت پـێ بینـی، بـیشـارەوە و بـاسی مـەکـە، ئـاوەهـا شـوکـری چـاوەکـانت دەکـەیت.[2]

(١) (أنيس المؤمنين/٣٣)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين: ج١/١٠٦)

## با قیامولله‌یل دابه‌ش بکه‌ین

ئه‌بو هوره‌یره (ﷺ) سه‌ره‌ڕای زانسته‌که‌ی، یه‌کێك بوو له خواپه‌رسته به‌رده‌وامه‌کان، ڕۆژه‌که‌ی به‌ڕۆژوو ده‌بوو، شه‌وه‌که‌یشی به سه‌ره له‌گه‌ڵ ژنه‌که‌ی و کچه‌که‌یدا.. شه‌ونوێژیان ده‌کرد، هه‌ر که‌سه و سێیه‌کی شه‌وه‌که‌ی به‌رده‌که‌وت و پێکه‌وه هه‌ڵده‌ستان به زیندووکردنه‌وه‌ی، ئیدی به‌و جۆره هه‌ر ده‌مێکی شه‌و تێپه‌ڕ بووایه، ماڵه‌که‌ی ئه‌بوهوره‌یره.. په‌رستش و، یادی خودا و، نوێژی تێدا ئه‌نجام ئه‌درا.[1]

وه ئه‌شعه‌سی کوڕی عه‌بدولڕه‌حمانی کوڕی زوبه‌یدی یامی له باوکیه‌وه ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: زوبه‌ید (ﷺ) شه‌وه‌که‌ی دابه‌ش کردبوو به‌سه‌ر خۆی و من و براکه‌مدا، زوبه‌ید سێیه‌کی شه‌وه‌که‌ی هه‌ڵده‌ستا، پاشان به قاچی لێی ئه‌دام ئه‌گه‌ر سستییه‌کی تیا بدیبام ده‌یگوت: بخه‌وه کوڕه‌که‌م.. من له بری تۆ ناخه‌وم، پاشان که به‌شه‌که‌ی منیشی زیندوو ده‌کرده‌وه، ده‌ڕۆشته لای براکه‌م و هه‌ڵی ده‌ساند، ئه‌گه‌ر سستییه‌کی له‌ویشدا بدیبا ده‌یگوت: بخه‌وه کوڕه‌که‌م.. من له بری تۆ ناخه‌وم، به‌و شێوه‌یه هه‌تا به‌یانی نه‌ده‌خه‌وت و عیباده‌تی ده‌کرد.[2]

وه وه‌کیعی کوڕی جه‌ڕاح ده‌ڵێت: عه‌لی و حه‌سه‌ن ــ دوو کوڕه‌که‌ی صاڵحی کوڕی حه‌ی ــ له‌گه‌ڵ دایکیاندا (رحمهم الله) شه‌وه‌که‌یان کردبوو به سێ به‌شه‌وه، بۆ زیندوو کردنه‌وه‌ی، عه‌لی سێیه‌کی شه‌وه‌که‌ی هه‌ڵده‌ستا، پاشان حه‌سه‌ن و پاشان دایکیان، کاتێك دایکیان مرد، شه‌وه‌که‌یان کرد به دوو به‌شه‌وه هه‌تا به‌یانی به نۆره نه‌ده‌خه‌وتن، پاشان عه‌لی مرد.. ئه‌و کاته حه‌سه‌ن خۆی به ته‌نیا هه‌موو شه‌وه‌که‌ی زیندوو ده‌کرده‌وه به شه‌و نوێژ و عیباده‌ت.[3]

---

(١) (صور من حياة الصحابة/٤٨٥)
(٢) (صفة الصفوة/٥٦٠)
(٣) (صفة الصفوة/٥٨٦)

## له‌گه‌ر نه‌تزانی بڵێ: نازانم

نافع ده‌ڵێت: پیاوێك ده‌رباره‌ی شـــتێــك پرســـیاری كـرد له‌ عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ر (ﭬ) عه‌بدوڵڵا ســـه‌ری دانه‌واند و وه‌ڵامی نه‌دایه‌وه‌، هه‌تا خه‌ڵكی وا گومانیان برد كه‌ ئیبن عومه‌ر گوێی لێ نه‌بووه‌، بۆیه‌ پیاوه‌كه‌ وتی: خودا ڕه‌حمت پێ بكات، ده‌ڵێی گوێت له‌ پرســـــیاره‌كه‌م نه‌بوو؟!!
عه‌بدوڵڵا وتی: به‌ڵێ گوێم لێبوو.. به‌ڵام ئێوه‌ وایده‌بینن كه‌ خوای گه‌وره‌ لێپرســینه‌وه‌مان له‌گه‌ڵ ناكات، له‌ســـه‌ر ئه‌و پرسیارانه‌ی كه‌ ئێوه‌ لێمانی ده‌كه‌ن؟! وازمان لێ بێنه‌ ڕه‌حمه‌تی خودات لێبێت.. تا له‌ مه‌ســـه‌له‌كه‌ت تێده‌گه‌ین، ئه‌وسا ئه‌گه‌ر وه‌ڵاممان هه‌بوو پێتی ده‌ڵێین، ئه‌گه‌ر نا.. ئه‌وا پێت ڕاده‌گه‌یه‌نین كه‌ زانیاریمان له‌ سه‌ری نییه‌.[1]

## هه‌ر دره‌فتێك و دوو ڕكات نوێژ!

عه‌بدوڵڵای كوڕی موباره‌ك ده‌ڵێت: عه‌لی كوڕی عه‌بدوڵڵای كوڕی عه‌بباس (ﭬ) پێنج سه‌د دره‌ختی هه‌بوو، ڕۆژانه‌ له‌ ژێر هه‌ر دره‌ختێكیاندا.. دوو ڕكات نوێژی ئه‌دا ئه‌كردا.[2]

## چیت بیر ده‌خه‌نه‌وه‌؟!

حه‌سه‌نی به‌سری (ڕه‌حمه‌تی خوای لێبێت) ده‌ڵێت: برایانی دینیمان خۆشه‌ویسترن له‌ خانه‌واده‌كانمان، چونكه‌ برایان ئاخیره‌تمان بیر ده‌خه‌نه‌وه‌ و، خانه‌واده‌كانیشمان دنیا.. خۆش به‌حاڵی خانه‌واده‌یه‌ك كه‌ ئاخیره‌ت بیری یه‌كتری ده‌خه‌نه‌وه‌.

(١) (صفة الصفوة/٢٠٥)
(٢) (سير اعلام النبلاء ٢٥٢/٥-٢٥٣)

## حورمەتی هەژاری

ڕوەیمی کوڕی ئەحمەد ( رحمه الله ) دەڵێت: هەژاری حورمەتی خۆی هەیە، ڕاگرتنیشی بە شاردنەوە و خۆشویستن و پاراستنیەتی، ئەوەی ئاشکرای بکات، ئەو کەسە ئەهلی ئەو هەژارییە نییە کە خوا خۆشیدەوێت.

وە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: گوێم لێ بوو ڕوەیم دەیوت: ماوەی بیست ساڵە خواردن نەهاتووە بە خەیاڵمدا، هەتا ئامادە کراوە و دانراوە بۆ خواردن.[1]

## تەنیا کەسێك.. بۆ گەلێك!

خالدی کوڕی صەفوان دەڵێت: گەشتم بە مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك، پێی وتم: ئەی خالد هەواڵی حەسەنی ئەهلی بەسرەم پێ بڵێ.

وتم: خودا چاکت بۆ بکات، ئەوەی دەیزانم پێتی دەڵێم، چونکە من دراوسێی حەسەنم و هەروەها لە کۆڕەکانیدا ئامادە دەبم..

حەسەن ( رحمه الله ) کەسێکە.. نهێنی و ئاشکراکانی وەك یەکن، گوفتار و ڕەفتاری وەك یەکن، کە دانیشت بۆ کارێك تا تەواوی نەکات هەڵناسێت، کە هەستێت بۆ کارێك تا تەواوی نەکات دانانیشێت، ئەگەر فەرمان بە نەکردنی کارێك بکات، خۆی بەر لە هەموو کەس وازی لێدەهێنێت، بینیم هیچ پێویستی بەخەڵك نەبوو، خەڵکانیشم بینی زۆر پێویستیان بەو بوو. مەسلەمە وتی: ئیدی بەسە..

چۆن گەلێك گومڕا دەبن، کە ئاوەها کەسێکیان تێدا بێت؟![2]

(١) (صفة الصفوة/٤٧٦)
(٢) (الف قصة وقصة/ ١١٧ـ١١٨)



## مـاندووت کـردین و هـیچـت نەخـوارد!

ڕەبیعی کوڕی خـوســـەیم ( رَحِمَهُ اللهُ ) ئـارەزووی حـەڵـوای کـرد.. کاتێـك بـۆی دروســـت کـرا، بانگی هـەژارانی کـرد و حـەڵـواکەیان خـوارد، خێـزانـەکەی وتـی: مـاندووت کـردین و خـۆت هیچت لێ نەخـوارد! ڕەبیـع وتـی: بـۆ لە مـن زیـاتـر کەس هـیـچـی خـــواردووە؟!!

## دۆعـای چـاکـان

عەلی کـوڕی ئـەبی حەرارە دەڵێـت: دایکـم نـزیکەی بیســـت ســاڵێـك لە پـێ کەوتبـوو، نەیدەتوانی لەســـەر پێکانی بـڕوات، ڕۆژێـك پێی وتـم: کـوڕم بـڕۆ بـــۆ لای ئـەحمەدی کـوڕی حەنـبەل ( رَحِمَهُ اللهُ ) داوای لێبکە بپاڕێـتەوە لە خـودا بــۆم، ڕۆشـــتمە خـزمـەتی ئیمام ئـەحمەد بـۆ مـاڵــەوە، پێم وت: مــن پـیـاوێکم، دایکـم زەمـــەنێکە لە پـێ کـەوتـــووە، نـاردوومی بـــۆ خزمـەتت نـزای بـــۆ بکـەی لە حـوزوری پـەروەردگـاردا، هەتا شـیفای بدات. ئیمام وتـی: کــوڕم.. کـێ وتـی کـە مـن دۆعـام گـیرا دەبێت؟! ! بـڕۆ بـە دایکـت بڵـێ: ئێمـە زیـاتـر پـێویـســتمان بــەوەیـە کـە ئـەو دۆعـامـان بــۆ بکات. ئیتر بـە دڵتەنگییەوە پشــتم هـەڵکـرد کـە بـــــــڕۆم، دایکی ئیمام بـینیمی و، پێی وتـم: بـــۆ وا دڵتــەنگیت؟! منیـش ئـــــەوەی ڕوویدابـــوو بـــۆم گـێـڕایــــــەوە.

دایکی ئیمام وتی: بگـەڕێـوە بــۆ لای دایکت، مــن گـوێم لێبـوو دۆعــای بـــۆ دایکـت دەکــرد. ئیـدی منـیش یەکـڕاســـت گـەڕامـــەوە بـــــــۆ مـــاڵ و لە دەرگامدا، دایکم بـە پێکانی خـۆی هـــات..!! دەرگـاکـــەی کـردەوە و وتـی: ڕۆڵــە گـیان خـوای گــەورە شـــیفای دام و تەندروســتی پێبەخشــیم!![1]

(١) (أنيس المؤمنين/٩٠)



## چەندان مەزڵوم لەبەر دەرگاتن!

مـالیکی کـوڕی دینــار (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەچێـتە لای والی بـەسـرە، والی پـێی دەڵێت: ئـەی مـالیك.. دۆعـام بـۆ بکە. مـالیك دەڵێت: دۆعـای چیت بـۆ بـکەم؟! چـەنـدان مـەزڵـوم لـەبـەر دەرگـاکـەتـن، دۆعـات لـێدەکـەن..!![1]

## چوار جار سوپاسی خودا دەکەم

شـورەیحی قازی (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێت: کە موسـیبەتێکم تووش دەبێت، چوار جـار (الحمد لله) دەکەم لە سـەری: سـوپاسـی خـودا دەکەم کە موسـیبەتەکە لـەوە گـەورەتـر نـەبـوو، سـوپاسـی خـودا دەکەم کە سـەبـرم پێدەبەخشـێ لە سـەری، سـوپاسـی خـودا دەکەم کە لە موسـیبەتەکاندا دەڵێم: لا حـول و لا قـوە الا بـالله و بە مەش پاداشـت وەدەگـرم، وە سـوپاسـی خـودا دەکەم کە موسـیبەتەکەم لە دینەکەمدا نییە.[2]

## یەك قسەی نەشیاو

پیاوێـك دوژمـنایـەتی ئـەحـنەفی کـوڕی قـەیـس دەکـات و پێـی دەڵێـت: ئـەگـەر یـەك قسـەی خـراپ بڵـێـیت، لـە بـەرامـبەردا دە قسـەی خـراپ دەبیسـتیت. ئـەحنـەف (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵـێت: بـەڵام ئـەگـەر تـۆ دە قسـەی نـەشـیاوم پـێ بڵـێیت، تـەنـهـا یـەك قسـەی نـەشـیاویشـم لـێ نـابـیسـتیت!![3]

(١) (حلية الاولياء ٣٨٤/٢)
(٢) (الف قصة و قصة/١٧٩)
(٣) (حرمة أهل العلم: ٦٢)



## شکاتی حاڵ

شـــورەیحی قازی ( رحمه الله ) گوێی لە کەسێك بـوو.. شـــکاتی حـاڵی خـۆی بـۆ هـاوڕێـیەکی دەکرد، شـورەیح دەسـتی گــرت و بـردیـیە کەنــارەوە و پێـی وت: ئـەی بـرازام.. نەکەیت شـــکاتی حـاڵت بـۆ غـەیـری خـودا بکەیـت! چــونکە ئـەوەی گلە و گازندەکەی لا دەکەیت.. یان هـاوڕێـیە، یان دوژمنە، ئـەگـەر هــاوڕێ بــوو.. ئــەوا دڵتەنگـی دەکەیـت، ئـەگــەر دوژمـن بــوو.. دڵخـۆشـــی دەکەیـت، تەمـاشـــای ئـەم چـاوەم بکە (ئـاماژەی بـۆ چـاوێکی کـرد) سـوێند بە خـودا پــازدە ســاڵـە، نە ڕێگایەکم پێ بـینیـوە.. نە کەسێك، (واتە ئـەو چـاوەی کوێـر بـووە) وە لەو کاتــەوە لای کەس باســم نەکـردووە، تـەنـیا تـۆ نەبێت، کە ئـێسـتا پێـتی دەڵـێم بــۆ ئــەوەی پــەندی لێـوەرگــریت.. ئــەی گــوێت لـێ نەبــووە کە خـوای گەورە لەســـەر زاری یەعقـوب ( عليه الصلاة والسلام ) دەفــەرمـــووێ:

﴿إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ﴾[1]

واتە: مـن باســـی خەفــەت و پــەژارەم هــەر لای خــودا دەکەم.[2] ئـیدی تــۆش تـەنـیا لای خـودای میهـرەبان، شـــکاتی حـاڵت بکە و.. دڵی تـەنگت بـۆ ئـەو بکەوە و ڕاز و نــیازت بــۆ ئــەو بـاس بـکە، چــونکە خــودا باشـتریــن بـەرپرســە و.. نـزیکـترین هــاوار لێکـراوە.[3]

## ساتەوەختی نەهامەتییەکان

ئەبو سـەعیدی خـەراز ( رحمه الله ) دەڵێت: تەندروسـتی و خـۆشـگوزەرانی.. بـاش و خـراپ دەشــارێــتەوە، پــیاوان لـە هــاتــنی نەهــامــەتی و نـاڕەحـەتــییەکاندا، دەردەکــەون.

(١) (یوســف/٨٦)
(٢) (پـوختەی تەفـسیری قـورئـان/٢٤٥)
(٣) (صور من حياة التابعين/١١٩ـ١٢٠)



## دەموچاوم پاک نابێتەوە!!

حەبشـــی کـوڕی وەرد دەڵێـت: ئەسـوەدی کـوڕی سـالم (رحمه الله) لە بەیانییەوە هەتا نیوەڕۆ خەریکی شۆردنی دەموچاوی بوو..!!
پێیان وت: دەنگوباست چییە، بۆ وادەکەیت؟!
ئەسوەد وتی: ئەمڕۆ کەسێکی بیدعەچیم بینی (کەسێک کارێکی خراپی داهێنابێت) ئیدی لەو ساتەوەی کە بینیوومە هەتا ئێستا، من خەریکم دەموچاوم دەشۆم و، وەها گومان دەبەم کە ڕوخسارم پاك نابێتەوە..!![1]

## مەرحەبا.. توێشوو هەڵگر

هەرکات دەرۆزەکەرێك دەرۆشت بۆ لای عەلی زەینولعابدین (عليه السلام) عەلی پێشوازییەکی جوانی لێدەکرد و پێی دەوت: مەرحەبا لەو کەسەی.. توێشووم بۆ هەڵدەگرێت بۆ ڕۆژی دوایی.[2]

## خۆشەویستی واتە بەخشین

سوفیانی کوڕی عویەینە دەڵێت: گوێم لێ بوو مساوری وەڕاق (رحمه الله) دەیوت: وەڵلاهی.. بە هەرکەس بڵێم لەبەر خوای (عز وجل) خۆشمدەوێی، ئیدی ئەو کەسە داوای هەر شتێکی دنیاییم لێبکات و توانام هەبێت پێی دەبەخشم.

(١) (التصنيف الموضوعي لتاريخ بغداد/١٠٥)
(٢) (صفة الصفوة/٣٢٥)



## پارچه پارچه بوونی دڵ!

ئه‌بوده‌رداء (رضي الله عنه) ده‌پارێته‌وه له په‌روه‌ردگـار و ده‌ڵێت: خودایا پـه‌نات پـێ ده‌گرم له پارچه پارچه بـوونی دڵ..!!
پێـی ده‌ڵـێن: ئه‌ی ئه‌بـوده‌رداء.. پارچـه پارچـه بـوونی دڵ چییه؟! له وه‌ڵامـدا ده‌ڵێت: ئـه‌وه‌یه که له هـه‌مـوو دۆڵێکدا سـه‌روه‌ت و سـامـانێکم هـه‌بێت.[1]

## حاڵم شـڕه.. براکـه‌م!

جـه‌عفه‌ری کـوڕی بـورقان ده‌ڵێـت: هـه‌واڵی بـاشـه و چـاکخـوازییـه‌کـانی یونسـی کـوڕی عـوبـه‌یـدم پێگـه‌شـت، منـیش نـامـه‌یـه‌کـم بـه‌مـشـێوه بـۆ نـووسی:
ئـه‌ی بـراکـه‌م.. فـه‌زڵ و چاکـه‌خـوازی تـۆم پێگـه‌شـتووه، بـۆیـه پـێم خـۆشـبـوو له حـاڵی خـۆتـم بـۆ بـنووسـیت. یونسـیش ( رحمه الله ) وه‌ڵامـی دامـه‌وه و بـۆی نـووسـیم:
نـووسـراوه‌که‌تم بـۆ هـات، داواتکـردووه لـه ئـه‌حـواڵی خـۆمـت بـۆ بـنـووسـم، پـێت ڕاده‌گـه‌یـه‌نـم.. کـه مـن داوام لـه نـه‌فـسـم کـرد، ئـه‌وه‌ی بـۆ خـۆی پێی خـۆشـه بـۆ خـه‌ڵکیش پێی خـۆش بێت، بـه‌ڵام سـه‌یرده‌کـه‌م زۆر لـه‌مـه‌وه دووره..!! پاشـان جـارێکی دیکـه داوام لێکـرد.. واز لـه باسـکـردنی خـه‌ڵکی بهـێـنێت، تـه‌نها بـه چاکـه نـه‌بێت، ئـه‌مجـار بینیـم.. نـه‌فـسـم ڕۆژووگـرتنی ڕۆژێـکی زۆر گـه‌رمی شـاری بـه‌سـره‌ی پـێ سـوکـتر و ئـاسـانتره له وازهـێنان لـه باسـکـردنـیان، بـراکـه‌م.. ئـه‌مـه حـاڵ و گـوزه‌رانـی مـنه، بـه‌ده‌سـت نـه‌فـسـمـه‌وه..!! والسـلام.[2]

---

(١) (رجال حول الرسول/ خالد محمد خالد)
(٢) (الف قصة و قصة/١١٦-١١٧)



## کێ دەتپارێزێت؟!

حەسەنی بەسری (رحمه الله) لە لای ئیبن هوبەیرەی والی بوو.. ئیبن هوبەیرە لە تەرەفی یەزیدی کوڕی معاویەوە فەرمانێکی بۆ هات، ئەگەر فەرمانەکەی جێبەجێ بکردایە.. خوای (عزوجل) لێی تووڕە دەبوو، ئەگەر جێبەجێی نەکردایە.. یەزیدی لێ تووڕە دەبوو، ئیدی لەو نێوەندەدا گیری کرد بوو، نەیدەزانی چی بکات؟! ! هەر بۆیە ڕاوێژی کرد بە حەسەنی بەسری، ئەویش زۆر حەکیمانە پێی وت: ئەی والی ئەوە باش بزانە..

خوای (عزوجل) دەتپارێزێت لە یەزید.. بەڵام یەزید ناتوانێت بتپارێزێت لە خوا.[1]

## خوانێك بۆ خۆشەویست

عەلی کوڕی ئەبوطالب (عليه السلام) دەڵێت: جارێك برسێتییەکی سەخت ڕووی تێکردم لە مەدینە، ڕۆشتمە دەر و بە دوای کارێکدا گەڕام لە بەرزاییەکانی مەدینەدا، ئافرەتێکم بینی کە گڵی کلۆ کلۆی کۆ کردبوویەوە، زانیم کە پێویستی بەوەیە گڵەکەی تەڕ بکات، ئیدی ڕۆشتم لەگەڵیدا ڕێك کەوتم بە هێنانی هەر سەتڵە ئاوێك بە خورمایەك، شازدە سەتڵە ئاوم بۆ هێنا، هەتا دەستەکانم هەڵاوسان، پاشان ئافرەتەکە شازدە دەنکە خورمای پێدام، منیش بردمەوە و چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و بە سەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە و.. پێکەوە لێمان خوارد.[2]

(١) (موسوعة اسماء الله الحسنى٣/١٦٨)
(٢) (موسوعة الأحزان ج٢/٢٩٣)

## چاکه‌ی نهێنی

ئه‌بو حه‌مزه‌ی ســومالی ده‌ڵێت: عه‌لی کوڕی حوســـه‌ین (عليهما السلام) شـــه‌وانه تـــوره‌که‌ی نـــانی له کـــۆڵ ده‌نـــا و ده‌یبه‌خشـــییه‌وه و ده‌یـــوت: به‌ڕاســـتی به‌خشـــین و چـــاکه کـردن بـه نهێنی، تـوڕه‌یی خـوا ده‌کـــوژێـنێـته‌وه.

هـه‌روه‌هـا عومه‌ری کوڕی ســابت ده‌ڵێت: کاتێـك عه‌لی کوڕی حوســـه‌ین مـرد و شـــۆردیان، شـــوێنه‌وارێکی ڕه‌شـــیان به پشـــتییه‌وه بینـی، پرســـیان: ئـــه‌مه چیـیه‌؟! وتیـان: شـــه‌وانه کیســـــه ئـارده‌ی له کـــۆڵ ده‌نـــا و ده‌یبه‌خشـــییه‌وه به‌ســـه‌ر هـه‌ژارانی مـه‌دینه‌دا..!!

هـه‌روه‌هـا ئیبن عائیشـــه ده‌ڵێت: گـوێم لێبـــوو ئـــه‌هلی مـــه‌دینه ده‌یانـــگوت: هـه‌ســتمان به نـه‌مـانی (به‌خشـــینی نهێنی) نه‌کـرد، تا دوای مـــردنی عه‌لـی کـوڕی حوســـه‌ین نه‌بێت.

عه‌لی زه‌ینولعابـدین شـه‌وانه به نهێنـی قـووتی ســه‌د مـاڵی ئـه‌هلی مـه‌دینه‌ی ده‌به‌خشی، ســه‌د مـاڵه‌که نـه‌یانـده‌زانی ئـه‌و خـێره‌یان له کوێـوه بـۆ دێـت؟! تـا کاتێـك عه‌لی مرد و خـێره‌که‌یان لێبڕا، ئـه‌و سات زانـییان، ئـه‌وه کاری عه‌لی بووه.[1]

## حـه‌مـاڵی شـاره‌زا

به‌کری کوڕی عه‌بدوڵڵا (رحمه الله) ده‌ڵێت: پیاوێکی حـه‌مـاڵم بینی کـۆڵێکی پـێ بـوو، زوو زوو ده‌یـوت: الحمـد لله.. أسـتغفر الله.. منیش له‌ســه‌ری وه‌ســتام هـــه‌تا کـۆڵـه‌کـه‌ی دانـا، ئه‌وکاته پێم وت: ئـــه‌وه تـــۆ له‌وه زیـاتـر هـیچ نـازانیت؟! وتـی: بـه‌ڵێ ده‌زانـم.. زیکر و ئـه‌ورادێکی زۆرتریـش ده‌زانـم و قـورئـانیش ده‌خـوێنمه‌وه، بـه‌ڵام مرۆڤ هـه‌میشـه له نـێوان نـیعمه‌ت و گـوناهـدایـه، بـۆیه ســوپاسی خـــوا ده‌کـه‌م بـۆ نیعمه‌تـه‌کانی کـه خـــه‌ڵاتی کـردووم، وه داوای لێخـۆشـبوون ده‌کـــه‌م بـــۆ گـوناهـــه‌کانم. منـیش لـــه دڵـی خـــۆمدا وتـم: ئـــه‌م حه‌مـاڵـــه لـــه بـه‌کـــر شـــاره‌زاتره!![2]

---

(١) (صفة الصفوة/١٢٥ـ١٢٦، الف قصة و قصة/١١٦)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين: ج١/١٠٨)

## سواڵکەرێکی یەهودی

ڕۆژێك عومەری كوڕی خەطاب (رضي الله عنه) به كۆڵانەكانی مەدینەدا دەڕۆشت، پیاوێكی نابینای دیت، له دەرگای ماڵانی دەدا و سواڵی دەكرد!! ئەمه زۆر كاریكردە سەر دەروونی عومەر، بۆیه لێی نزیك بوویەوە و پێی وت: ئەی پیاو بۆچی داوا له غەیری خوا دەكەیت؟!
پیاوەكه وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، من پیاوێكی یەهودیم، پیر بووم و سەرم سپی بووە و هیچ پارەم نییه.
عومەر دەستی گرت و بردییەوە بۆ ماڵی خۆی و، وتی به ئوم كولسومی خێزانی: چ خواردنێكت هەیه بیهێنه، چونكه من میوانێكم لەگەڵدایه. پاش نان خواردن، عومەر پیاوە یەهودییه نابیناكەی برد بۆ بەیتولماڵ و به بەرپرسەكەی وت: بزانه كێی وەكو ئەمه هەیه لەم شارەكەدا، له بەیتولماڵ بەشیان بۆ دابنێ، هیچ خێرێكمان تێدا نییه ئەگەر ئەمانه واز لێ بهێنین، پاش ئەوەی كه پیربوون و پشتیان چەمایەوە!![1]

## خەتای خۆمە!!

عەبدوڵڵای كوڕی وەرامی كوفی دەڵێت: له كوفه پیاوێك هەبوو، كوڕێكی خراپەكاری هەبوو.. ڕۆژێك لەسەر شتێك توڕە بوو له باوكی، به قاچ ڕایكێشا، هەتا له ماڵ كردیه دەرێ و زۆرێك به ڕێگادا ڕایكێشا..!! هەتا گەیاندیه شوێنێك.
باوكەكه وتی: ئەی كوڕەكەم.. تائێره بەسە، من پێشتر به هەمانشێوە باوكمم تا ئێرە ڕاكێشاوە!! ئەوەتا تۆش منت تا ئێرە ڕاكێشایەوە، كەواته تا ئێره گوناهی تۆ نیه و خەتای خۆمە، تۆش بەسیكه ئیتر، وازم لێ بهێنه..!! با سبەی تووشی هەمان سزا نەبیتەوە، به دەست ڕۆڵەكانتەوە.[2]

---

(١) (أنيس المؤمنين/٣٤)
(٢) (الف قصة و قصة/١٨٣)



## رسـول الله (عليه الصلاة والسلام) سـەلامـت لێدەكات!!

زوبەیری كوڕی مـوحەممەدی كـوڕی موسـلیمی مەككی دەڵێـت: لە خـزمـەت جابـری كوڕی عەبـدوڵلادا بـووین (رضي الله عنه) عەلـی كـوڕی حوسـەینی كـوڕی عەلـی كوڕی ئـەبـو طالـب (عليه السلام) لەگەڵ موحەممەدی كوڕیدا هـاتن، مـوحەممەد ئـەو كاتە منداڵ بـوو، عەلی وتی بە كوڕەكەی: ئـەی موحەممەد سـەری مـامـەت مـاچ بكە. موحەممەد سـەری جابـری ماچكـرد، جـابـر بـینایی لە دەسـت دابـوو، وتـی: ئـەمە كێیە؟ عەلی وتی: موحەممەدی كوڕمە. ئیـدی جابـر مـوحەممەدی لە ئـامێـز گـرت و، وتی: ئـەی موحەممەد، موحەممەدی رسـول الله (صلى الله عليه وسلم) سـەلامی لێـدەكـردیت..!!

وتیان: ئـەو سـەلام گەیـاندنە چـۆن بـوو ئـەی جابـر؟!

جابـر وتی: لە خزمـەتی رسـول الله دا بـووم (ﷺ) حوسـەینی لە ئـامێـزدا بـوو یـاری لەگەڵ دەكـرد، فـەرمـووی: ئـەی جـابـر.. حوسـەینی كـوڕم، كـوڕێكی دەبێت پێی دەڵـێن: عـەلی. ڕۆژی دوایی بـانـگـبـێـژێـك بـانـگ دەكـات: بـا گـەورەی خـواپـەرسـتان (سـید العابـدین) هـەسـتێت. ئیـدی عەلـی كـوڕی حوسـەین هـەڵدەسـتێت!! وە هـەروەهـا عەلیش كـوڕێكی دەبێـت، پێـی دەڵـێن: موحەممەد. ئـەی جابـر.. ئـەگـەر پێـی گەشـتیت، سـەلامی منـی پـێ بگەیـەنـە، ئـەوەش بـزانـە دوای بە یەك گەشـتنتان، تـۆ كەمێكت دەمێنێت لە ژیاندا.

هـەر بەپێی فەرمـوودەكەی رسـول الله (ﷺ) جابـری كـوڕی عەبـدوڵلا پـاش سـێ ڕۆژان لە دوای ئـەو بـەیەك گەشـتنە، كـۆچی دوایی دەكات.[1]

## كـات لـێم نـاڕوات!!

خەلیلـی كـوڕی ئەحـمەد (رحمه الله) دەڵـێت: قـورسـترین كـات كـە لـێم نـاڕوات، ئـەو كـاتـەیـە كـە خـەریكم نـان دەخـۆم.

(١) (نور الأبصار/١٤٢ـ١٤٣)



## لەوەی پێتی دەڵێم.. وابکە

سەعیدی حاریسی دەڵێت: ڕەبیعی کوڕی خوسەیم (رَحِمَهُ اللَّهُ) توشی ئیفلیجی هات و ئازارەکەی تولی کێشا، حەزی چووە سەر گۆشتی مریشك و تا چل ڕۆژ نەفسی خۆی گرتەوە..!! پاشان وتی بە خێزانەکەی: ئارەزووم لە گۆشتی مریشك کرد، چل ڕۆژ خۆم گرت بەڵکو نەفسم واز بهێنێت، بەڵام وازی نەهێنا. ژنەکەی وتی: سبحان الله..!! دەی ئەوە چییە تا نەفسی خۆتی لێ بگریتەوە؟! کاتێك خوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردوویت.

ئیدی ناردی بۆ بازاڕ مریشکی بۆ هێنا و بۆی سوور کردەوە و نانی بە ڕۆنی بۆ کرد و، خوانی ئامادەکراوی خستە بەر دەمی، کاتێك ویستی دەست بە خواردن بکات.. دەرۆزەکەرێك هات و، وتی: خێرێکم پێ بکەن خودا بەرەکەت بڕژێنێت بە سەرتانا.

ڕەبیع دەستی لە خواردن هەڵگرت و، وتی بە ژنەکەی: هانێ ئەوە بپێچەوە و بیبە بیدە بەو سواڵکەرە!! ژنەکەی وتی: سبحان الله..!! ڕەبیع پێی وت: ئەوەی پێتی دەڵێم تۆ وا بکە. ژنەکەی وتی: من کارێك دەکەم کە بۆ ئەو باشتر و خۆشەویستتر بێت. ڕەبیع وتی: دەی بزانم چی دەکەیت، پێمی بڵێ؟ وتی: نرخی ئەم خواردنە، پارەی پێدەدەین و تۆش ئارەزووەکەت بشکێنە و خواردنەکەت بخۆ. ڕەبیع وتی: زۆر باشت کرد.. بڕۆ پارەکەم بۆ بهێنە.

ئیدی ئافرەتەکە بایی نرخی مریشك و نان و ڕۆنەکە پارەی هێنا.. بەڵام ڕەبیع بە ژنەکەی گوت: دەی ئێستا پارەکەش بخەرە سەر خواردنەکە و هەمووی ببە بۆ سواڵکەرەکە!![1]

## باسکردنی باشییەکان

موحەممەدی کوڕی سیرین (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێت: زوڵمێکە و لە براکەتی دەکەیت.. کاتێك کە خراپەیەکی دەزانیت و باسی دەکەیت، بەڵام کارە باشەکانی دەشاریتەوە.

(١) (صفة الصفوة/٥٤٤)



## خۆی دوور خسته‌وه تا نه‌ناسرێته‌وه!

عه‌بدوڵڵای کوڕی سینان ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ عه‌بدوڵڵای کوڕی موباره‌کدا چووینه غه‌زا دژی ڕۆمه‌کان.. کاتێك هه‌ردوو کۆمه‌ڵه‌که به‌رامبه‌ر وه‌ستان، یه‌ك له ڕۆمه‌کان هاته ده‌ر و داوای زۆرانبازی کرد، پیاوێك چووه ده‌ر بۆی، زۆری بۆ هێنا و کوشتی، به‌و جۆره هه‌تا شه‌ش سه‌ربازی موسوڵمانه‌کانی کوشت، ئیدی که‌س نه‌ده‌چووه ده‌رێ بۆی و ئه‌ویش له نێوان دوو ڕیزه‌که‌دا خه‌ریکی خۆنواندن بوو..!!

عه‌بدوڵڵای کوڕی موباره‌ك ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ڕووی تێکردم و، وتی: ئه‌گه‌ر مردم، ئه‌مه وه‌سێتی منه و جێبه‌جێی بکه. پاشان ئه‌سپه‌که‌ی جوڵاند و خۆی ده‌رخست بۆ ڕۆمییه‌که، پاش ماوه‌یه‌ك ڕۆمییه‌که‌ی کوشت و به‌و شێوه‌یه تا شه‌ش له ڕۆمه‌کانی کوشت و که‌سیتر نه‌یوێرا ڕووبه‌ڕووی ببێته‌وه..!! ئه‌ویش دای له وڵاخه‌که‌ی و خۆی دوورخسته‌وه تا نه‌ناسرێته‌وه، پاش ماوه‌یه‌ك سه‌یر ده‌که‌م ئه‌وه‌تا له شوێنه‌که‌ی خۆیدا و پێی وتم: ئه‌ی عه‌بدوڵڵا هه‌تا من له ژیاندام، ئه‌مه بۆ که‌س مه‌گێڕه‌وه.[1]

## ڕاستگۆیی له فرۆشتندا

زیادی کوڕی ڕه‌بیع له باوکییه‌وه ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: موحه‌ممه‌دی کوڕی واسع ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) گوێدرێژێکی هه‌بوو.. ڕۆژێك بردی بۆ بازاڕی (مه‌رو) بۆ ئه‌وه‌ی بیفرۆشێت، پیاوێك پێی وت: یا شێخ.. گوێدرێژه‌که‌ت به که‌ڵکی من دێت بیکڕم؟! موحه‌ممه‌د له وه‌ڵامدا به پیاوه‌که‌ی وت: ئه‌گه‌ر به باشم زانیبایه و.. به که‌ڵك بهاتبا، ئه‌وا نه‌مده‌فرۆشت..!![2]

(١) (الف قصة و قصة/ ١١٧)
(٢) (صفة الصفوة/٦٤٣)

## ده‌رباره‌ی مه‌حه‌به‌ت

موحه‌ممه‌دی کوڕی عه‌لی جوله‌ندی ده‌ڵێت: پرسیار کرا له ئیبن جه‌لاء (رحمه الله) ده‌رباره‌ی مه‌حه‌به‌ت، گوێم لێی بوو له وه‌ڵامدا وتی: چیمداوه له مه‌حه‌به‌ت؟! من ده‌مه‌وێت فێری ته‌وبه بم.[1]

## ڕووناکی چراکه بێتاقه‌تم ده‌کات!

شه‌وێك له شه‌وان.. ئه‌بایه‌زیدی بوستامی (رحمه الله) چراکه‌ی داگیرساند، به‌ڵام ڕووناکی و تیشکی چراکه بێتاقه‌تی ده‌کرد..!! بۆیه وتی به‌و که‌سانه‌ی که له ده‌وری بوون: بگه‌ڕێن بزانن چ کارێکمان کردووه که بووه‌ته هۆی بێتاقه‌تییه‌که‌م؟! دوای بیرکردنه‌وه‌یه‌ك وتیان: بوتڵێکمان وه‌رگرت بۆ ئه‌وه‌ی ته‌نیا یه‌کجار زه‌یتی پێ بهێنین.. به‌ڵام دووجار پێمان هێنا.[2]

## برای موسوڵمان

جارێك باسی برای موسوڵمان ده‌کرێت، موحه‌ممه‌دی کوڕی یوسف (رحمه الله) ده‌ڵێت: له چ شوێنێك وێنه‌ی برای باش هه‌یه؟! کاتێك ده‌کرێیت به ژێر خۆڵه‌وه، که‌سوکاره‌که‌ت سه‌رقاڵی دابه‌شکردنی میراتییه‌که‌تن و.. برا موسوڵمانه‌که‌شت له گۆشه‌یه‌کدا به ته‌نیا داده‌نیشێت.. نزای خێرت بۆ ده‌کات.[3]

(١) (منجد الخطيب: ج٢٩/١)
(٢) (روضة الحبور ومعدن السرور/٢٧)
(٣) (روضة الزاهدين/٩٠)

## هیممەتی بەرز و.. گەشتنە لوتکە

ئین ڕەجەبی حەنبەلی دەڵێت: شێخ عەبدولقادر (رحمه الله) وتی: قووتی ڕۆژانەم خرنوکی دڕکاوی و خاشاکی سەوزە و پاقلە و گەڵای کاهو بوو لە لێوار و ڕۆخی ڕووبارەکە..!! وە بە هۆی گرانییەکەوە لە بەغداد.. تووشی نەبوونی و ژیانێکی سەخت بووم، کە ڕۆژانێك بە بێ خواردن مامەوە، بەڵکو دەگەڕام خواردنی پاشماوە و فڕێدراوەم دەدۆزییەوە و دەمخوارد..!!

ڕۆژێك برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیم، ڕۆشتم بۆ کەناری ڕووبارەکە. بەڵکو گەڵای کاهو یان پاقلە یان هەر شتێکی دی بدۆزمەوە و بیکەمە قووتی ئەو ڕۆژەم، بەڵام نەڕۆشتمە هەر شوێنێك و بەر لە من کەسانی تری بۆ نەچووبێت! وە ئەگەر شتێکیشم ئەدۆزییەوە، دەمبینی هەژارەکان بۆ پەلاماردانی، قەرەباڵغیان لەسەر دروست دەکرد.. ئیتر لە سۆز و خۆشەویستیم بۆ هەژارەکان، جێم دەهێڵا..!!! دواتر گەڕامەوە ناوەندی شار و لەوێ گەڕام.. هیچ پاشماوەیەکم نەبینی پێش من کەسی بۆ نەچووبێت، تا گەشتمە مزگەوتی (یاسین) لە بازاڕی (الریاحين) لە بەغداد، لاواز و بێ هێز.. نەمدەتوانی خۆم بگرم، ئیتر چوومە مزگەوت و لە کەنارێکەوە دانیشتم، خەریك بوو لەگەڵ مەرگدا تەوقە بکەم..!! گەنجێکی عەجەمی هاتە مزگەوت، نانێکی پوختی پێ بوو لەگەڵ برژاوێکدا، دانیشت و دەستی کرد بە خواردن، ئیدی من وام لێ هاتبوو.. هەر کاتێك ئەو لوقمەیێکی بەرز دەکردەوە، من لە شوێن خۆمەوە، لە تاو برسێتی دەمم دەکردەوە!! تەنانەت ئەوەشم پێ ناخۆش بوو بۆ نەفسم..!

بۆیە وتم بە نەفسی خۆم: ئەمە چییە؟! ! لێرە کەسی لێ نییە بێجگە لە زاتی پیرۆزی (الله عزوجل) نەبێت، یا ئەو قەزایەی بۆ مردنی داناوە، ئیتر بۆ وادەکەیت؟! لەپڕ عەجەمیەکە لایێکی لێکردمەوە و، وتی: بسم الله ئەی براکەم.. فەرموو. وەلێ من نەمویست بچمە پێشەوە، ئەمجار سوێندی دام، منیش نەفسم پەلەی بوو بۆ خواردن.. بەڵام موخالەفەی نەفسم جوڵامەوە، دووبارە سوێندی خواردەوە، ئیتر منیش داوەتەکەیم قبوڵ کرد، بەڵام هێشتا بە شەرم و لەسەرخۆوە دەستم درێژ دەکرد بۆ خواردنەکە، گەنجەکە دەستی کرد بە پرسیار کردن لێم: ئیش و کارت چییە؟ خەڵکی کوێیت؟ بە چی دەناسرێیت؟

منیش وتم: زانایەکی ئاینیم و خەڵکی گەیلانم.

عەجەمیەکە وتی: ئێ منیش خەڵکی گەیلانم، ئایا گەنجێکی گەیلانی

دەناسیت ناوی عەبدولقادر بێت؟ کە بە کچەزای ئەبی عەبدوڵڵای سەوم‌ەعی زاهید دەناسرێت؟

وتم: من ئەوەم کە تۆ هەواڵی دەپرسیت. ئیتر گەنجەکە تێکچوو و ڕەنگی ڕووخساری گۆڕا و، وتی: سوێند بە خودا.. گەشتمە بەغداد و لە خەرجی خۆمم پێ مابوو، دەستم کرد بە هەواڵپرسینی تۆ و کەس ڕێنیشاندەرم نەبوو بۆ لات.. تا خەرجییەکەم تەواو بوو، وە سێ ڕۆژانە من خەرجی قووتی خۆمم پێ نییە، تەنیا ئەوە نەبێت کە هی تۆیە پێم، وە برسێتی هێندە زۆری بۆ هێنام، هەتا گۆشتی مردارۆ بووم بۆ حەڵاڵ بوو، ئیدی بە ناچاری لەو ڕاسپاردەی کە هی تۆیە، ئەم نان و برژاوەم کڕی. دەی ئێستا بە باشی خواردنەکەت بخۆ، چونکە ئەمە خواردنی تۆیە، وە من ئێستا میوانی تۆم، دوای ئەوەی کە تۆ میوانی من بووی..!!

پێم وت: ئەمە چییە کە تۆ باسی لێوە دەکەیت؟!

عەجەمییەکە وتی: دایکت هەشت دیناری پێ ڕاسپاردم کە بیدەمە دەستی تۆ، منیش بە ناچاری و بۆ زەرورەت ئەم خواردنەم لێ کڕی، ئێستا.. من داوای لێ بووردنت لێ دەکەم. منیش ئارامم کردەوە و بە باشی هەڵسوکەوتم لەگەڵ کرد، ئەوەی مایەوە لە خواردنەکە پێم دا و لەبری ئەو خەرجییەی کە لە گەڕان بە شوێن مندا سەرفی کردبوو، شتێك لە پارەکەم پێدا، ئەویش وەری گرت و ڕۆشت.

شێخ عەبدولقادر. لاوێك بوو لە شاری (گەیلان) تاسە و ئارەزووی زانست هێنابوویە بەغداد، لەوێ بە ژیان و گوزەرانێکی پڕ لە دەردی سەری و نەهامەتییەوە کۆڵ نادات، تا شارەزاییەکی نایاب لە زانستەکانی ئەو سەردەمەدا پەیدا دەکات.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی حەسەنی جەببائی دەڵێت: شێخ عەبدولقادری گەیلانی پێی وتم: لە خەو و بێداریمدا فەرمانم بە چاکە دەکرد و ڕێگریم لە خراپە دەکرد، وە قسەکردن (ئامۆژگاری کردنی خەڵکی) زۆری بۆ دەهێنام، بە ڕادەیەك کە ئەگەر قسەم نەکردبایە ئەوا قەرەباڵغی لەسەر دڵم دروست ئەکرد و، وام لێدەهات خەریك بوو دەخنکام..!! ئیتر نەمدەتوانی بێدەنگ ببم، سەرەتا دوو تا سێ کەس لە دەورم کۆ دەبوونەوە و ئامۆژگاریم دەکردن، دواتر خەڵکی گوێبیستی ناوم بوون و لە دەورم جمەیان دەهات..!! تا وای لێهات لە کۆڕەکانمدا نزیکەی حەفتا هەزار کەس دادەنیشتن و گوێیان لێدەگرتم!!

جەببائی دەڵێت: شێخ پێی وتم: ئاواتەخوازم وەك سەرەتاکانم بگەڕێمەوە بۆ دەشت و سارا، نە من خەڵك ببینم و نە ئەوان من ببینن!

پاشان وتی: خوای گەورە سوود و مەنفەعەتی خەڵکی لە من ویست،

چونكە لەسەر دەستمدا زیاتر لە پێنج سەد كەسی بێباوەڕ موسوڵمان بوون و.. زیاتر لە سەد هەزار گوناهبار لەسەر دەستم تۆبەیان كرد و پەشیمان بوونەوە..!!
ئیمامی ڕەببانی عەبدولقادری گەیلانی (رحمه الله) دەڵێت: هەموو كارەكانم پشكنی و گەڕام، كارێكم نەبینی لە بەخشینی خواردن فەزڵی زیاتر بێت، بۆیە پێم خۆشە دنیا بە دەستی من بووایە، هەتا دەرخواردی برسییەكانم ئەدا و تێرم دەكردن، ناو لەپی دەستم كونداره هیچی تیا نامێنێتەوە..!! ئەگەر هەزار دینار بێتە دەستم، ئەوا ناهێڵم شەوی بە سەردا بێت، هەمووی دەبەخشمەوە.[1]

## زاڵم بوون یان مەزڵوم؟!

دوو كوڕی موعافی كوڕی عیمران (رحمه الله) پێكەوە دەكوژرێن، كاتێك هەواڵەكەی پێدەدەن، بە هەواڵهێنەكە دەڵێت: پێم بڵێ كوڕەكانم بە زاڵمی كوژراون یان بە مەزڵومی؟ هەواڵهێنەكە دەڵێت: بەڵكو بە مەزڵومی كوژراون.
ئیدی موعافی لە بەسەرهاتی كوژرانەكە ناپرسێت.. هەتا سەر دەخاتە سەر زەوی و سوجدەی شوكر بۆ خوا دەبات، پاشان سەری بەرز دەكاتەوە و دەڵێت: دەی ئێستا بۆم باس بكە، بزانم چۆن كوژران؟[2]

## دیارە گوناهێكم كردووە!

بەكری كوڕی عەبدوڵڵا (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر بینیت براكانت ڕێزت لێدەگرن و بچوكیت دەكەن، بڵێ: ئەوە فەزڵ و گەورەیی خۆیانە، وە ئەگەر قسوریان هەبوو بەرامبەرت، بڵێ: ئەوە سوچی خۆمە، دیارە گوناهێكم كردووە.[3]

---

(١) (سير اعلام النبلاء:٢٠/٤٤٥_٤٤٧ ) و(الذيل على طبقات الحنابلة: ٢/١٨٧)
(٢) (سلوة الأحزان/٨٣)
(٣) (أين نحن من هؤلاء:ج٤/٣٦)

## زیندوون و.. لە خزمەت پەروەردگارن

ئەنەس دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر مردووێك دەکرد، چوار جار (الله اکبر) ی دەکرد، بەڵام لەسەر تەرمەکەی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه) حەفتا جار (الله اکبر) ی کرد!!

جابری کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنه) دەڵێت: معاویە نووسراوێکی نارد بۆ کاربەدەستەکەی لە مەدینە، کە کارێزێك بگەیێنێتە کێوی ئوحود، کاربەدەستەکەی بۆی نووسی: کارێزەکە تەنها بە سەر گۆڕی شەهیدەکاندا نەبێت تێناپەڕێت؟ معاویە بۆی نووسی: گۆڕەکان هەڵدەنەوە و کارەکە جێبەجێ بکە. ئیدی تەرمی شەهیدەکانم بینی بە سەر شانی پیاوەکانەوە، دەتوت پیاوانێکن خەویان لێ کەوتووە، تەنانەت بێلێك بەر قاچی حەمزەی مامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەوت و خوێنی لێ چۆڕا!![1]

## بەر لە زانستت، نەفست پەروەردە بکە

عەبدوڵلای کوڕی موبارەك (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر باسی پیاوێکم بۆ بکەن کە زانستی هەموو گەلەکان بزانێت، دڵگران نابم بەوەی کە بە دیداری نەگەم..!! وە ئەگەر باسی کەسێکم بۆ بکرێت، کە نەفسی پەروەردە کردووە و خاوەنی ئەدەبە، ئەوا ئاواتەخوازم کە بە خزمەتی بگەم، وە دڵگران دەبم بەوەی کە ئەگەر بە دیداری شاد نەبم!![2]

(١) (صفة الصفوة/١٣٨)
(٢) (حرمة أهل العلم: ١٤٠)

## خوای گەورە بۆچی مێشی دروست کردووە؟!

ئەحمەدی کوڕی عومەری کوڕی مقدامی ڕازی دەڵێت: مێشێك نیشتەوە بە دەموچاوی خەلیفە مەنسورەوە و گازی لێگرت، مێشەکە دەڕۆشت و دەهات.. دەڕۆشت و دەهات!! هەتا مەنسوری بێتاقەت کرد، لەو کاتەدا ئیمام جەعفەری صادق (علیه السلام) لەوێ بوو، مەنسور پێی وت: ئەی ئەبا عەبدوڵلا.. خوای گەورە بۆچی مێشی دروست کردووە؟

ئیمام جەعفەر وتی: بۆ ئەوەی زۆردارانی پێ زەلیل بکات..!!

ئیدی مەنسور بێدەنگ بوو![1]

## خەمی زەردەخەنەیەك!

موحەممەدی کوڕی ئەبی حاتەم دەڵێت: گوێم لە ئیمامی بوخاری بوو دەیوت بە ئەبی مەعشەری زەریر: گەردنم ئازادکە ئەی ئەبا مەعشەر. ئەبا مەعشەر وتی: بۆ چشتێك ئازادت کەم؟! ئیمام بوخاری (رحمه الله) وتی: ڕۆژێك فەرموودەم دەگێڕایەوە، سەیرم کردیت و بینیم هێندە فەرموودەکەت بە دڵە، سەر و دەستی بۆ ڕادەوەشێنیت، ئیدی زەردەخەنەیەك گرتمی..!! ئەبی مەعشەر وتی: گەردنت ئازاد بێت و خودا ڕەحمت پێ بکات. ئەی ئەبا عەبدوڵلا.[2]

## کاتی دەنگدان لە بیرت بێت

ئیمامی عەلی (علیه السلام) دەڵێت: ئەگەر کەسێکت لە شوێنێك دانا و شوێنەکە.. بەرزتر بوو لە ڕێز و قەدری کەسەکە، ئەوا چاوەڕێی ئەوە بکە.. کە ئەو کەسە تۆ لە شوێنێك دابنێت، کە لە ڕێز و قەدری تۆ نزمتر و کەمتر بێت.

---

(١) (نور الابصار/١٤٨)
(٢) (ألامام البخاری أستاذ ألاستاذین/ ٦٦ )

## ئایا ده‌ترسی.. کچه‌کانم هه‌ژار بکه‌ون؟!

عه‌بدوڵڵای کوڕی مه‌سعود (رضي الله عنه) له‌ به‌یتوماڵ به‌خششی مانگانه‌ی بۆ دابین کرا بوو، به‌ڵام نه‌یده‌ویست و وه‌ری نه‌ده‌گرت، له‌ کۆتا نه‌خۆشییه‌که‌یدا ڕۆژێك ئه‌میری باوه‌ڕداران عوسمانی کوڕی عه‌فان (رضي الله عنه) ده‌چێته‌ سه‌ردانی و پێی ده‌ڵێت: به‌ ده‌ست چییه‌وه‌ ده‌ناڵێنی؟

عه‌بدوڵڵا ده‌ڵێت: به‌ ده‌ست گوناهه‌کانمه‌وه‌.

عوسمان ده‌ڵێت: ئاره‌زووت له‌ چییه‌؟

عه‌بدوڵڵا ده‌ڵێت: ڕه‌حمه‌تی په‌روه‌ردگارم.

عوسمان ده‌ڵێت: با ئه‌و به‌خششه‌ت بده‌ینێ، که‌ ساڵانێکه‌ وه‌ری ناگریت.

عه‌بدوڵڵا ده‌ڵێت: پێویستم پێی نییه‌.

عوسمان ده‌ڵێت: با بۆ کچه‌کانت بێت له‌ دوای خۆت.

عه‌بدوڵڵا ده‌ڵێت: ده‌ترسی کچه‌کانم هه‌ژار بکه‌ون؟! من فه‌رمانم پێکردوون هه‌موو شه‌وێك سوره‌تی (الواقعة) بخوێنن، چونکه‌ گوێم له‌ ره‌سول الله‌ بوو (ﷺ) ده‌یفه‌رموو: هه‌ر که‌س هه‌موو شه‌وێك سوره‌تی (الواقعة) بخوێنێت، هه‌رگیز تووشی موحتاجی نابێت.

شه‌وی به‌ سه‌ردا دێت.. عه‌بدوڵڵا زمان و دڵی پاراو ده‌بن به‌ یادی خودا و. ڕۆحی ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ لای په‌روه‌ردگار.[1]

## به‌ گه‌نجی.. نه‌زه‌رێکم کرد!

عه‌مروی کوڕی موڕره‌ (رحمه الله) ده‌ڵێت: پێم خۆش نییه‌ که‌ چاوانم ده‌بینێت، چونکه‌ باشم له‌ بیره‌ به‌ گه‌نجی نه‌زه‌رێکم کرد..!!

هه‌روه‌ها عه‌مرو ده‌ڵێت: ته‌ماشای ئافره‌تێکم کرد، زۆرم به‌ دڵ بوو..! ئیدی کوێرایی چاوم داهات، هه‌ر بۆیه‌ تکا ده‌که‌م، که‌ ئه‌و کوێربوونه‌م ببێته‌ که‌فاره‌تی ئه‌و گوناهه‌م.[2]

(١) (أنيس المؤمنين/٦٠)
(٢) (صفة الصفوة/٥٦٤)

## با فێری فاکێتی ببێت

ئیبن جابر ده‌ڵێت: مه‌کحولی شامی و هاوه‌ڵه‌کانی پێکه‌وه دانیشتبووین.. یه‌زیدی کوڕی عه‌بدوملەلیك هات بۆ لامان، کاتێك یه‌زیدمان بینی ویستمان جێگایه‌کی بۆ چۆڵ بکه‌ین، مه‌کحول ( رحمه الله ) وتی: له شوێنی خۆتان مه‌جوڵێن، وازی لێ بهێنن له کوێ شوێن هه‌بوو با له‌وێ دابنیشێت.. بۆ ئه‌وه‌ی فێری خاکێتی و بێ فیزی ببێت..!![1]

## ده‌ڕوات و.. ڕۆزییه‌که‌یشی ده‌بات؟!!

موحه‌ممه‌دی کوڕی سه‌لام ده‌ڵێت: سیلمی کوڕی قوته‌یبه به سواری بارگیره‌وه ده‌هاته لای موحه‌ممه‌دی کوڕی سیرین، ماوه‌یه‌کی به‌سه‌ردا چوو، سیلم به پیاده ده‌هات..!! موحه‌ممه‌د ( رحمه الله ) پێی وت: بارگیره‌که‌ت چی به‌سه‌رهاتووه وا به پیاده دێیت؟ سیلم وتی: فرۆشتم. موحه‌ممه‌د وتی: ده‌ی بۆ فرۆشتت؟ وتی: له‌به‌ر مه‌سروفی خواردنه‌که‌ی. موحه‌ممه‌د وتی: ده‌ی وا ئه‌زانیت که بارگیره‌که‌ت ڕۆشت، ئیتر ڕزق و ڕۆزییه‌که‌ی له‌لای تۆ جێ هێشتووه..؟!![2]

## بۆ دووری ناخه‌یته‌وه له خۆت؟!

پرسیار کرا له سیڕی سه‌قه‌تی ( رحمه الله ) له مه‌سه‌له‌یه‌کدا ده‌رباره‌ی ئارام گرتن، له‌و کاته‌دا دووپشکێك په‌یدا بوو، به چزووه‌که‌ی دای به قاچیدا، به‌ڵام سیڕی هیچی نه‌کرد! پێیان وت: ئایا دووپشکه‌که له خۆت دوور ناخه‌یته‌وه؟! سیڕی وتی: شه‌رم ده‌که‌م له خودا.. من باسی حاڵه‌تێك بکه‌م و پاشان پێچه‌وانه‌ی ئه‌و زانسته بجوڵێمه‌وه، که باسی لێوه ده‌که‌م.[3]

---

(١) (تهذيب حلية الأولياء: ج٢/١٨٢)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء: ج١/ ٣٨٧)
(٣) (إحياء علوم الدين ١٥١/٥)

## ڕەحمەتی پەروەردگار

فـــوزەیلی کــوڕی عەیــاز ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەڵێــت: ئــەگەر الـله (عَزَّوَجَلَّ) بمخاتــە نــاو دۆزەخەوە، هێـشتا لـەنـاو دۆزەخیـشدا.. نائومێد نابم لـە ڕەحـمەتی.[1]

## هـاتم دزی لێبکەم.. بەڵام لـەو دزی لێکـردم!

دزێـك دەچێـتە مـاڵی مالیکی کـوڕی دینـار ( رَحِمَهُ اللهُ ) دزەکە دەگەڕێـت و هـیچ شـــتێکی بـــۆ پـــەیدا نـابێ کە بیـدزێ، بـــەڵام دەبینێـت مـــالیك وەســـتاوە نـوێـــژ دەکـات، مـــالیك نوێـــژەکەی کـــورت دەکـاتەوە و ســـــەلام دەداتـــەوە، پاشـــــان ڕوودەکاتـە دزەکە و ســـەلامی لێ دەکات و پێی دەڵێت: ئـەی بـراکەم.. خـــودا لێـت خـۆش بێـت، هـــاتیتە مـــاڵەکـەمـەوە، شـــتێکت پـەیدا نـەکــرد ببیەیـت، بەڵام مـن ڕێت پێـنادەم بە بێ هیچ ســوود و قازانجێــك بچـیتە دەرەوە..!! پاشـــــان مـــالیك هـەڵدەســـتێت و دەچێـت دەفـرێــك دەهێنێـت کە ئــاوی تێـدا دەبێـت، بە دزەکە دەڵێــت: دەســـتنوێـــژ بگـــرە و دووڕکـات نـوێـــژ بـکە، لەوە باشـــترت دەســـت دەکەوێت کە بـــۆی هـاتبـوویت.

دزەکە دەڵێت: بـــــەڵێ.. وا دەکەم.

ئیتر دزەکـە بەوپـەڕی ڕێـزەوە دەســتنوێـژ دەگـرێت و دووڕکات نـوێـژ دەکات، دواتـر دەڵێت: ئـەی مـالیك بە لاتـەوە گــران نییە دوو ڕکاتی تر ئـەداکەم؟!

مـالیك دەڵێت: ئـەوەی خـوا بـۆی نـووســـیویت، زیـــادی بـکە. دزەکە هەتـا ڕۆژ دەبێـــتەوە خـــەریکی نـوێـژکـــردن دەبێـت!! مالیـك پێـی دەڵێـت: ئـێســـتا بـــڕۆ و.. هـۆشـیاری خـــۆت بە. دزەکـــە دەڵێـت: ئــەی گـــەورەم بـــا ئـەمـــڕۆش لــە لات بـمێنمـەوە، چـــونکە نـیەتـــی ڕۆژووم هێنــاوە..!! مالیـك دەڵێـت: چەنـدت ئـــەوێ بمێنەوە.

دزەکە ڕۆژانـێـــك لە مـــاڵی چـــۆڵ لە مـــەتاعی دنیـــا و پـــڕ لـــە نـــووری خـوداپـەرسـتی مالیکـدا دەمێنێـتەوە، شـەوانی شەونـوێــژ و.. ڕۆژانــی ڕۆژووگـــرتن دەبـــێت، دزەکـــە کاتـــێك دەیەوێـــت بـــڕوات دەڵێــت: ئـــەی مـــالیك، نـــیەتی تـەوبـەکـردنـم هـێنـاوە. مـالیك دەڵێت: نـیەتت بـاشــە و خـوداش بـاشـی دەوێ.

---

(١) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/٩١)

دزه‌که‌ ته‌وبـه‌ ده‌كـات و به‌ باشـی ده‌گه‌ڕێـته‌وه‌، كه‌ ده‌چێـته‌ ده‌ری له‌به‌ر ده‌رگـاكه‌ی مالیكدا دزێك له‌ دزان پێی ده‌گات و پێی ده‌ڵێت: واگومـان ده‌بـه‌م، ڕێت له‌ گه‌نجینه‌یه‌ك كه‌وتووه‌؟!

تـه‌وبـه‌كاره‌كه‌ش ده‌ڵێت: ئـه‌ی بـراكـه‌م.. هـه‌روایـه‌ كه‌ تۆ ده‌یڵێیت، ڕێـم لـه‌ مـالیكی كوڕی دینـار كـه‌وتـووه‌، هـاتم دزی لێبكه‌م، بـه‌ڵام ئـه‌و دزی لێكـردم (مـه‌بـه‌سـتی ئـه‌وه‌یـه‌ كه‌ دڵی بـردووه‌) ئـیتر گـه‌ڕامـه‌وه‌ بـۆ لای خـودای (عزوجل) و، ئـه‌وه‌تا ده‌مبینـی نـووسـاوم بـه‌ ده‌رگـاكـه‌یه‌وه‌ و ئـێـره‌ جـێـناهێڵم.. هـه‌تا ئـه‌وه‌م ده‌سـت ده‌كـه‌وێت، كه‌ خـۆشـه‌ویـسـتان ده‌سـتیـان كـه‌وتـووه‌!![1]

## ڕێگای گـه‌ڕانـه‌وه‌

پیاوێـك پرسـیار له‌ ئـه‌بـو حه‌سـه‌ن عه‌لـی كـوڕی به‌شـار ده‌كـات و پێـی ده‌ڵێت: ڕێگای گـه‌ڕانـه‌وه‌ چـۆنـه‌ بـۆ خـزمـه‌ت خـوای گـه‌وره‌؟ عه‌لـی (رحمه الله) پێی ده‌ڵێت: هـه‌روه‌ك چـۆن به‌ نهـێنی سـه‌رپـێچی فـه‌رمـانی خـوای گـه‌وره‌ت كـردووه‌، هـه‌ر به‌ نهـێنیش گـوێـڕایـه‌ڵی فـه‌رمانـه‌كانی بـبه‌، هـه‌تـا نـایـابـه‌كانی چـاكـه‌كـردن دێـته‌ نـاو دڵ و ده‌روونـته‌وه‌.[2]

## هـه‌مـان ئـه‌نـدازه‌

ئـیمـام یـه‌حیای كـوڕی مـه‌عـاز (رحمه الله) ده‌ڵـێـت: بـه‌ ئـه‌نـدازه‌ی تـرسـت لـه‌ خـوای (عزوجل) هـه‌یبه‌ت و سـامـت هـه‌یـه‌ لـه‌ لای خـه‌ڵك، وه‌ بـه‌ ئـه‌نـدازه‌ی خـۆشـه‌ویـستـیـت بـۆ خـوای (عزوجل) خـه‌ڵك خـۆشـیان ده‌وێـیـت، وه‌ بـه‌ ئـه‌نـدازه‌ی مـه‌شغـوڵ بـوونـت بـه‌ فـه‌رمـانـه‌كـانی خـواوه‌، خـه‌ڵك گـرنگی بـه‌ كـار و بـاره‌كـانت ده‌ده‌ن.[3]

(٢) (الف قصة و قصة/١٢١)
(٣) (التصنيف الموضوعي لتاريخ بغداد/١٧٠)

## فۆم.. فزمه‌تگوزاره‌كه‌ی فۆم!

ئه‌بوعوبه‌یده‌ی كوڕی جه‌ڕاح (رضي الله عنه) ئه‌میر بوو.. كاتێك ده‌چوو بۆ گه‌رماو، ئاوی گه‌رمی ده‌كرده سه‌تڵه دارینه‌كه‌یه‌وه و خۆی هه‌ڵی ده‌گرت، نه‌یده‌هێشت كه‌س بۆی هه‌ڵبگرێت.[1]

## پلوسكه‌كه‌ی ماڵی عه‌باس

عه‌بدوڵلای كوڕی عه‌باس ده‌ڵێت: عه‌باسی كوڕی عه‌بدولموته‌لیب (رضي الله عنه) پلوسكێكی[2] هه‌بوو، كه له‌سه‌ر ڕێگاكه‌ی عومه‌ری كوڕی خه‌طاب دا بوو (رضي الله عنه) ڕۆژی هه‌ینی عومه‌ر به‌رگی پۆشی و كه‌وته ڕێ بۆ مزگه‌وت، خانه‌واده‌ی عه‌باسیش دوو باڵنده‌یان سه‌ربڕی بوو، كاتێك عومه‌ر گه‌شته ئاستی پلوسكه‌كه، له ماڵی عه‌باسه‌وه ئاو ڕژێندرا كه خوێنی باڵنده‌كانی پێوه بوو، و به‌ر عومه‌ر كه‌وت، ئیدی عومه‌ر فه‌رمانی لابردنی پلوسكه‌كه‌ی دا و.. گه‌ڕایه‌وه بۆ ماڵ و به‌رگێكی تری پۆشی، پاشان هاته مزگه‌وت و ئیمامه‌تی بۆ خه‌ڵكه‌كه كرد، عه‌باس هاته لای و پێی وت: سوێند به خودا.. ئه‌وه ئه‌و شوێنه بوو كه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) پلوسكه‌كه‌ی تیا دانابوو.

عومه‌ر به عه‌باسی وت: ده‌ی منیش سوێندت ده‌ده‌م، كه ده‌بێت بچیته سه‌ر پشتم و پلوسكه‌كه بخه‌یته‌وه ئه‌و شوێنه‌ی كه رسول الله (ﷺ) دانابوو..!!

عه‌باسیش هه‌مان كاری كرد.[3]

(١) (من روائع اقوال الصالحين:ج١٦٢/١)

(٢) (پلوسك: له سه‌ربان یان له قاتی دووه‌م داده‌نرێت، بۆ ده‌رچوونی ئاوی باران و ئاوه‌ڕۆ، وه ئاوه‌كه‌ی ده‌ڕژێته كۆڵان.)

(٣) (الف قصة و قصة/١١٩)

## کـەیف و ســرور.. یان دڵتەنگی؟!

هوشـەیم دەگێـڕێـتەوە و دەڵێـت: چـووینە سـەردانی یەسـاری کـوڕی دینـار، دەگـریـا..! پێمان وت: چی دەتگرێـنێت؟ یەسـار (رحمه الله) وتـی: هــەر ئــەوەی کە خـواپـەرسـتەکانی پێـش منی گــریـاند.

هـەروەهـا یەسـار دەڵێت: کـەیف خـۆشی بـۆ دنیا و دڵتەنگی بـۆ ئـاخـیرەت.. لە یەك دڵدا کـۆ نـابـنەوە، هـەرکامیان جێی بـۆ خـۆی خـۆشـکرد، ئـەوی تـریـان دەردەکات.[1]

## قســەی لە قســەی پێغـەمـبەران دەچـێت!

حەســـەنی بەسـری کوڕی کەنیزەکەکەی ئوم ســـەلەمەی خێزانـی رســـول الله (ﷺ) بـــوو، ڕۆژێـــك ئـــوم ســــەلەمە کەنیــزەکەکەی دەنــــێرێت بــــۆ پـێداویـســـتییەك، حەســــەن زۆر دەگـریــێت.. ئــوم ســــەلەمە (رضي الله عنها) بە میهرەبــانی خــۆی هـەڵیدەگــرێت و، مــەمکی دەخــاتە دەمـی حەســــەن و بە فــەرمـانی خـودا مـەمکی ئوم ســـەلەمە شــیری لێ دێت و حەســــەن شـــیری دایکی بـاوەڕداران نـۆش دەکات..!!

هــەر بــۆیە وتــوویانە: ئــەو پـلە و پـایەی حەســــەن پێـی گـەشــــتووە لە حیکمـەتدا، هـۆکاری ئـەو شــیرەی خێـزانی رســول الله (صلى الله عليه وآله وسلم) یە.

وە هـەر کاتێك باسی حەســـەنی بەســری دەکــرا، لە حــوزوری مـوحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوســـەین دا (عليهما السلام) دەیـگوت:

حەســـەن ئـەو کەسـەیە، کە قســـەی لە قســـەی پێغەمبەران دەچـێت![2]

---

(١) (صفة الصفوة/٥٢٠)
(٢) (الف قصة و قصة/١٣١)

## خواپەرستی ڕاستەقینە

لە دەوری کەعبەی پیرۆز.. عائیشـــەی دایکی ئیمانداران پیاوێـك دەبـینێت کە بـە ســـەر شـــان هـەڵیان گـرتووە و تـەوافـی پێدەکـەن.

عــائیـشـە (رضي الله عنها) دەپـرسـێت: ئـەوە کـێـیە؟

دەڵێن: ئـەوە پـیاوێکە ترســی خـودا دڵی لەت کـردووە..!!

عائیشـــە دەڵێـت: لە خـواتـرســـــان.. خـۆڕاگـرتــن و نــیاز و پێداگــیرییەکە، بــاوەڕدار لاواز ناکـات، بـەڵکو هێـزێکی زیـادە دەخـاتـە پـاڵ هـێـزەکـەی خـۆی، عـومـەری کـوڕی خەطـاب (رضي الله عنه) لە خـواتـرســـاوتـرینمان بـــوو، کـەچی کاتێــك دەڕۆشـــت خێــرا بـــوو، کاتێــك قـســـــەی دەکـرد گـوێی لێدەگـیرا، وە کاتێــك لەبـەر خـودا.. لە کەسێکی دەدا، ئـازاری پێدەگـەیـاند.[1]

## مـامی پێغـەمـبەرەکـەت دەکـەینە شـەفاعـەتکار

ڕۆژانێکی سەخت و بێبارانی و وشکەساڵی بـوو.. کە بە (ساڵی خـۆڵەمێشـــەکە) ناسـراوە، ســائیبی کـوڕی یەزیـد دەڵێـت: ڕۆژێــك بینـیم عـومەری کـوڕی خەطـاب (رضي الله عنه) بە زەلیلی دەپـاڕایــەوە، کـراســێکی خەتـداری لەبەردا بـــوو.. نەدەگـەشـــتە ئـەژنــۆکانی، دەنگـی بــەرز دەکــردەوە بــۆ لێخـۆشـــبـــوون، ئـەشـــکی چــاوانی بە ســـەر گـۆنایدا دەهـاتنە خـوار.. عەبـاســی کـوڕی عەبـدولموتەلیب لە لای ڕاســتییەوە بـوو، ئـەو ڕۆژە عومەر ڕوو بە قیبلە دۆعـای دەکـرد، دەســتەکانی بـەرز کـردبـۆوە بـۆ ئـاســمان، هــاواری بـۆ خـودا دەبـرد و خەڵکیش لەگەڵیـدا نـزایـان دەکــرد، پاشـــان عومـەر دەسـتی عەباســی گـرت و، وتی:

خـودایـــا.. پێغـەمـبەرەکـەت لــە نـاومـانــدا بـــوو، بـارانــت بــۆ دەبــاراندین، ئـێســـتا مـامــی پێغـەمـبەرەکـەت (صلى الله عليه وآله وسلم) دەکـەیــنە شـەفـاعــەتکار بــۆ لات، بــە میهرەبـانی خـۆت بــارانمـان بـۆ ببارێنە.

عــومـەر ئـاوەهـا مـایــەوە، هـەتـا بـارانی ڕەحمــەت دایکــرد و تــەڕی کــرد.. عـەبـاســیش دۆعـای دەکـرد و چـاوەکانی فـرمێســکیان دەبـــاراند.

---

(١) (أنيس المؤمنين/١٣٠)

## بۆ سووکترینیان دەگریەم!!

لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا موحەممەدی کوڕی مونکەدر دەست دەکاتە گریان..! پێی دەڵێن: بۆچی دەگریەیت؟ موحەممەد ( رحمه الله ) دەڵێت: وەڵڵاهی. بۆ گوناهێك ناگریەم کە خۆم دەزانم ئەنجامم داوە، بەڵکو ترسی ئەوەم هەیە کە کارێکم کردبێت و زۆر بە سووك سەیرم کردبێت، بەڵام لە لای خودا زۆر گەورە بێت.[1]

## کوڕە ژیکەڵەیەکی نەفۆش

موعافی کوڕی عیمران دەگێڕێتەوە و دەڵێت: چوومە سەردانی فەتحی موسڵی، دیتم بە دیار کیژۆڵەیەکی بەرگ دڕاو و کوڕە ژیکەڵەیەکی نەخۆشیەوە لەبەر هەتاودا دانیشتووە..! پێم وت: ڕێگەم بدە تا ئەم کیژۆڵەیە پۆشتە و پەرداخ بکەم.

فەتح ( رحمه الله ) وتی: نەخێر ڕێگە نادەم. وتم: بۆچی؟! وتی: وازی لێ بهێنە هەتا خوای گەورە ئارامی کچەکەم و سەبری من لە سەری ببینێت و ڕەحمم پێ بکات.

پاشان کاتێك چوومە ڕاسەری کوڕەکە و دانیشتم، پێم وت: ئارەزووت لە چشتێك هەیە هەتا بۆتی ئامادەکەم؟ منداڵەکە وتی: دەی تۆ کێیت؟ وتم: موعافیم. کوڕەکە سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و وتی: ئەی پەروەردگارم.. دیاری و تاقیکردنەوەکان لە تۆوە و.. ئارام گرتنیش لە من.[2]

(١) (موسوعة الأخلاق ج٢/٣٥٠)
(٢) (حدائق الأولياء ج١/٨١)

## فێڵی شەیتان

حاریسی کوڕی قەیس (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر لە نوێژدا بوویت و شەیتان پێی وتیت: نوێژەکەت کورت بکەوە با تووشی ڕیا نەبیت، چونکە خەڵکی دەتبینن. تۆ گوێی پێ مەدە و نوێژەکەت زیاتر درێژ بکەوە.[1]

## ئاوەکە بدەن بە هاوەڵەکەم!

جەنگی یەرمووك کۆتایی هات.. سەرکەوتنێکی گەورە نسیبی موسوڵمانان و.. دۆڕاندنێك مایە پووچی ڕۆمەکان بوو، سەربازانێك.. دوا دڵۆپە خوێنیان بەخشییە دینەکەیان، جەنگاوەرانێك.. برینی سەخت تەواو هیلاکی کرد بوون..!! سیانیان لە ئامێزی خاکدا، لە نزیك یەکەوە کەوتبوون و.. بە هۆی برینی زۆرەوە هێز و برستیان لێبڕا بوو، ئەوانیش حاریسی کوڕی هیشام و عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و عکریمەی کوڕی ئەبو جەهل بوون.

حاریس تینوێتی زۆری بۆ هێنا و داوای ئاوی کرد، ئاویان بۆ هێنا.. ویستی بیخواتەوە، عکریمە سەیرێکی کرد، ئیدی حاریس وتی: ئاوەکە بدەن بە عکریمەی هاوەڵم..!! ئاوەکەیان دا بە عکریمە، ویستی بیخواتەوە.. عەییاش سەیرێکی کرد، ئەویش وتی: ئاوەکە بدەن بە عەییاشی هاوەڵم..!!

کاتێ ئاوەکەیان برد بۆ عەییاش و لێی نزیك بوونەوە، سەیر دەکەن گیانی دەرچووەوە!!

ئاوەکەیان گەڕاندەوە بۆ دوو هاوەڵەکەی تری.

بەڵام ئەوانیش بە دووی هاوەڵەکەیاندا گیانیان دەرچوو بوو..!! کەسیان ئاوەکەیان نەخواردەوە و شەهید بوون..!! (رضي الله عنهم).[2]

کاتێك خالیدی کوڕی وەلید دەیانبینێت، دەڵێت: خالید بە فیدای ئێوە بێت!!

(١) (منجد الخطيب: ج١١/١)
(٢) (صور من حياة الصحابة/١٢١ ـ ١٢٢)



## بازرگانییەك بۆ هەردوو دنیا

حەسەنی بەسری (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم.. دنیات بفرۆشە بە ئاخیرەتت، لە ئاکامدا هەردووکیانت دەست دەکەوێت، وە هەرگیز نەکەیت ئاخیرەتت بفرۆشیت بە دنیات، ئەو کاتە هەردووکیانت لە کیس دەچێت و ڕەنج بە خەسار دەبیت.

## خەمی دنیا.. بۆچی؟!!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) پیاوێکی بینی کە خەمی دنیا دایگرتبوو، پێی وت: ئەی پیاو.. من سێ پرسیارم هەیە بۆ تۆ، وەڵامم بدەوە.

پیاوەکە وتی: بپرسە با وەڵامت بدەمەوە. ئیبراهیم پێی وت: ئایا لەم گەردوونەدا شتێك ڕوو دەدات، کە ویستی پەروەردگاری لەسەر نەبێت؟! ! پیاوەکە وتی: نەخێر. ئیبراهیم وتی: ئایا لەو ڕزق و ڕۆزییەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوویت، شتێك کەم دەکات..؟! ! پیاوەکە وتی: نەخێر.

ئیبراهیم وتی: ئایا ئەو تەمەنەی کە خوای گەورە بۆی نووسیویت لەم ژیانەدا، یەك لەحزە کەم دەکات..؟! ! پیاوەکە وتی: نەخێر.

ئیبراهیم پێی وت: دەی ئیتر بۆچی خەم و خەفەتی دنیا دایگرتوویت؟![1]

## لەرزوتای شەوانە

حەسەنی بەسری (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێت: هاوەڵان ئومێدیان دەکرد کە شەوانە لەرزوتایەکیان لێبێت و.. ببێتە کەفارەتی گوناهانی لەوەو پێشیان.[2]

(١) (الف قصة و قصة/٤٤١)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين:ج٨٩/١)

## خودا به‌ره‌كه‌ت بخاته شه‌وه‌كه‌تانه‌وه

ئه‌بی ته‌ڵحه و ئوم سه‌لیم (رضي الله عنهما) كوڕێكیان ده‌مرێت.. ئوم سه‌لیم ده‌ڵێت به كه‌سوكاره‌كه‌ی: كه‌ستان مه‌رگی كوڕه‌كه‌مان به ئه‌بی ته‌ڵحه ڕانه‌گه‌یه‌نێت، هه‌تاخۆم قسه‌ی بۆ ده‌كه‌م.

ئوم سه‌لیم ده‌ڵێت: ئه‌با ته‌ڵحه هاته‌وه، خواردنی شێوانم بۆ ئاماده‌كرد و خواردی و خواردییه‌وه و سه‌رخه‌وێكی شكاند، پاشان له جاران جوانتر خۆم بۆ ڕازانده‌وه و پێكه‌وه چووینه سه‌ر جێگا.

كه دیتم تێری خوارد و كاری خۆی كرد، پێم وت: ئه‌ی ئه‌با ته‌ڵحه، ئه‌گه‌ر قه‌ومێك قه‌رزێكیان دا به خێزانێك و دوای ماوه‌یه‌ك داوای قه‌رزه‌كه‌یان كرده‌وه، ئایا خێزانه‌كه ده‌توانن قه‌رزه‌كه‌یان بۆ نه‌گێڕنه‌وه؟

ئه‌با ته‌ڵحه وتی: نه‌خێر ناتوانن.

ئوم سه‌لیم ده‌ڵێت: پێم وت: ده‌ی وایدابنێ قه‌رزه‌كه، كوڕه‌كه‌ته. دواتر ئه‌با ته‌ڵحه ده‌كه‌وێته ڕێ بۆ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) و ئه‌وه‌ی ڕوویدا بوو بۆی ده‌گێڕێته‌وه، ره‌سول الله (ﷺ) پێی ده‌فه‌رموێت: خودا به‌ره‌كه‌ت بخاته شه‌وه‌كه‌تانه‌وه.

ئوم سه‌لیم ده‌ڵێت: هه‌ر ئه‌و شه‌وه دووگیان بووم.[1]

## سوودی یه‌كتر بینین

یه‌كێك له هاوه‌ڵه‌كانی ئه‌بو مه‌یسه‌ره ئه‌حمه‌دی كوڕی نزار (رحمه الله) گله‌یی ئه‌وه‌ی لێده‌كات كه ده‌مێكه نه‌یبینیوه.

ئه‌بو مه‌یسه‌ره پێی ده‌ڵێت: ئه‌ی براكه‌م.. سوودی یه‌كتر بینین، دۆعا كردن و پاڕانه‌وه‌یه بۆ یه‌كتر، تۆش هه‌ركات یادی منت كرد دۆعای خێرم بۆ بكه، منیش هه‌ركات یادی تۆم كرد دۆعای خێرت بۆ ده‌كه‌م.. ئیدی وه‌ك ئه‌وه وایه كه به دیداری یه‌كتر شاد بووبین، ئه‌گه‌رچی یه‌كتریشمان نه‌دیبێت.[2]

---

(١) (الف قصة و قصة/١٧٤)
(٢) (ترتيب المدارك ج ٢٩/٦)

## زانست و سامان

ئیمامی عەلی (عليه السلام) دەڵێت: زانست لە سەروەت و سامان باشترە، چونکە زانست تۆ دەپارێزێت، بەڵام تۆ دەبیتە پاسەوانی سەروەت و سامان.. بۆ ئەوەی بیپارێزیت.

## نەوسنەکان

ئیمامی عومەر (رضي الله عنه) قامچییەکەی دەگرت بە دەستییەوە و دەڕۆشتە قەسابخانەکەی زوبەیری کوڕی عەوام (کە تاکە کوشتارگە بوو لە مەدینەدا) هەر کاتێك پیاوێکی دەبینی دوو ڕۆژ بەسەریەکەوە گۆشتی دەکڕی، قامچییەکەی پیا دەکێشا و پێی دەوت: ئەوە ناتوانی کەمێك لە نەوست بگریتەوە بۆ دراوسێکەت و ئامۆزاکانت؟![1]

## شووێك لە من باشتربێت!

موحەممەدی کوڕی خالدی زەبی دەڵێت: نەماندەزانی کە خەیسەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان چەندە قورئان دەخوێنێت، هەتا ئەو کاتەی کە نەخۆش کەوت، ژنەکەی هات و دەستی کرد بە گریان.

خەیسەمە وتی: بۆچی دەگریەیت ئەی ئافرەت؟! مردن ئاکامی هەموومانە.

ژنەکەی وتی: لە دوای تۆ هەموو پیاوێك لە من حەرام بێت.

خەیسەمە ( رحمه الله ) وتی: ئەو هەموووەم لە تۆ نەویست، تەنها دەترسام شوو بە موحەممەدی برام بکەیت. چونکە پیاوێکی خراپەکار و ئارەق خۆرە، منیش پێمخۆش نییە ئەمماڵەی کە سێ ڕۆژ جارێك خەتمێکی قورئانم تیا کردووە، ببێتە شوێنی ئارەق خواردنەوە.[2]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج٢٦٨/٣)
(٢) (صفة الصفوة/٥٥٨)

## ئایا تۆمان لەدەست دا؟!

ئەبوحەنیفە (رحمه الله) دراوسێیەکی کەوشدرووی هەبوو.. هەموو ڕۆژەکەی کاری دەکرد، تا تاریکی شەو باڵی دەکێشا بەسەر دنیادا، ئەوجا دەگەڕایەوە بۆ ماڵەکەی، یاخود گۆشتی پێبوو دەیکوڵاند، یاخود ماسی پێبوو دەیبرژاند، پاشان دەستی دەکرد بە شەراب نۆشین، تا شەرابەکە دەیگرت و مەست دەبوو، ئەو کات ئەم گۆرانییەی دەوتەوە:

أَضاعُونـي وَأَيَّ فَتىً أَضاعُوا.... لِيَومٍ كريهةٍ وَ سدادِ ثُغرِ

واتە: لە دەستیان دام، ئەمما چ لاوێکیان لەدەست دا، بۆ ڕۆژی سەخت و نەخوازراو و.. پڕ کردنەوەی کەلێنەکان.

ئەم پیاوە بەردەوام دەیخواردەوە و ئەم بەیتەی دەوتەوە، تا خەو دەیبردەوە، ئەبوحەنیفەش هەموو شەوەکەی نوێژی دەکرد و بە گۆرانی وتنی دراوسێکەی زیانی پێدەگەشت، شەوێ لە شەوان.. ئەبوحەنیفە دەنگی دراوسێ کەوشدرووەکەی نەبیست! هەواڵی پرسی، وتیان: پۆلیس بردوویانە و ئێستا لە زیندانە. ئەبوحەنیفە نوێژی بەیانی کرد و کە ڕۆژ بوویەوە سواری ئێسترێك بوو و ڕۆشت داوای دیداری ئەمیری کرد، ڕێی پێدرا و ڕۆشتە لای ئەمیر، ئەمیر لە مەجلیسەکەیدا ڕێی بۆ خۆش کرد و پێی وت: چ پێویستییەکت هەیە تا بۆتی جێبەجێ بکەین؟ ئەبوحەنیفە وتی: دراوسێیەکی کەوشدرووم هەیە پۆلیس گرتوویانە، ئەمیر فەرمان بدات ئازاد بکرێت. ئەمیریش ئازادی کرد، پاشان ئەبوحەنیفە بە دراوسێکەی وت: ئەی لاو ئایا تۆمان لە دەست دا؟!

لاوەکە وتی: نا.. هەرگیز لە دەستت نەدا، بەڵکو پارێزگاریت لێکرد و بە باشی ئاگاداری بوویت!! خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە بۆ ڕێزگرتنی دراوسێکەت. ئیتر کەوشدرووەکە لەوە بە دواوە، نەگەڕایەوە سەر شەراب خواردنەوە و گۆرانی وتن.[1]

(١) (الف قصة و قصة/١٥٦_١٥٧)



# خودا نهێنیت بپارێزێت

ئه‌حمه‌دی کوڕی مه‌هدی ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: شه‌وێ له شه‌وانی به‌غداد.. ژنێك هاته لام و باسی ئه‌وه‌ی کرد که له خانه‌واده‌یه‌کی به‌ڕێزه و تووشی ناڕه‌حه‌تییه‌ك هاتووه و، پێی وتم: تکات لێده‌که‌م له‌به‌ر خودا نهێنییه‌کم هه‌یه بیپارێزه.

وتم: ناڕه‌حه‌تییه‌که‌ت چییه تا به پێی توانا یارمه‌تیت بده‌م؟

وتی: ئێستا ڕقم له خۆم ده‌بێته‌وه، چونکه من دووگیانم..!! وه به خه‌ڵکم وتووه که تۆ هاوسه‌رمی و ئه‌م کۆرپه‌ش که له سکمدایه هی تۆیه! تۆش ئابڕووم مه‌به و په‌رده‌پۆشم به، خودا پارێزه‌رو داپۆشه‌رت بێت.

ئه‌و ڕۆشت و منیش بێده‌نگ بووم، هه‌تا منداڵه‌که‌ی بوو، ئیمامی گه‌ڕه‌ك و چه‌ن دراوسێیه‌ك هاتن بۆ پیرۆزبایی له دایکبوونی منداڵه‌که‌م، منیش خۆشی خۆمم بۆ ده‌ربڕین..!! ڕۆژی دووه‌م دوو دینارم دایه ده‌ست ئیمامی گه‌ڕه‌ك و پێم وت: ئه‌م دینارانه بده به‌و ئافره‌ته بۆ خه‌رجی منداڵه‌که، چونکه ئێمه پێشتر لێك جیابووینه‌ته‌وه. ئیدی له‌وه به دواوه هه‌موو مانگێك له ڕێی ئیمامه‌که‌وه دوو دینارم بۆ ده‌نارد و پێم ده‌وت: ئه‌مه نه‌فه‌قه‌ی منداڵه‌که‌یه.

دووساڵ گوزه‌شت و منداڵه‌که مرد.. خه‌ڵك هاتن بۆ سه‌ره‌خۆشیم و منیش ڕه‌زابوونم به قه‌ده‌ری خودا ده‌رده‌بڕی و سوپاسیانم ده‌کرد.

شه‌وێکیان پاش تێپه‌ڕبوونی مانگێك ئافره‌ته‌که هات و هه‌موو ئه‌و دینارانه‌ی که به ئیمامه‌که‌دا مانگانه بۆم نارد بوو، بۆی گه‌ڕاندمه‌وه و وتی: خوای گه‌وره سه‌ڕت بپۆشێ، وه‌ك چۆن سه‌ڕی منت پۆشی.

منیش وتم: ئه‌م دینارانه په‌یوه‌ست بوون به منداڵه‌که‌ته‌وه، ئێستاش هی تۆن، بیانبه و چیت پێخۆشه وایان لێبکه.[1]

(١) (الف قصة و قصة/١٧٨)



## هاوڕێی ڕاستەقینە

کۆمەڵێك هاوڕێی خۆشەویست، دەگەن بە موحەممەد باقری کوڕی عەلی زەینولعابدین (عليه السلام) موحەممەد پێیان دەڵێت: ئایا یەکێکتان دەتوانێت دەست بکات بە کیسەی هاوڕێ کەیدا و چی بووێت بیبات؟ ئەوانیش دەڵێن: نەخێر کاری وەها ناکەین!! موحەممەد دەڵێت: کەواتە ئێوە برا نین، وەك ئەوەی خۆتان باسی لێوە دەکەن.[1]

## بەکەم سەیری مەکە!!

قەتادە دەڵێت: بۆمان باسکراوە کە سواڵکەرێك دێتە خزمەتی عائیشە ئەویش دەنکە خورمایەکی پێدەدات..! پێی دەڵێن: ئەی دایکی ئیمانداران.. بە دەنکە خورمایەك خێر دەکەن؟!

عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێت: بەڵێ وەڵلاهی وایە.. خەڵك زۆرە و تەنها خوا تێریان دەکات، ئەی ئایا ئەو دەنکە خورمایە مسقاڵە زەڕڕەی زۆری تێدا نییە؟!

وە هەروەها جەعفەری کوڕی بورقان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێمان گەشتووە کە هەژارێك هاتۆتە خزمەت عومەر (رضي الله عنه) لەو کاتەدا عومەر هێشوویەك ترێی بە دەستەوە دەبێت و دەنکە ترێیەك دەداتە هەژارەکە و دەڵێت: ئەم دەنکە ترێیە مسقاڵە زەڕڕەی زۆری تێدایە، ئاوەها بەکەم سەیری مەکەن![2]

(١) (صفة الصفوة/٣٣٣)
(٢) (موسوعة الأخلاق ج١١٩/١)

## مه‌بادا.. حه‌سره‌ته‌که‌ی له‌دڵم ده‌رنه‌چێت!

ئه‌بو یوسفی قازی[1] ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: حه‌قده ساڵ هاوه‌ڵی ئه‌بوحه‌نیفه‌م کرد، فێرخوازی زانستی فه‌رمووده و فقه بووم، که‌مده‌ست و حاڵم شڕ بوو، ڕۆژێك له‌ خزمه‌ت ئه‌بوحه‌نیفه‌دا بووم باوکم هات، له‌گه‌ڵیدا ڕۆشتم، باوکم پێی وتم: ئه‌ی کوڕه‌که‌م.. له‌گه‌ڵ ئه‌بو حه‌نیفه‌دا قاچت ڕامه‌کێشه‌، چونکه ئه‌و نانی برژاوه‌، تۆش پێویستت به‌ موچه‌ و خه‌رجی هه‌یه‌.

ئیدی منیش زۆرێك له‌ کاتی فێرخوازیم که‌م کرده‌وه‌ و گوێڕایه‌ڵی باوکم بووم و کاته‌که‌م دابه‌شکرد له‌ نێوان کارکردن و خوێندندا، پاشان یه‌که‌م ڕۆژێك که‌ هاتمه‌وه‌ کۆڕی ئه‌بوحه‌نیفه‌.. پێی وتم: چی مه‌شغوڵی کردوویت لێمان؟

وتم: مه‌شغوڵ بوون به‌ کاره‌وه‌ بۆ خه‌رجی و.. گوێڕایه‌ڵیم بۆ باوکم. ئیدی دانیشتم، کاتێك خه‌ڵکه‌که‌ هه‌ستان و ڕۆشتن، توره‌که‌یه‌کی پێدام و، وتی: بێ دڵی خۆت مه‌که‌. کاتێك سه‌یرم کرد ده‌بینم سه‌د دره‌همی تێدایه‌، وه‌ پێی وتم: له‌ کۆڕه‌کان دامه‌بڕێ و کاتێك ئه‌مه‌ت ته‌واو کرد، ئاگادارم بکه‌وه‌.

ئیدی به‌رده‌وام ئاماده‌ی کۆڕه‌کان ده‌بووم، وه‌ ماوه‌یه‌کی که‌م تێپه‌ڕی کرد، سه‌د دره‌همی دیکه‌ی پێدام، پاشان ده‌م نا ده‌مێك سه‌د دره‌همی پێئه‌دام، وه‌ من هیچم پێنه‌ئه‌وت بۆ نه‌مانی پاره‌کان، وه‌ك بڵێی که‌سێك پێی ده‌ڵێت.. به‌ر له‌ ته‌واو بوونی پاره‌که‌ کیسه‌یه‌کی تری سه‌د دره‌همی پێده‌دام.. هه‌تا حاڵم باش بوو، و بوومه‌ خاوه‌ن سامان.

ئه‌بو یوسف ده‌ڵێت: کوڕێکم مرد، ئاماده‌ی کفن و دفنی نه‌بووم و.. لێی گه‌ڕام بۆ دراوسێ و خزمه‌کانم ..!! له‌ ترسی ئه‌وه‌ی نه‌وه‌ك زانستێکم له‌ کیس بچێت له‌ خزمه‌تی ئه‌بو حه‌نیفه‌دا، دوایی حه‌سره‌ته‌که‌ی له‌ دڵم ده‌رنه‌چێت..!!!

(١) (أبويوسف القاضي: (مناقب ابي حنيفة للامام الموفق المكي ١/ ٤٧٢، سير اعلام النبلاء ٨/٥٣٦، تاريخ بغداد ١٤/ ٢٤٤))



## برابه‌ش ئاوه‌ها ده‌بێت

عه‌بدولڕه‌حمانی کوڕی عه‌وف کۆچی کرد بۆ مه‌دینه، ئه‌نه‌سی کوڕی مالیك ده‌ڵێت: رسول الله (ﷺ) عه‌بدولڕه‌حمانی کرد به برای سه‌عدی کوڕی ڕه‌بیعی ئه‌نساری (رضي الله عنه) سه‌عد پێی وت: ئه‌ی عه‌بدولڕه‌حمان من له زۆربه‌ی پشتیوانان سه‌روه‌تم فره‌تره و له‌گه‌ڵ تۆدا به‌شی ده‌که‌م، وه دوو هاوسه‌رم هه‌یه کامیانت به دڵ بوو.. بۆت ته‌ڵاق ده‌ده‌م، هه‌ر که عیدده‌که‌ی به‌سه‌رچوو تۆ ماره‌ی بکه..!!
عه‌بدولڕه‌حمان نه‌یویست بێ کار دابنیشێت و بچێته سه‌ر ماڵ و حاڵی حازر، بۆیه وتی: خودا به‌ره‌که‌ت بخاته خێزان و سامانته‌وه.. به‌ڵام تۆ ڕێگای بازاڕم پیشان بده، ئیدی خۆم ماڵ و حاڵێك بۆ خۆم پێکه‌وه ده‌نێم. ئه‌ویش بازاڕی پیشاندا.
ئیدی عه‌بدولڕه‌حمان ده‌ستی کرد به کڕین و فرۆشتن.. قازانج کردن و کۆ کردنه‌وه.. هه‌ر بۆیه زۆری نه‌برد به ڕه‌نج و ماندووبوونی خۆی، ماڵی پێکه‌وه‌نا و.. ژنی هێنا.[1]

## بیر له خه‌ڵك مه‌که‌وه

ئه‌حمه‌دی کوڕی ئه‌بی حه‌واری ده‌ڵێت: وتم به ئه‌بو سوله‌یمانی دارانی: دوێنێ له خه‌ڵوه‌تدا نوێژێکم کرد و زۆر له‌زه‌تم لێبرد!
ئه‌بو سوله‌یمان (رحمه الله) پێی وتم: چشتێك ئه‌و له‌زه‌ته‌ی پێبه‌خشیت؟
وتم: ئه‌وه له‌زه‌تی پێبه‌خشیم که که‌س نه‌یبینیم له کاتی نوێژه‌که‌مدا.
وتی: ئه‌ی ئه‌حمه‌د.. تۆ هێشتا لاوازیت، که بیرت له خه‌ڵکی کردۆته‌وه، بیر له خه‌ڵکی مه‌که‌ره‌وه.[2]

---
(١) (صور من حياة الصحابة/٢٥٥)
(٢) (مواعظ الصالحين والصالحات/٢٣٩)

## تۆ له خودی ستەمكارانیت!

پیاوێك دەچێتە خزمەتی حەسەنی بەسری و لێی دەپرسێت: من بەرگ بۆ ئەمیرە ستەمکارەکان دەدوورم و خودای گەورەش دەفەرمووێت:

﴿وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ ﴾[1]

واته: پاڵ مەدەن بەوانەوە کە ستەمیان کردووە، چونکە دووچاری ئاگری دۆزەخ دەبن.[2] ئیدی نازانم ئایا من لەوانەم کە پشت بە ستەمکاران دەبەستن؟!

حەسەن ( رحمه الله ) پێی دەڵێت: نەخێر.. ئەوانەی دەرزی و دەزووەکەت پێ دەفرۆشن، ئەوانە لەو کەسانەن کە پشت بە ستەمکاران دەبەستن و پشتیوانیان دەبن، بەڵام تۆ لە خودی ستەمکارانیت!![3]

## لەویش وەك تۆ گێژە!!

ئیمامی شافعی ( رحمه الله ) دەڵێت: دوو پیاو زوو زوو دەهاتنە لای ئەعمەش، یەکێکیان خولیای فەرموودە بوو، ڕۆژێك ئەعمەش تووڕە بوو لەوەیان کە خولیای فەرموودە بوو.. پیاوەکەی تریان وتی: ئەگەر ئاوەها لە من تووڕە بووایە، چیتر نە ئەهاتمەوە بۆ لای..!! ئەعمەشیش ( رحمه الله ) پێی وت: کەواتە ئەویش وەك تۆ ئەحمەق و گێژە..!! کە لەبەر خووی بەدی من، واز لە شتێك دەهێنێت کە سوودی هەیە بۆی.[4]

---

(١) (هود/١١٣)
(٢) (پوختەی تەفسیری قورئان/٢٣٤)
(٣) (أنيس المؤمنين/١٠٦)
(٤) (حرمة أهل العلم/٢٢٦)

## بەشـیکە بۆ هەردووکمان

عەبـدوڵڵای خـوشـکەزای موسـلمی کـوڕی سـەعد (رحمهما الله) دەڵێـت: ویسـتی حـەجکـردنـم هـەبـوو، خـالـۆ موسـلیمم دە هـەزار دیـنـاری پێـدام و پێـی وتـم: کـاتێـك چـوویتە شـاری مـەدینە بـزانـە هـەژارتـریـن خـانـەوادە کێیە، ئـەو دە هـەزار دیـنـارەی بـدەرێ. کە گـەشـتمە مـەدیـنە پـرسـیاری هـەژارتـریـن مـاڵـم کـرد، پیشـانیاندام و لـە دەرگـامـدا، ئـافـرەتێـك وەڵامـی دامـەوە و وتـی: تـۆ کێیت؟

وتـم: مـن حاجییەکـم لـە ئـەهـلی بـەغـداد، دە هـەزار دیـنـارم پـێ سـپێـردراوە کـە بیدەم بە هـەژارتـریـن مـاڵی مـەدینە، پـرسـیارم کـرد و ئێوەیـان بـۆ باسـکـردم، فـەرمـوو وەریبگرە.

ئـافـرەتـەکـە وتـی: ئـەی بـەنـدەی خـوا.. هـاوەڵـەکـەت مـەرجی هـەژارتـرینی دانـاوە، ئـەو خێزانـەی بـەرامبـەرمان لـە ئێمە هـەژارتـرن، بیدەن بـە ئـەوان. عـەبدوڵڵا دەڵێت: ئـەو مـاڵـەم جێـهێشـت و چـوومـە لای مـاڵـەکـەی تـر، لـە دەرگـامدا و ئـافـرەتێـك وەڵامـی دامـەوە، منیـش بـابـەتـەکـەم بـۆ باسـکـرد و ئـەویـش وتی: ئـەی بـەنـدەی خـودا.. ئێمـە و دراوسـێکـەمـان لـە هـەژاریـدا هـاوتـایـن، پـارەکـە بـەشـکـە لـە نێوانـماندا.[1]

## ناتوانم لەوە زیاتر بخۆم

عـوقبەی ڕاسـبی دەڵێـت: چـوومـە سـەردانی حەسـەنی بەسـری (رحمه الله) خـەریك بـوو نـان و گـۆشتی دەخـوارد، پێی وتـم: فـەرمـوو بـۆ سـەر خـوانـی ئـازادەکـان (ئـەو کەسـانـەی بـە کەس نیازمـەند نـین خـودا نـەبـێت). وتـم: نـانـم خـواردووە و نـاتـوانـم لـەوە زیـاتـر بخـۆم. حەسـەن وتـی: سبحان الله..!! موسوڵمان هێـندە دەخوات کە نەتوانێـت شتێکی دیکە بخوات؟!![2]

(١) (الف قصة و قصة/١٨٦)
(٢) (مواعظ الصالحين والصالحات/١٩)



## له‌ خزمه‌ت پاشاكاندا

سـیری سـه‌قه‌تی (رحمه الله) ده‌ڵێت: شه‌وێك له‌ شه‌وان ویرده‌كه‌م خوێند و له‌ میحرابه‌كه‌دا قاچم ڕاكێشا.. بانگیان لێ كردم: ئه‌ی سیری.. به‌م شێوه‌ له‌ خزمه‌ت پاشاكاندا داده‌نیشیت؟! منیش قاچم هه‌ڵكێشا و پاشان وتم: سوێند به‌ عیزه‌تی تۆ خودایا.. چیتر هه‌رگیز قاچم ڕاناكێشم.

جونه‌ید ده‌ڵێت: دوای ئه‌وه‌ سیری بۆ ماوه‌ی شه‌ست ساڵ نه‌ به‌ ڕۆژ، نه‌ به‌ شه‌و قاچی ڕانه‌كێشاوه‌.

وه‌ هه‌روه‌ها ئه‌بو موحه‌ممه‌دی ئه‌لحه‌ریری ده‌ڵێت: من بۆ ماوه‌ی بیست ساڵ له‌ خه‌ڵوه‌ت و ته‌نیاییمدا قاچم ڕانه‌كێشاوه‌!! چونكه‌ به‌ڕاستی ڕه‌چاوكردنی جوانترین ئه‌ده‌ب له‌ خزمه‌تی (الله) دا باشتر و له‌به‌رتره‌.[1]

## ترسان له‌ ڕیا

ئه‌بو عه‌بدوڵلای ئه‌نتاكی ده‌ڵێت: فوزه‌یلی كوڕی عه‌یاز و سوفیانی سه‌وری (رحمهما الله) كۆ بوونه‌وه‌ و، وتووێژیان كرد.. سوفیانی سه‌وری دڵنه‌رم بوو و گریا! پاشان وتی: ئومێده‌كه‌م ئه‌م دانیشتنه‌مان ببێته‌ مایه‌ی ڕه‌حمه‌ت و به‌ره‌كه‌ت بۆمان.

فوزه‌یل وتی: به‌ڵام ئه‌ی ئه‌با عه‌بدوڵلا.. من ئه‌ترسم له‌مه‌ پڕ زه‌ره‌رترمان نه‌بێت!! مه‌گه‌ر تۆ باشترین قسه‌ی خۆتت نه‌كرد و منیش باشترین قسه‌ی خۆمم نه‌كرد، مه‌گه‌ر تۆ قسه‌ت نه‌ڕازانده‌وه‌ بۆ من و من قسه‌م نه‌ڕازانده‌وه‌ بۆ تۆ؟!

سوفیان گریا و، وتی: منت ژیانده‌وه‌، خودا بتژێنێته‌وه‌.[2]

(١) (إحياء علوم الدين ١٥١/٥)
(٢) (الف قصة و قصة/١٨٧)



## بێ هوودە ڕۆشتن

مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) دەڵێت: ئەهلی دنیا ڕۆشتن و خۆشترین شتی دنیایان نەچەشت. پێی دەڵێن: ئەوە چشتێکە کە خۆشترین چێژی هەیە لە دنیادا؟ مالیك دەڵێت: خۆشترین چێژی دنیا ناسینی پەروەردگارە عزوجل.[1]

## سەرۆکی وڵات.. نەدارە؟!

عومەری کوڕی خەطاب (رحمه الله) داوای قەرزێك دەکات لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بە بڕی (٤٠٠) چوار سەد درهەم، عەبدولڕەحمان (رضي الله عنه) پێی دەڵێت: قەرز لە من دەکەیت، لە کاتێکدا بەیتولماڵ لەبەر دەستی خۆتدایە، بۆ لێی نابەیت و پاشان بیگێڕیتەوە؟
عومەر دەڵێت: دەترسم لە بەیتولماڵ بیبەم، لە ناکاو ئەجەلم بێت و نەتوانم پارەکە بگێڕمەوە بۆ شوێنی خۆی!! پاشان تۆ و هاوەڵەکانیشت بڵێن: قەیناکا ئەوە بۆ عومەر بێت. ئیدی لەو دنیا لە بڕی پارەکە، لە چاکەکانم ببەن..!! بەڵام لە تۆی قەرز دەکەم، ئەگەر بیشمرم تۆ دێیت و لە میراتییەکەم دەیبەیتەوە.[2]

## باسکردنی نیعمەتەکان

حەسەنی بەسری (رحمه الله) دەڵێت: باسی نیعمەتەکانی خوا بکەن بەسەرتانەوە، چونکە باسکردنیان.. شوکری نیعمەتەکانە.[3]

---

(١) (منجد الخطيب: ج١/٤٤)
(٢) (أنيس المؤمنين/١٢٧)
(٣) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/١٠٠)

## بڵێ قبوڵم کرد!

ڕۆژێــك.. دزێــك له‌ مزگــه‌وت نــه‌عله‌کانی ئـیمام مــوحیه‌دینی نــه‌وه‌وی ده‌دزێت! ئیمام مـوحیه‌دین ( رحمه الله ) ده‌که‌وێـته‌ شــوێـن دزه‌کـه‌ و به‌ دوایـدا هــاوار ده‌کات: ئــه‌وا نــه‌عـلـه‌کـانـم پێ بـه‌خـشـیت، بـڵێ قـبـوڵـم کـرد.. بـڵێ قـبـوڵــم کــرد..!! مــاوه‌یــه‌ك بــه‌و شـێوه‌ ده‌ڕوات بــه‌ شــوێـنیدا، بــه‌ڵام دزه‌ی دامــاو خێـراتـر ڕاده‌کات و خـۆی وون ده‌کات.

دواتـر ده‌ڵێـن بـه‌ ئیمام مـوحیه‌دین: بـۆچی ئـه‌ونده‌ خـۆت مــانـدوو کـرد؟!! ئیمـام ده‌ڵێت: پـێم خـۆش نـییه‌ سـبه‌ی بـۆ جـووتـه‌ نـه‌علێـك له‌ خـزمــه‌ت پــه‌روه‌ردگــاردا ڕابــووه‌سـێـنرێــم و بــه‌ هــۆی مــنه‌وه‌ ســـزای کـه‌سێــك بدرێـت!!

## هاوده‌مه‌کانم هیلاکم ده‌که‌ن!!

مـه‌نـسـوری کـوڕی زازان ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: کـاتێـك بــه‌ دیـداری بــراده‌رێکم ده‌گـه‌م، دڵخـۆش ده‌بـم بـه‌وه‌ی که‌ باسـی خرابـه‌ی هـاوڕێـیه‌کمان نـه‌کــات، وه‌ قسـه‌ی غــه‌یبه‌تکارێکم بـــۆ بـاس نـه‌کــات که‌ غــه‌یبه‌تی منـی کـرد بـێت، وه‌ بـه‌ڕاسـتی مـن هـیلاك ده‌بـم به‌ ده‌سـت هــاوده‌مــه‌کانمه‌وه‌ هـه‌تــا لـێم جـیا ده‌بــنه‌وه‌، لــه‌ تـرسـی ئــه‌وه‌ی نــه‌وه‌ك بــه‌ بــاس کـردنی که‌ســانی دیکـه‌ خـۆیـشـیان و مـنیـش تـووشـی گــونـاه بکـه‌ن.[1]

## له‌ کـێوی عـه‌ره‌فات

بــه‌کری کـوڕی عه‌بـدوڵڵای مـوزنی ( رحمه الله ) ده‌ڵێـت: کاتێــك له‌ کـێــوی عـه‌ره‌فـات تـه‌ماشــای ئـه‌و هـه‌مـوو حاجـیـیه‌م کـرد، وا هــات بـه‌ خـه‌یـاڵمدا که‌ ئـه‌گـه‌ر منـیان لـه‌ نــاودا نـه‌بـووایــه‌.. ئــه‌وا خــوا له‌ هـــه‌ر هــه‌موویـــان خــۆش ده‌بـــوو.

---

(١) (حرمة اهل العلم/٧٩)

## دوو ڕێگا بۆ مزگه‌وت

عه‌بدوڵڵای کوڕی بیشر ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: له کاتی چوون بۆ نوێژدا تاووسی کوڕی که‌یسان (رحمه الله) دوو ڕێگای هه‌بوو بۆ مزگه‌وت: ڕێگایه‌ك به نێو بازاڕدا تێده‌په‌ڕی و ڕێگایه‌ك له شوێنێکی تره‌وه، ڕۆژێك به ڕێگایه‌کیاندا ده‌ڕۆشت و ڕۆژی دواتر به ڕێگاکه‌ی تردا، ئیدی هه‌ر کات به ڕێگاکه‌ی ناو بازاڕدا بڕۆشتایه و ئه‌و سه‌ره بڕژاوانه‌ی دوکانی گۆشت فرۆشه‌کانی بدیبایه، ئه‌و شه‌وه نانی نه‌ده‌خوارد (له ترسی ئاگری دۆزه‌خ) و خه‌وی لێ نه‌ده‌که‌وت.

وه ئیبن ئه‌بی ڕواد ده‌ڵێت: تاووس و هاوه‌ڵه‌کانیم ده‌بینی که له نوێژی عه‌سر ده‌بوونه‌وه، ڕوویان ده‌کرده قیبله و قسه‌یان له‌گه‌ڵ که‌س نه ده‌کرد و به نزا و پاڕانه‌وه‌کانیان هانایان ده‌برده خزمه‌ت په‌روه‌ردگار.[1]

## وتووێژی گه‌یلانی و شه‌یتان

شێخ عه‌بدولقادری گه‌یلانی (رحمه الله) ده‌ڵێت: ڕۆژێك له بیاباندا بووم، تینوێتی و.. برسێتی و.. گه‌رما زۆریان بۆ هێنا بووم!! له ئاسۆوه نورێکی گه‌وره‌م بۆ ده‌رکه‌وت، پاشان گوێم له ده‌نگێکه‌وه بوو ده‌یگوت: ئه‌ی عه‌بدولقادر.. من خودای تۆم، ئه‌وا هه‌رچی حه‌رام هه‌یه بۆم حه‌ڵاڵ کردیت!! منیش وتم: ڕووت ڕه‌ش بێت.. هه‌ی نه‌فره‌ت لێکراو!! ئیتر نوره‌که گۆڕا بۆ تاریکی و ده‌نگه‌که ده‌یگوت: ئه‌ی عه‌بدولقادر.. به فه‌رمانی خودا و پاشان به زانیاری خۆت ده‌ربازت بوو، هه‌ر به‌مشێوه‌یه حه‌فتا که‌سم له گه‌وره خواپه‌رستان گومڕا کردووه، ئه‌گه‌ر به هۆی زانسته‌که‌ته‌وه نه‌بووایه تۆشم گومڕا ده‌کرد..!!

وه کاتێك که لێی ده‌پرسن: چۆنت زانی که شه‌یتانه؟! شێخ عه‌بدولقادر ده‌ڵێت: به‌وه‌دا زانیم که شه‌یتانه، چونکه خودای گه‌وره شتێك حه‌ڵاڵ ناکات.. که خۆی حه‌رامی کردووه.[2]

(١) (صفة الصفوة/ ٤٠٧ ـ ٤٠٨)
(٢) (نور ألابصار/٢٣٤)



## ژیان وانه‌بێ.. نابێ

حه‌سه‌ن ده‌ڵێت: ڕۆژێك له‌گه‌ڵ عه‌بدوڵلای کوڕی موبارەك دا بووم ( رَحِمَهُ اللهُ ) گه‌شتینه شوێنی ئاو خواردنه‌وه و خه‌ڵکی ئاویان لێ ده‌خوارده‌وه، عه‌بدوڵلا نزیك بوویه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی ئاو بخواته‌وه، خه‌ڵکه‌که نه‌یانناسی، قه‌ره‌باڵغیان دروست کرد و پاڵیان پێوه‌نا، کاتێك لێبوویه‌وه، پێی وتم: ژیان وانه‌بێ نابێ..!! ژیان کاتێك خۆشه، که نه‌ناسرێین و شکۆدار نه‌کرێین و وه‌ك که‌سی ئاسایی ده‌رکه‌وین.[1]

## گیرۆده‌ی چیت؟!

سه‌هلی توسته‌ری ( رَحِمَهُ اللهُ ) ده‌ڵێت: موريد له گیرۆده بوون به سه‌رپێچییه‌وه ده‌ترسێت و.. عاریفیش له گیرۆده بوون به کوفره‌وه ده‌ترسێت.[2]

## یه‌ك قوم ئاو

ده‌ڵێن به حه‌سه‌نی به‌سری: پیاوێك هه‌یه ده‌ڵێت: من شیرینی و فالوده ناخۆم، چونکه ناتوانم شوکری ئه‌و نیعمه‌تانه بکه‌م!!
حه‌سه‌ن ( رَحِمَهُ اللهُ ) ده‌ڵێت: ئه‌وه ئینسانێکی ئه‌حمه‌ق و گێژه! بۆچی ئه‌و ده‌توانێت شوکری یه‌ك قوم ئاوی سارد بکات؟!![3]

---

(١) (ألاتقياء ألاخفياء/٢٤٩)
(٢) (أقوال السلف/١٤)
(٣) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/١٠٢)

## من بۆ ئەم ڕۆژەم هەڵگرتبوو

کاتی سەرەمەرگ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ) داوای جبەیەکی خۆی کرد کە لە خوری دروست کرا بوو، کاتێك بۆیان هێنا، وتی: لەم جبەدا کفنم بکەن، چونکە لەم جبەدا ڕووبەڕووی بێبڕواکان جەنگاوم لە بەدردا.. من بۆ ئەم ڕۆژەم هەڵگرتبوو.[1]

## چوون و گەڕانەوە.. لە بازاڕ

ئین ئەبی عەدی دەڵێت: داوودی کوڕی ئەبی هیند (رحمه الله) هاتە لامان و، وتی: ئەی گەنجەکان شتێکتان بۆ باس دەکەم بەڵکو یەکێکتان سوودی لێ وەربگرێت، لە تەمەنی لاوێتیمدا زوو زوو دەچوومە بازاڕ، کاتێك کە دەگەڕامەوە بۆ ماڵ، لەسەر خۆمم پێویست دەکرد کە هەتا فلان شوێن دەبێت من یادی خوا بکەم، کە دەگەشتمە شوێنەکە لەوێشەوە لەسەر خۆمم پێویست دەکرد کە هەتا فلان شوێنی تر دەبێت من یادی خوا بکەم، ئیدی لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێن هەتا دەگەشتمەوە ماڵەوە، من بەردەوام یادی خودام دەکرد.[2]

## زوڵم مەکە و.. مەترسە

پیاوێکی قورەیشی دەڵێت بە عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ): نەرمونیان بە لەگەڵماندا، دڵمان پڕ بووە لە ترس بەرامبەرت! عومەر دەڵێت: ئایا لەو توندییەمدا هیچ زوڵمێکم لێکردوون؟ پیاوەکە دەڵێت: نەخێر. عومەر دەڵێت: دەی خوا ترسم زیاتر بکات لە دڵتاندا!![3]

(١) (الف قصة وقصة/٢٦٨)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء: ج١/٤٦٤)
(٣) (أنيس المؤمنين/١٣٢)

## گه‌وره‌ی خزمه‌تكار!

ئه‌بـوعه‌لی ڕیباتی ده‌ڵێـت: بـوومه هـاوڕێی عه‌بـدوڵڵای ڕازی ( رَحِمَهُ اللهُ ) كه به‌ره‌و ده‌شـــت و چـۆڵـه‌وانی ده‌ڕۆشـــت.

عه‌بدوڵڵا وتی: بـه مـه‌رجێـك هـاوڕێـتیت قبـوڵ ئه‌كـه‌م كـه یـه‌كێكمـان ببینه ئـه‌مـیر. وتـم: باشـــه تـۆ ببه‌ره ئـه‌مـیر. وتـی: فـه‌رمـان لـه مـن و گوێـڕایه‌ڵیش لـه تـۆ. وتـم: بـــه‌ڵێ هـه‌ر واده‌كـه‌ین.

عـه‌بدوڵڵا تـوره‌كـه‌یه‌كی هـێنا.. توێـشـــووی ســـه‌فـه‌ری تێخســـت و دای به شـــانیدا، وتـم: بیهێنـه بـا مـن هــه‌ڵی بگـــرم. وتی: ئـه‌ی مـن ئـه‌مـیر نیم و گـوێـڕایـه‌ڵیش لـه‌ســـه‌ر تـۆ نییه‌؟! كه‌واتـه گـوێـڕایـه‌ڵ بـه.

ئیـدی ڕۆشـــتین.. شـــه‌وێكیان ئـاســـمان ڕه‌حمـــه‌تی ده‌بـارانـــد، مـــن دانیشـتم و عه‌بدوڵڵا هـه‌تـا بـه‌یـانی بـه ڕاســـه‌رمـه‌وه ڕاوه‌ســـتا، جلوبـه‌رگـێكی لـه‌به‌ردا بـــوو نـه‌یده‌هـێشـــت مـــن تـــه‌ڕ ببـم، منیـش لـه دڵی خـۆمـدا ده‌مـــگوت: بـریـا مـن ده‌مـردم و نـه‌مـده‌وت: تـۆ ئـه‌مـیر به‌![1]

## چۆن ڕۆژت كـرده‌وه‌؟!

مـــروزی ده‌ڵێـت: پرســـیم له ئـیمام ئـــه‌حمه‌د ( رَحِمَهُ اللهُ ): چـــۆن ڕۆژت كـرده‌وه‌؟! ئـه‌حمه‌د وتی: كـه‌سێـك كه خـواكـه‌ی داوای ئـه‌داكـردنی فـه‌رزه‌كانی لێبكـات، پـێـغه‌مبه‌ره‌كه‌ی (ﷺ) داوای جـێبه‌جـێكـردنی ســونه‌ته‌كانی لێبكـات، دوو فـریـشـــته‌كـه‌ی داوای ڕاسـتكـردنـــه‌وه‌ی كـرده‌وه هـه‌ڵـه‌كـانی لێـبكه‌ن، نـه‌فســـی داوای هـــه‌وا و ئـــاره‌زووی لێبكـــات، فـریشـــته‌ی گیانكێـــش چـاوه‌ڕێـــی ڕۆح كـێشـــانی بكــات و ســه‌ربـاری هــه‌مـــوو ئه‌مانـه‌ش.. خـاوخـێزانـــی داوای خــه‌رجـــی لێبكـــه‌ن، ده‌بـــێ ئـــه‌و كـه‌ســـه چـــۆن ڕۆژ بكـاتـه‌وه‌؟!![2]

---

(١) (إحياء علوم الدين ١٨٣/٢)

(٢) (الف قصة و قصة/١٨٨)

## فێری زۆری بۆ جێ هێشـــتووین

ئه‌ســـمای كچـی ئه‌بـوبه‌كـر (رضي الله عنها) ده‌ڵێـت: كاتێــك پێـغه‌مبه‌ر (ﷺ) له مه‌ككه‌وه به‌رێ كه‌وت بـۆ مــه‌دینه، ئه‌بـوبه‌كـر هـه‌مــوو پـاره‌كـانی كه پێـنج یـان شــــه‌ش هــــه‌زار ده‌بــــوو، لـه‌گــه‌ڵ خـــۆی هـه‌ڵگـــرت و به هـاوڕێـــیه‌تـــی پێـغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌رچـــوو.
ئـه‌بـــو قـوحافــه‌ی باپــیرم (واته بـاوكی ئـه‌بـوبه‌كـر) بینـایی چـــــاوه‌كانی له ده‌ســت دابـــوو، هـــاتـــــه لام و وتـی: ئه‌بـوبــه‌كـر به خــۆی و پــاره‌كانییه‌وه تـووشـــی كـاره‌ســـاتی كـردن. وتـم: نه‌خێر باپـــیره گیـان.. ئـه‌و خێـری زۆری بـــۆ جێ هێشـــتووین..!! دواتــر چـــووم ورده بــه‌ردم هێنــا و خســـتنمه كه‌له‌بـــه‌ری مــاڵه‌كه و به به‌رگێك داپـۆشـــین، پاشــان ده‌ســتیم گـرت و خســـتمه ســـه‌ر بــه‌رگه‌كه و پێم وت: باپـــیره گـیان.. بـاوكم ئه‌مــه‌ی بـــۆ داناویـــن. ئـه‌و كـاته باپـیرم وتی: ده‌ی ئـه‌گـه‌ر ئـه‌مه‌ی بـۆ دانابن، ئـه‌وه نیعمه‌ته.[1]

## ته‌نها نوێژ كردن پێوه‌ر نیه

پیاوێـك به عـومه‌ری كـوڕی خه‌طـابی وت: به‌ڕاســـتی فڵان پیـاو ڕاســـتگـۆیه. عـــومـــه‌ری فـاروق (رضي الله عنه) وتی: هـاوســـه‌فـه‌ری بـــوویت؟ وتـی: نه‌خێـر. عـومه‌ر وتـــی: نـاكـــۆكییه‌ك له نـێوانتانـــا هـه‌بـــووه؟ وتـــی: نه‌خێـــر. عـــومه‌ر وتـــی: ئـــه‌ی ئـه‌مانـه‌تێكت پێ ڕاســپاردووه؟ وتی: نه‌خێـر. عومه‌ر وتی: تـۆ كه هیچ زانیارییه‌كت له‌ســــه‌ری نیـیه، له خـۆتــه‌وه چـــۆن حـوكم ده‌ده‌یـت..؟! ! وابـــزانـــم ته‌نـــیا له مــزگـه‌وت دا بـینیوته.. ســـه‌ری بـه‌رز كـردۆتـه‌وه و نـزمی كـــردۆتـه‌وه..!![2]

---

(١) (الف قصة وقصة/١٩٤)
(٢) (الف قصة و قصة/٢٠٢)



## شیفایه‌ك به‌ هه‌نگوین

ڕۆژێك عومه‌ری كوڕی خه‌طاب نه‌خۆش كه‌وت.. پزیشكه‌كان هه‌نگوینیان بۆ نووسی و له‌و كاته‌شدا هه‌نگوین له‌ به‌یتولماڵدا هه‌بوو، كه‌ له‌ هه‌ندێ وڵاتی ڕزگار كراوه‌وه‌ هێنابوویان، به‌ڵام عومه‌ر (رضي الله عنه) هه‌نگوینه‌كه‌ی به‌كار نه‌هێنا هه‌تا خه‌ڵكه‌كه‌ی كۆ كرده‌وه‌ و سه‌ركه‌وته‌ سه‌ر مینبه‌ر و وتی به‌ خه‌ڵكه‌كه‌: وه‌ك ده‌زانن پزیشكه‌كان هه‌نگوینیان بۆ نووسیوم و له‌ به‌یتولماڵیشدا هه‌نگوین هه‌یه‌.. ئه‌گه‌ر ئێوه‌ ڕێگام پێبده‌ن ئه‌وا ئه‌ندازه‌یه‌كی به‌كار ده‌هێنم وه‌ك ده‌رمان، ئه‌گه‌ر نا.. ئه‌وا له‌من حه‌رام بێت.

دوای بیستنی ئه‌م قسانه‌ خه‌ڵكه‌كه‌ ده‌ستیان كرد به‌ گریان و به‌ تێكڕای ده‌نگ مۆڵه‌تیان پێدا، خه‌ڵكه‌كه‌ بڵاوه‌یان لێكرد و یه‌كێكیان به‌وی تریانی ده‌وت: خوا پاداشتی چاكه‌ت بداته‌وه‌ ئه‌ی عومه‌ر..!! به‌ ڕاستی ئه‌ركی ئه‌و خه‌لیفانه‌ت قورستر كرد كه‌ له‌ دوای خۆته‌وه‌ دێن.[1]

## كێ به‌رگه‌ ده‌گرێت؟!

ئه‌بوبه‌كری واستی ده‌گێڕێته‌وه‌ و ده‌ڵێت: سمنونی كوڕی حه‌مزه‌ (رحمه الله) وتی: ئه‌ی په‌روه‌ردگارم.. ڕازیم و به‌رگه‌ی هه‌موو قه‌زا و قه‌ده‌رێك ده‌گرم، كه‌ له‌ خزمه‌ت تۆوه‌ بێت.

دوای ئه‌وه‌ بۆ ماوه‌ی چوارده‌ ڕۆژ، ڕێڕه‌وی میزكردنی گیرا..!! وه‌ك چۆن مار به‌سه‌ر لمه‌وه‌ پێچ ده‌خوا، ئاوه‌ها سمنون به‌ لای ڕاست و چه‌پیدا ده‌كه‌وت و لوول ده‌بوو له‌ تاو ئازار، دواتر كه‌ خوای گه‌وره‌ شیفای پێبه‌خشی، سمنون وتی: ئه‌ی په‌روه‌ردگارم.. به‌ میهره‌بانی خۆت لێم خۆش ببه‌، من په‌شیمانم له‌و قسه‌یه‌ی كه‌ كردم.[2]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/١٤٦ ـ ١٤٧)
(٢) (صفة الصفوة/٤٦٩)

## سـەربازێکی نەناسـراو!

فەڕوخ ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ژیانێکی خۆشی هەبوو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، بەڵام ئەوە نەبووە هۆکار بۆ ئەوەی خۆی دوور بگرێت لە ئەرکە ئیمانییەکەی کە غەزاکردنە، بۆیە بێ هیچ دوو دڵییەك فەڕوخ ماڵئاوایی کرد لە هاوسەرە دووگیانەکەی و سی هەزار دیناری لەلا جێهێشت، وە بە مەبەستی غەزاکردن لە مەدینەوە بەرەو خوراسان بەڕێ کەوت، پاش تێپەڕ بوونی بیست و حەوت ساڵ، وەك سوار چاکێکی بە تەمەن و لێهاتوو، بە سواری ئەسپێکەوە و ڕمێك بە دەستییەوە.. خۆی کردەوە بەناو شاری مەدینەدا، لە بەردەم ماڵەکەیدا دابەزی و بە ڕمەکەی دەستی دەرگاکەی کردەوە، کوڕەلاوێکی لێ هاتە دەر و پێی وت: ئەی دوژمنی خودا دێیتە سەر ماڵەکەم؟ فەڕوخ وتی: نەخێر، بەڵکو ئەمە ماڵی منە و تۆ هاتوویتە سەر خێزانەکەم!! دەمەقاڵە و پەلاماردانیان بوویە هۆی کۆبوونەوەی دراوسێکان و هەواڵەکەش گەشت بە مالیکی کوڕی ئەنەس و شێخانی مەدینە، ئەوانیش هاتن بۆ پشتگیری کردنی کوڕە لاوەکە، کە ناوی ڕەبیعەیە و خاوەن ماڵەکەیە!!

ڕەبیعە دەیوت: وەڵلاهی وازت لێ ناهێنم تا نەتبەمە لای سوڵتان.

فەڕوخیش دەیوت: وەڵلاهی منیش وازت لێ ناهێنم هەتا نەتبەمە لای سوڵتان، تۆ هاتوویتە سەر ماڵەکەم و هاوسەرەکەم!!

دەنگەدەنگ و ژاوەژاوێکی زۆر دروست بوو، بەڵام کاتێك خەڵکەکە مالیکیان بینی هەموویان بێدەنگ بوون..!!

مالیك ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) وتی: ئەی پیاو هیچ شتێکت هەیە بیڵێیت؟

فەڕوخ وتی: ئەمە ماڵی منە و من فەڕوخم.

ژنەکەی لەو کاتەدا گوێی لە دەنگی فەڕوخ بوو، ناسییەوە و هاتە دەرەوە، وتی: ئەمە پیاوەکەی منە و ڕەبیعەش کوڕەکەیەتی، ئەو کاتەی منی جێهێشت من دووگیان بووم پێوەی. ئیدی ئەوکاتە جەنگ و هەرا.. بوویە خۆشی و شادی! خەڵکی بڵاوەیان لێ کرد و فەڕوخ ڕۆشتە ژوورەوە بۆ لای هاوسەرەکەی و پێی وت: ئەمە کوڕەکەی منە؟ هاوسەرەکەی وتی: بەڵێ ئەوە کوڕەکەی خۆتە. فەڕوخ وتی: من ئێستا چل هەزار دینارم پێیە، ئەی تۆ ئەو سی هەزار دینارەی جێم هێشت چیت لێ کرد؟ هاوسەرەکەی وتی: لە شوێنێك شاردوومەتەوە، دوای چەند ڕۆژێك بۆتی دێنمەوە.

ڕەبیعە ڕۆشت بۆ مزگەوت و وەك هەمیشە کۆڕی بەست، مالیکی

کـوڕی ئـەنــەس و زانـایــان و گـــەورە پیـاوانی مـــەدینە و خـــەڵکانی لە دەور کـــۆبـــوویـــەوە، دایکـی ڕەبیـــعە بـــە فـــەڕوخی وت: بـــڕۆ لە مـزگـــەوتی پێـغەمبەر (ﷺ) نـوێـژ بـکە. ڕۆشـــت و ســـەیری کـرد کـــوڕێکی گـەورە گـیراوە، نـزیك بـــوویـەوە و کەمێك ڕێیان بـــۆ خـــۆش کـرد، ڕەبیعە ســـەری دانـــەواند و وای پـیشـــاندا کە فـــەڕوخی نەبینـــیوە، فـــەڕوخ پـرســـی لە کەسێـــك: ئـــەو پیـــاوە کـێ یە؟ پیـاوەکە وتـی: ئـــەوە ڕەبیعـــەی کـــوڕی ئـــەباعەبدولڕەحمانە. فـــەڕوخ بە دڵێکـــی خـۆشـــەوە گـەڕایـــەوە بـــۆ لای هـاوســـەرەکەی و پێـی وت: کـوڕەکـەتـم لە حـاڵەتێکدا بینـی، هـیچ کەسـم لە ئـــەهلی فیقهـو عـیلم نـەدیـوە لەو بـــاڵاتـر!! هـاوســـەرەکەی وتـی: بـاشـــە ئێســـتا ســـی هـــەزار دینـارەکەت پـێ خـۆشـــە بـــۆتی بهێنمـــەوە یـان پـلەوپـایـەی کـوڕەکـەت؟ وتی: نـا سـوێند بـەخـودا ئـەمـەم پـێ خـۆشـــترە. هـاوســـەرەکەی وتی: دەی بـزانـــە من هـــەر هـەمـــوو پـارەکـەی تـــۆم لـــە پـەروەردەکـردنی کـوڕەکـەتدا خـەرجکـردووە. فـــەڕوخ وتـی: دەی ســـوێند بـە خـــودا بـە زایـــەت نـــەداوە.

وە ســـەبارەت بـــە زیـرەکی و زانســـتی ڕەبیعە، یونســـی کـوڕی یـــەزیـد دەڵێـــت: ئـــەبـوحـەنیفـــەم بینـــی لە لای ڕەبـــیعە (رحمهما الله) لە هـــەوڵی ئـــەوەدابـــوو لـەو قـــســـانە تێبـگات کـە ڕەبیعە دەیکـردن.[1]

## کـێ پـێدەکـەنێت؟!

فـوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: تەڵحەی کـوڕی مـوســەڕیف (رحمه الله) ڕۆژێـك پێدەکـەنێت، دواتـر بە نـەفسـی خـۆی دەڵێت: بـە چـشـتێـك پێدەکـەنیت؟! لـە ڕاسـتیدا کـەسێك دەبێت پێبکـەنێت، کـە هـیچ مـەتـرسـییەکی نـەمـابێـت و لـە پـردی ســیرات تێپـەڕی کـــردبێت! ســـوێـندبێت.. پـێنەکـەنـم هـەتـا نـەزانـم کـۆتـاییەکـەم چـۆن دەبێت؟!!

ئیدی هـەتا لـە ژیـاندا بـــوو، نـەبـینـراوە تـەڵحە پێبکـەنێت!![2]

(١) (صفة الصفوة/٣٤٨ـ٣٤٩)
(٢) (صفة الصفوة/٥٥٩)

## باڵنده‌یه‌ك له‌ناو ئاودا

كۆمه‌ڵێك زانا ده‌چنه لای فاتمه‌ی كچی عه‌بدوملەلیك (رحمها الله) بۆ پرسه و سه‌ره‌خۆشی له مه‌رگی عومه‌ری كوڕی عه‌بدولعه‌زیزی هاوسه‌ری، داوای لێ ده‌كه‌ن كه‌مێك باسی عومه‌ریان بۆ بكات، تا بزانن ڕه‌فتاری ناو ماڵی چۆن بووه؟ چونكه كه‌س وه‌ك ژن، پیاوه‌كه‌ی ناناسێت.

فاتمه ده‌ڵێت: له نوێژ و ڕۆژوودا له ئێوه زیاتری نه‌بوو، به‌ڵام سوێند به خودا كه‌سم نه‌دیوه هێنده‌ی ئه‌و له خوداترس بێت، وه‌ڵڵاهی خۆشترین كاتی پیاو ئه‌و كاته‌یه، كه به هیلاكی دێته‌وه لای خێزانی و كه‌مێك ده‌حه‌سێته‌وه، شه‌وان له نێوان من و ئه‌ودا ته‌نیا لێفه‌یه‌ك هه‌بوو، هێنده‌م ده‌زانی یادی خوای ده‌كرده‌وه و ڕاده‌په‌ڕی و ده‌ستی ده‌كرد به باڵ ڕاته‌كاندن، وه‌ك بڵێی باڵنده‌یه‌ك بێت و كه‌وتبێته ناو ئاوێكه‌وه، پاشان ده‌ستی ده‌كرد به گریان! منیش له دڵی خۆمدا ده‌موت: وه‌ڵڵاهی خۆی به هه‌لاكه‌تا نه‌بات باشه!! پاشان به‌زه‌ییم پێدا ده‌هاته‌وه و لێفه‌كه‌م له‌سه‌ر هه‌ردووكمان لاده‌دا و پێم ده‌وت: خۆزگه و سه‌د خۆزگه هێنده‌ی ڕۆژهه‌ڵات و ڕۆژئاوا له خه‌لافه‌ته‌وه دوور بووینایه، سوێند به خودا له‌وه‌تی تێی كه‌وتووین خۆشیمان نه‌دیووه.

## ئه‌گه‌ر موحتاجی كه‌س نه‌بیت

حه‌مادی كوڕی زه‌ید ده‌ڵێت: ئه‌یوبی سختیانی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) پێی وتم: به‌رده‌وام به له كه‌سابه‌تی ناو بازاڕت، چونكه هه‌تا ئاتاجت نه‌بێت به براكانت، وه‌ك ئه‌وه وایه كه به‌خشنده بیت بۆیان، ئه‌گه‌رچی هیچیشیان پێ نه‌به‌خشیت.[1]

(١) (روضة الزاهدين/٩١)



## تەوافێك بە مەلەكردن!

موجاهدی كوڕی جوبەیر دەڵێت: سێڵاوێك[1] هات..! چوار دەوری كەعبەی شەریفەی داپۆشی، ئیدی تەواف كردن خوداپەرستییەك بوو، خەڵكی دەستەوسان بوون لە ئەنجامدانی، هەر خوداپەرستییەكیش كە خەڵكی توانایان بەسەریدا نەدەشكا، عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر (رضي الله عنهما) هەڵدەستا بە ئەنجامدانی، بۆیە عەبدوڵڵا بە ناو لافاوەكەدا و بە مەلەكردن دەستی كرد بە تەوافی بەیت!![2]

... خۆرە، گەر بەفر و باران و سێڵاوە
وشك و برینگە، یا قوڕ و لیتاوە
شێتانە دێم، لە دەوریماڵت گەڕێم
دڵ غەرقی ئەوین و جەرگ بۆت سوتاوە

## شتێك لە دڵتا ماوە؟!

پیاوێك بە جنێودان و قسەی ناشیرین كەوتە شوێن ئەحنەفی كوڕی قەیس، ئەویش هیچ وەڵامی نەدایەوە، بەڵام كاتێك نزیكبوونەوە لە ئاوەدانی.. ئەحنەف (رحمه الله) ڕووبەڕووی پیاوەكە وەستا و پێی وت: ئەی مەرد.. ئەگەر شتێك لە دڵتا ماوە بیڵێ، نەوەك هەندێك لە نەفامەكانی گەڕەك گوێیان لێت بێت و، بەو شێوازەی خۆت وەڵامت بدەنەوە!![3]

(١) (سێڵاو: لافاو)
(٢) (صفة الصفوة/٢٧٩)
(٣) (مواعظ الصالحين والصالحات/١٩٤)

## متمانە بە پەروەردگار

دەڵێن بە ئەبوحازم (رحمه الله): سەروەت و سامانەکەت چییە؟! دەڵێت: متمانە و پشت بەستنمە بە خوا و.. نائومێدی و بێ نیازیمە بەوەی لە دەستی خەڵکدایە.[1]

## تۆ شیاو نیت ببیتە والی!

ئەقرەعی کوڕی حابس چووە خزمەت ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەطاب، دیتی عومەر لەگەڵ منداڵەکانیدا یاری دەکات و منداڵەکان خۆیان داوە بەسەر شان و پشتیدا، ئەقرەع دەڵێت: ئەمە چییە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟! ئاوەها ڕەفتار دەکەن لەگەڵ منداڵەکانتانا؟!

عومەری بە سۆز و میهرەبان بۆ ڕەعیەت (رضي الله عنه) ڕادەپەڕێت و لێی دەپرسێت: ئەی تۆ ئەقرەع.. چی دەکەیت لە ماڵەوە؟! ئەویش دەڵێت: من کە ڕۆشتمە ماڵەکەمەوە، ئەوەی وەستاوە دادەنیشێت، قسەکەر بێدەنگ دەبێت، خەوتوو خۆی ڕێك دەکاتەوە، وە من دە کوڕم هەیە هیچیانم ماچ نەکردووە..!!

عومەر دەڵێت: دەی کەواتە تۆ شیاو نیت ببیتە والی بەسەر موسوڵمانانەوە. ئیدی عومەر فەرمانی پێدەدات و.. لەسەر کار لایدەبات..!![2]

## غەمی دنیا.. نا!

مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر دڵێك غەمی ئاخیرەتی تێدا نەبێت.. وێران دەبێت، وەك چۆن خانوویەك ئەگەر کەسی تێدا نەژی و چۆڵ بێت.. وردە وردە وێران دەبێت.

---

(١) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/٧٠)
(٢) (ألف قصة وقصة/٢١٠)

## دواکەوتنی مووچەی دوو مانگ

معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ماوەی دوو مانگ.. موچەی خەڵکی لە بەیتولماڵ دەگرێتەوە و بۆیان سەرف ناکات، ڕۆژێك سەردەکەوێتە سەر مینبەر و دەست دەکات بە وتاردان.
ئەبو موسلیمی خەولانی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) بانگی دەکات و پێی دەڵێت: ئەو پارەی لەژێر دەستایە، نە هی تۆیە.. نە هی باوك و دایکت، ئیتر بە چ هەقێك لە خەڵکی دەگریتەوە و مووچەکانیان پێ نادەیت؟!!
تورەبوون لە ڕوخساری معاویەدا (خوا لێی خۆش بێت) بە دیار دەکەوێت و خەڵك چاوەڕێ دەبن هەتا بزانن چی دەکات؟! معاویە ئاماژەیان پێدەدات کە لە شوێن خۆیاندا بمێننەوە، پاشان دادەبەزێت و دەڕوات دەست نوێژ دەگرێت و بڕێك ئاو دەپڕژێنێت بە خۆیدا، پاشان دەڕواتەوە سەر مینبەر و پاش حەمد و سەنای خودا دەڵێت: ئەبوموسلیم ڕاستی وت، من گوێم لە رسول الله (ﷺ) بوو دەیفەرموو: تورەبوون لە شەیتانە، شەیتانیش لە ئاگرە.. ئاویش ئاگر دەکوژێنێتەوە، ئەگەر کەسێکتان تورە بوو.. با دەست نوێژ بگرێت، ئەی خەڵکینە: لەسەر بەرەکەتی خوای (عزوجل) بە ڕێ کەون بۆ وەرگرتنی موچەکانتان.[1]

## لەوین و قین

ئیمامی عەلی (عليه السلام) دەڵێت: خۆشەویستەکەت بە شێوەیەکی ئاسایی خۆشبووێت و زیادەڕەوی لە خۆشەویستییەکەتدا مەکە، نەوەك ڕۆژێك ڕقی لێ هەڵبگریت، بەهەمانشێوە ڕقت لە هەرکەس هەیە زیادەڕەوی تێدا مەکە، نەوەك ڕۆژێك ببێتە یەکێك لە خۆشەویستەکانت.

---

(١) (صور من حياة التابعين/٣٦٦)

## شــکۆداری له ته‌قوادایه

ئــیمامی شــافــعی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌گاتــه میســر.. عه‌بــدوڵڵای کــوڕی حــه‌که‌م پـێی ده‌ڵێت: ئـه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت لـه میســردا نـیشــتـه‌جێ ببـیت، بــا قــووتی ســاڵێکــت هــه‌بێــت و.. پــه‌یــوه‌ندیت بــه ســولْتانــه‌وه هــه‌بێت، هـه‌تا شــکۆی خـۆت بپارێـزیت.

ئیمامـی شــافعی پێـی ده‌ڵێـت: ئـه‌ی ئـه‌باموحه‌ممه‌د.. هــه‌ر که‌س ته‌قــوا شــکــۆداری نــه‌کات، هـیچ شــتێــك شــکــۆداری ناکــات، مــن لــه غـــه‌ززه لــه‌دایك بــووم و، له حیجـاز گــه‌وره بــووم، ئــه‌وه‌ی هــه‌مان بــوو ته‌نیـا قــووتی شه‌وێك بــوو!! لـه‌گه‌ڵ ئـه‌وه‌شدا قـه‌ت بـه بـرسـییه‌تی نـه‌ماوینـه‌ته‌وه.[1]

## نـوێژه‌کـه‌یان لێ تێکـدایت؟!

عه‌بدوڵڵای کوڕی عه‌باس (رضي الله عنهما ) ده‌ڵێـت: خشـــوع له نـوێــژدا ئـه‌وه‌یــه که نــوێـژخــوێـن هێنده بێ ئـاگـابێت له دنیا، کـه نـه‌زانـێت کێ لــه لای ڕاســتییه‌وه وه‌ســتاوه و کێ لـه لای چـه‌پییه‌وه وه‌ســتاوه بــۆ نــوێــژ.

جـارێـك مـوســای کـوڕی جـه‌عـفـه‌ر (عليه السلام) خه‌ریکی نـوێـژ خوێـندن ده‌بێت (پـاش دانـانی به‌ربه‌ستێــك له به‌رده‌میـدا)، دوای لـێ بــوونــه‌وه له نـوێــژه‌که‌ی که‌سێـك پێی ده‌ڵێت: خـه‌ڵکی هێـنده هــاتن بـه به‌رده‌مـتا.. هــه‌تا نـوێــژه‌کــه‌یان لێ تێکـدایت. مـوسا ده‌ڵێت: ئـه‌وه‌ی نـوێـژی بـۆ ده‌کـه‌م زۆر نـزیکـتره لــه‌وه‌ی که بـه بـه‌رده‌ممدا ده‌ڕوات.[2]

---

(١) (الف قصة و قصة/٢٠٧)

(٢) (إحياء علوم الدين٥/١٦٦ــ١٦٨)

## فراپترین گومان

فوزەیلی کوڕی عەیاز (رحمه الله) دەڵێت: ئا لەم شێوەدا.. دەستی سوفیانی کوڕی عویەینەم گرت و پێم وت: ئەگەر وا گومان دەبەیت کە لەسەر زەویدا لە من و تۆ خراپتر ماوە، ئەوا خراپترین گومانت بردووە.[1]

## خوڕەوشتی ئەهلی سەلەف

کۆمەڵێك دەڕۆن بۆ ماڵی سوفیانی سەوری (رحمه الله) بەڵام ئەو لە ماڵ نابێت، خۆیان دەرگا دەکەنەوە و دەچنە ژوورەوە.. سفرە دادەخەن و نان دەخۆن، کاتێ سوفیان دێتەوە زۆر دڵخۆش دەبێت بەو کارەیان و دەڵێت: خوڕەوشتی ئەهلی سەلەفتان بیر خستمەوە.. ئەوان ئاوەها بوون..!![2]

## سەرخۆشێکی جنێو فرۆش!!

عومەری کوڕی خەطاب سەرخۆشێکی بینی.. ویستی بیبات بۆ ئەوەی سزای بدات، سەرخۆشەکەش دەستی کردە جنێودان بە عومەر.. ئیدی عومەر گەڕایەوە دواوە و وازی لێهێنا..!!

پێیان وت: ئەی ئەمیری ئیمانداران، بۆچی کە جنێوی پێدایت وازت لێهێنا؟! عومەر (رضي الله عنه) وتی: بۆیە وازم لێهێنا.. چونکە بە جنێوەکانی تورەی کردم، ئەگەر سزام بدایە ئەوا بۆ تۆڵە سەندنەوەی خۆم بوو، منیش پێم خۆش نییە بۆ پاراستنی نەفسم لە موسوڵمانێك بدەم، ئیدی چاوەڕێم کرد هەتا ئارام بمەوە و تورەییەکەم نەمێنێت.[3]

---

(١) (منجد الخطيب: ج١/٤٦)
(٢) (إحياء علوم الدين١٧٨/٥)
(٣) (موسوعة الأخلاق ج١/٣٤٣)

## بده لە کوڕی بەڕێزترین

ئەنەس دەڵێت: پیاوێك لە میسرەوە هاتە خزمەتی عومەری کوڕی خەطاب و پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران.. پەنا دەگرم بە تۆ لە زوڵم و ستەم.
عومەر وتی: پەنات هێناوە بۆ کەسێك بەڵێن وەهایە کە بتپارێزێت، بڵێ بزانم کێشەکەت چییە؟ پیاوەکە وتی: پێشبڕکێم کرد لەگەڵ.. کوڕی عەمروی کوڕی عاصی ئەمیری میسر، پێشبڕکێکەم لێبردەوە.. ئیدی کوڕەکەی عەمرو بە قامچی دەستی کرد بە لێدانم و دەیوت: من کوڕی بەڕێزترینم.
عومەر (رضي الله عنه) نامەیەکی نوسی بۆ عەمروی کوڕی عاص، تیایدا داوای لێکرد کە خۆی و کوڕەکەی بکەونە ڕێ و بە زووترین کات بگەنە لای ئەمیری باوەڕداران، عەمرو و کوڕەکەی هاتن.. ئەو کاتە عومەر پیاوە میسرییەکەی بانگ کرد و پێی وت: هانێ ئەوە قامچی. بیگرە و لێیبدە. ئیدی پیاوە میسرییەکە بە قامچی دەستی کرد بە لێدانی کوڕەکەی عەمرو، عومەریش دەیگوت: بدە لە کوڕی بە ڕێزترین.
ئەنەس دەڵێت: ئیدی لێیدا و سوێند بە خوا ئێمەش پێمان خۆش بوو کە لێی بدات، بەڵام کاتێك پیاوەکە بەردەوام بوو لە لێدانەکەی.. ئاواتمان خواست کە دەستی لەسەر هەڵگرێت، پاشان عومەر وتی بە میسرییەکە: قامچییەکەت بخە سەر عەمرو. پیاوەکە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران.. ئەوەی لێیدام کوڕەکەی بوو، وە منیش هەقی خۆمم وەرگرت. پاشان عومەر وتی: ئەی عەمرو.. کەی خەڵکانتان کردە کۆیلە؟! لە کاتێکدا ئەوان بە ئازادی لەدایك بوون. عەمرو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران.. من ئاگاداری ئەم کارە نەبووم و ئەم پیاوەش نەهاتۆتە لام بۆ شکات کردن.[1]

## چاکەکاری ڕاستگۆ

مەعروفی کەرخی (رحمه الله) دەڵێت: چاکەکاران چەندە زۆرن..! بەڵام ڕاستگۆیان چەندە کەمن!!!

---

(١) (حياة الصحابة ٢/٣٣٧ ـ ٣٣٨)

## تـۆ دەمـیت پاك کـردەوە، ئـێمه دڵی!

مالیکی کوڕی دینار ( رَحِمَهُ اللهُ ) له یـه‌کێـك له کـۆڵانـه‌کانی بـه‌سـره‌دا، پیـاوێکی سـەرخـۆش دەبینێت، بە پـشـتا کـەوتـووە و، دڵـۆپـە مـەی بە لێـوەکانییەوە دەچـۆڕێت و دەڵێت: اَللّٰهُ.. اَللّٰهُ.. اَللّٰهُ..

مالیك دەڵێت: جـوان نییە ئـەو نـاوە گـەورەیـە، له دەم و لێـوێکی تـەڕ بـە شـەرابـەوە بێتە دەرێ. هـەر بـۆیـە دەڕوات و ئـاو دەهێـنێت، دەم و لێـوی سـەرخـۆشـەکەی پێ دەشـوات، پاشـان دۆعـای هیدایـەتی بـۆ دەکـات و دەڕوات.

مـالیك شـەو له خـەونیدا، گـوێی له دەنگێکەوە دەبێت کـە دەڵێت: ئـەی مـالیك.. تـۆ لەبـەر ئێمە دەمیت پـاك کـردەوە، ئـێمەش لـەبـەر تـۆ دڵـیمان پاککـردەوە.

له کـۆتـا بـەشـی شـەودا مـالیك بێدار دەبێـتەوە و دەڕوات بـۆ مـزگـەوت، لـە ڕێگـادا گـوێی لـە پیاوێـك دەبێت کـە دەڵێت: یـاڕەب.. مـن لـەبـەر دەسـتی تـۆدام و پەشـیمانـم لـە کـردەوە خـراپـەکـانم، بـە گـەورەیی خـۆت تـۆبـەکەم قـبـوڵ بکـە، یـاڕەب.. یـاڕەب..!

کـاتێـك مـالـیك نـزیـك دەبێـتەوە لـە پیاوەکـە، دەبینـێت هـەمـان سـەرخـۆشـەکـەیـە کـە الـلە.. الـلە.. ی دەکـرد، مـالیك پێـی دەڵێـت: حـاڵـت چـۆنـە، ئـەی بـەنـدەی خـوا؟! پیاوەکـەش دەڵـێت: ئـەی مـالیك.. هـەر ئـەوەی کـە هـیدایـەتی دام، پێی وتیت کـە حـاڵـم چـۆنـە.[1]

## کار بـۆ خـوا بکـه

بـیـشـری حـافی ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەڵێت: بـا کـردەوکـانت لـەبـەر تـرسـی لـۆمـەی خـەڵـکی نـەبێـت، کـار و کـردەوەت بـا تـەنها بـۆ ڕەزامـەنـدی خـوا بێـت.

---

(١) (أنيس المؤمنين/٧٣)



## بۆ سەیری کتێب دەکەیت؟!

دەڵێن بە عەبدولغەنی مەقدسی (رحمه الله): پیاوێك تەڵاقی خواردووە کە تۆ سەد هەزار فەرموودەت دەرخە! ئەویش دەڵێت: ئەگەر زیاتریشی بووتایە هەر ڕاستی دەکرد.
هەروەها لێی دەپرسن: تۆ کە ئەو هەموو فەرموودەیەت دەرخکردووە، ئیدی بۆچی لە کاتی گێڕانەوەدا سەیری کتێب دەکەیت؟! عەبدولغەنی دەڵێت: دەترسم ئەگەر سەیری کتێب نەکەم تووشی ڕیا ببم.[1]

## تەمەنت چەند ڕۆژێکە

حەسەنی بەسری (رحمه الله) دەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم.. تۆ پێکهاتوویت لە چەند ڕۆژێك! هەر کە ڕۆژێك تێدەپەڕێت، بەشێکی تۆیش لەگەڵ خۆیدا دەبات، ئیدی تۆ کە مانەوەت مەحاڵە لەم دنیایەدا.. بۆچی کار بۆ دنیایەك ناکەیت، کە مانەوەت ئەبەدییە تێیدا؟!!

## گۆڕی مردووان

مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) هەندێك جار کە بێ کار دەبوو، دەچوو لە گۆڕستان کاتەکەی بەسەر دەبرد..!! ڕۆژێك پیاوێك پێی دەڵێت: ئەی مالیك لە نێو گۆڕی مردوواندا دادەنیشیت، چی دەکەیت؟! مالیك پێی دەڵێت: من لەگەڵ قەومێکدا دادەنیشم، ئەگەر لە لایان بم ئازارم نادەن و، ئەگەر لە لایان نەمێنم غەیبەتم ناکەن.[2]

(١) (سیر أعلام النبلاء: ج٢١/٤٤٨-٤٤٩)
(٢) (انیس المؤمنین/٧٣)

## تۆوچاندنیش دڵێکی حازری دەوێت!

کاتێک ئیمامی غەزالی (رحمه الله) لە شاری تووس گەڕایەوە.. باسی شێخێکیان بۆ کرد لە یەکێک لە گوندەکانی ئەو دەوروبەرەدا، ئەویش بە نیەتی سەردان ڕۆشت بۆ خزمەتی، لەو کاتەدا شێخەکە لە زەوییەکیدا خەریکی گەنم وەشاندن بوو، کاتێک موحەممەدی غەزالی بینی، ڕۆشت بۆ پێشوازی کردنی، ئیدی یەکێک لە هاوەڵەکانی پیاوچاکەکە هات و داوای لێ کرد تۆوی گەنمەکەی پێ بدات، بۆ ئەوەی بیوەشێنێت، هەتا ئەو بێ خەیاڵ بێت و بچێت بە دەم غەزالییەوە، بەڵام شێخەکە ڕازی نەبوو تۆوی گەنمەکەی پێ بدات، بۆیە غەزالی لە ڕازی نەبوونی شێخەکەی پرسی، ئەویش وتی: چونکە من بە دڵێکی حازر و.. زمانێکی پاراو بە یادی خوداوە.. تۆوەکە دەوەشێنم و ئومێدی بەرەکەت بۆ هەموو ئەوانە دەکەم کە شتێکی لێ دەخۆن، بۆیە حەز ناکەم بیدەم بە ئەو، مەبادا بە دڵێکی بێ ئاگا و بە زمانێکی دوور لە یادی خوداوە بیوەشێنێت.[1]

## دڵسۆزی

سەهلی تووستەری (رحمه الله) دەڵێت: هیچ شتێک بە ئەندازەی دڵسۆزی سەخت و قورس نییە لەسەر نەفس.. چونکە دڵسۆزی هیچ پشکێکی نەفسی تێدا نییە لە هەوا و ئارەزوودا.

## نوێژی ماڵئاوایی

بەکری موزنی (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر ویستت نوێژەکەت سوودت پێ بگەیەنێت، ئەوا بە خۆت بڵێ: پێدەچێت ئەمە دواهەمین نوێژم بێت.[2]

---

(١) (إحياء علوم الدين٥/١٧٥)
(٢) (أقوال السلف/٨٨)

## پێیان بڵێ: مالیك نازانێت!

عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێکم بینی هاتە لای مالیکی کوڕی ئەنەس (رحمه الله) و چەندین ڕۆژ بە بەردەوامی پرسیاری شتێکی لە مالیك دەکرد و ئەویش وەڵامی نەئەدایەوە..!! ئیدی پیاوەکە وتی: ئەی ئەباعەبدوڵڵا.. من بە نیازی چوونە دەرەوەم، وەڵامی پرسیارەکەم چی بوو؟! مالیك ماوەیەکی زۆر سەری دانەواند و پاشان سەری بەرز کردەوە و وتی: ئەی برادەر.. من قسەیەك دەکەم کە گومانی خێرم هەبێت لە کردنیدا، بۆ ئەم مەسەلەی تۆش من بە باشی لێی نازانم.

وە ئیبن مەهدی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك پرسیاری شتێکی لە مالیك کرد و ئەویش وتی: شارەزایی تەواوم لێی نییە.

پیاوەکە وتی: من چەندین شوێنم بڕیوە و هاتووم بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی ئەو پرسیارەت لێ بکەم.. تۆش دەڵێیت نایزانم!! مالیك وتی: دەی ئەگەر گەڕایتەوە بۆ شوێنەکەی خۆت، بە خەڵکەکەی بڵێ: مالیك وتی: شارەزایی تەواوم لێی نییە.[1]

## ناڕازی بوون!

حەسەنی بەسری (رحمه الله) دەڵێت: کاتێك بینیم خەڵك لە پەروەردگاریان ڕازی نین، ئیدی زانیم کە لە کەسانی وەك خۆشیان ڕازی نابن.[2]

## عاسی بوون

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر ویستت لە خوای (عز وجل) عاسی ببیت، ئەوا لە شوێنێکدا لێی عاسی ببە کە موڵکی ئەو نەبێت و نەتبینێت.

---

(١) (مناقب الامام مالك/٣٩)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين:ج١٨١/١)

## کوان؟! پیاوانی مینبەر لە کوێن؟!!

حەسەنی بەسـری ( رحمه الله ) لە مـاڵە خـاکییەکەیدا دانیشـتبـوو.. وەفدێکی کـۆیلەکانی بەسـرە هـاتنە خـزمـەتی و، وتیان: گەورەکانمان خراپ هـەڵسـوکەوتمان بەرامـبەر دەکەن، بـۆیە داوات لێدەکەین وتـارەکەی ڕۆژی هـەینیت بـا لەسـەر ئـازادکـردنی بەندە و کۆیلەکان بێت.

حەسـەن گـوێی لە قسـەی وەفـدی کـۆیلەکان گـرت، بـەڵام چەنـد هـەفتەیەك تـێپەڕی و لەو بـارەوە وتاری نەدا، پـاش مـاوەیەك لە ڕۆژی هـەینیدا هـاتە سـەر مینبەر و وتارێکی لەسـەر ئـازادکـردنی کـۆیلەکان خـوێندەوە، کە زۆر کاریگـەر بـوو لەسـەر نوێـژخـوێنان، بە شـێوازێـك کە هـەرچی لە مـزگـەوتەکەدا بـوو، و کـۆیلەی هـەبـوو، بە بێ بەرامبەر ئـازادی کـرد..!!

ڕۆژان تـێپەڕیـن و وەفـدی کـۆیلەکـان بە ئـازادکـراوی هـاتنە خـزمـەت حەسـەن و، وتیـان: بـۆ سـوپاسـگـوزاریت نەهاتـووین، بـەڵکـو بـۆ لـۆمـەکـردنـت هـاتـووین..!!

حەسـەن وتی: لـۆمـە لەبـەر چی ئـەی بـراکانـم؟!

وتیان: ئـێمە تکامـان لێکـردیت کە پـەلە بکەیت لە وتارەکەتـدا، بەڵام تـۆ چەنـد هـەفتەیەك دوات خسـت، لە کاتێکدا ئـێمە لەوپـەڕی موحتاجیدا بـووین بـۆ ئـەو خـوتبـەی تـۆ!!

حەسـەن وتـی: مـن بـۆیە وتـارەکەم دواخسـت، چـونکە خـۆم کـۆیلـەم نـەبـوو هـەتا ئـازادی بکەم، وە پـارەشـم نـەبـوو کـۆیلـەیـەك بکـڕم و دواتـر ئـازادی بکـەم، هـەتا خـوای گـەورە سـەرکـەوتـووی کـردم بـەندەیـەکم کـڕی و ئـازادم کـرد، یـەکـەمجـار قسـەکـانم لە خـۆمدا جێبەجێ کـرد، پاشـان داوام لـە خـەڵك کـرد و ئـەوانـیش بـە دەم بـانگـەوازی خـوداوە هـاتـن.[1]

## فوازیارانی بەهەشت

حەسەنی بەسری ( رحمه الله ) دەڵێت: خـواسـتن و داواکـردنی بـەهـەشـت، بـە بـێ کـردەوەی بـاش.. تـاوانـێکـە لـە تـاوانـەکـان.

(١) (أنيس المؤمنين/٧١)

## چاوم فرمێسکی بۆ ڕشت و..
## دڵم بۆی تۆقی!

عەتا دەڵێت: پاش مردنی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ( رحمه الله ) چوومە لای فاتمەی خێزانی و پێم وت: ئەی کچی عەبدولمەلیك.. باسی ئەمیری باوەڕدارانم بۆ بکە. وتی: باست بۆ دەکەم، بەڵام ئەگەر زیندوو بووایە بۆم باس نەدەکردیت..!!

فاتمە (رحمها الله) وتی: عومەر نەفس و جەستەی یەکلا کردبوویەوە بۆ خەڵك، ڕۆژەکەی دادەنیشت بۆ کار و باریان تا ئێوارەی لێدەهات، هەرچییەکیشی بۆ تەواو نەکرایە، دەیهێنانەوە ماڵ و بۆ شەوەکەی تەواوی دەکردن، دواتر داوای چراکەی دەکرد کە بە پارەی خۆی ڕۆشنی دەکردەوە، هەڵدەستا دوو ڕکات نوێژی بەجێ دەهێنا، پاشان سەری دەخزاندە نێوان دەستەکانی و فرمێسکی دەباراندە سەر ڕوومەتی، بە جۆرێ بەرەنسکی دەدا دەموت ئەوا گیانی دەرچوو، جگەری شەقی برد..! شەوەکەی ئاوا دەمایەوە تا ڕۆشن دەبوویەوە، ڕۆژەکەشی بەڕۆژوو دەبوو.

فاتمە وتی: لێی نزیك بوومەوە و وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ چ شتێك بوو دوێنێ شەو ئاوات لێهات؟

عومەر وتی: واز لە ئیشی من بهێنە و بڕۆ بە دەم کاری خۆتەوە.

پێم وت: من بە ئومێدی وەرگرتنی ئامۆژگاریم. عومەر وتی: کەوایە پێتی دەڵێم، من سەیری خۆمم کرد، کراومەتە گەورە و لێپرسراوی ئەم ئوممەتە، لە بچوك و گەورە و ڕەش و سووری، پاشان یادی.. غەریبێکی وونبوو و.. هەژارێکی موحتاج و.. ئەسیرێکی بێ سەر و شوێن و.. نمونەی ئەمانەم کردەوە، لە دوورترین شار و ئەترافی زەوی، زانیم کە خوای گەورە پرسیاریانم لێدەکات و بەڕاستی موحەممەدیش (ﷺ) بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەرم، بۆیە ترسێك لە نەفسی خۆم ترسام، کە چاوم فرمێسکی بۆ ڕشت و.. دڵم بۆی تۆقی، هەر چەند زیاتر یادم دەکردەوە، دڵم زیاتر دەتۆقی، ئەی فاتمە.. ئەوا پێم وتیت، دە تۆش پەند وەربگرە، یاخود وازبهێنە.[1]

---

(١) (الف قصة و قصة/٢٠٠ـ٢٠١)

## نە لەبوو خۆمم بیر بخەیتەوە؟!

ئوم زەڕی خزمەتکاری عائیشەی دایکی ئیمانداران دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ( ) سەد هەزار درهەمی نارد بۆ عائیشە، ئەویش دەستیکرد بە دابەشکردنی، کاتێك ئێوارە داهات پێی وتم: ئەی ئوم زەڕ خواردنەکەمان بهێنە. منیش وتم: ئەی دایکی ئیمانداران.. ئەو هەموو پارەت لەبەر دەستا بوو، وەلێ نەتتوانی بایی درهەمێك گۆشتمان بۆ بکڕیت؟! عائیشە ( ) وتی: دەی تۆ ئەبوو بیرم بخەیتەوە، هەتا وام کردبا.[1]

## مافی برایەتی دەزانیت؟!

پیاوێك هاتە لای ئەبو هورەیرە ( ) و پێی وت: من دەمەوێت لەبەر خوا برایەتیت بکەم. ئەبو هورەیرە وتی: ئایا مافی برایەتی دەزانیت؟! پیاوەکە وتی: پێم بڵێ تا بیزانم. ئەبو هورەیرە وتی: یەکێك لە مافەکانی برایەتی ئەوەیە من و تۆ یەکسان بین و.. تۆ لەبەرتر نەبیت بۆ دینار و درهەمەکانت، هەتا من. پیاوەکە وتی: من هێشتا نەگەشتوومەتە ئەو پلە و مەقامە!! ئەبو هورەیرە وتی: دەی کەوایە بڕۆ و وازم لێ بهێنە.[2]

## قەڵغانی ئیماندار

سوفیانی سەوری ( رحمه الله ) دەڵێت: زەمانێك لەمەوبەر ئیمانداران سەروەت و سامانیان نەدەویست، بەڵام ئەمڕۆ سەروەت و سامان سوپەری ئیماندارە.[3]

(١) (الف قصة و قصة/٢٣٨)
(٢) (الحب في الله/٢٨)
(٣) (روضة الزاهدين/٩٢)

## بریا دوو فریشته‌كه‌یشم نه‌یانده‌زانی!!

ئه‌بوعه‌بدوڵڵای خزمه‌تگوزاری موحه‌ممه‌دی كوڕی ئه‌سله‌م ده‌ڵێت: زیاتر له بیست ساڵ هاوه‌ڵێتی موحه‌ممه‌دی كوڕی ئه‌سله‌می توسیم كرد (رحمه الله) له‌و شوێنانه‌دا كه من ئه‌مبینی.. نه‌مدیوه كه نوێژی سوننه‌ت بكات، بێجگه له ڕۆژانی هه‌ینی، وه نه‌مدیوه كه ته‌سبیحات بكات یاخود قورئان بخوێنێته‌وه، وه هیچ كه‌سیش له من زیاتر شاره‌زای كرده ئاشكرا و نهێنییه‌كانی نه‌بوو، وه چه‌ندجار گوێم لێ بوو سوێندی ده‌خوارد و ده‌یگوت: ئه‌گه‌ر بمتوانیبا له كاتی زیندوو كردنه‌وه‌ی سوننه‌ته‌كاندا نه‌هێڵم دوو فریشته‌كه‌یشم ببینن، ئه‌وا ئه‌و كاره‌م ده‌كرد له ترسی ڕیا.. به‌ڵام ناتوانم.[١]

وه هه‌روه‌ها موحه‌ممه‌دی كوڕی ئه‌سله‌می توسی ده‌یگوت: من چیمداوه له‌م خه‌ڵكه؟! ! من خوای گه‌وره له پشتی باوكمدا به ته‌نیایی خه‌لقی كردم، پاشان به ته‌نیایی له سكی دایكمدا مامه‌وه، پاشان به ته‌نیایی ده‌خرێمه گۆڕه‌وه، پاشان دوو فریشته‌كه به ته‌نیایی پرسیارم لێ ده‌كه‌ن، پاشان به ته‌نیایی كرده‌وه‌كانم ده‌خرێنه ترازووه‌وه.. دواتر ئه‌گه‌ر بخرێمه به‌هه‌شته‌وه ئه‌وا به ته‌نیایی ده‌خرێمه به‌هه‌شت، وه ئه‌گه‌ر بخرێمه ناو ئاگره‌وه هه‌ر به ته‌نیایی ده‌خرێمه ناویه‌وه.. ئیدی من چیمداوه له خه‌ڵكی!! وه‌ڵڵاهی.. دوور كه‌وتنه‌وه له خه‌ڵكی گه‌وره‌ترینی غه‌نیمه‌ته‌كانه.[٢]

## زیندوویه‌كی مردوو

پرسیار كرا له حوزه‌یفه‌ی كوڕی یه‌مان ده‌رباره‌ی زیندووه مردووه‌كان، حوزه‌یفه (رضي الله عنه) وتی: ئه‌وه‌ی كه هه‌وڵ بۆ گۆڕینی خراپه‌كان نادات.. نه به ده‌ستی، نه به زوبانی، نه به دڵی، ئه‌و كه‌سه.. زیندوویه‌كی مردووه.[٣]

(١) (حلية الأولياء ٢٤٣/٩)
(٢) (سلوة الأحزان/٨١)
(٣) (صفقات رابحة/١٧٦)

## نه غه‌مبار ده‌بم.. نه دڵخۆش!!

مالیکی کوڕی دینار ده‌ڵێت: له‌و کاته‌وه‌ی که به باشی خه‌ڵکم ناسیوه.. نه دڵم خۆش بووه به‌وه‌ی که ستایشم بکه‌ن، نه غه‌مبار بووم به‌وه‌ی که زه‌مم بکه‌ن. پێی ده‌ڵێن: ده‌ی بۆ وا بیر ده‌که‌یته‌وه؟!!

مالیك ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: چونکه خه‌ڵکی هه‌م له ستایش کردندا، هه‌م له زه‌م کردندا.. زۆر زیاده‌ڕه‌وی ده‌که‌ن.[1]

## له‌ی به‌نده‌که‌م

ئه‌بایه‌زیدی بوستامی ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: خه‌ڵکی له‌ده‌ست لێپرسینه‌وه هه‌ڵدێن و منیش داواکارم له خوا که لێپرسینه‌وه‌م له‌گه‌ڵدا بکات.

پێی ده‌ڵێن: بۆچی وا ده‌ڵێیت؟!

ئه‌بایه‌زیدیش ده‌ڵێت: به‌ڵکو له‌و لێپرسینه‌وه‌دا خوای (عز وجل) پێم بفه‌رمووێت: ئه‌ی به‌نده‌که‌م. منیش عه‌رزی ده‌که‌م و ده‌ڵێم: سه‌رم له‌ڕێته.. ئه‌ی په‌روه‌ردگارم. ئیدی به فه‌رمایشتی (ئه‌ی به‌نده‌که‌م) من شه‌ره‌فمه‌ند ئه‌بم به‌سه‌ر ئه‌هلی دنیادا، پاشان چی پێ باشه با ئه‌وه‌م له‌گه‌ڵدا بکات.[2]

## که‌مته‌رخه‌می

عه‌بدوڵڵای کوڕی موباره‌ك ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: له گه‌وره‌ترین موسیبه‌ته‌کانی پیاو ئه‌وه‌یه که بزانێت خودی خۆی که‌مته‌رخه‌مه، به‌ڵام هیچ به‌لایه‌وه گرنگ نه‌بێت و خه‌م بۆ که‌مته‌رخه‌مییه‌که‌ی نه‌خوا.

(١) (مواعظ الصالحين والصالحات/١٧٥)
(٢) (سلوة الأحزان/٨١)

## ڕزق و ڕۆزیتان لای خودایه

کوڕانی عومەری کوڕی عەبدولعزیز لە پاش خۆی هەموویان باری ئابوورییان باشبوو، گەرچی عومەر (رحمه الله) شتێکی بۆ جێ نەهێشتبوون لە دارای دنیا، بەڵام ئەوەی هەندێ لە خەلیفەکان.. (یاخود ڕاستترە بڵێین: پاشاکان، چونکە لە دوای حەسەنی کوڕی عەلی یەوە (عليه السلام) خەلافەت نەماوە و بووەتە پاشایەتی، بێجگە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کە لەناو جەرگەی پاشاکاندا جارێکی تر خەلافەتی ڕاستەقینەی چوار یارەکەی پێغەمبەری (ﷺ) زیندوو کردەوە) بەو هەموو سەروەت و سامانەوە کە لە باوکە پاشاکانیانەوە بۆیان جێما بوو، بینراون کە سواڵیان کردووە.

ئیبن جەوزی دەڵێت: بیستوومە کە مەنسور بە عەبدولڕەحمانی کوڕی قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صدیقی (رضي الله عنه) وتووە: ئامۆژگاریم بکە. ئەویش وتویەتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز مرد و یازدە (١١) کوڕی لە پاش بەجێما، میراتییەکەی تەنیا حەڤدە (١٧) دینار بوو، بە پێنج (٥) دیناری قوماشی کفنەکەی بۆ کڕدرا، بە دوو (٢) دیناریش جێگای گۆڕەکەیان بۆ کڕی، ئەوەشی مایەوە دابەشکرا بەسەر کوڕەکانیدا، هەر کوڕەی نۆزدە (١٩) درهەمی بەرکەوت، بەڵام کاتێک هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك مرد، ئەویش یازدە (١١) کوڕی لێ بەجێما، کە سەروەتەکەی هیشام دابەشکرا، هەر کوڕێکی هەزار هەزار دیناری بەرکەوت (واتە یەك ملیۆن دینار بۆ یەك کوڕ!) ڕۆژان تێپەڕین و یەکێك لە کوڕەکانی عومەرم بینی لە یەك ڕۆژدا باری سەد وڵاخ شتومەکی لە پێناوی خوادا بەخشی، هەروەها یەکێك لە کوڕەکانی هیشامم بینی خەڵکی خێریان پێدەکرد.[1]

(١) (الف قصة وقصة/٥٤٨)

## دووجار گوێڕایەڵی دایکم نەبووم!

ئەبایەزیدی بوستامی ( رحمه الله ) دەڵێت: دووجار گوێڕایەڵی دایکم نەبووم، تووشی زیان و خراپە هاتم، جارێك فەرمانی پێدام کە لە سەربانەوە ڕووەکی تاڵیشك بخەمە خوارەوە.. لەوکاتەیدا کە خەریکی ئەو کارە بووم، دایکم بانگی لێ کردم و وتی: دەست هەڵگرە.. کوڕم. وەلێ من پارچەیەك لە دەستم کەوتە خوارێ و، بۆ تەسلیم بوون بە فەرمانەکەی ئەو، ویستم پارچە تاڵیشکەکە بگرمەوە، کەچی کەوتمە خوارێ و لووتم بریندار بوو..! ئیدی زانیم ئەوە بە هۆی زوو جێبەجێ نەکردنی ئەمری دایکمەوە بوو..!!

وە جارێکی دیکە.. داوای ئاوهێنانی لێ کردم و، وتی: یەك گۆزە هەڵگرە.

وەلێ من دوو گۆزەم هەڵگرت، کاتێك دەرکەوتم، سەرخۆشێك هات. لێیدام و گۆزەیەکی شکاندم، ئیدی ئەوەشم لە پێچەوانەی فەرمانی دایکمدا بینییەوە..!!

هەروەها پرسیار دەکەن لە ئەبایەزید: بە چ شتێك گەشتیتە ئەم پلەوپایە؟ لە وەڵامدا دەڵێت: بە ڕەزامەندی دایکم.[1]

## زیندانی پڕ لە فێر!!

حەججاج، ئیبراهیمی تەیمی دەخاتە زیندان، پێی دەڵێن: دۆعا بکە با خوای گەورە ڕزگارت بکات. ئیبراهیم ( رحمه الله ) دەڵێت: بێ گومان زیندانی کردنم خێری تێدایە کە خوا کردوویەتی بە نسیبم، منیش پێم خۆش نییە نزا بکەم، هەتا خوا لە شتێك ڕزگارم بکات کە خێری تێدابێت بۆم.[2]

---

(١) (روضة الحبور ومعدن السرور/٣٢)
(٢) (اقوال السلف/٨٣)

## دەوڵەمەندی بە شێوە فەقیر

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رحمه الله) دەرسی بە کۆمەڵە خەڵکێك دەوتەوە، لە نێوانیاندا پیاوێکی بینی کە بەرگێکی کۆنەی پۆشیبوو.. کاتێك لە دەرس وتنەوەکەی بوویەوە و خەڵکەکە ڕۆشتن، ئیمام ئەحمەد پیاوەکەی بانگ کرد و پێی وت: ئەو بەرماڵە بەرز بکەوە.. هەزار درهەمی تێدایە، هەڵی بگرە و بیبە، گوزەرانی خۆتی پێ باشتر بکە.

پیاوەکە وتی: من دەوڵەمەندم و پێویستم بەم پارەیە نییە.

ئیدی ئیمام ئەحمەد لە پیاوەکە توڕە بوو و پێی وت: ئەی باشە نەتبیستووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: بەڕاستی خوا پێی خۆشە کە ڕەنگدانەوەی نیعمەتەکانی بە ڕواڵەتی بەندەکانییەوە ببینێت.[1]

## کاری زانایان قورسترە

یەزیدی کوڕی هارون دەڵێت: نەمدیوە کەسێك لە ئەبوحەنیفە (رحمه الله) زیاتر لە خودا بترسێ، دیتم ڕۆژێك لەبەر خۆردا دانیشتبوو لە نزیك ماڵی کەسێك، پێم وت: ئەی ئەباحەنیفە.. ڕۆشتبایتە بەر سێبەری خانووەکە!!

ئەبوحەنیفە پێی وتم: خاوەنی ئەم خانووە هات و.. بڕێك قەرزی لێوەرگرتم و خانووەکەشی کردە ڕەهن لە لام، بۆیە پێم خۆش نیە لە سێبەری خانووەکەیدا دانیشم، نەوەك سێبەری خانووەکەیشی ببێتە ڕیبا و سوود وەرگرتن بۆم، چونکە لەسەر زاناکان پێویستە کاری زیاتر ئەنجام بدەن، لەوەی کە بە زانستەکەیان خەڵکی بۆ بانگ دەکەن.[2]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/٣١٤)
(٢) (الف قصة و قصة/٢٣٤)

## نەفسم تامەزرۆیە بۆ بەهەشت

ڕەجای کوڕی حەیوە وەزیری دڵسۆزی خەلیفەی دادپەروەر عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: لە خزمەت عومەردا بووم، کاتێك والی بوو لە شاری مەدینە ناردمی پۆشاکێکی بۆ بکڕم، ڕۆشتم بۆم کڕی بە (٥٠٠) پێنج سەد درهەم.. کاتێك سەیری کرد وتی: پۆشاکێکی باشە، ئەگەر نرخەکەی هەرزان نەبووایە..!! بەڵام کاتێك بوویە خەلیفەی موسڵمانان ناردمی پۆشاکێکی بۆ بکڕم، ڕۆشتم بۆم کڕی بە (٥) پێنج درهەم، کاتێك سەیری کرد وتی: پۆشاکێکی باشە ئەگەر نرخەکەی گران نەبووایە. کاتێك گوێم لەم قسەیەی بوو گریام..!! عومەر (رحمه الله) وتی: چی دەتگریێنێت ئەی ڕەجا؟

وتم: بیری ئەو قسەیەم کردەوە کە بەر لە ساڵانێك، بۆ ئەو پۆشاکەی بۆم کڕیت، کردت. عومەریش نهێنی ئەو هەڵوێستەی بۆ ئاشکرا کردم و، وتی: ئەی ڕەجا.. من نەفسێکی پەرۆشم هەیە، هەر شتێکم بە دەست هێنابێ، نەفسم پەرۆشی لەوە بەرزتر بووە، نەفسم پەرۆشی هاوسەرگیری بوو لەگەڵ دۆتمامەکەمدا[1] (فاتمەی کچی عەبدولمەلیك) و هێنام، پاشان نەفسم پەرۆشی ئیمارەت بوو، ئەویشم بە دەستم هێنا و بوومە ئەمیری مەدینە، پاشان نەفسم پەرۆشی خەلافەت بوو، ئەویشم بە دەست هێنا و ئێستاش ئەی ڕەجا.. نەفسم پەرۆشی بەهەشتە، بۆیە ئومێدەکەم لە ئەهلی بەهەشت بم.[2]

## گێڕانەوە، یان بەخشین؟!

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دەڵێت: گێڕانەوەی یەك دانقی حەرام بۆ خاوەنەکەی، زۆر باشترە لە بەخشینی سەد هەزار لە ڕێی خوادا.

(١) (دۆتمام: کچی مام)
(٢) (الف قصة و قصة/٢١٠-٢١١)

## ئاگر نایسوتێنێت!!

ئه‌بی معشه‌ر ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: له كوڕێكی ئه‌بو حازم دا، عه‌ونی كوڕی عه‌بدوڵلام بینی ( رحمه الله ) ده‌گریا و فرمێسكه‌كانی ده‌سوی به‌روخساریدا، پێیان وت: بۆ وا ده‌كه‌یت؟! عه‌ون وتی: پێم گه‌شتووه هه‌ر به‌شێكی جه‌سته‌ی مرۆڤ، فرمێسكی به‌ندایه‌تی به‌ركه‌وێت.. ئاگر نایسوتێنێت.[1]

## له‌م پیاوه‌م له ده‌ست چوو!

حه‌سه‌نی به‌سری ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: ئافره‌تێكی سۆزانی هه‌بوو، سێ یه‌كی جوانی برد بوو بۆ خۆی، ته‌نها به (١٠٠) سه‌د دینار ڕێی ده‌دا خه‌ڵكی بچنه لای، عابدێك ئافره‌ته‌كه ده‌بینێت و پێی سه‌رسام ده‌بێت، ده‌چێت و به ده‌سته‌كانی خۆی كار ده‌كات تا سه‌د دیناره‌كه‌ی بۆ كۆ ده‌كاته‌وه، پاشان ده‌ڕواته لای ئافره‌ته جوانه‌كه و پێی ده‌ڵێت: من تۆم به دڵه و بۆ گه‌شتن به تۆ ڕۆشتووم به ده‌سته‌كانم كارم كردووه و ئه‌م سه‌د دینارەم خڕكردۆته‌وه تا بێمه لات.

ئافره‌ته‌كه ده‌ڵێت: وه‌ره ژووری.

عابده‌كه ده‌چێته ژووری و له‌سه‌ر جێگاكه‌ی داده‌نیشێت كه له ئاڵتون دروستكرا بوو، پاشان ده‌ڵێت به ئافره‌ته‌كه: ده‌ی وه‌ره. كاتێك له نێوان قاچه‌كانیدا داده‌نیشێت، عابده‌كه بیری ئه‌و كاته ده‌كاته‌وه كه ده‌چێته‌وه به‌ر ده‌ستی خودا، ترسێك دایده‌گرێت و، ده‌ڵێت به ئافره‌ته‌كه: وازم لێ بهێنه با بچمه ده‌رێ، سه‌د دیناره‌كه‌ش بۆ خۆت.

ئافره‌ته سۆزانییه‌كه ده‌ڵێت: چی بووه؟! كه‌وات لێهات، خۆت وتت كه به زه‌حمه‌ت گه‌شتوویته لام، ئێستا له‌پڕ بۆ ده‌ته‌وێ بڕۆی؟!

عابده‌كه ده‌ڵێت: له ترسی خودا تۆم له‌به‌ر چاو كه‌وت، ئێستا تۆ بوغزاوترین كه‌سیت له‌به‌ر چاوم. ئافره‌ته‌كه ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر ڕاست بكه‌یت، ئه‌وا له تۆ زیاتر شوو به كه‌س ناكه‌م. ده‌ڵێت: وازم لێبێنه با بچمه ده‌رێ. ئافره‌ته‌كه ده‌ڵێت: ناهێڵم بڕۆیت تا نه‌مكه‌یته هاوسه‌ری خۆت. ده‌ڵێت: بهێڵه با بچمه ده‌ر. ئافره‌ته‌كه ده‌ڵێت: ده‌ی كه‌وایه من دێمه لات، ئه‌و

---

(١) (صفة الصفوة/٥٦٣)



كاته ده‌مخوازیت؟ عابده‌كه ده‌ڵێت: كه چوومه ده‌ر له‌وه ده‌چێت وابكه‌م كه تۆ ده‌یڵێیت.
پاشان عابده‌كه خۆی كۆ ده‌كاته‌وه و ده‌ڕواته‌وه بۆ شاره‌كه‌ی خۆی، ئینجا ئافره‌ته‌كه ته‌وبه ده‌كات و په‌شیمان ده‌بێته‌وه له‌وه‌ی كه پێشتر ئه‌نجامی ده‌دا و، بار ده‌كات بۆ ئه‌و شاره‌ی كه عابده‌كه‌ی لێ نیشته‌جێ ده‌بێت، پرسیاری ناونیشانی عابده‌كه ده‌كات و پیشانی ده‌ده‌ن.
ده‌ڵێن به عابده‌كه: شاژن هاتووه بۆ لات!! (له جوانیدا وایانزانیوه كه شاژنه). كاتێك عابده‌كه ئافره‌ته‌كه ده‌بینێت، دوا هه‌ناسه‌ی هه‌ڵده‌كێشێت و ده‌مرێت..!! ئافره‌ته‌كه‌ش ده‌ڵێت: تازه ئه‌م پیاوه‌م له ده‌ست چوو، ئایا كه‌سی نزیكی هه‌یه؟ ده‌ڵێن: برایه‌كی هه‌ژاری هه‌یه.
ئافره‌ته‌كه له‌به‌ر خۆشه‌ویستی عابده‌كه، شوو ده‌كات به برا هه‌ژاره‌كه‌ی.[1]

## باسی خۆشه‌ویست

ئیمامی مالیك ده‌ڵێت: له دوو مه‌وسیمی حه‌جكردندا له مه‌ككه ئه‌یوبی سیختیانیم بینی ( رحمه الله ) به‌ڵام هیچم لێ وه‌رنه‌گرت بۆ نووسین، پاشان بۆ جاری سێیه‌م له لای ئاوی زه‌مزه‌مدا بینیم دانیشتبوو، هه‌ركه باسی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌كرا، هێنده ده‌گریا تا ده‌بوویه مایه‌ی سۆز و به‌زه‌ییم، ئیدی كه ئه‌وه‌م لێوه بینی فه‌رمووده‌م لێوه وه‌رگرت بۆ نووسین.[2]

## یادێك له كاتی خۆیدا

مه‌یمونی كوڕی میهران ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: یادی خوا به زوبان.. جوان و باشه، به‌ڵام له‌و باشتر ئه‌وه‌یه كه به‌نده‌یه‌ك له كاتی گوناهه‌دا.. یادی خوا بكاته‌وه و به هۆی یاده‌كه‌یه‌وه ده‌ست له گوناهه‌كه هه‌ڵبگرێت.

(١) (الف قصة و قصة/٢٤٦)
(٢) (حرمة أهل العلم: ١٤٢)

## ڕۆژه‌كه‌م به‌برسێتی ده‌مێنمه‌وه

عه‌بدوڵڵای كوڕی جه‌عفه‌ر (رضي الله عنهما) كه‌وته‌ ڕێ بۆ سه‌ر زه‌وی و زاره‌كه‌ی، له‌ ڕێگه‌دا چووه‌ باخه‌خورمای كه‌سانێك دانیشت، كه‌ غوڵامێكی ڕه‌ش پێست كاری تێدا ده‌كرد، غوڵامه‌كه‌ خواردنی هێنا.. سه‌گێك هاته‌ ناو باخه‌كه‌وه‌ و نزیك بوویه‌وه‌ له‌ غوڵامه‌كه‌، غوڵامه‌كه‌ به‌شێك له‌ خواردنه‌كه‌ی بۆ سه‌گه‌كه‌ فڕێدا، پاشان به‌ سێ جار هه‌موو خواردنه‌كه‌ی خۆی فڕێدایه‌ به‌رده‌می سه‌گه‌كه‌، سه‌گه‌كه‌یش له‌ تاو برسێتییه‌كه‌یدا هه‌موو خواردنه‌كه‌ی خوارد و عه‌بدوڵڵا به‌ سه‌رسورمانه‌وه‌ سه‌یری ده‌كرد!!

ئه‌وجا وتی: ئه‌ی غوڵام قووتی ڕۆژانه‌ت چه‌نده‌؟

غوڵامه‌كه‌ وتی: هه‌ر ئه‌وه‌نده‌یه‌ كه‌ بینیت.

عه‌بدوڵڵا وتی: ده‌ی بۆ هه‌موویت دا به‌و سه‌گه‌؟!

وتی: له‌ زه‌وی و زاری ئه‌م نزیكانه‌ سه‌گی لێ نییه‌، كه‌واته‌ ئه‌م سه‌گه‌ له‌ شوێنێكی دووره‌وه‌ به‌ برسێتی هاتووه‌ بۆ ئێره‌، پێم خۆش نه‌بوو خۆم تێر بخۆم و ئه‌و به‌ برسێتی بمێنێته‌وه‌.

عه‌بدوڵڵا وتی: ئه‌ی ئه‌مڕۆ تۆ چی ده‌خۆیت؟

وتی: ئه‌مڕۆ به‌ برسێتی به‌ڕێده‌كه‌م.

عه‌بدوڵڵا به‌ هاوه‌ڵه‌كانی وت: به‌ڕاستی ئه‌م غوڵامه‌ له‌ من سه‌خیتره‌.

پاشان عه‌بدوڵڵا غوڵامه‌كه‌ی كڕی و ئازادی كرد، وه‌ باخه‌كه‌ و هه‌رچی تێدا بوو هه‌مووی كڕی و به‌خشی به‌ غوڵامه‌كه‌.[1]

## زۆر فۆری

حه‌سه‌نی به‌سری (رحمه الله) ده‌ڵێت: وه‌ڵلاهی.. كه‌سێك خواردنه‌كه‌ی فڕێ بداته‌ به‌رده‌م سه‌گێك، زۆر له‌وه‌ باشتره‌ بۆی كه‌ له‌ ئه‌ندازه‌ی تێر خواردنی خۆی زیاتر بخوات.[2]

(١) (إحياء علوم الدين ٢٥٨/٣)
(٢) (روضة الزاهدين/٨٩)

## چۆن تێکەڵی خەڵکی دەبیت؟!

پیاوێك دەڵێت بە وەهبی کوڕی مونەبیهـ (رحمه الله): وەك دەبینیت خەڵك خراپ بووە، منیش بڕیارێکم داوە کە تێکەڵییان نەکەم.
وەهب پێی دەڵێت: وەها کارێك مەکە.. هەر دەبێت بچیتە لای خەڵکی و ئەوانیش هەر دەبێت بێنە لات، وە تۆ کارگەلێکت بەوان دەبێت و ئەوانیش کارگەلێکیان بە تۆ دەبێت، بەڵام تۆ هەوڵ بدە لەناوخەڵکیدا کەرێکی بیسەر و.. نابینایەکی بینا و.. بێدەنگێکی قسەکەر بە.[1]

## سەرەتا دراوسێ یەهودییەکەمان

موجاهد دەڵێت: لە خزمەت عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا بووم (رضي الله عنهما) بزنێکیان سەر بڕی بوو، غوڵامێك خەریکی پێست گرتنەوەی بوو، عەبدوڵڵاش زوو زوو دەیوت: ئەی غوڵام.. بۆ دابەشکردنی گۆشتەکە لە دراوسێ یەهودییەکەمانەوە دەست پێبکە. عەبدوڵڵا هێندە ئەم وتەی دووبارە کردەوە، هەتا پێیان وت: چەندە ئەمە دەڵێیتەوە؟! !
عەبدوڵڵا وتی: رسول الله (ﷺ) بەردەوام هێندە وەسێتی بۆ دەکردین کە چاکبین لەگەڵ دراوسێدا، وامان دەزانی کە دراوسێ میراتی دراوسێکەی دەبات.[2]

## پۆز لێ مەدە

ڕەبیع دەڵێت: کاتێك کەسێك داوای شتێکی لە ئیمامی شافیعی دەکرد لە شەرمی ئەو کەسەدا کە داوای شتەکەی لێ دەکرد، شافیعی (رحمه الله) ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا.[3]

(١) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/١٧٨)
(٢) (الف قصة و قصة/٢٤٩-٢٥٠)
(٣) (ترتيب المدارك: ج٣/١٨٨)

# فەرمانی خواردنت پێ نەکردم

گەورە و قازی (مەرو)[1] پیاوێك بوو، ناوی نوحی کوڕی مریەم بوو.. خوای گەورە ناز و نیعمەتێکی زۆری بە سەردا ڕشتبوو، کچێکی جوان و چاك و بە نرخ و ژیری هەبوو، گەلێك لە گەورە و سەرۆك هۆزان و دەوڵەمەندان خوازیاری بوون، بەڵام نوح هیچیانی پەسەند نەبوو، هەر بۆیە لە بە شوودانی کچە نازدارەکەیدا تیا مابوو، ئەم قازییە.. خزمەتکارێکی دیندار و خۆپارێزی بە ڕەگەز (هیندی)[2] هەبوو، ناوی موبارەك بوو.

قازییەکە باخێکی ئاوەدان و بەردار و پڕ لە داری میوەی هەبوو، ڕۆژێك وتی بە موبارەکی غوڵامی: دەمەوێ بچیت خزمەت و پارێزگاری باخەکەم بۆ بکەیت. غوڵامەکە ڕۆشت و.. دوومانگ گوزەشتی کرد، قازییەکە ڕۆژێك چووە باخەکە و بە غوڵامەکەی وت: ئەی موبارەك هێشوویەك ترێم بۆ بهێنە. بۆی هێنا و خواردی، ترێکە ترشبوو، قازییەکە وتی: هێشوویەکی ترم بۆ بهێنە با ترش نەبێت. موبارەك هێشوویەکی تری هێنا و ئەویش هەر ترشبوو!!

قازییەکە وتی: هۆی چییە تۆ لەم باخە گەورەدا، بەس ترێی ترشم بۆ دەهێنیت؟! موبارەك وتی: چونکە نازانم کامەی ترشە و کامەی شیرینە.

قازییەکە وتی: سبحان الله..!! ماوەی دوو مانگە تۆ لەم باخەدایت و هێشتا نازانی کامە ترێ ترشە و کامەی شیرینە؟! ! غوڵامەکە، وتی: سوێند بێت ئەی گەورەم.. هێشتا تامم نەکردووە تا بزانم کامە شیرینە و کامە ترشە.

گەورەکەی وتی: ئەی بۆچی لێت نەخواردووە؟! غوڵامەکە وتی: چونکە تۆ تەنها فەرمانی خزمەت و پارێزگاری کردنت پێکردم نەك خواردن، بۆیە نەمویست خیانەتت لێ بکەم و بە بێ فەرمانی تۆ لێی بخۆم. قازییەکە زۆر سەری سوڕما و پێی وت: خوای گەورە ئەمانەتەکەت بۆ بپارێزێت!! قازییەکە کە بۆی دەرکەوت غوڵامەکەی زۆر لە خواترس و ژیر و خۆپارێزە لە حەرام، پێی وت: ئەی غوڵام ویستێك لە دڵمدایە بۆ تۆ، پێویستە هەرچیم وت لە فەرمانم دەر نەچیت. غوڵامەکە وتی: من گوێڕایەڵی خودا و پاشان تۆم.

قازییەکە وتی: تۆ دەزانیت کە من کچێکی جوانم هەیە و داخوازیکارێکی زۆری هەیە لە گەورە پیاوان و دەوڵەمەندان، منیش نازانم بە کامەیان ڕازی بم؟

---

(١) (مەرو: شارێکی بەناوبانگە لە خوراسان)

(٢) (لە( صفة الصفوة) دا هاتووە کە موبارەك بە ڕەگەز تورکی بووە.)

ڕاوێژم بـۆ بکە بـزانـم کامـەیـان بە باش دەزانی؟
غوڵامەکە وتی: گەورەم بـزانە.. خەڵك لە زەمەنی جاهیلیدا، بـنەچە و ڕەچەڵەك و پلە و پایەیان دەویسـت، یەهـودی و نەسـرانییەکانیش جـوانییان دەویسـت، لە سـەردەمی رسـول اللە دا (ﷺ) دینـداری و خـۆپـارێـزی لەبـەرتـر بـوو لە هـەمـوو شـتێـك، لەم ڕۆژگـارەی خـۆشـماندا پـارە و سـەروەت و سـامـان هـەمـوو شـتێکە، تـۆش لـەم چـوارە هـەڵـبژێـرە بـزانـە کـامـەیـانـت دەوێ.
قـازییەکە وتـی: ئـەی غـوڵام.. دینـداری و خـۆپارێـزیم هـەڵبژارد، و دەمـەوێ کچەکەمت بدەمێ چونکە دینداری و چاکخـوازیم لە تـۆدا بەدیکـرد و، ئـەمـانەت دارێتی و خـۆپارێـزیتم بـۆ دەرکـەوت.
موبـارەك وتـی: گـەورەم مـن کـۆیلە و خزمەتکـارێکم، بە پـارەی خـۆت منـت کـڕیـوە، ئێسـتا چـۆن کچەکەی خـۆتم لێ مـارە دەبـڕیت؟ و کچەکەت چۆن بە مـن ڕازی دەبێت؟! نوح وتی: هـەسـتە بچینەوە مـاڵ ئـەم کارە ڕێکخەین.
کە چـوونەوە مـاڵ نـوح بە ژنـەکەی وت: ئـەی ئافـرەت.. ئـەو بەندەی کە کـاری باخەکەمـان بـۆ ڕادەپەڕێـنێت دینـدار و خـۆپارێـزە لـە حـەرام، بـە هـۆی چـاکـەکـانییەوە من دەمەوێ کچەکەمانی پێ بدەین، تـۆ دەڵێی چی؟
خێزانەکەی وتی: فـەرمـان هی تـۆیـە، بەڵام با پێـشـتر بـزانین کچەکەمان چـی دەڵێت؟ دایکەکە پـەیامی باوکەکەی بە کچەکەیان گەیانـد و کـچەکەش وتـی: دایـە گیان.. من لە فـەرمـانی خـودا و پاشـان لە فـەرمـانی ئـێـوە دەرناچم و خـراپـەتـان بـەرامبەر ناکەم بـە دەرچـوونـم لە فـەرمـانتان.
لە ئـاکامدا.. قازییەکە کچەکەی خـۆی لە غـوڵامـەکەی مـارەکـرد و سـامـان و مـاڵێکی زۆری پێدان، بە هـۆی ئـەو هـاوسـەرگیرییە پـیرۆزەشـەوە کوڕێـك لە دایکبـوو کە نـاوی عەبدوڵڵای کـوڕی موبـارەك بـوو (رحمه الله) کە پیـاوێکی زانـا و خـوداپەرسـت و گـێـڕەرەوەی فـەرمـوودەیە و هـەتا دنیـا دەمێنـی باسـکـردنی عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکیش دەمێنێت.[1]

## خۆمـان و بـەرپرسـەکانمان

ئـەبوبـەکـری صـدیق (ﷺ) دەڵێـت: بـەرپـرسـەکـانـتان وەك کـردەوەکـانـتـان وەهـان، ئـێـوە چـۆن بـن ئـەوانـیش بـەو شـێـوە کـارەکـانـتان ڕادەپـەڕێـنن.

(١) (الف قصة و قصة/١٠٥-١٠٦-١٠٧)

## لەخواردنی خۆم بدەنە بکوژەکەم

عەلی کوڕی ئەبوطالب (عليه السلام) کاتێك لێی دەدرێت و بەو لێدانە شەهید دەکرێت، دەڵێت: ئەوەی لێیدام چی لێهات؟ پێی دەڵێن: گرتوومانە. دەڵێت: لە خواردن و خواردنەوەی خۆمی پێبدەن، ئەگەر من ژیام ئەوا خۆم بڕیاری لەسەر دەدەم، وە ئەگەر مردم تەنها یەك شمشێر زیاتری لێنەدەن.

پاشان وەسێت دەکات کە حەسەن بیشوات و زیادەڕۆیی لە کفنەکەیدا نەکات، و دەڵێت: من گوێم لێبوو رسول الله (ﷺ) دەیفەرموو: زیادەڕۆیی لە کفندا مەکەن.. وە نە زۆر بە پەلە بمبەن بۆ گۆڕستان، نە خاوە خاوی تێدا بکەن، چونکە ئەگەر ئاکامم خێربێت، زوو دەمبەن بۆی، وە ئەگەر خراپ بێت ئەوا لە شانتان دامدەگرن.[1]

## خودی دۆعا

دەڵێن بە سوفیانی سەوری (رحمه الله): بۆ ناتبینین دۆعا بکەیت؟! سوفیان دەڵێت: بەڕاستی وازهێنان لە گوناه.. خودی دۆعایە، دۆعاکردن تەنها ئەوە نییە بە دیار چاوی خەڵکییەوە دەستەکانت بەرز بکەیتەوە.

## بەهەشتیم.. یان دۆزەخی؟!

لە کاتی گیانەڵلادا ئیبراهیمی نەخەعی گریا، پێیان وت: بۆ دەگریەیت؟ ئیبراهیم (رحمه الله) وتی: ئەی بۆ نەگریەم؟! کاتێك من چاوەڕێی پەیامهێنی خوای (عزوجل) دەکەم و نازانم. ئایا مژدەی بەهەشتم پێدەدەن؟ یاخود دۆزەخ؟!![2]

---

(١) (الف قصة و قصة/٣٦٧)
(٢) (الف قصة و قصة/٣٧٠)

## مەرگی هەژارانە

کاتی سەرەمەرگ، عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دەڵێت بە نەسری خزمەتکاری: ئەی نەسر.. سەرم بخە سەر خۆڵەکە. نەسر دەست دەکات بە گریان! عەبدوڵڵا دەڵێت: بۆچی دەگریەیت؟
نەسر دەڵێت: بیری ئەو هەموو ناز و نیعمەتانەم کردەوە کە تێیدا بوویت، بەڵام ئەوەتا ئێستاکە بە هەژاری و بە غەریبی دەمریت. عەبدوڵڵا دەڵێت: بێدەنگ بە، چونکە من تکام کردووە لە یەزدان.. ژیانی دەوڵەمەندانە بمژێنێت و مەرگی هەژارانە بمرێنێت.
عەبدوڵڵا لە کاتی مردنیدا، چاوەکانی دەکاتەوە و بە پێکەنینەوە دەڵێت:
﴿ لِمِثْلِ هَذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴾[1][2].
با تێکۆشەران بۆ پاشەڕۆژی وەها تێبکۆشن.[3]

## لە سەردان کردن باشتر!

ئەبو عەبدوڵڵای ناجی دەڵێت: هەرەمی کوڕی حەییان، سەردانی وەیسی قەرەنی کرد ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) و پێی وت: ئەی وەیس.. بە سەردانێك پەیوەندیمان پێوە بکە.
وەیس وتی: بە شتێك پەیوەندیم پێوە کردوویت، کە لە سەردان باشترە و زیاتر سوودی هەیە بۆ تۆ، ئەویش پاڕانەوەیە لە ساتەوەختی ئامادە نەبوونتا، چونکە سەردانکردن و یەکتر بینین، ڕەنگە ڕازاندنەوە و ڕیای تێ بکەوێت.[4]

---

(١) (الصافات/٦١)
(٢) (الف قصة و قصة/٢٦٨)
(٣) (پوختەی تەفسیری قورئان/٤٤٨)
(٤) (صفة الصفوة/٥٤٠)

## ڕووەو بەیت کەوت و گیانی سپارد!!

عەبدوڵڵای کوڕی مەرزوق (رحمه الله) وەزیری هارونە ڕەشید بوو.. ڕۆژێك بە هارون دەڵێت: ئەگەر کەسێك داوای گەرانەوەی کۆیلەیەکی خۆی کرد، کە ڕایکرد بوو بۆ لای تۆ، ئایا دەیدەیتەوە بە خاوەنەکەی؟

هارون پێی دەڵێت: بەڵێ، دەیدەمەوە بە خاوەنەکەی.

عەبدوڵڵا دەڵێت: دەی من بەندە و کۆیلەی خودام، ڕامکرد و هاتم بۆ خزمەتکردنی تۆ، ئێستا وازم لێ بهێنە دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ خزمەت گەورەکەم.. خوای (عزوجل).

هارون دەڵێت: ئێمە دانیشتووین و پیاوێك لە نێوانماندا خۆی دەربازکرد، بڕۆ چیت دەوێ ئەوە بکە. عەبدوڵڵا بەرگی ئیحرام دەپۆشێت، ڕێگای مەککە دەگرێتە بەر و دەڵێت: لَبَّيكَ اللَّهُمَّ.. لَبَّيكَ.. سەرم لەرێتە پەروەردگارم، سەرم لەرێتە.

عەبدوڵڵا لە ڕێگاکەیدا دانیشتبوو لەسەر زەوی، ڕەشەبا تۆز و خۆڵی دەکرد بە سەریدا..!! سوفیانی سەوری (رحمه الله) دەیبینێت و پێی دەڵێت: ئەی عەبدوڵڵا.. لە بری ئەو پلە و پایەیەی کە وازت لێهێنا، خودا چی پێبەخشیت؟

عەبدوڵڵا دەڵێت: ئەی سوفیان.. ڕازیبوون بە قسمەتی خوام وەرگرت. پاشان بە ڕێ دەکەوێتەوە بەرە و مەککە، پیرانی مەککە و حەرەم دێنە دەرەوە بۆ سەلامکردن لە عەبدوڵڵا، کاتێك قژی بژ و، سەر و چاوی خۆڵاویی عەبدوڵڵا دەبینن و.. هیلاکبوون لە ڕوخساریدا بەدی دەکەن..! پێی دەڵێن: شەکەت بوون و ئارامگرتنی بڕینی سەحرات بە لاوە چۆن بوو؟!

دەڵێت: هەروەك چۆن بەندەیەکی تاوانبار نەفسی دەخاتە بەر خۆی و دێتە بەر دەرگای گەورەکەی، وەڵڵاهی بمتوانیبا بە ڕاکردن و بە سەر سەر دەهاتم. پاشان گریانێکی سەخت دەگریەت..!!

دەڵێن: ئەم گریانەت لە پای چی بوو؟!!

دەڵێت: ئەم گریانەم دەکەمە تکاکار بۆ لای پەروەردگارم، بەڵکو لێم وەرگرێت. ئیدی خەڵکەکەش دەست دەکەن بە گریان، پاشان کاتێك عەبدوڵڵا بەیتی لێ دیار دەکەوێت، ڕووەو بەیت دەکەوێت و گیانی دەسپێرێت.[1]

---

(١) (الف قصة و قصة/٢٧٩)

## قەرزاری خۆمم!

ئەبوحازم بەلای قەسابێکدا تێدەپەڕێت، پیاوەکە دەڵێت: ئەی ئەبوحازم.. وەرە لەم گۆشتە ببەوە زۆر جوان و قەڵەوە. ئەبوحازم (رحمه الله) دەڵێت: پارەم پێ نییە هەتا گۆشتی پێ بکڕم. پیاوەکە دەڵێت: کێشەمان نییە، بەقەرز پێتی دەدەم. ئەبوحازم دەڵێت: جارێ من قەرزاری نەفسی خۆمم، با قەرزی تۆیشم نەیەتە سەر.[1]

## داوود لە تاریکییەوە هات!!

ئەبونەعیم دەڵێت: داوودی طائی لە تاریکییەوە هات..!! هیچ زانستی پێ نەبوو..!! بۆیە بەردەوام خەریکی زانست و خواپەرستی بوو، هەتا بوویە گەورەی ئەهلی کوفە!

داوود (رحمه الله) دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) چۆن لە قسەکردندا فزولییان نەدەکرد، بە هەمانشێوەش لە سەیرکردندا فزولییان نەدەکرد![2]

وە هەروەها عەبدولڕەحمانی کوڕی موسعەب دەڵێت: جارێکیان داوودی طائی کراسێکی دڕاوی لەبەردا بینرا..!! پیاوێك پێی وت: بۆچی ئەو کراسەت نادووریتەوە؟!

داوود وتی: ئەی نەتزانیوە.. سەیرکردنی شتێك کە پەیوەندی بە تۆوە نییە، نەهی لێ کراوە و دروست نییە؟!![3]

(١) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/١٣٠)
(٢) (الف قصة و قصة/٤٥٧_٤٥٨)
(٣) (تهذيب حلية ألاولياء: ج٢/٤٦٦)



## خەڵك واز ناهێنێت!

پیاوێك دەڵێت بە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (رضي الله عنهما): ئەی چاكترینی خەڵك و، كوڕی چاكترینی خەڵك. عەبدوڵڵاش دەڵێت: من باشترینی خەڵك نیم و، كوڕی باشترینی خەڵكیش نیم، بەڵام بەندەیەكم لە بەندەكانی خوا، ئومێدم بە خوا هەیە و لێیشی دەترسم، سوێند بە خوا واز لە پیاو ناهێنن، هەتا بە هەلاكەتیا دەبەن..!![1]

## تۆ پێمان ناگەیتەوە

عەبدوڵڵای قەواریری (رحمه الله) كە مامۆستای هەر دوو ئیمام بوخاری و موسلیم بوو، دەڵێت: قەت نوێژی جەماعەتم نە دەفەوتا، شەوێك میوانم هات، مەشغوڵ بووم بە میوانەكەوە و نوێژی عیشام بە جەماعەت لە كیس چوو، ڕۆشتمە دەر بە شوێن نوێژێكی جەماعەتدا لە مزگەوتەكانی بەسرە، بەڵام دیتم خەڵكی نوێژیان كردووە و مزگەوتەكان داخراون، ئیدی گەڕامەوە ماڵ و وتم: لە فەرموودەی حەزرەتدا (ﷺ) هاتووە كە نوێژی جەماعەت (٢٧) بیست و حەوت پلە لە نوێژی تاك خێری زیاترە، هەر بۆیە بیست و حەوت جار نوێژی عیشام خوێند، پاشان خەوتم، لە خەومدا.. لەگەڵ قەومێكدا پێشبڕكێم دەكرد، ئەوان بە سواری كۆمەڵە ئەسپێكی تیژ ڕەوەوە بوون و منیش بە سوار ئەسپێكەوە بووم، هەرچەندم دەكرد پێیان نەدەگەشتم..!!

یەكێكیان ڕووی تێكردم و، ووتی: ئەسپەكەت ماندوو مەكە، تۆ پێمان ناگەیتەوە. وتم: بۆچی ناتوانم پێتان بگەمەوە؟!

سوارەكە وتی: چونكە ئێمە نوێژی عیشامان بە جەماعەت كرد و تۆش بە تەنیا كردت. ئیتر لە خەونەكەم بێدار بوومەوە، زۆر غەمبار و دڵتەنگ بووم..!![2]

---

(١) (الف قصة و قصة/١٨٩)
(٢) (أنيس المؤمنين/٧٢-٧٣)

## من کێم تا قســـەم بنووســرێتەوە؟! !

حەســـــەن دەڵێـت: کاتێـك عەبـدوڵڵای کـوڕی مـوبارەك (رحمه الله) لە کوفـە بــوو، کتێبی (المناسك) ی بـۆ خـوێنـدرایــەوە، هـەتـا گـەشـتـە قســـەیــەك کــە تـیایــدا نـووســـرا بـــوو: (عــەبدوڵڵا وتـی و ئـێمە لـــەوی وەردەگـریــــن). لێــرەدا عەبدوڵڵا وتی: کێ ئـەم قســـەی مـنی نـووســـیوە؟!

وتــم: دەی دیـارە کە نـووســـــەری کتێـبەکە نــووسـیویــەتی. ئــیتر عەبـدوڵڵا خـەریکبـــوو بە دەســــتەکانی نـووســـــینەکەی دەکــڕاند، هـەتــا کـــوژاندییەوە، پـاشــان وتـی: مـن کێم، هەتـا قســـــەم بنـووســـرێـتەوە؟![1]

## دیـاری بـۆ ئـێمە بـەرتیلە

عەمــروی کـوڕی موهــاجر دەڵێـت: عـومەری کـوڕی عەبـدولعەزیز (رحمه الله) ئـارەزووی ســـێوی کــرد و، وتــی: چ باشــــوو ئـەگــەر ســێومــان هـەبـووایــە! چـونکە سـێـو هـەم بـۆنی خـۆشـــە، هـەم تامی خـۆشــــە..!!

کـوڕەمـامێکی ســێوی بـــۆ نـارد، عومەر لێی نـەخـوارد و وتی: چ بـــۆن خـــۆش و چاکــە! ئــەی غـولام.. ســـێوەکە دابــەش بـکە و بـــڕۆ ســـڵاومان بگـەیـەنــە بە ئامــۆزاکـەم و پێی بڵێ: ســێوەکەت گەشــــتە دەســتمان، بـەو شــــێوەی تــۆ پێـت خـۆشـــە.

عەمــرو دەڵێـت: وتــم: ئــەی ئـەمـــیری ئیمانـداران، ئــەوە کـــوڕە مــامــتە و یەکێکە لە ئـالـوبـەیتت، وە پێت گــەشـتووە کە رسـول الله (ﷺ) شـــتی دیــاری دەخـوارد و ســــەدەقـەی نـەدەخـوارد، ئیتر بـــۆچی لەو ســێوە ناخـۆیت کــە زۆر ئـــارەزووت لێیەتـی؟! ! عـومــەر وتــی: هــاوار لە دەســـتی تــۆ..!! دیـــاری بـــۆ پێغەمبەر (ﷺ) دیــاری بــوو، بـەڵام ئـەمڕۆ بـۆ ئـێمە بـەرتـیلە.[2]

---

(١) (ألاتقياء ألاخفياء/٢٥٠)
(٢) (الف قصة و قصة/٤٧٠)

## مەرگ.. دیداری دۆستان

کاتێک مەرگی بیلال نزیک بوویەوە (رضي الله عنه) ژنەکەی وتی: ئەی داخەکەم..!! بیلال کاتێک گوێی لەم قسەیە بوو بە هۆش هاتەوە و پێی وت: من بەریم لەو قسەی تۆ، بەڵکو بڵێ: ئەی خۆشیەکەم..!! سبەینێیە دیداری دۆستان.. موحەممەد و یاران.[1]

## پەغمای ئیماندار

سەعیدی کوڕی جوبەیر (رحمه الله) دەڵێت: هەر ڕۆژێک لە تەمەنی ئیماندار دەستکەوتێکە، خەسارۆمەندە ئەو کەسەی لە دەستی بدات.[2]

## کۆڕی زیکر

عەونی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دەرۆشتین لە خزمەت ئوم دەرداء دادەنیشتین و یادی الله عزوجل.. مان دەکرد، جارێک پێیان وت: پێدەچێت بێتاقەتمان کردبی.

ئوم دەرداء (رضي الله عنها) وتی: ئێوە وا دەزانن کە منتان بێتاقەت کردووە..!! بەڵام من لە هەموو شتێکدا خواپەرستیم کردووە و، هیچ شتێکم گیر نەهاتووە کە لە کۆڕی زیکر کردن ئارامبەخشترین بێت بۆ دەروونم و، باشترین بێت بۆ دەست کەوتنی ئەو شتەی کە دەمەوێت.[3]

(١) (انیس مومنین/٣٦)
(٢) (اقوال السلف/٨٩)
(٣) (التصنیف الموضوعی لتاریخ بغداد/٢٨٣)

## چۆن دۆعا له دزان ده‌که‌یت؟!

ئه‌حمه‌دی کوڕی عه‌بدوڵڵای کوڕی مه‌سروق ده‌ڵێت: ئه‌سپێکی ڕه‌بیعی کوڕی خوسه‌یمی سه‌وری ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دزرا، که بیست هه‌زاری پێدا بوو، پێیان وت: دۆعا له دزه‌که بکه.
ئه‌ویش وتی: په‌روه‌ردگارم.. ئه‌گه‌ر دزه‌که ده‌وڵه‌مه‌نده، ئه‌وا لێی خۆش به‌، وه ئه‌گه‌ر هه‌ژاره، خودایا.. ده‌وڵه‌مه‌ندی بکه!![1]

## سه‌گی کوڕی سه‌گ

فوزه‌یلی کوڕی عه‌یاز ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: وه‌ڵڵاهی بۆت حه‌لاڵ نییه که ئازاری سه‌گێك یاخود به‌رازێك بده‌یت به‌بێ هه‌ق، ئیدی چۆن ده‌توانیت ئازاری موسوڵمانێك بده‌یت؟! !
ئیمام تاجه‌دینی سه‌بوکی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: له ڕاڕه‌وی ماڵه‌که‌ماندا دانیشتبووم، سه‌گێك به‌ره‌و ڕووم هات، منیش وتم: دوور بکه‌وه.. سه‌گی کوڕی سه‌گ. باوکم له ژووره‌وه گوێی لێم بوو، لێم توڕه بوو و ته‌ریقی کردمه‌وه..!! منیش وتم: ئه‌دی ئه‌وه سه‌گی کوڕی سه‌گ نییه؟! مه‌گه‌ر چ شتێکی هه‌ڵه‌م وتووه؟! باوکم وتی: مه‌رجی ڕه‌وا بوونی قسه‌که‌ت، له نه‌بوونی نیه‌تی به سوك سه‌یرکردن و گاڵته پێ کردنیدایه‌[2].

## دڵانی پڕ له قه‌سوه‌ت

ئه‌بوبه‌کری صدیق (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ده‌ڵێت: چاوه‌کان به هۆی دڵڕه‌قیمانه‌وه، بێ ئه‌شکن و دڵه‌کان به‌هۆی گوناهی زۆرمانه‌وه، پڕ قه‌سوه‌تن.

---

(١) (صفة الصفوة/٥٤٣)
(٢) (حرمة أهل العلم: ٦٥)

## نەخێر.. هی خۆت نییە!!

ئەحنەفی کوڕی قەیس ( رَحِمَهُ اللهُ ) درهەمێکی لە دەستی پیاوێکدا بینی و پێی وت: ئەو درهەمە هی کێیە؟! ! پیاوەکە وتی: هی خۆمە.
ئەحنەف وتی: نەخێر.. هەتا لە دەستی تۆدا بێت هی خۆت نییە!! بەڵکو هەر کاتێك بەخشیت، یاخود لە کارێکی باشدا خەرجت کرد، ئەو کاتە دەبێتە هی خۆت.[1]

## لەشساغی و نوێژکردن

**سبحان الله..!! چاکان لەشساغییان بۆ عیبادەت دەوێت و ئێمەش بۆ لەززەت، کەچی ئێمە لە ئەوان زۆرتر داوا دەکەین، خوایە جەننەت.. خوایە جەننەت..!!**
ئەبو سولەیمانی دارانی دەڵێت: عەبدولواحیدی کوڕی زەید ( رَحِمَهُ اللهُ ) تووشی ئیفلیج بوون هات و لە پێ کەوت، پاڕایەوە لە خوای گەورە کە لە کاتی دەستنوێژ گرتندا شیفای بدات و بتوانێت بۆ خۆی دەستنوێژ بگرێت، ئیدی هەر کات دەیویست دەستنوێژ بگرێت، بە ئاسانی دەست و قاچی دەجوڵاند تا دەستنوێژەکەی دەگرت، وە هەر کات دەگەڕایەوە ناو جێگاکەی لە پێ دەکەوت و تووشی ئیفلیج بوونەکەی دەهاتەوە.[2]
وە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای خوزاعی دەڵێت: عەبدولواحیدی کوڕی زەید ماوەی چل ساڵ، بە دەستنوێژی خەوتنان نوێژی بەیانییانی کردووە.[3]

---

(١) (اين نحن من هؤلاء: ج٤/١٩٦)
(٢) (من عجائب الدعاء/ ٦٢)
(٣) (تهذيب حلية ألاولياء: ج٢/٣٠٥)

## شــیرینی خواردن یان بـەرد گواسـتنەوە؟!

مالیکی کوڕی دینار ( رحمه الله ) دەڵێت: تـۆ ئـەگـەر بـەرد بگـوازیـتەوە لـەگـەڵ چـاکـەکـاراندا.. زۆر باشـترە بـۆت، هـەتـا شـیرینی بخـۆیت لەگەڵ خراپـەکاراندا.[1]

## بـە بیانـوی گـوێڕایـەڵی

پیاوێـك دەڵێت بە بیـشری کوڕی حاریس: ئـەگـەر پـیاوێـك دایکی پـێی بڵێت: ژنـەکـەت تـەڵاق بـدە. دەبـێت بـە گــوێـی بکـات، یــان نــا؟

بـیـشـر ( رحمه الله ) دەڵێت: ئـەگـەر پـیاوەکـە لە هـەمـوو شـتێکدا بـە گــوێی دایکی کـردبێت، تـەنها ئـەو فــەرمانـەی مــابێت، ئــەوا بـا ئـەو فـەرمــانـەشـی جـێـبەجـێ بکـات، بـەڵام ئـەگـەر بیەوێـت بـە بـیانــوی گـوێڕایـەڵی کــردنی دایکی ژنـــەکـەی تــەڵاق بـدات و پـاشــان دەسـت بکـات بـــە ســەرپـێچـی کـردن و ئـــەزیـەت دانی دایکی، ئـەوا نـەخـێـر.. بـا لـەو کـارەدا بـە گـوێی نـەکـات و بـڕوات لە کارەکانی دیکـەیدا خـۆی چـاك بکـات.

## تەنیا کراسـێك!

مەسـلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك دەڵێت: چوومە ســـەردانی ئەمیری ئیمانـداران عـومەری کـوڕی عەبـدولعەزیز ( رحمه الله ) لە نەخـۆشـــییەکەیدا، ســــەیرم کــرد کـراسـێکی کـۆنـەی لە بــەردا بـــوو، وتـم بە فــاتمەی خـوشــکم: باشـــتر بـــوو ئـەگــەر ئــەم کـراســـەتان بگـۆڕیــایە. فــاتمە بـێدەنگ بــوو، پاشـــان چــەند جـارێـك دووبـارەم کـردەوە، هەتا فــاتمە ســوێندی خـوارد و وتـی: وەڵڵاهـی هـیچ کـراسـێکی تـری نییە، ئـەم کـراســـەی بـەری نەبێت.[2]

(١) (رفـقـاء طـريـق/٢٨)
(٢) (الف قصة و قصة/٤٩٥)

## ئه‌مه ئه‌و ئیمامه بوو؟! !

ئـیمام ئـه‌حمه‌د ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) زۆرجـاران باسـی زانسـت و گه‌وره‌یـی و خـوداپه‌رسـتی ئـیمام شـافیعی بـۆ کـچه‌که‌ی ده‌کـرد، ئـیمام ئـه‌حمه‌د ڕۆژێـك داوه‌تی ئیمام شـافیعی کـرد بـۆ مـاڵه‌که‌ی، نانی شـێوانیان خـوارد و پاش نـوێـژی خه‌وتنان، ئیمام شـافیعی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) چـووه نـاو جێگای نـووسـتنه‌وه هه‌تا نـوێـژی بـه‌یانی..!!

پاشـان که میواندارییه‌که ته‌واو بـوو، کچه‌که‌ی ئیمام ئـه‌حمه‌د وتی: ئـه‌ی بابـه گیان.. ئـه‌مه ئـه‌و ئیمامه بـوو که باسـت بـۆ ده‌کـردم؟!

وتی: به‌ڵێ.

کچه‌که وتی: سـێ شـتم تیا بـه‌دی کـرد که به دڵـم نه‌بـوو، کاتێـك خـواردنمان پێشـکه‌ش کـرد زۆری خـوارد..!! کاتێـك ڕۆشـته ژووره‌که‌وه، خـه‌وت و هـه‌ڵنه‌سـتا بـۆ شـه‌ونوێـژ..!! وه نـوێـژی به‌یـانی بـۆ کـردین بـه بـێ ئـه‌وه‌ی ده‌سـتنوێـژ بگـرێت..!!

ئیمام ئـه‌حمه‌د ڕۆشـت بـۆ ئـه‌وه‌ی شـافیعی ئـه‌م قسـانه‌ی کـچه‌که‌ی بـۆ ڕوون بکـاته‌وه، شـافیعی پێـی وت: ئـه‌ی ئـه‌حمه‌د.. خـواردنی زۆرم خـوارد، چـونکه ده‌زانـم نـانـه‌کـه‌تان حـه‌ڵاڵه و تـۆ بـه‌خشـنده‌یت، نانـی به‌خشـنده‌یش هـه‌تـوانـه، مـن بـۆ تێربـوون نا.. به‌ڵکو بـۆ هـه‌تـوانی ده‌ردان نانـم خـوارد، که هـه‌ڵنه‌سـتام بـۆ شـه‌ونـوێژ له‌به‌ر ئـه‌وه بـوو کاتێك سـه‌رم دانـا بـۆ نـووسـتن.. کتێبی خـودا و سـوننه‌تی پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی (ﷺ) هـاتنه پـێش چـاوم، منیش حـه‌فتا و دوو بابه‌تی جـودام لێـده‌رهێنان و چـاره‌سـه‌رم بـۆ دانـان، بـۆ ئـه‌وه‌ی موسـوڵمانان سـوودی لێـوه‌ربگـرن..!!

ئیدی هیچ فرسـه‌تی شـه‌ونوێـژم نـه‌بـوو، وه ئـه‌وه‌ی که نـوێـژی به‌یـانیم بـۆ کـردن و ده‌سـتنوێـژم نه‌گـرت، هـۆکاره‌کـه‌ی ئـه‌وه بـوو که مـن به ده‌سـتنوێـژی عیشـاوه چـوومـه نـاو جێگـا و هـه‌مـوو شـه‌وه‌کـه‌ش بێـدار بـووم و ده‌سـتنوێـژم نه‌شـکا، بـۆیه به ده‌سـتنوێـژی عیشـا نـوێـژی به‌یـانیم بـۆ کـردن..!! [1]

---

(١) (أنيس المؤمنين/٨٩)

## شـه‌وانه بـووكـێك بـوو!!

ئه‌بو فه‌ره‌جی ئیبن جه‌وزی ( رحمه الله ) باس ده‌كات و ده‌ڵێت: ئـافـره‌تـێكی زۆر جـوان هـه‌بـوو له مه‌كـكه، له‌گه‌ڵ مێرده‌كـه‌ی ده‌ژیـا، ڕۆژێـك له ئـاوێنه‌دا تەمـاشـای جوانییه‌كه‌ی خۆی كـرد و.. به مێرده‌كه‌ی وت: ئـایـا كه‌سێـك هـه‌یـه تـه‌مـاشـای ئـه‌م جوانییه‌م بكات و شـه‌یدای نـه‌بێت؟!

مێرده‌كـه‌ی وتـی: بـه‌ڵـێ. ئافـره‌ته‌كه وتـی: ئـه‌و كـه‌سـه كـێیه؟ وتـی: عـوبـه‌یدی كـوڕی عـومـه‌یر. ئافره‌ته‌كه وتی: ده‌ی مـۆڵـه‌تـم بده، بـزانـه چـۆن لـه خـشـته‌ی ده‌بـه‌م. پیاوه‌كـه‌ی وتی: ده‌ی بـڕۆ ئـه‌وا مـۆڵـه‌تـم پـێدایت.

ئیدی ئـافـره‌تـه‌كـه بـه بیانـوی پـرسێكی شـه‌رعییه‌وه ڕۆشـته لای عـوبـه‌ید له گـۆشـه‌یـه‌كی (مسـجد الحـرام) دا.. له فـرسـه‌تـێكدا ڕوخسـاری خـۆیی بـۆ ده‌رخست كه وه‌ك مـاهی تـابـان دره‌وشـاوه و جـوان بـوو..!

عوبه‌ید (رضي الله عنه) وتی: ئـه‌ی بـه‌نده‌ی خـودا خـۆت دابـپۆشـه.

ئافره‌ته‌كه وتی: به‌ڕاستی من شـه‌یدای تـۆ بـووم و پێم خـۆشـه پێكـه‌وه‌بین.

عوبه‌یـد وتـی: پـرسیاری چـه‌ند شـتێكت لێده‌كـه‌م، ئه‌گـه‌ر به‌ڕاسـتی وه‌ڵامـم بده‌یته‌وه، ئـه‌وا بـیرێك له داواكـه‌ت ده‌كـه‌مه‌وه.

وتی: هـه‌ر پـرسـیارێكم لێ بكه‌یت، به ڕاستی وه‌ڵامت ده‌ده‌مه‌وه.

عوبه‌یـد وتـی: پـێم بڵـێ ئه‌گه‌ر ئێسـتا فـریـشـته‌ی گیـانكێش بێـت و گیانـت بكێشـێت.. ئایا حـه‌ز ده‌كه‌یت داواكه‌ت جێبه‌جێ بكه‌م و پێكه‌وه‌بین؟! !

وتی: نـا.. سـوێند بـه خـودا حـه‌ز نـاكـه‌م.

عوبه‌ید وتی: ده‌ی ئه‌گه‌ر مـردیت و خـرایته ناو گـۆڕه‌كـه‌تـه‌وه و دانـرایت بـۆ لێپرسینه‌وه.. ئایا حه‌زت ده‌كرد كه داواكه‌م بـۆ جێبه‌جێ كـردبـایت؟! !

وتی: نـا.. سـوێند بـه خـودا حـه‌ز نـاكـه‌م.

عوبه‌ید وتی: ده‌ی ئه‌گه‌ر خه‌ڵكی كتێبه‌كانیان وه‌رگـرت و تـۆش هێشـتا نازانیت به ده‌ستی ڕاست یان چـه‌پ نامـه‌ی ئه‌عمالت وه‌ر ده‌گـریته‌وه.. ئایا له‌و له‌حـزه‌دا پێت خـۆشـه كه داواكه‌م بۆ جێبه‌جێ كردبایت؟! !

وتی: نـا. سـوێند بـه خـودا حـه‌ز نـاكـه‌م.

عوبه‌یـد وتـی: ئه‌ی ئه‌گه‌ر له كـاتی په‌ڕینه‌وه‌تـدا به سـه‌ر پـردی سـیراتدا، له كاتێكدا نازانیـت ڕزگـارت ده‌بێـت یـان نـا.. ئایـا پێـت خـۆشـه كه داواكه‌تـم بـۆ جێبه‌جێ كـردبایت؟! !

وتی: نـا.. سـوێند بـه خـودا حـه‌ز نـاكـه‌م.

عـوبـه‌ید وتـی: ئـه‌ی ئـه‌گـه‌ر تـرازووه‌كـه‌ی په‌روه‌ردگاریـان هێنـا و تـۆ

نەتئەزانی ئایا تای چاکەکانت قورس دەبێت یان سووك.. ئایا حەزت ئەکرد کە من داواکەتم بۆ جێبەجێ کردبایت؟!!

وتی: نا.. سوێند بە خوا حەز ناکەم.

عوبەید وتی: تۆ ڕاست دەکەیت.. دەی کەوایە لە خوا بترسە و خۆت بپارێزە، چونکە خوای گەورە نیعمەتی زۆری پێبەخشیویت، کە هەرگیز توانای ئەژماردنیانت نییە.

ئیدی ئافرەتەکە بە پەشیمانی گەڕایەوە بۆ لای هاوسەرەکەی، هاوسەرەکەی وتی: هەواڵم پێبدە بزانم چیت کرد لەگەڵ عوبەید؟!!

ئافرەتەکە وتی: بەڕاستی تۆیش و منیش دەست بەتاڵ و مایە پووچین!

ئیدی پاش ئەو ڕووداوە ئافرەتەکە خۆی یەکلا کردەوە بۆ نوێژ و ڕۆژوو و خواپەرستی و.. پیاوەکەیشی هەردەم دەیگوت: ئاخر من چیمدابوو لە عوبەیدی کوڕی عومەیر..!! خووی ژنەکەی شێواندم، ئەو هەموو شەوێك بووکێکی جوان و ڕازاوە بوو.. عوبەید کردی بە ڕاهیبەیەك (واتە: ئافرەتی خواپەرست).[1]

## بریا دەمزانی.. من هۆکار نیم!

موسای کوڕی قاسم دەڵێت: بوومەلەرزە و بایەکی سوور دایگرتینەوە..! بەو هۆیەوە ڕۆشتم بۆ خزمەت موحەممەدی کوڕی موقاتل (رحمه الله) و پێم وت: ئەی ئەبا عەبدوڵلا.. تۆ گەورە و پێشەوامانی، لە حوزوری پەروەردگار بپاڕێوە هەتا ڕزگارمان بکات لەم ناڕەحەتییە. بەڵام موحەممەد دەستی کرد بە گریان و. پاشان وتی: من کێم هەتا نزاتان بۆ بکەم؟!! بریا دەمزانی.. کە من هۆکاری تیاچوونتان نیم!

موسای کوڕی قاسم دەڵێت: ئەو شەوە لە خەونمدا بە خزمەت پێغەمبەر گەشتم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پەروەردگار بە هۆی نزاکەی موحەممەدی کوڕی موقاتلەوە ڕزگاری کردن.[2]

(١) (موسوعة الأخلاق ج٢٧٩/١ ـ ٢٨٠)
(٢) (إحياء علوم الدين ٣٤٢/٣)

## هەر کات لەو ڕۆژەم دێتەوە یاد

عومەری کوڕی خەطاب دەڵێت بە سەعیدی کوڕی عامر[١] (ﷺ): بڕۆ ببە بە والی حمص. سەعید دەڵێت: ناڕۆم و.. وەریناگرم، چونکە ئەو کارە سەختە بۆ من..!! عومەر دەڵێت: وەڵڵاهی دەبێت وەری بگریت.. خەلافەتەکەتان کردە گەردنی من و.. وازم لێدەهێنن، ئەمە کەی ڕەوایە؟! !

ئیدی سەعید ڕازی بوو، و بە یارمەتی خوا کەوتە ڕێ و، وەك والی لە حمص مایەوە، عومەریش بۆ زانینی ئەحواڵی ئوممەتەکەی و لێپرسینەوەی کاربەدەستەکانی، دەڕۆشتە شارەکان و لە نزیکەوە لە بارودۆخی دەپرسین، کاتێك خەلیفەی موسوڵمانان چووە سەردانی شاری حمص لە شام، خەڵکەکەی هاتنە لای و گلە و گازندەی ئەمیرەکەیان کرد کە سەعیدی کوڕی عامر بوو، چوار خدە و خوویان باسکرد کە بە دڵیان نەبوو.. وتیان:

یەکەم: بەیانیان درەنگ دێتە دەر بۆ لامان..!!

دووەم: شەوانە وەڵامی کەس ناداتەوە..!!

سێیەم: مانگانە ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ، گۆشەگیرە و خۆی لە خەڵك دوور دەگرێت!!

چوارەم: بەینابەینێك بێهۆشی ڕووی تێدەکات..!!

عومەر داوای ڕوونکردنەوەی کرد و سەعید وتی: من خزمەتکارم نییە و ژنەکەم نەخۆشە، بەیانیان خۆم هەویر دەشێلم و.. نان بۆ خۆم و خێزانم ئامادە دەکەم، پاشان دەستنوێژ دەگرم و دووڕکات نوێژ دەکەم.. ئیدی دوای ئەوە هەموو ڕۆژەکەم بۆ خزمەتی ئەوانە..!! وەشەوەکەم هی خودایە و خوداپەرستی تیا دەکەم..!! هەروەها مانگانەش ڕۆژێك یا دوو ڕۆژ جلوبەرگی خۆم دەشۆم و بە دیاریەوە دادەنیشم تا وشك دەبێتەوە.. چونکە تەنیا یەك بەرگم هەیە..!!

بۆ بێ هۆشییەکەشم.. کاتێك من بێباوەڕ بووم و ئامادەی کوشتنی خوبەیبی ئەنساری بووم (ﷺ) قورەیش گۆشتیان لێکردەوە و.. بە قەدی دارێکدا هەڵیانواسی و پێیان وت: حەز دەکەیت موحەممەد لە شوێنی تۆدا بووایە؟ و تۆش بە سەلامەت لە نێو خانەوادەی خۆتا بوویتایە؟!

---

[١] () (سعید بن عامر: ( صور من حياة الصحابة/ ٧، صفة الصفوة/٢٣٨، حلية ألاولياء ٢٤٤/١))

خـوبەیب وتی: وەڵڵاهی پێم خـۆش نییە کە خـۆم و خاوخـێزانم تـەندروسـت بـین و رسول الله (ﷺ) درکـێـك بچـێت بـە پێیدا..!! پاشـان خـوبـەیب بـانگێکی کـرد لە خـۆشـەویسـتەکەی و، وتی: یـا مـوحـەمـەد..!!

دواتر دەسـتی کـرد بە پـاڕانـەوە لەو خـودایـەی.. کە هـیچ هـاوبـەش و هـاوتایەکی نیـیە و تەنهـا ئـەوە کە لە ناڕەحەتییەکـان فریـامـان دەکەوێـت و وەڵامی داواکانمـان دەداتـەوە، وە ئـەم دۆعـایـەی خـوێند:

اللَّهُمَّ أَحصِهم عَدَداً وَ اقتلهُم بَدَداً وَلا تُغادِر مِنهُم أَحَداً.

ئیتر هـەرکات ئـەو ڕۆژەم بـیر دێـتەوە، کە مـن بـێباوەڕ بـووم و وازم لە ڕزگـارکـردنی خـوبـەیب هێنا، بێ هـۆش و ئیختیار دەکـەوم و ئـاگام لە خـۆم و دەوروبـەرم نـامێـنێت..!!

دوای ئەو ڕوونکردنەوانـە، پلە و بەهـای سـەعید زیاتـر بوو لە لای عومـەر.

## ڕۆژی جـەژن چی دەکـەیت؟! !

مـوحەممەدی کـوڕی یەزیـد دەڵێـت: وەهیبـی کـوڕی وەردم بینـی ( رحمه الله ) نـوێـژی جەژنـی کـرد، کاتێـك خەڵـکەکە بڵاوەیـان لـێ کـرد و ڕۆشـتن بـۆ لای، سـەیرێکی کـردن و هـەناسـەیەکی قووڵی هـەڵکێشـا..!!

پاشـان وتی: ئـەگەر ئـەم خـەڵکـە کـاتێـك ڕۆژیـان کـردەوە و دڵنیـا بـوون لـەوەی کـە ڕۆژوو و پـەرستشـی مـانگـەکـەیـان لـێ وەرگـیراوە.. پێویـسـت بـوو لـە بـری ئـەم خـۆسـەرقـاڵ کـردنـەیـان، خـەریکی ئـەداکـردنی شـوکر بـوونـایـە بـۆ وەرگـیرانی عیبادەتـەکەیان، وە ئـەگـەر لێیشـیان وەرنـەگـیرابێـت: ئـەوا ئـەوکاتـە پـێویـسـت بـوو زیاتـر و زیاتـر سـەرقاڵی عـیبادەت بـوونـایـە.[1]

## لـێوە بـێ گـونـاهـن

عومەری کوڕی خەتـاب (رضي الله عنه) داوای لە منـداڵان دەکـرد نـزای لێخۆشـبـوونی بـۆ بکـەن و پـێی دەوتـن: ئـێوە هێـشـتا پـاك و بـێ گوناهـن، نـزاتـان گـیرایـە.[2]

(١) (صفة الصفوة/٣٨١)
(٢) (اقوال السلف/٩٢)

## داوای چی دەکەیت لە باوکە بەرپرسەکەت؟!

ئیبن ئەبی عەلیە دەڵێت: ڕۆژێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رحمه الله) دانیشتبوو بۆ گوێگرتن لە خەڵکی و چارەکردنی گرفتەکانیان، کاتی نیوەڕۆ هات، ئەویش ماندوو و بێتاقەت و شەکەت بوو..!! بۆیە عومەر وتی بە خەڵکەکە: لە شوێن خۆتان بمێننەوە، کەمێکیتر دێمەوە بۆ لاتان. ئیدی ڕۆشتە ژوورەوە تا دەمێك پشوو بدات.

پاشان عەبدولمەلیکی کوڕی هات و پرسیاری باوکی کرد، وتیان: چووە ژوورێ. ئەویش مۆڵەتی وەرگرت و چووە لای باوکی و پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران.. چی هێنایتییە ژوورێ؟! وتی: ویستم دەمێك پشوو بدەم. کوڕەکەی وتی: ئەی ئایا دڵنیایت کە مردن لەم لەحزەدا نایەت؟! کە ئوممەتەکەت لەبەر دەرگاکەت چاوەڕێت دەکەن و، تۆش خۆت شاردۆتەوە لێیان!!

ئیدی عومەر پشووەکەی نەدا و ڕۆشتەوە بۆ لای خەڵکەکەی.[1]

## فزمەتگوزارت بم

عومەری فاروق و ئیمامی عەلی (رضي الله عنهما) لە تەواف بوونەوە و چوونە دەرەوە.. دەشتەکییەکیان بینی، دایکی گرتبوو بە کۆڵەوە و دەیگوت:

منم وڵاخی دایکم..! بەڵام وەك وڵاخ هەڵنایەم.. سڵ ناکەمەوە و ناترسم.. وە دایکم زیاتر هەڵی گرتووم و شیری پێداوم.. سەرم لەڕێتە پەروەردگارم، سەرم لەڕێتە..!! لَبَيْكَ اللَّهُمَ.. لَبَيك..

لەو کاتەدا ئیمامی عەلی بە ئیمامی عومەر دەڵێت: ئەی ئەباحەفص.. با بچینەوە تەواف، ڕەنگە ئێستا ڕەحمەتی خوا دابەزێت و هەمووومان بگرێتەوە. پیاوەکە بەو شێوەیە ڕۆشتە تەواف و هۆنراوەکەی خۆی دەوتەوە و لەبەبەیکی دەکرد، ئیمامی عەلیش دەیگوت: ئەگەر چاکبیت لەگەڵیدا، خوا لێت ڕازی دەبێت و.. بەو کارە کەمانەت پاداشتێکی زۆرترت ئەداتەوە.[2]

(١) (الف قصة و قصة/٤٩٤ـ٤٩٥)
(٢) (حياة الصحابة: ج٣/٤٠١)

## شاردنەوەی ڕاستییەکان.. خیانەتە

عەبدوملەلیکی کوڕی هانئ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: زوبەیدی کوڕی حاریسی یامی کچێکی تەڵحەی کوڕی موسەڕیفی خواست (رحمه الله) لە ساتی خواستنەکەیدا تەڵحە پێی گوت: کچەکەم ناشیرینە!!

زوبەید وتی: ئەوا ڕازی بووم.

تەڵحە گوتی: لە پاژنەی پێیدا برینێك هەیە!!

زوبەید وتی: ئەوا ڕازی بووم.[1]

## بار قورسەکان.. تیاچوون!

ئاگرێك کەوتەوە لە شاری بەسرە.. مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) چمکی پۆشاکەکەی گرت بە دەستییەوە و دەڕۆشت و دەیگوت: بار قورسەکان تیاچوون..!! بار قورسەکان تیاچوون..!![2]

## لە خۆشەویستی درهەمەکاندا

عەبدوڵلای کوڕی وەهەب (رحمه الله) دەڵێت: نەزرم کرد لەسەر خۆم هەرکات غەیبەتی ئینسانێك بکەم، لە بری ئەو گوناهەدا ڕۆژێك بەڕۆژوو ببم، ئیدی غەیبەتێکم دەکرد و ڕۆژێك ڕۆژووم دەگرت.. غەیبەتێکم دەکرد و ڕۆژێك ڕۆژووم دەگرت، هەتا هیلاکی کردم! بۆیە نیەتم هێنا لە پاش هەر غەیبەت کردنێك، درهەمێك ببەخشم، ئیدی لە خۆشەویستی درهەمەکاندا توانیم واز لە غەیبەت کردن بهێنم.[3]

---

(١) (صفة الصفوة/٥٥٩)
(٢) (صفة الصفوة/٦٤٨)
(٣) (حرمة أهل العلم: ٧٢)

## له‌ده‌بی فه‌رمووده گێڕانه‌وه

مالکی کوڕی ئـه‌نه‌س ده‌ڵێـت: پیاوێـك هـاته سـه‌ردانی سـه‌عـیدی کـوڕی موسـه‌یب (رَحِمَهُ اللَّهُ) له کـاتی نه‌خۆشـییه‌که‌یدا.. لـه‌و کـاتـه‌دا سـه‌عید ڕاکـشـا بـوو، پیاوه‌کـه پرسـیاری فـه‌رمـووده‌یـه‌کی لێکـرد.. سـه‌عید دانـیشـت و خـۆی ڕێـك کـرد، ئینجا فـه‌رمـووده‌کـه‌ی بـۆ گـێڕایـه‌وه، پـیاوه‌کـه وتی: حـه‌زم نـه‌کـرد ئـه‌زیـه‌تی خـۆت بـده‌یـت. سـه‌عید وتی: بـه‌ڕاسـتی مـن پـێم نـاخـۆشـه فـه‌رمـووده‌ی رسـول الله (ﷺ) باس بکـه‌م بـۆت و.. ڕاکشابم.[1]

## پێ پـه‌تیم هـه‌تا مردن

بیشری حافی (رَحِمَهُ اللَّهُ) له سه‌رده‌می گاڵـته و گه‌پ و ڕابـواردنیدا، هـاوڕێکانی له ماڵه‌که‌ی خۆیدا جه‌م ده‌کـات و سه‌رقـاڵی خـواردن و خـواردنـه‌وه و گـاڵـته و گـه‌پ و گـۆرانی وتـن ده‌بـن، پیاوچـاکێـك له پیاوچـاکان ده‌ڕواتـه به‌ر ده‌رگـاکه‌ی بیشـر و تـه‌قـولـبابی لێ ده‌کات، کـه‌نیزه‌کێك ده‌چێته ده‌ر و پـیاوچـاکـه‌کـه پێـی ده‌ڵێت: ئـایا خـاوه‌نی ئـه‌م مـاڵه، که‌سێکی ئـازاده؟ یاخـود بـه‌نـده‌یـه؟!

که‌نیزه‌که‌که‌ش ده‌ڵێت: خـاوه‌نی ئـه‌م مـاڵه که‌سێکی ئـازاده.

پیاوچـاکه‌که ده‌ڵێت: ده‌ی دیـاره که ڕاسـت ده‌که‌یت، چونکه ئـه‌گـه‌ر بـه‌نده بـووایـه، ئـه‌وا ئـه‌ده‌بی بـه‌ندایه‌تی ڕه‌چـاو ده‌کـرد و وازی له گاڵـته و گـه‌پ و گـۆرانی ده‌هێـنا.

بیشـر له ژووره‌وه گـوێی له وتـووێـژه‌کـه‌یان ده‌بێـت، به خێـرایی و بـه سـه‌ری ڕووت و به پێـی پـه‌تی.. دێـته به‌ر ده‌رگـاکه، به‌ڵام له‌وکـاته‌دا پـیاوه‌که ڕۆشـتووه و تێپه‌ڕی کـردووه، ده‌ڵێت بـه کـه‌نیـزه‌که‌که: هـاوار له ده‌سـتی تـۆ..! ئـه‌وه کێ بـوو کـه قسـه‌ی لـه‌گـه‌ڵ کـردیت؟! ئـه‌ویـش بـاسـه‌که‌ی بـۆ ده‌گێـڕێته‌وه، بـیشـر ده‌ڵێت: لـه چ لایـه‌که‌وه ڕۆشـت؟ ده‌ڵێت: لـه‌وێـوه. ئیدی بیشـر ده‌که‌وێته شـوێن پـیاوچـاکـه‌کـه هـه‌تا پێی ده‌گات و، پێـی ده‌ڵێـت: ئـه‌ی گـه‌وره‌م تـۆ بـوویت له‌بـه‌ر ده‌رگـاکـه‌م وه‌سـتـایت و لـه‌گـه‌ڵ کـه‌نیزه‌کـه‌کـه‌م وتـووێـژت کـرد؟ پیاوچـاکـه‌کـه‌ش ده‌ڵێت: بـه‌ڵێ مـن بـووم.

بیشـر ده‌ڵێـت: تکایـه ئـه‌و قسـانـه‌م بـۆ دووبـاره بـکه‌وه.

---

(١) (صفة الصفوة/٣١٧)

پیاوچاکەکەش قسەکانی بۆ دووبارە دەکاتەوە و پێی دەڵێت: تۆ کەسێکی ئازادیت، نەوەك بەندە..!! چونکە ئەگەر بەندە بوویتایە، ئەدەبی بەندایەتیت ڕەچاو دەکرد و، وازت لە گاڵتە و گەپ و گۆرانی و ڕابواردن دەهێنا و.. ملکەچی گەورەکەت دەبوویت و بەندایەتیت بۆ دەکرد..!!

ئیدی لە دوای بیستنی ئەو وتانە، بیشر خۆی ناگرێت و کوڵمەکانی لە زەویدا دەگەوزێنێت و دەڵێت: بەڵکو بەندەم..!! بەڵکو بەندەم..!! پاشان سەری خۆی هەڵدەگرێت، بە سەری ڕووت و بە پێی پەتی دەگەڕێت، هەتا وای لێدێت بە (حافی) ناوبانگ دەردەکات..!! واتە: پێ پەتی.

پێی دەڵێن: بۆچی نەعلێك لە پێ ناکەیت؟! بیشر دەڵێت: چونکە گەورەکەم.. اللَّهُ جَلَّ جَلَالُهُ لە ساتەوەختێکدا هێنامیەوە سەر ڕێی چاکە، من پێم پەتی بوو، بۆیە واز لەم حاڵەتە ناهێنم هەتا مردن!![1]

## قەزات لە من کەوێت!

کەهمسی کوڕی حەسەن ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دەیەوێت دووپشکێك بکوژێت، دووپشکەکە خۆی دەکات بە کونێکدا، کەهمس پەنجەی دەکات بە کونەکەدا بۆ ئەوەی بیگرێت و بیکوژێت، دووپشکەکە دەدات بە پەنجەیەوە، پێی دەڵێن: بۆ ئەو کارەت کرد؟!! کەهمس دەڵێت: ترسی ئەوەم هەبوو دووپشکەکە بێتە دەرەوە و بدات بە دایکمەوە.

## شیاوترین زیندانی

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەڵێت: سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەك نییە بێجگە لە ئەو، لەسەر زەویدا شتێك نییە هێندەی زمانم.. پێویست بکات زۆرترین کات لە زیندانا بێت.[2]

(١) (التوابين /٢١١)
(٢) (اقوال السلف/٦٤)

## نزیکبوونەوە

ئیبن ئەبی حەواری دەڵێت: لە خزمەت ئەبوسولەیمانی دارانیدا بووم، لێیان پرسی: نزیکترین شتێك چییە کە نزیکت بکاتەوە لە پەروەردگار؟! ئەبوسولەیمان ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دەستی کرد بەگریان و وتی: ئایا من کەسێکم کە ئەو پرسیارەم لێ بکرێت؟!! دواتر وتی: نزیکترین شتێك کە نزیکت بکاتەوە لە اللَّهُ جَلَّ جَلَالُهُ.. ئەوەیە کە پەروەردگار سەیری دڵت بکات و دڵی تۆیش.. هیچ شتێکی دنیا و ئاخیرەتی نەوێت، بێجگە لە زاتی پاکی اللَّهُ.. نەبێت.[1]

## حەسیرێکی دەستچن

عوبەیدی کوڕی سابت دەگێڕێتەوە و دەڵێت: نووسراوێکم نارد بۆ عەلی کوڕی زەبیان، کە لەو کاتەدا قازی بەغداد بوو، پێم وت: پێم گەیشتووە کە لەسەر حەسیرێکی دەستچن دادەنیشیت، لە کاتێکدا قازییەکانی بەر لە تۆ لەسەر فەرشی نەرم و نۆڵ دادەنیشتن و پاڵیان دەدایەوە..!!

عەلی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) بۆی نووسیم: بەڕاستی من شەرم دەکەم کە لە بەردەممدا دوو پیاوی ئازاد و موسوڵمان، لەسەر حەسیرێکی دەستچندا دابنیشن و من لەسەر فەرشی نەرم و نۆڵ..!! دوو نەیارەکەی بەردەمم لەسەر چی دانیشتن، منیش تەنها لەسەر ئەوە دادەنیشم.[2]

## خەریکن تەمەنت دەبەن!

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دەڵێت: شەو و ڕۆژ.. خەریکن کار لە تۆدا دەکەن و لە تەمەنت دەبەن، دەی تۆش قۆڵی مەردانەی لێ هەڵکە و باشترین کاریان تێدا بکە.

---

(١) (روضة المحبين/ ٣٠٨)
(٢) (التصنيف الموضوعي لتاريخ بغداد/ ١٦٩ ـ ١٧٠)

## نافەوم هەتا بەیانی

ئیمامی زەهەبی (رحمه الله) دەڵێت: عەلی زەینولعابدین کوڕی حوسەین (عليه السلام) کە شەوی بە سەردا دەهات، دەستنوێژی دەگرت و دەچووە لای جێگای نووستنەکەی و دەیوت: چەندە باشیت!! چەندە گەرم و نەرمیت!! چەندە پشوو هێنەریت!! بەڵام لە بەهەشتدا لە تۆ باشتر هەیە، لە تۆ گەرم و نەرمتر هەیە، لە تۆ پشوو هێنەرتر هەیە، دەسا وەڵڵاهی ناخەوم هەتا بەیانی.
ئیدی هەتا بەیانی نوێژی دەکرد، بۆیە کە ڕۆژ دەبوویەوە، لە ڕوخساریدا تیشکێك لە نور و ڕووناکی دەبینرا.

## من سەری عەبدوڵڵا ماچ دەکەم

عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی پاڵەوان (رضي الله عنه) لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) یەکەمین نامەی مێژوویی.. لە رسول الله وە (ﷺ) دەبات بۆ کیسرای گەورەی وڵاتی فارس و بانگهێشتی دەکات بۆ ئیسلام و دەگەڕێتەوە.
ساڵانێك گوزەشتن و.. عومەری فاروق لە ساڵی نۆزدەی کۆچیدا سوپایەکی نارد بۆ جەنگی ڕۆم، کە عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە یەکێك بوو لە سەربازەکانی ئەو سوپایە، هەرقلی قەیسەری گەورەی ڕۆم هەواڵی ئەوەی پێگەشتبوو کە شوێنکەوتووانی فەخری کائینات (ﷺ) خاوەنی ئیمانێکی ڕاستن و.. بیروباوەڕێکی دامەزراویان هەیە و.. نەفسی خۆیان زۆر بە هەرزان دادەنێن لە پێناو ڕێبازی خوا و پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) بۆیە داوای کرد لە سوپاکەی ئەگەر موسوڵمانەکانیان بە ئەسیری گرت.. نەیانکوژن و بە زیندوێتی بیانهێنن بۆ بەردەمی قەیسەر.
ویستی خوداوەند وەها بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە یەکێك بێت لە ئەسیرەکان لای سوپای قەیسەر، عەبدوڵڵایان هێنایە بەردەم قەیسەر و پێیان وت: ئەمە یەکێکە لە هاوەڵە پێشینەکانی موحەممەد (ﷺ).
هەرقل کاتێکی زۆر ڕوانییە عەبدوڵڵا و پاشان دەستی کرد بەقسەکردن و، پێی وت: من پێشنیارت بۆ دەکەم ببیتە نەسرانی.. ئەگەر وات کرد ئازادت دەکەم و.. ڕێزێکی زۆرت لێدەگرم.
عەبدوڵڵا وتی: هەیهات..!! مردن زۆر خۆشەویست ترە لە لام، لەوەی تۆ

بانگم ده‌كه‌یت بۆی.
قه‌یسه‌ر وتی: وایده‌بینم تۆ كه‌سێكی مه‌ردیت.. ئه‌گه‌ر ڕازی ببیت، ده‌تكه‌مه هاوبه‌شی خۆم و نیوه‌ی موڵكه‌كه‌مت پێده‌به‌خشم.
عه‌بدوڵلای ئه‌سیر و كۆتكراو، به زه‌رده‌خه‌نه‌وه وتی: وه‌ڵلاهی نه‌ك نیوه‌ی موڵكت، به‌ڵكو ئه‌گه‌ر هه‌موو موڵكه‌كه‌ت و هه‌موو موڵكی عه‌ره‌بم پێبده‌یت.. ئه‌وا هه‌رگیز بۆ چاوتروكانێكیش بێت.. واز له دینی موحه‌ممه‌د (ﷺ) ناهێنم.
قه‌یسه‌ر وتی: ده‌ی كه‌واته ده‌تكوژم.
عه‌بدوڵلا وتی: چیت له ده‌ست دێت درێغی مه‌كه.
قه‌یسه‌ر فه‌رمانی دا بدرێت له خاچ و.. تیربارانی بكه‌ن، به‌ڵام نه‌پێكرێت، ته‌نها بیترسێنن، خۆیشی به‌رده‌وام داوای به‌نه‌سرانی بوونی لێده‌كرد.. عه‌بدوڵلاش ڕازی نه‌ده‌بوو، پاشان هێنایانه خوار و.. مه‌نجه‌ڵێكی زۆر گه‌وره‌یان هێنا، زه‌یتیان تێكرد و خستیانه سه‌ر ئاگر، به پله‌یه‌كی زۆر گه‌رم زه‌یته‌كه‌یان هه‌ڵقرچاند و، به دیار چاوییه‌وه دوو له هاوه‌ڵه‌كانی یه‌ك له دوای یه‌ك خرانه ناو زه‌یته‌كه‌وه..!! به‌ڵام عه‌بدوڵلا زیاتر له جاران سوورتر بوو له‌سه‌ر بیر و باوه‌ڕه‌كه‌ی.
قه‌یسه‌ر نائومێد بوو، بۆیه وتی: بیخه‌نه ناو مه‌نجه‌ڵه زه‌یته‌كه‌وه.. كاتێك بردیان بۆ لای مه‌نجه‌ڵه‌كه فرمێسك به چاوانیدا هاته خوار.. قه‌یسه‌ر كه به‌مه‌ی زانی، وا هه‌ستی كرد كه ترساوه، بۆیه وتی: بیگێڕنه دواوه.
هێنایانه‌وه به‌رده‌م قه‌یسه‌ر بۆ پاشگه‌ز بوونه‌وه، به‌ڵام ئه‌و خۆڕاگرانه په‌رچی دانه‌وه، قه‌یسه‌ر وتی: به‌ڵا لێت بدا.. ئه‌ی چی گریاندیتی..!!
وتی: بۆ ئه‌وه گریام كه ته‌نها یه‌ك نه‌فسم هه‌یه به‌ختی بكه‌م.. له كاتێكدا ئاره‌زووی ئه‌وه‌م ده‌كرد كه به ئه‌ندازه‌ی مووه‌كانی جه‌سته‌م، گیانم هه‌بووایه و به‌ختم بكردایه له پێناو ڕێبازی خوا و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یدا (ﷺ)..!!
هه‌رقل فه‌رمانیدا كردیانه ژوورێكی داخراو كه ته‌نها ئافره‌تێكی سۆزانی تیا بوو، بۆ ئه‌وه‌ی عه‌بدوڵلا له خشته به‌رێت، پاش چه‌ند كاتژمێرێك.. هه‌رقل سۆزانییه‌كه‌ی بانگ كرد، تا گوێ بیستی ڕووداوه‌كانی ناو ژووره‌كه بێت.
ئافره‌ته سۆزانییه‌كه وتی: گه‌وره‌م. نازانم تۆ منت بۆ لای مرۆڤ ناردووه یان بۆ لای به‌رد؟! هه‌رچی لێی نزیك ده‌بوومه‌وه، ئه‌و هیچی نه‌ده‌كرد و بێجگه له لا اله الا الله.. لا اله الا الله.. هیچی تری نه‌ده‌وت!
هه‌رقل وتی: بیكه‌نه‌وه ژوور و بێجگه له گۆشتی به‌راز و شه‌راب، هیچ خواردن و خواردنه‌وه‌یێكی تری پێ مه‌ده‌ن، عه‌بدوڵلا به‌و جۆره تا سێ ڕۆژ هیچی له به‌رده‌مدا نه‌بوو گۆشتی به‌راز و شه‌راب نه‌بێت، پاشان چوونه ژوورێ ده‌بینن عه‌بدوڵلا خه‌ریكی نوێژكردنه و خواردن و خواردنه‌وه‌كه‌ش وه‌ك خۆی ماوه‌ته‌وه!

پێیان وت: بۆ هیچت نه خواردووه؟! تۆ سێ ڕۆژه برسێتی و تینوێتی زۆری بۆ هێناویت.. بۆت هەبوو بخۆیت، وه گوناهبار نەدەبوویت چونکه ناچار کرا بوویت.

عەبدوڵلا وتی: پێم خۆش نەبوو به خواردنی گۆشتی بەراز و خواردنەوەی شەراب، ئەم دوژمنەی خودا گاڵته به دینەکەم بکات.

ئیدی قەیسەری ڕۆم تەواو نائومێد بوو لەم پاڵەوانه خۆڕاگره، بۆیه پێی وت: سەرم ماچ بکه.. وازت لێدێنم و ئازادت دەکەم.

عەبدوڵلا وتی: باشه.. بەو مەرجەی هەموو برا ئەسیرەکانی دیکەشم ئازاد بکەیت. هەرقلیش بەوه ڕازی بوو، ئیدی کاتێك عەبدوڵلا ڕۆشت بۆ ئەوەی سەری هەرقل ماچ بکات، له دەروونیدا وتی به خوای خۆی: ئەی پەروەردگارم.. خۆت باش دەزانیت که ئەم پیاوه بێ باوەڕ و پیسه، وه من دەچم تف دەکەمه سەری، به شێوەیەك که ئەو وابزانێ ماچم کردووه، وه ڕۆژی دوایی که پرسیارت لێ کردم بۆ ئەم کارەم کردووه، پێت دەڵێم: به عیززەت و جەلالی تۆ.. تەنها بۆ ئەوه وامکرد که براکانم له نارەحەتی ڕزگار بکەم. ئیدی عەبدوڵلا وایکرد و هەرقل لەسەر بەڵێنەکەی خۆی، عەبدوڵلا و برا ئەسیرەکانی ئازاد کرد..!

ئەسیرەکان پێکەوه گەڕانەوه بۆ مەدینه و.. ئەم هەواڵەیان بۆ عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) باسکرد، هەرچەنده هەندێك له موسوڵمانەکان ئەو کارەیان به دڵ نەبوو، بەڵام عومەری فاروق زۆر دڵخۆش بوو بەو کارەی عەبدوڵلا و وتی: هەقه لەسەر هەموو موسوڵمانێك سەری عەبدوڵلای کوڕی حوزافه ماچ بکات، وه سەرەتا من خۆم ئەو کاره دەکەم. ئیدی عومەر و موسوڵمانەکان یەك له دوای یەك هەستان و سەری عەبدوڵلایان ماچکرد.[1]

## بەرەو جێژوانی یار

مەعازی کوڕی جەبەل (ﷺ) دەڵێت: ئەوه گومانداره‌کانن که مردنیان خۆش ناوێت..! چونکه مردن، خۆشەویست له خۆشەویستەکەی نزیك دەکاتەوه.

---

(١) (أنيس المؤمنين/٥٤ ـ ٥٥ ـ ٥٦)

## چراکە بکوژێنەوە!

لە گوندێکی نزیك ڕەی، زیاتر لە سی (٣٠) کەس لە لای ئەبی حەسەنی ئەنتاکی (رحمه الله) جەم بوو بوون، ژمارەیەکی کەم کولێرەیان پێ بوو، کە تێری نەئەکردن، بۆ ئەوەی کەس شەرم نەکات و برسییەکان.. بە ئیسراحەت دەست بۆ کولێرەکە ببەن، هەستان کولێرەکانیان پارچە پارچە کرد و چراکەیان کوژاندەوە و بسم الله یان کرد بۆ خواردن..!! دواتر کە چراکەیان ڕۆشن کردەوە، سەیر دەکەن پارچە کولێرەکان وەك خۆیان ماون..!! چونکە هەر یەکە و بە نییەتی ئەوەی کە براکەی تری لە کولێرەکە بخوات، دەستی بۆ کولێرەکە نەبرد بوو! هەرچەندە هەموویشیان برسییان بوو..!![1]

## گەورە ئاو دەڕێژێت

فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: مالیکی کوڕی دینار پیاوێکی بینی نوێژی دەکرد و بە باشی ئەدای نەدەکرد، مالیك وتی: چەندە بەزەییم بە منداڵەکانیدا دێتەوە!! پێیان وت: سەیرە..! ئەم پیاوە خراپ نوێژ دەکات و تۆش بەزەییت بە منداڵەکانیدا دێتەوە؟! مالیك (رحمه الله) وتی: ئاخر ئەمە گەورەکەیانە و هەر لەمەوە فێر دەبن.[2]

## باشترین پەشیمانی

ئیمام جەعفەری صادق (عليه السلام) دەڵێت: پەشیمان بم لەوەی کە کەسێکم بەخشیوە، چاکترە لەوەی کە پەشیمان بم لەوەی کە تۆڵەم لە کەسێك سەندووەتەوە و ئازارم داوە.

---

(١) (إحياء علوم الدين ٢٥٢/٣ ـ ٢٥٣)
(٢) (مواعظ الصالحين والصالحات/١٧٩)

## چل ساڵه ئاره‌زووم لێته

عوسمانی کوڕی ئیبراهیم ده‌ڵێت: گوێم له مالیکی کوڕی دینار بوو وتی به پیاوێك له هاوه‌ڵه‌کانی خۆی: من ئاره‌زووم له کولێره و ماسته. ئه‌ویش رۆشت و بۆی هێنا، مالیك (رحمه الله) کولێره‌که‌ی کرد به ماسته‌که‌دا و هه‌ر ئه‌مدیودیوی پێده‌کرد و سه‌یری ده‌کرد، پاشان وتی: ماوه‌ی چل ساڵه ئاره‌زووم لێته و به سه‌رتدا زاڵبووم هه‌تا ئه‌مڕۆ، ئێستا ده‌ته‌وێ لێم ببه‌یته‌وه؟! دوور که‌وه لێم. ئیدی مالیك وازی له کولێره و ماسته‌که هێنا و نه‌یخوارد.[1]

## به‌ر ده‌رگای زانایان

عه‌لی کوڕی ئه‌بوطالب (عليه السلام) ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر زانایانت له به‌ر ده‌رگای پاشایاندا بینی، بڵێ: ئه‌وانه خراپترینی زانایان و خراپترینی پاشایانن، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بینیت پاشایان له به‌ر ده‌رگای زانایانن.. ئه‌و کاته بڵێ: ئه‌وانه باشترینی زانایان و باشترینی پاشایانن.

## شه‌وی زاوایه‌تی و نوێژی به‌یانی؟!

(عنبسه بن الازهر) ده‌ڵێت: حاریسی کوڕی حه‌سان (رضي الله عنه) ژنی گواسته‌وه، وه پیاو ئه‌و کاته که ژنی ده‌هێنا و ده‌چووه په‌رده‌وه.. رۆژانێك له‌گه‌ڵ بووکه‌که‌یدا ئه‌مایه‌وه و، ئاماده‌ی نوێژی به‌یانیان نه‌ئه‌بوو، به‌ڵام حاریس له یه‌که‌م شه‌ویدا نه‌یهێشت نوێژی به‌یانی له مزگه‌وت له ده‌ست بچێت، بۆیه پێیان وت: تۆ ئه‌م شه‌و بووکت گواستۆته‌وه و دێیت بۆ مزگه‌وت؟!

حاریس پێی وتن: سوێند به خودا.. ئه‌و ئافره‌ته‌ی نه‌هێڵێت بێمه نوێژی به‌یانی له مزگه‌وت، به‌ڕاستی ئافره‌تێکی خراپه.[2]

(١) (صفة الصفوة/ ٦٤٦)
(٢) (حياة الصحابة ١٦٣/٤)

## دڵە پاکەکان

عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ) دەڵێت: ئەگەر دڵەکانمان پاك ببنەوە.. ئەو کاتە تێر نابین لە کەلامی خوای (ﷻ) هێندە تامەزرۆی دەبین، بۆیە بەڕاستی من پێم ناخۆشە ڕۆژێکم بەسەردا بێت و قورئانی تێدا نەخوێنم.

## خواردن هەرس دەکات؟! !

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) لەگەڵ ئەوەدا کە بازرگانێکی دەوڵەمەند و سەرکەوتوو بوو، دنیا نەویست و بەخشندەش بوو، ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی کیسەیەکی پڕی بۆ هێنا بە دیاری، ئیبن عومەر وتی: ئەمە چییە؟ هاوڕێکەی وتی: ئەمە دەرمانێکی زۆر باشە لە عێراقەوە بە تایبەت بۆم هێناویت. ئیبن عومەر وتی: باشە ئەم دەرمانە بۆچی چاکە؟ وتی: بۆ هەرسکردنی خۆراك باشە. ئیبن عومەر زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: خواردن هەرس دەکات!! من ماوەی چل ساڵە.. تێر خواردنم نەخواردووە.[1]

## دان بدە بە مریشکەکان

حەیوەی کوڕی شورەیح (ﷺ) ئەڵقەی زانستی دەبەست و دادەنیشت دەرسی دەوتەوە بە قوتابییەکانی، لە گەرمەی وانەکەدا.. دایکی بانگی لێ دەکرد و دەیوت: ئەی حەیوە.. هەستە جۆ بدە بە مریشکەکان. ئەویش خێرا مەجلیسەکەی جێدەهێشت و دەڕۆشت بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکەی دایکی.

(١) (صفة الصفوة/٢٠٨)



## ئافره‌تێكی تۆبه‌كار!

ئافـره‌تێك زینـا ده‌كات و حـه‌ددی شـه‌رعی لێ ئـه‌درێت.. پاشـان تۆبـه ده‌كات و، واز له‌و كاره پیسـه ده‌هێنێت، پاش ماوه‌یێك كـه‌سێك ده‌چێته خوازبێنی ئافـره‌ته‌كه، برای ئافـره‌ته‌كه پێی خـۆش ده‌بێت كـه‌سێكی باش و ڕینماییـده‌ر بێت بـۆ خوشـكه‌كه‌ی، ئیدی بـۆ ئـه‌م مه‌به‌سته ده‌چێته خزمه‌ت عومـه‌ری كـوڕی خه‌طـاب ڕاوێـژی پێده‌كات و ده‌ڵێت: فڵان كـه‌س هـاتـۆته خـوازبێنی خـوشـكه‌كه‌م.. ئایا باسی ئه‌وه‌ی ڕابردووی بـۆ بكـه‌م؟

عومـه‌ر (ﷺ) ده‌ڵێت: وه‌ڵلاهـی.. ئه‌گـه‌ر باسـی ئـه‌و كـاره‌ی ڕابـردووی بكه‌ی، بـه‌م قـامچییه هـه‌ڵتئـه‌واسـم!![1]

## فریشـته‌كان شـه‌رمی لێ ده‌كه‌ن!

ئیمامی عه‌لی (ﷺ) ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كارێكی كرد بـۆ عوسـمانی كوڕی عه‌ففان، نه بـۆ منی كـرد، نه بـۆ ئـه‌بوبه‌كر و نه بـۆ عومه‌ر..!!

ئیمامی عه‌لی ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ ئـه‌بوبـه‌كـر و عومـه‌ردا له خـزمه‌ت رسـول الله (ﷺ) دانیشـتبووین، ئـازارێك له قاچی پیرۆزیـدا بـوو، بـۆیه قـاچی پیـرۆزی هه‌تا لای ئـه‌ژنۆی ده‌رخسـتبـوو و له‌نـاو ئـاوی سـاردا دایناببوو، چونكه له‌ناو ئـاوی سـاردا ئـازاره‌كه‌ی ده‌سـره‌وی و سوكنایی بـۆ ده‌هـات، عـه‌رزم كـرد: یارسـول الله (ﷺ) بـۆچی ئـه‌ژنـۆی مـوباره‌كت ده‌رناخـه‌یت؟ فـه‌رمووی: ئـه‌ی عـه‌لی.. ئـه‌ژنـۆ عـه‌وره‌ته.

له‌و ده‌مانه‌دا كه ئێمه له ده‌وری بـووین، عوسـمانی كوڕی عه‌ففان هـات، ئیـدی رسـول الله (ﷺ) به پۆشـاكه‌كه‌ی خـۆی، پـێ و لاقـی پیـرۆزی داپـۆشـی!! منیش وتـم: سـبحان الله یارسـول الله. !! ئێمه له ده‌ورت بـووین و پێ و لاقی پـیرۆزت به ده‌ره‌وه بـوون، به‌ڵام كاتێك كه عوسـمان هـات داتپۆشـین؟!! رسـول الله (ﷺ) فـه‌رمووی: ئـایا شـه‌رم له كه‌سێك ناكه‌م كه مـه‌لائیكه شـه‌رمی لێ ده‌كه‌ن؟![2]

---

(١) (موسـوعة أسـماء الله الحسـنى/الغفور)
(٢) (مختصر تاريخ دمشـق لإبن عسـاكر: ١١٨/١٦)



## بە نیازی خوا

فوزەیلی کوڕی عەیاز ( رحمه الله ) دەڵێت: ئەگەر بەڕادەیەك بێ نیاز بـــوویت لــە خــەڵك.. كــە هــیچ شــتێكیان لــێ داوانــەكــەیت، ئــەوا خـــوای گــەورە هەرچییەكت بـــووێت پێت دەبەخشێت.[1]

## بەری باخان

عورەوەی کوڕی زوبەیر (رضي الله عنهما) باخێكی هەبـوو.. كە یەكێـك بـوو لە باخـە گەورەكانی مەدینە، پەرژین و دیـواری بـۆ باخــەكە كـرد بـــوو و بە درێـژایی ســـاڵ درەخـــتەكانی دەپاراســـت، لە ئەزیـــەتی ڕێبـــواران و چەقاوەســـوویی منداڵان، هـەتا ئـەو كاتــەی كە خورمـاكانی پێدەگەشــت و بـەروبـوومـەكـەی دەرەسی و خـۆش دەبـوو، ئیدی لە چەنـدین لاوە دەرگای دەكردەوە بۆ خـەڵكان، هـەتا بـە ئـاسانی بێنە ناو باخـەكـەیەوە و.. لە بـەروبـوومـەكـەی بخـۆن.[1]

وە هەروەها ئیبن شــەوزەب، دەڵێت: عـوروەی كـوڕی زوبـەیـر كاتێـك باخــە خـورماكەی پێدەگەشـــت.. دەرگـای باخــەكەی واز دەكـرد و مـۆڵـەتی خەڵكی دەدا بێنە نـاو بـاخـەكە و.. بخـۆن و لەگەڵ خـۆشـــیاندا هـەڵبگـرن و بیبەنەوە، ئیدی خـەڵكانی ئـەو دەوروبـەرە و كـۆچـەرییەكان.. دەهـــاتنە نـاو بـاخـەكـە و دەیـانخـوارد و دەشـــیانبـــردەوە بـــۆ مـاڵەوەیان، عـوروە كاتێـك دەهــاتە نــاو باخـەكەی هـەتا دەچـووە دەرێ، ئـەم ئـایـەتـە پــیرۆزەی دەوتـــەوە:

﴿وَلَوْلَا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ﴾[2][3].

واتە: وە با كاتێك چـوویـتە نـاو بـاخەكەتـەوە، بتووتایـە هـــەرچـی خـودا دەیـــەوێت هـــەر ئـــەوە دەبێـت، هـەمـــوو تـوانـایـەكیـــش هـــەر بـــە دەســـت خـودایـە.[4]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/٢٦٥ـ ٢٦٦)
(٢) (الكهف/٣٩)
(٣) (صفة الصفوة/٣٢٠)
(٤) (پوختەی تەفسیری قورئان/٢٩٨)



## له‌ی غافڵێك.. خودا ده‌تپارێزێ

یوسفی کوڕی حوسه‌ین ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ زینونونی میسری دا بووم، دووپشکێکی گه‌وره‌مان دیت له که‌ناری گۆماوێکدا وه‌ستا بوو.. بۆقێك له گۆماوه‌که هاته ده‌ر و دووپشکه‌که سواری پشتی بوو، بۆقه‌که ده‌ستیکرد به مه‌له‌کردن بۆ ئه‌وبه‌ری گۆماوه‌که..!!

زینونون (رحمه الله) وتی: ئه‌م دووپشکه کارێکی هه‌یه، بڕۆ با بزانین چیده‌کات! ڕۆشتین دیمان پیاوێکی سه‌رخۆش له‌ژێر سایه‌ی دره‌ختێکدا خه‌وی لێکه‌وتووه، مارێك هات و ڕۆشته سه‌ر سنگی پیاوه سه‌رخۆشه‌که و ده‌یویست پێوه‌ی بدات، دووپشکه‌که هات، دای به ماره‌که‌وه، کوشتی و گه‌ڕایه‌وه بۆ گۆماوه‌که، له‌وێ سواری پشتی بۆقه‌که بوویه‌وه و چوویه‌وه بۆ ئه‌وبه‌ری گۆماوه‌که..!!

زینونون پیاوه خه‌و لێکه‌وتووه سه‌رخۆشه‌که‌ی جووڵاند تا چاوه‌کانی کرده‌وه و پێی وت: ئه‌ی لاو.. هه‌سته ته‌ماشای ئه‌مه بکه که خودا ڕزگاری کردی لێی! به‌سه‌رهاته‌که‌ی بۆ لاوه‌که گێڕایه‌وه و وتی:

یاغافِلاً وَالجَلیلُ یَحرُسُهُ.. مِنْ کُلِّ سوءٍ یَدُبُّ فی الظُلَمِ
کَیفَ تَنامُ العُیونُ عَنْ مَلِكٍ.. تَأتیه مِنْه الفَوائِدُ النِّعَمِ

واته: ئه‌ی غافڵێك که خودا ده‌یپارێزێ، له هه‌موو خراپه‌یه‌ك که به تاریکیدا ده‌ڕوات، چاوان چۆن ده‌چنه خه‌و له ئاست خودایه‌ك، که له خزمه‌تییه‌وه سوودی نیعمه‌تانی بۆ دێت و ده‌یانبینێت؟!

لاوه‌که هه‌ستا و وتی: ئیلاهی.. ئه‌مه ڕه‌حمه‌تی تۆیه بۆ که‌سێك که سه‌رپێچیت ده‌کات، ئه‌ی ده‌بێت نه‌رمونیانیت بۆ که‌سێك چۆن بێت که گوێڕایه‌ڵت ده‌بێت؟!!

پاشان لاوه‌که پشتی هه‌ڵکرد که بڕوات، پێم وت: بۆ کوێ ده‌چیت؟

لاوه‌که وتی: ده‌چم بۆ ده‌شت و بیابان.. چیدی ناگه‌ڕێمه‌وه بۆ شاران.[1]

(١) (الف قصة و قصة/٥١٣_٥١٤)



## خودا لە ئێوە بە ڕەحمترە

مالیکی کوڕی دینار (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێت: دراوسێیەکم هەبوو.. ئەهلی بەزم و خراپەکاری بوو، دراوسێکان گلە و گازندەیان کرد و پێکەوە ڕۆشتینە لای، پێمان وت: بە ڕاستی گلە و گازندەت لە سەرە و ڕێگە چارە ئەوەیە کە لێرە بڕۆیت. وتی: من لە ماڵی خۆمدام و.. ناڕۆم.

وتمان: دەی کەواتە خانووەکەت بفرۆشە.

وتی: خانووی خۆم نافرۆشم.

وتمان: لای سوڵتان شکاتت دەکەین.

وتی: من خۆم لە دار و دەستەی سوڵتانم.

وتمان: کەوایە لای خوای گەورە دۆعات لێ دەکەین.

وتی: خودا لە ئێوە بە ڕەحمترە بۆ من..!!

مالیك دەڵێت: کە شەو داهات، هەستام نوێژم کرد و نزام لێ کرد، لە ناکاو.. دەنگێك هاتە بەر گوێم، دەیوت: دۆعای لێمەکە، ئەوە یەکێکە لە پیاوچاکەکان. بۆیە ڕۆشتمە بەر دەرگاکەی و تەقولبابم کرد، هاتە دەر، کە منی دیت وەها گومانی برد کە دەمەوێ دەری بکەم لە گەڕەك، بۆیە بە داوای لێخۆشبوونەوە قسانی دەکرد، منیش وتم: بۆ ئەوە نەهاتووم، بەڵام ئەمشەو شتێکی ئاوەها و ئاوەها ڕوویدا.

گەنجەکە دەستیکرد بە گریان و وتی: بەڕاستی منیش تۆبەم کردووە کە جارێکی تر ئازارم بۆ کەسی تر نەبێت..!! منیش سوپاسی خودام کرد و گەڕامەوە.

پاشان کە هەواڵم زانی دەبینم نەك لە گەڕەك، بەڵکو لە شارەکەشدا نەماوە، ئیدی نەمزانی بۆ کوێ ڕۆشتووە؟!!

قەدەری خوا وابوو، ڕۆشتم بۆ حەج، لە (مسجد الحرام) دا کۆڕ و کۆمەڵێکم دیت، لە کۆڕەکە نزیك بوومەوە، سەیر دەکەم دراوسێ گەنجەکەم لە زەویدا کەوتووە، هێندە نەمامەوە هەر لەوێدا مرد!![1]

---

(١) (الف قصة و قصة/٥١١_٥١٢)



# بووکێکی که‌ڕ و.. لاڵ و.. کوێر!!

سابت ڕۆشته ناو باخێکه‌وه.. برسێتی و تینوێتی زۆریان بۆ هێنا، بۆیه چاوی گێڕا تا شتێك بدۆزێته‌وه که بیخوات، سێوێکی به‌دی کرد و که‌مێکی لێ خوارد، قومێك ئاویشی خوارده‌وه، به‌ڵام.. چه‌ند ساتێکی زۆری نه‌برد به ئاگا هاته‌وه و به خۆی وت: هه‌ی تیاچیت..! چۆن له‌به‌ری دارێك ده‌خۆیت که هی خۆت نییه و مۆڵه‌تت له خاوه‌نه‌که‌ی وه‌رنه‌گرتووه؟!

سابت سوێندی خوارد هه‌تا خاوه‌ن باخه‌که نه‌دۆزێته‌وه و، داوای لێخۆشبوونی لێ نه‌کات نه‌ڕوات، هه‌واڵی پرسی و خاوه‌ن باخه‌که‌ی دۆزییه‌وه و پێی وت: من کارێکی هه‌ڵه‌ی وه‌هام کردووه، تکات لێ ده‌که‌م به گه‌وره‌یی خۆت له گوناهه‌که‌م خۆش ببه. خاوه‌ن باخه‌که وتی: ته‌نیا به مه‌رجێك لێت خۆش ده‌بم، مه‌رجه‌که‌ش ئه‌وه‌یه که من کچێکم هه‌یه تۆ ده‌بێ بیکه‌یته هاوسه‌ری خۆت، به‌ڵام ئاگاداربه.. کچه‌که‌ی من کوێره و.. نابینێ، لاڵه و.. قسان ناکات، که‌ڕه و. نابیستێ..!!!

سابت که‌وته بیرکردنه‌وه.. پاشان وای به باش زانی که هاوسه‌رگیری له‌گه‌ڵ کچێکی به‌و شێوه‌یه، زۆر باشتره له خواردنه‌وه‌ی کیم و زووخاوی دۆزه‌خ، له بری ئه‌و له‌ته سێوه حه‌رامه‌ی که به بێ مۆڵه‌تی خاوه‌نه‌که‌ی خواردوویه‌تی، بۆیه ڕه‌زامه‌ندی خۆی بۆ هاوسه‌رگیرییه‌که ده‌ربڕی و ڕۆژی بووك گواستنه‌وه‌یان دیاری کرد، بووکێکی که‌ڕ و لاڵ و کوێر..!!! ئاماده‌کرا و زاواش دڵته‌نگ و غه‌مباوی، به‌ڵام پشتی به خودا به‌ست و به‌رده‌وام یادی په‌روه‌ردگاری ده‌کرد و ده‌یگوت: لا حول و لا قوه الا بالله، وانا لله و انا اليه راجعون.

سابت که چووه ژووری، له دڵی خۆیدا وتی: هه‌رچه‌نده هاوسه‌ره‌که‌م که‌ڕه، به‌ڵام هه‌ر سه‌لام ده‌که‌م خۆ فریشته‌کان وه‌ڵامم ده‌ده‌نه‌وه. بۆیه به ده‌نگی به‌رز وتی: السلام عليكم و رحمة الله و بركاته.

سابت گوێی له ده‌نگێکه‌وه بوو وه‌ڵامی دایه‌وه، که سه‌یری کرد ده‌بینێت ئه‌وه هاوسه‌ره‌که‌یه‌تی وه‌ڵامی ده‌داته‌وه..!! ئیدی بۆی ده‌رکه‌وت که هاوسه‌ره‌که‌ی ده‌بینێت و.. ده‌بیستێت و.. قسانیش ده‌کات، بۆیه پاش بێده‌نگییه‌ك سابت وه‌سفه‌که‌ی باوکی بۆ هاوسه‌ره‌که‌ی گێڕایه‌وه، که‌وا نه‌بووه..!!!

هاوسه‌ره‌که‌ی وتی: باوکم درۆی نه‌کردووه، من لاڵم.. چونکه قسانی حه‌رام ناکه‌م و له‌گه‌ڵ هیچ پیاوێکی نامه‌حره‌مدا قسه‌م نه‌کردووه!! من

نابیستەم.. چونکە لە کۆڕێکدا دانەنیشتووم، کە غەیبەت و بوهتان و گاڵتە و گەپ و قسەی گوناهی تێدا کرا بێت!! من نابینام.. چونکە سەیری هیچ پیاوێکی نامەحرەم و هیچ دیمەنێکی ناشەرعیم نەکردووە!![1]

بەمجۆرە سابتی خواناس و خۆپارێز، هاوسەرێکی لە خۆی خواناستر و خۆپارێزتری بوو بە نسیب، کە بەرهەمی ئەو هاوسەرگیرییە پیرۆزەش ئیمام ئەبو حەنیفە نیعمانی کوڕی سابت بوو (رحمهم الله) .

## خۆم شتومەکی خۆم هەڵدەگرم

عەلی کوڕی ئەبوطالب (عليه السلام) بایی درهەمێك خورما دەکڕێت و هەڵی دەگرێت، هەتا بیباتەوە بۆ خانەوادەکەی.. پیاوێك دەیبینێت و پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. بهێڵە با بۆت هەڵبگرم. عەلی پێی دەڵێت: نا براکەم سوپاست دەکەم.. وا هەقترە باوکی منداڵەکان خۆی هەڵی بگرێت.[2]

## قاچەکانم تۆزاوی نەبوون

ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم دەڵێت: یونسی کوڕی عوبەید (رحمه الله) لە کاتی سەرەمەرگیدا، سەیرێکی قاچەکانی کرد و دەستی کرد بە گریان..!

پێیان وت: چی دەتگریێنێ ئەی ئەبا عەبدوڵڵا؟!

وتی: مەخابن بۆ قاچەکانم..!! چونکە خۆڵاوی نەبوون لە پێناوی خوادا و غەزاکردنیان بە قیسمەت نەبوو.[3]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج٢٩٩/٢)
(٢) (حياة الصحابة ٣/ ٣٤٣)
(٣) (صفة الصفوة/٦٥٩)



## مراویـیەکی مردارۆ بـوو!

عەبـدوڵڵای کـوڕی موبـارەك ( رحمه الله ) سـاڵێـك دەچـووە حەج و سـاڵێـك دەچـووە غەزا، خـۆی دەگێـڕێـتەوە و دەڵێت: سـاڵێك سـەرە حەجـم بـوو، پێـنج سـەد (٥٠٠) دینارم بـرد و چـووم بـۆ کـوفـە تـا وشـترێـك بکـڕم، لە ڕێگامـدا ئـافـرەتێکم دیت خەریك بـوو پـەڕی مـراوییەکی مـردارۆ بـووی لـێ دەکـردەوە و پـاکی دەکـرد!! بـەرەو ڕووی ڕۆشـتم و پێم وت: بـۆ ئـەم کـارە دەکـەیـت؟!!

وتی: ئـەی بەنـدەی خـودا پرسـیاری شـتێکم لـێ مـەکە، کە پـەیـوەندی بە تـۆوە نیـیە. بەڵام مـن وازم نەهێنـا، چـونکە هـەسـتم کـرد شـتێـك هـەیە لەم کارەیـدا، بـۆیە سـوور بـووم لەسـەر وەڵام وەرگـرتن، ئـافـرەتەکەم هێنـایە قسـەکردن و وتـی: وات لێکـردم کە نهێنییەکەمـت بـۆ ئاشـکـرا بـکەم، مـن چـوار کـچم هـەیـە، بـۆ مـاوەی چـوار ڕۆژە هیچیـان نەخـواردووە، باوکیشـیان مـاوەیەك لەمـەوبەر کۆچی دوایی کـردووە، بـۆیە ئـەم مـراوییەم هـەڵگـرت و بە نیـازم چـاکی بـکەم بـۆیـان، چـونکە مـردارۆ بـوو حـەڵاڵە بـۆمـان هـەتا لە بـرسـانـا نەمـرین.

عەبدوڵڵا دەڵێت: بە نەفسـی خـۆمم وت: هـەی تیا چـیت عەبدوڵڵا..!! تـۆ چـی دەکەیت بـۆ ئـەمـە؟! ! ئیدی پێنج سـەد دینـارەکەم پێدا و، وتـم: ئـەمـە بـۆ تـۆیـە، بگەڕێـوە بـۆ لای کچەکانت و بـەم پـارە حـاڵ و گـوزەرانـتان بـاش بکە.

ئیـدی خـوای گەورە ئـارەزووی حەجکـردنی لە دڵمـدا نەهێشـت، پاشـان گەڕامـەوە بـۆ شـارەکەی خـۆم و لەوێ مـامـەوە تا حاجییەکان هـاتنەوە، بە هـەر حـاجییەکی دراوسـێ و هـاوڕێمم دەوت: خـوای گەورە حەجـت قبـوڵ بکـات و پاداشـتی کـردە و کـۆشـەت بداتـەوە. ئـەویـش دەیـگوت: خـوای گـەورە حەجـی تـۆش قبـوڵ بکات، ئـێمە لە فڵان و فڵان جێگادا تـۆمـان بینی..!!

زۆر لە حـاجـییەکان ئـەم قسـەیان دووبـارە دەکـردەوە بـۆم، منـیش تێڕادەمـام و بـیرم لەو وتـانـە دەکـردەوە و تێنەدەگـەشـتم، هـەتا لە خەونمـدا گەشـتم بە خـزمـەتی رسـول الله ( عليه الصلاة والسلام ) و پێی فـەرمـووم:

ئـەی عەبـدوڵڵا.. بـەلاتەوە سـەیر نـەبێت، تـۆ ئـافـرەتێکی دڵتەنگـی ئـوممەتەکەمت ڕزگـارکـرد، بـۆیـە تکـام لـە خـودا کـرد فریشـتەیـەك لـە شـێوەی تـۆدا ڕابسـپێرێت، لـە بـری تـۆ حـەج بکات!![1]

(١) (الف قصة و قصة/٤٤٠-٤٤١)



## بۆ دەنگت بەرز دەكەیتەوە؟! !

موحەممەدی كوڕی مونكەدر ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) شەوانە هەڵدەستا و دەست نوێژی دەگرت، پاشان نزای دەكرد و سوپاس و ستایشی خودای دەكرد، دواتر بە دەنگی بەرز زیكری دەكرد!! پێیان وت: بۆ دەنگت بەرز دەكەیتەوە؟! وتی: دراوسێیەكی ناساغم هەیە شكاتی حاڵی دەكات و لە تاو ئازار دەنگی بەرز دەكاتەوە، منیش بۆ شوكرانەی نیعمەتەكانی پەروەردگار دەنگم بەرز دەكەمەوە.[1]

## برۆ تۆ ئازادیت

ڕۆژێك غولامێكی ئیمام جەعفەری صادق (عَلَيْهِ السَّلَامُ) ئاوی دەكرد بە دەستی جەعفەردا، ئاوەكەی پیا ڕشت و جلوبەرگەكەی تەڕ كرد، جەعفەر ناڕەزایانە سەیرێكی غولامەكەی كرد.

غولامەكە وتی: ئەی گەورەم، ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ﴾

واتە: ئەوانەی ڕقی بە تینی خۆیان دەخۆنەوە، لە ڕێی خوادا.

جەعفەر وتی: ئەوا توڕەییەكەم شاردەوە.

غولامەكە وتی: ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾

واتە: ئەوانەی لە خەڵكی دەبوورن، لەبەر ڕەزامەندی خودا.

جەعفەر وتی: ئەوا عەفوم كردیت.

غولامەكە وتی: ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾[2].

واتە: خوای گەورە چاكەكارانی خۆشدەوێت.[3]

جەعفەر وتی: برۆ تۆ ئازادیت لە پێناوی خوادا و لە سامانەكەشم (١٠٠٠) هەزار دینار بۆ تۆ بێت.[4]

---

(١) (تهذيب حلية الأولياء: ج١/٤٩٣)
(٢) (آل عمران/١٣٤)
(٣) (پوختەی تەفسیری قورئان/٦٧)
(٤) (الف قصة و قصة/٣٧٠)



## وەڵامێکی پڕ لە حیکمەت

وتیان بە ڕابیعەی عەدەویە (رحمها الله): بۆ داوا لە کەسوکارت ناکەیت تا خزمەتکارێکت بۆ بگرن، ئیش و کاری ناو ماڵت لە کۆڵ بکاتەوە؟ ڕابیعەی خواناس وتی: سوێند بە خوا.. من شەرم دەکەم داوای دنیا بکەم لە کەسێك کە خاوەنیەتی، دەی چۆن بتوانم داوای دنیا لە کەسێك بکەم کە هی ئەو نییە..!![1]

## بازرگانی بەبێ سەرمایە!

مالیکی کوڕی دینار (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێت: تاعەتی پەروەردگار بکەرە بازرگانییەك، بەبێ هیچ سەروەت و سەرمایەیەك.. قازانج لە دوای قازانج دەکەیت.

## چشتێکی خراپ دەبینیت؟!

چاوی سولەیمانی تەیمی ئاوی سپی کرد و پزیشك نەشتەرگەری بۆ کرد و پێی وت: نابێت ئاو بەر چاوت بکەوێت. سولەیمان (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەستنوێژەکەی شکا.. لەفافەکەی چاوی لابرد و دەستنوێژی گرتەوە، پاشان لۆکە و لەفافەکەی خستەوە سەر چاوی، کاتێك پزیشکەکە هات، سولەیمان پێی وت: بزانە هیچی خراپ دەبینیت؟

پزیشکەکە سەیری چاوی کرد و وتی: هیچ شتێکی خراپ نابینم..!!

سولەیمان وتی: دەی من دەستنوێژم گرت و چاویشم تەڕ بوو.

پزیشکەکەش پێی وت: دەی موژدەت لێبێت.. خوای گەورە شیفای داویت و چاوت چاك بۆتەوە.[2]

---

(١) (أنيس المؤمنين/٦٣)
(٢) (صفة الصفوة/٦٥٧)

## باخەکەت.. یان.. جەماعەتی عەسـر؟!

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێـت: ڕۆژێـك عـومـەری کـوڕی خەطـاب ڕۆشـــتە دەر بـۆ نـــاو بـاخە دارخـورمـایـەك کە هـی خـۆی بـــوو، هـــەتا هـــاتەوە نـوێـژی عەسـری بـە جـەمـاعـەت لـە کیـس چـوو.

عـومـەر وتی: انـا لله و انـا الیه راجعـون.. بـە هـــۆی بـاخـەکـەمـــەوە نـوێـــژی عـەســـرم بــە جـەمـاعـــەت لە دەســـت چـــوو، ئـێوە بە شـــایەت دەگــرم کە باخـەکـەم دەکـەمـە خـێـر بـــۆ هـەژاران، بـەڵکو بـبـێـتە کەفـــارەتی ئــەم کــارەی کە عـومـەر کـردی!![1]

## لەگەڵ خۆمدا دنیا ڕادەکێشـــم!

عـومەیری کـوڕی ســـەعد[2] (ﷺ) ســاڵێکی تەواو والـی شــاری حمـص بـــوو لە شـــام.. لەو مـــاوەدا نە هـەواڵێـــك، نە خەراجێـــك لە عومـــەیرەوە بـــۆ عومـــەر نەهـات، عومەری کوڕی خەطـاب (ﷺ) دەڵێـت بە نـــووســـــەرەکەی: نامـەیــەك بنێرە بـــۆ عـومەیر و بانگهێشـــتی بـکە بـا بێـت بـــۆ ئـێرە، تـا بـزانـــین خیـانەتی لە پەیمانـەکەی نەکـردووە.

ڕۆژێـك کـۆڵانـەکانی مـەدیـنە بـــوونـە بـینەری..
پـیـاوێکی.. پـــرچ بـــژ و ئـــاڵۆســـکاوی!!
جـەســـتە شـــــەکـەت و خـــــۆڵاوی..!!
کـۆســـپ و نـەهـــامـــەتی ســــــــەفـەری..
بـوو بـوونـــە کـاڵا و پـۆشـاکی بـەری..!!

بە هـۆی نـاڕەحەتی و زەحـمەت و مـــاندوو بـــوونی زۆری ڕێگـای تـــولانییەوە، خەریکبـوو قـاچـەکانی هـەڵیان نەدەگـرت، بەسـەر شانی ڕاسـتییەوە هــەگبەیەك و قـاپـێـــك، بـــەسەر شـانی چەپیشــــییەوە کـــوندەیەکی بچـووکی ئـــاو خـواردنـــەوە دەبینرا، جەستەی سوك و لاواز و بێ هێـزی دابـوو بەسـەر دارعەسـایەکدا، هەنگـاوە کـورت و ماندووەکانی بـــەرە و کـــۆڕی ئـــەمیری باوەڕدارانیـان دەبــرد، ئـــەم پیـاوە

(١) (أنيس المؤمنين/٢٩)
(٢) (عـمـير بن ســـعد: صفة الصفوة /٢٥٣، ســير أعلام النبلاء: ج٥٥٧/٢، ألف قصة و قصة/ ٣٠١)



شەکەت و تۆزاوییە کە لە (حمص)ەوە بە پێ هاتۆتـە مەدینـە، بەبـێ پـشوودان..!!
هاتە بـەردەم عومەر، وتی: السـلام علیك.. ئـەی ئـەمیری باوەڕداران.
عومەر سـلاوی لێکـرد و، بینینی ئـەم پیـاوە هـیلاك و شـەکەتە زۆر ئـازاری دەروونی دا، عـومـەر پـێی وت: حـاڵـت چۆنـە ئـەی عـومـەیـر؟! !
عومەیر وتی: حالم ئـەمەیە بە دیـار چـاوتەوە.. نـامبینی تەندروسـت و خـوێن گەرم، لەگەڵ خۆمدا دنیا بە هـەر دوو شـاخەکەی ڕادەکێشـم؟! !
عـومـەر وتـی: ئـەی ئـەوە چـییە کـە پـێتـە؟
عـومەیر وتـی: هـەگبەکەم.. توێشـووی سـەفەرمی تێـدایە و، قـاپەکەم.. خـواردنی تێدا دەخـۆم و، کوندەکەشـم.. ئـاوی دەسـت نـوێـژ و خـواردنـەوەمی تێدایە، دارعەسـاکەشـم.. خۆمی بە سـەردا دەدەم و دوژمنێکی پێ تـار دەنـێم کە لێم نـزیك دەبێتەوە، دەی سـوێند بە خـودا.. دنـیا هیچ نییە، شـەیدا بـوونی ئـەم کەلـوپـەلانـەم نەبـێت..!!
عومەر وتـی: بە پـیادە هـاتـوویت؟! عـومەیر وتـی: بـەڵێ. عـومەر وتـی: ئـایا ئیمارەت وڵاخێکی لێ نـەبـوو، پـێتی بدەن هەتا سـواری ببیت؟! وتی: کـەس پـێـی نـەدام و.. منیـش داوام لـەکـەس نـەکـرد!!
عومەر وتی: ئـەی باشـە چیت کـرد بـۆ ئـەوەی کە بەڵێـنمان لـێ وەرگـرتیت بۆی؟ عومەیر وتی: چـوومـە ئـەو شـارەی کە ناردمـت بـۆی، چـاکانی ئـەوێم کۆکـردەوە و وەرگـرتنی بـاجم دایـە دەسـتیان، تـا کـۆیان کـردەوە و منیش لە شـوێنی شـیاوی خـۆیدا دامنـا و تەواوم کـرد، وە ئـەگـەر شـتێکی لـێ بمابا بـۆتم دەهێنا. عومەر وتی: کەواتە هیچت نەهێنـاوە؟ عومەیر، وتی: نەخێر. عـومەر بە دڵخـۆشـی و ڕووی گـەشـەوە، وتـی: بـەڵـێن بـۆ عومـەیر تـازە بکەنـەوە.
عومەیر وتی: هـەیـهـات..! ئـەوە ڕۆژانێـك بـوون گـوزەشـتن، چـیتر نە بـۆ تـۆ کـار دەکەم، نە بـۆ غـەیـری تـۆ. پاشـان مـۆڵەتی لە عـومەر وەرگـرت و گـەڕایەوە مـاڵەکەی خۆی کە چەند میلێـك لە مـەدینەوە دوور بـوو.
مـوددەتێـك پاش ئـەوە عومەر (١٠٠) سـەد دیناری هێنـا و دای بە پیاوێـك کە نـاوی حاریـس بـوو، پێـی وت: بـڕۆرە خزمـەتی عـومەیری کـوڕی سـەعد وەك میوانێـك خـۆت پیشـان بدە، ئـەگـەر حاڵیـت بە بـاش زانـی بێـدەنگ بە، ئـەگـەر ژیانی سـەخت و دژوار بـوو ئـەم سـەد دینارەی پێ بدە.
پیاوەکە ڕۆشـت و عومەیر پێی وت: لە کـوێـوە هـاتـوویت؟
پیاوەکە، وتی: لە مـەدینـەوە.
عومەیر وتی: موسـوڵمانان چـۆن بـوون؟
وتی: ئـەوان باشـبـوون.
عومەیر وتی: ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران حـاڵی چـۆن بـوو؟
وتی: کەسێکی ڕاسـت و پیاوێکی چاکە، حاڵی باشـە.

عومەیر وتی: خـودایا.. یارمـەتی عومـەر بدە، بەڕاسـتی مـن کەسێـك نـاناسـم هێـندەی ئـەو تـۆی خۆشبـوێت و، تـوند بێـت لەسـەر خۆشـەویستییەکەی بـۆت.
پاشـان پیاوەکە سـێ ڕۆژ لە ماڵی عومەیر مـایەوە، هیچیان نەبـوو کـولێـرەی جـۆ نەبێـت، کە دەیانـدا بە پیـاوەکە و خـۆیان بە بـرسـێتی دەمـانـەوە، هەتـا بـرسـێتی زۆری بـۆ هێنان.
پیاوێـك بە میوانەکەی عومەیری وت: بەڕاسـتی ئـەم مـاڵەت هـیلاك و بـرسـی کـرد، ئـەوان لە دەمی خـۆیـانی دەگـرنەوە بـۆ تـۆ، ئـەگـەر بە باشـی دەزانیـت وەرە بـۆ ماڵی من، تا بارگـرانییان لەسـەر نەمێنێت.
ئیدی پیاوەکە سـەد دینارەکەی دەرهێنـا و وتی: ئـەمـە ئـەمـیری بـاوەڕداران ناردوویەتی بـۆت، ئـاتاجی خـۆتی پێ دابـین بکە.
عـومەیر هـاواریکـرد و وتـی: ئـاتاجم پێـی نیـیە بیگەڕێـنەوە بـۆ ئـەمیری باوەڕداران!! خێزانەکەی پێی وت: ئـەگـەر پێویسـتت پێی بـوو هـەڵیگـرە، ئـەگـەر نا.. دابەشـی بکە بە سـەر موحتاجاندا.
وتـی: سـوێند بەخـودا.. هـیچم نیـیە تاپـارەکەی تیـا خەرج بـکەم. پاشـان ڕۆشـتە دەرێ و هـەموو پـارەکەی بە سـەر منـداڵە شـەهید و هـەژاراندا دابەشـکرد.
پیـاوەکە گەڕایـەوە خزمـەت عـومەر و بە سـەرهـاتەکەی بـۆ گێـڕایـەوە، عومەریش نـووسـراوێکی نـارد بـۆ عـومەیر کە تێیـدا نووسـرا بـوو: ئـەگـەر ئـەم نووسـراوەمت پێگەشـت، نووسـراوەکە دامەنـێ تا دەگەیتە لام.
عـومەیر هـاتە لای عـومـەر، خەلـیفەی موسـوڵمانان وتـی: چیـت کـرد بە دینارەکان؟ وتی: بـۆ پرسـیاریان دەکەیت؟ خەلیفەی موسـوڵمانان وتـی: سـوێندت دەدەم چیت لە دینارەکان کـرد؟ عومەیر وتی: بەخشـیم بە نەفسـی خـۆم. (واتە بەخشـینم، چـونکە ئـەوەی دەیبەخشـیت دەمێنێتەوە، ئـەوەی نایبەخشـیت دەڕوات و نـامێنێتەوە). عـومەر وتـی: خـودا ڕەحمـت پێبکـات. پاشـان فەرمانیـدا کـوڵێـك خـواردن و دوو پـۆشـاکیان بـۆ هێنا.
عومەیر وتی: هیچ پێویسـتییەکم بە خـواردنەکە نیـیە، چـونکە لە مـاڵەوە دوو ئـەندازە جـۆمان هـەیە، تـا ئـەوە دەخـۆین خـودا ڕزق دەنێرێـت، بەڵام دوو پـۆشـاکەکە دەبەم، چونکە دایکی فڵان (مەبەسـتی ژنەکەی بـوو) پـۆشـاکەکەی کـۆن بـووە و کەڵکێکـی وەهـای نەمـاوە. عـومەیر دوو بەرگـەکـەی بـرد و ڕۆشـتەوە بـۆ مـاڵەکەی خـۆی!!

## دەرگایەك لە میهرەبانی!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) لە سەفەرێکیدا، سێ کەس لە هاوەڵەکانی هاوسەفەری دەبن. لە هەندێ شوێنی دەشت و چۆڵەوانیدا، دەڕۆنە ناو مزگەوتێکی چۆڵ.. هەوا زۆر سارد دەبێت، مزگەوتەکەش دەرگای پێوە نابێت، کاتێك شەو دادێت و هاوەڵەکانی دەخەون، ئیبراهیم هەڵدەستێت و لە جێی دەرگاکەدا دەوەستێت.. هەتا بەیانی!

کاتێك هاوەڵەکانی بێدار دەبنەوە پێی دەڵێن: ئەمشەو بۆ نەخەوتیت؟! ئیبراهیم دەڵێت: هەواکەی سارد بوو.. ترسم هەبوو سەرماتان ببێت، بۆیە هەستام.. لە جێی دەرگاکەدا وەستام![1]

## گوناهی چل ساڵ لەمەوبەر!

موحەممەدی کوڕی سیرین ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) بە هۆی قەرزێکەوە غەم دایگرتبوو، کە دەبوو بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، دەیگوت: دەزانم.. ئەم غەمەی دایگرتووم بە هۆی گوناهێکمەوەیە، کە بەر لە چل ساڵ ئەنجامم داوە..!! ئەوکات وتم بە پیاوێك: ئەی موفلیس..!!

کاتێك ئەمە بۆ ئەبو سەعیدی دارانی دەگێڕنەوە، دەڵێت: ئەوان لەبەر کەمی گوناهەکانیان، زانیویانە لە کوێوە غەم و ناڕەحەتییەکانیان بۆ دێت، وە لە بەر زۆری گوناهی من و گوناهی تۆیە، کەوا نازانین لە کوێوە سەختی و گرفتەکانمان بۆ دێت!![2]

## هاوڕێیەتی

ئەبو موسای ئەشعەری (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەڵێت: هاوڕێی چاك.. باشترە لە تەنیایی، وە تەنیاییش.. باشترە لە هاوڕێی خراپ.

---

(١) (التبصرة لابن الجوزی ٣٠١/٢ ـ ٣٠٢)
(٢) (حلیة الاولیاء ٢٧١/٢)



## نوێکردنەوەی بەرگی کەعبە

داوا دەکەن لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) کە وەك عادەتی سالانە بەرگی کەعبەی پیرۆز تازە بکاتەوە، عومەر لە وەڵامدا دەڵێت: من ئەمساڵ نیەتم هێناوە پارە لەو کارەدا خەرج نەکەم و لەبری ئەوە چەند هەژارێکی برسی پێ تێر بکەم.

## کێ لەمەی پێدایت؟!

عومەری کوڕی خەطاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) پارچە بڕۆنزێکی بچووك بە دەست منداڵە بچووکەکەیەوە دەبینێت، پرسیاری لێ دەکات: کوڕی من کێ ئەمەی پێدایت؟! منداڵەکەی دەڵێت: بابە گیان.. کاربەدەستەکەی بەیتوماڵ پێیدام.
عومەر دەڕوات و دەڵێت بە کاربەدەستەکە: کێ فەرمانی پێکردیت ئەمە بدەیتە کوڕەکەم؟ کاربەدەستەکە دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران.. جەردی بەیتوماڵم کرد، هەمووی ئاڵتون و زیو بوو، تەنها ئەم پارچە بڕۆنزەی تیابوو، کە نرخێکی وەهای نییە، منیش دام بە دەستی کوڕەکەی تۆوە.
ئیدی عومەر هێندە توڕە بوو هەتا ڕوخساری سوور بۆوە و پێی وت: هەی دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات.. ئایا هەموو ماڵی موسوڵمانان گەڕایت، ماڵێکت نەدۆزیەوە حەرام بخوات ماڵی عومەر نەبێت؟! هانێ پارچە بڕۆنزەکە بگرە و بیخەوە شوێن خۆی.[1]

## چۆن ناسیمت؟!

بیشری حافی دەڵێت: پیاوێك وتی بە مالیکی کوڕی دینار: ئەی ڕیابازا..! مالیك ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) وتی: ئەوە لە کەیەوە ناوی من دەزانیت؟! بێجگە لە تۆ کەس ئاوەها بە تەواوی ناوی منی نەزانیوە.[2]

(١) (أنيس المؤمنين/٣٩)
(٢) (صفة الصفوة/٦٥١)



## گرانی.. ترسی ناوێت!

وتیان به سه‌له‌مه‌ی کوڕی دینار (رحمه الله): ئه‌ی ئه‌با حازم.. نابینی چۆن نرخی شتومه‌ك گران بووه؟!! سه‌له‌مه وتی: ده‌ی بۆچی ئه‌وه خه‌متان پێده‌دات؟! ! ئه‌و خوایه‌ی له هه‌رزانیدا ڕۆزیمان ده‌دات، هه‌ر ئه‌و خوایه‌شه که له گرانیدا ڕۆزیمان ده‌دات.[1]

## دابه‌شی سێی ده‌که‌یت؟!

هاوه‌ڵی پایه به‌رز ئه‌بو قیلابه (رضي الله عنه) ده‌ڵێت: ڕۆژێکیان له ساته‌وه‌ختێکدا ده‌ڕۆشتم، هه‌ورێکم بینی، له ئاسمانه‌وه ده‌نگێك لێی ده‌خوڕی و پێی ده‌وت: ئه‌ی هه‌وره‌که.. ئاوه‌که‌ت ببارێنه کێڵگه‌ی فلان که‌س. منیش دوای هه‌وره‌که که‌وتم، تا هه‌وره‌که گه‌شته کێڵگه‌یه‌ك و هه‌موو ئاوه‌که‌ی بارانده کێڵگه‌که، که هه‌وره‌که له بارانه‌که‌ی بوویه‌وه، وتم به خاوه‌نی کێڵگه‌که: تۆ چی ده‌که‌یت له به‌روبوومی ئه‌م کێڵگه‌یه‌ت؟! وتی: ئه‌ی براکه‌م.. کاتێك خودا به به‌روبوومی ئه‌م کێڵگه‌یه ڕۆزیم ده‌دات، به‌روبوومه‌که‌ی ده‌که‌مه سێ به‌ش: به‌شێکی بۆ هه‌ژاران.. به‌شێکی بۆ خۆم و خاوخێزانم.. به‌شه‌که‌ی تریشی وه‌ك بنه‌تۆو هه‌ڵده‌گرمه‌وه و وه‌رزی داهاتوو ده‌یچێنمه‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی هه‌مان به‌روبوومم پێ بداته‌وه..!![2]

## دۆزه‌خ ناهێڵێت بخه‌وم

کچه‌که‌ی ڕه‌بیعی کوڕی خوسه‌یم ده‌ڵێت به باوکی: باوه گیان.. ئه‌وه بۆ خه‌ڵکی ده‌خه‌ون و نابینم تۆ بخه‌ویت؟! ! ڕه‌بیع (رحمه الله) ده‌ڵێت: کچی خۆم.. دۆزه‌خ ناهێڵێت خه‌و بچێته چاوم.[3]

---

(١) (تهذيب حلية ألاولياء: ج١/٥٢٦)
(٢) (أنيس المؤمنين/٥٤)
(٣) (موسوعة الأخلاق ج١/ ١٧٧)

## ســـاتێك بۆ یادی خوا

ئـه‌بـوزه‌ڕ (ﷺ) ده‌ڵێـت: عـومه‌ری كـوڕی خه‌طـاب له‌و كه‌ســانه بـــوو.. كه ده‌ســتی پیاوێـك یان دوو پیاو له هـاوه‌ڵه‌كانی خـۆی ده‌گـرت و ده‌یـگوت: وه‌ره‌ن با ســاتێك بـه یـــادی پــه‌روه‌ردگـار ئیمانمان زیـــاد بكـه‌ین.

هه‌روه‌ها ئـه‌سـوه‌دی كوڕی هیلال ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ مه‌عازدا (ﷺ) ده‌ڕۆشـــتین، پێی وتین: دانیشـــن با ســه‌عاتێك یـادی خـودا بكـه‌یـن.[1]

## وه‌ها بـیر ده‌كـه‌یـنه‌وه‌؟!

ڕابـیعه‌ی عـه‌ده‌ویــه (رحمهـا الله) كه هێشـــتا ته‌مه‌نـی شـــه‌ش ســـاڵان بــوو، خـواردن خرایه به‌رده‌می و نه‌یخـوارد..!

باوكی وتی: ڕابیعه گیان.. چ زیـانێكی هـه‌یــه ئـه‌گـه‌ر بیخـۆی؟! ڕابیعه وتی: مـن نـایخـۆم هـه‌تـا نـه‌زانـم ئـایـا ئـه‌م خـواردنه حـه‌ڵاڵه یاخـود حـه‌رامـه؟ باوكی وتـی: ئـه‌گـــه‌ر زانیـت حه‌رامـــه و هیچـی تـــرت ده‌ســـت نه‌كه‌وت له‌م خـــواردنه زیاتـــر، ئـه‌وســـا چـی ده‌كه‌یـت؟ ڕابیعه وتـی: ئـــه‌ی بـابـــه گیـان.. ئـارامگـــرتن له‌ســــه‌ر بـرســـێتی دنیـا باشـــتره، هــــه‌تا ئـــارامگرتن له‌ســــه‌ر ئـاگـــری دۆزه‌خ له ڕۆژی قـیامــه‌تدا.[2]

## دوو ده‌رگای به‌هـه‌شـت

كـاتـێـك ئـیاسی كـوڕی مـعـاویـه ( رحمه الله ) دایكی ده‌مــرێت.. زۆر نـاڕه‌حــه‌ت ده‌بـێــت و ده‌گــریــه‌ت. پــێی ده‌ڵـێــن: بـــۆ هـێــنــده ده‌گــریـه‌یــت؟! ئـیاس ده‌ڵێت: چـۆن نـه‌گــریـه‌م؟! لـه كـاتێكدا مـــن دوو ده‌رگـــای كـراوه‌م هــه‌بـــوون بـــۆ بـه‌هــه‌شــت.. یـه‌كێكـیانـم لێ داخـــرا.

(١) (حیاة الصحابة ٤/١٦)
(٢) (أنیس المؤمنین/٦٢)

## دوو جار ئازاری مه‌ده

عه‌بدوڵڵای کوڕی موباره‌ك (رَحِمَهُ اللَّهُ) وتی: تۆبه کردن له غه‌یبه‌ت ئه‌وه‌یه که داوای لێخۆشبوون و نزای خێر بکه‌یت بۆ ئه‌و که‌سه‌ی که غه‌یبه‌تت کردووه.

سوفیانی کوڕی عویه‌ینه (رَحِمَهُ اللَّهُ) پێی وت: به‌ڵکو ده‌بێت داوای لێبوردن له خودی ئه‌و که‌سه بکه‌یت که غه‌یبه‌تت کردووه.

عه‌بدوڵلا وتی: ئه‌و کاته دووجار ئازاری ده‌ده‌یت..!! جارێك به‌وه‌ی که غه‌یبه‌تت کردووه و جارێکیش به‌وه‌ی که ئاگاداری ده‌که‌یته‌وه له‌وه‌ی که غه‌یبه‌تت کردووه.[1]

## خۆراگری و نوێژکردن

عه‌بدوڵڵای کوڕی عه‌باس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) به سه‌ر وڵاخه‌که‌یه‌وه بوو، که‌سێك هات و پێی وت: خودا پاداشتی گه‌وره‌ت بداته‌وه، ئه‌ی ئیبن عه‌باس.. کوڕه‌که‌ت مرد. عه‌بدوڵلا له‌سه‌ر وڵاخه‌که‌ی دابه‌زی و دوو ڕکات نوێژی کرد، دواتر پیاوه‌که وتی: به‌ڕاستی سه‌یره..!! ئه‌ی ئیبن عه‌باس، من وتم: کوڕه‌که‌ت مرد، که‌چی تۆ دوو ڕکات نوێژت خوێند! عه‌بدوڵلا وتی: ئه‌ی فه‌رمووده‌ی خودات نه‌خوێندۆته‌وه که ده‌فه‌رمووێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾[2][3]

واته: ئه‌ی ئه‌و که‌سانه‌ی که باوه‌ڕتان هێناوه، پشت ببه‌ستن به خۆڕاگرتن و نوێژکردن، به‌ڕاستی خودا له‌گه‌ڵ خۆڕاگرانه.[4]

(١) (مواعظ الصالحين والصالحات/٥٩ ـ ٦٠)
(٢) (البقرة /١٥٣)
(٣) (أنيس المؤمنين/٥٨ـ٥٩)
(٤) (پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان/٢٣)

## زانایه‌كی خاوه‌ن وه‌رع

ئه‌بوبه‌كـری كـوڕی ئـه‌بی عیســام (رحمه الله) ده‌ڵێـت: ئـه‌وه‌ی ڕوویـدا له به‌ســه‌رهـاتی عه‌لـه‌وییه‌كه لـه بـه‌ســره[1] .. ڕوویدا و كتێبه‌كانی منیش فه‌وتـان و، هیچیـان لـێ نه‌مایـه‌وه، بـۆیـه له‌وه‌ی كه ده‌رخـم بــوو په‌نـجا هــه‌زار فه‌رمـوودم هێنایـه‌وه و ئامـاده‌م كـرده‌وه، بـۆ ئـه‌و كـاره‌ش ئه‌ڕۆشـــتم له دوكانی بـه‌قاڵـه‌كه، له‌به‌ر ڕۆشـــنایی چــراكه‌یدا ده‌منووســییه‌وه، پاشــان بـیرم كـرده‌وه كـه مـن مۆڵـه‌تم لـه خـاوه‌نـی چــراكه وه‌رنـه‌گرتــووه..!! هــه‌ر بـۆیه ڕۆشـتم له ئــاوی ڕووبـاره‌كـه‌دا نـووســینه‌كـه‌م پـاك شــۆرده‌وه و دووبــاره ئـامـاده‌م كـرده‌وه!![2]

## شـه‌ڕی لـێمـه و.. خۆشـه‌ویـستی لـه‌وان!!

جارێكیان عومه‌ری كوڕی خه‌طاب ڕۆشـــته خزمه‌تـی رسـول الله (ﷺ) گله‌یـی له عه‌لـی كـوڕی ئـه‌بـوطالــب كـرد، عـومه‌ر وتـی: یارســول الله (ﷺ) هــه‌تا مـن ســه‌لام نه‌كه‌م له عه‌لی، ئـه‌و ده‌سـتپێشـخه‌ری ناكات بـۆ ســه‌لام لێكردنـم!!

فـه‌خـری عـالـه‌م ناردی بـه شـوێـن عــه‌لی دا و گـله و گازنـده‌كه‌ی عــومه‌ری پــێوت، عه‌لی له وه‌ڵامدا وتی: یارسـول الله (ﷺ) خـۆت فـه‌رمــووت: هــه‌ركه‌س ده‌ســپێشــخه‌ربێت بـۆ ســه‌لام كـردن له بـراكه‌ی، خـوای گــه‌وره قه‌ســرێكی بـۆ بنیـات ده‌نێـت له بـه‌هـه‌شـــت. مـنیــش لــه خۆشـه‌ویســتیمدا بــۆ عومــه‌ر ویســتم قـه‌ســره‌كه بـۆ ئـه‌و بـێت!![3]

---

(١) ((عه‌له‌وییه‌كه): كه‌سێك بـوو به نـاوی عه‌لی كوڕی مـوحه‌ممه‌د، له ســاڵی ٢٥٥ كـۆچی له به‌ســره بانگـه‌شـــه‌ی ئـه‌وه‌ی كـرد بوو كه له عه‌له‌وییه‌كانه، وه كـۆیله زنجییه‌كانی ســودانی له خـۆی كۆ كردبوویه‌وه و ســوپایه‌كی پێك هێنابوو، خه‌لیفه مـوعته‌مه‌دی شــكاند بـوو، بـۆ مـاوه‌ی ســیازده ســاڵ كارگه‌لێكی خراپی ئـه‌نجام دا بـوو، تا له ئـه‌نجامدا كوژراوه.)

(٢) (سـير اعلام النبلاء١٣/ ٤٣٣)

(٣) (أنيس المؤمـنين/٤٠)

## بریا هاوەڵێکم لێرە دەبوو

سوفیانی کوڕی عویەینە (رحمه الله) دەڵێت: ڕۆژێك.. دڵگەرم بووم و گریام، لە دڵی خۆمدا وتم: بریا ئێستا یەکێك لە هاوەڵەکانم لێرە بووایە و لەگەڵ مندا بگریایە، پاشان کەمێك خەو بردمیەوە و کەسێك هاتە خەوم.. کێشای بە سینەمدا و وتی: ئەی سوفیان.. بڕۆ پاداشتەکەت لای ئەو کەسە وەربگرە کە پێت خۆش بوو بتبینێت.. کاتێك دەگریایت.[1]

## چاوی وشترەکەم کوێر کرد!

عەبدوڵلای کوڕی عەون (رحمه الله) کەمجار تووڕە دەبوو، ئەگەر تووڕەش بووایە دەیوت بەو کەسەی کە تووڕەی دەکرد: خوا بەرەکەتدارت بکات.
ئەزهەر دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی عەون غولامێکی هەبوو.. ڕۆژێکیان غولامەکەی هات و بە عەبدوڵلای وت: گەورەم چاوی وشترەکەم کوێر کرد. عەبدوڵلا وتی: خوا بەرەکەتدارت بکات..! وتم: سەیرە..!! ئەو چاوی وشترەکەی دەرهێناوە و تۆش دەڵێی خوا بەرەکەتدارت بکات؟! ! وتی: دەی کەواتە پێی دەڵێم.. بڕۆ ئازاد بە لە ڕێی خوادا.[2]

## بێ هاوەڵ دەمێنیتەوە

فوەزەیلی کوڕی عەیاز (رحمه الله) دەڵێت: ئەوەی بە شوێن برایەکی بێ کەم و کورتیدا بگەڕێت.. لە ئاکامدا بە بێ برا دەمێنێتەوە.[3]

---

(١) (مواعظ الصالحين والصالحات/٥٣ ـ ٥٤)
(٢) (حلية الاولياء ٣٩/٣)
(٣) (رفقاء طريق/٤٠)

## مردنی ئیمام و.. شـــكاندنی دەرگاكە!

پێغەمـبەر (ﷺ) بە عـومەری کـوڕی خەطـاب دەفـەرمـووێت: ئیســلام بـۆ مـردنـت دەگــریـەت، ئەی عـومەر.. لـە کـاتێکدا تـۆ چـرای ئیسلامیت.

هــاوەڵی پایەبـەرز.. حوزەیفەی کوڕی یەمان دەڵێت بە عومەری کوڕی خەتـاب: ئــەی عـومەر.. حەزرەتـی رســول الله (ﷺ) هــەواڵی پێـدام، کە لە نێـوان تــۆ و فیتنەدا دەرگایەك هــەیە، ئـەگـەر تــۆ مـردیت ئـەوە دەرگـاکە واڵا دەبێـت و فــیتنە دەووروژێت.

عومەر (رضي الله عنه) دەڵێت: دەرگاکە دەشــکێندرێت؟ یاخــود دەکـرێتەوە؟ چـونکە ئـەگـەر کـرانەوە بێـت، ئومێـدی داخســـتنەوەی هــەیــە. حـوزەیفە دەڵێـت: بەڵکـو دەشــکێندرێت.

ڕۆژێکی هــەینی عومەر سەردەکەوێتە سەر دوانگە و دەڵێت بە هــاوەڵەکانی: لە خەونمــدا دیــتم کەڵەشــێرێــك ســێ دەنــووکی لێـدام، مــن خــۆم ئــەمە بە نـزیکبــوونەوەی ئــەجەلم دەزانــم، چــونکە کەڵەشــێــر لە خــەوندا بەنـدەیەکی عەجەمییە و، دەنـووك لێدانی کەڵەشــێریش.. تانە لێدانە بە خەنـجەر.

پاشــــان عــومەر دەڵێــت: ئـەگــەر مــن مــردم، ئــەوا خــودا دیــنەکەی و ئـەمانەتەکەی و ئـەوەی نـاردوویەتی بــۆ پێغەمـبەرەکەی (ﷺ) دەیـپارێــزێت و نایـفەوتێـنێت.

عـومەر وتـاری هــەینی خــوێند و لە ڕۆژی چـوار شـــــەممەدا بــریندار کــرا، ئـەوانەی هـەســتان بە شـــەهید کــردنی عـومەر (کۆمەڵەیەکی نهێنـی) بــوون بە ســــەرۆکایەتی پیـاوێکی یەهـودی، کە خــۆی بە ئیســلام پیشـــان دەدا بە نــاوی (عەبدوڵڵای کوڕی ســــەبەء) کە لە کۆمەڵەکەیدا.. لە مـەجـوســـان و یەهــودییانی کــۆکـردبــوویــەوە، هــەر لەو کـۆمەڵەیەدا پیـاوێکی مەجوســی نـارد بـۆ شـەهید کـردنی حەزرەتی عومەر (رضي الله عنه) کە ناوی ئەبا لوئلوئـە بوو.

عومەر لە نـوێژی بەیـانی ڕۆژی چوار شــەممەدا ســێ خەنـجەری لـێ دەدرێـت، لـەگـەڵ ئـەوەشـــدا دەیـەوێت بە ئـیمامەت نـوێــژەکەی بەیـانی بــۆ مـوســـوڵمانان تـەواو بکات، بەڵام قاچەکانی توانای هـەڵگرتنی جەســتەی عومەریان نامێنێـت، بــۆیە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بانگ دەکات، بـۆ ئـەوەی نـوێـژەکەیان بە ئیمامـەت بــۆ تـەواو بکات، ئـەویش نـوێـژەکەیان بــۆ دەکات.

پاشــان عومەر هـەڵدەگــرن و دەیـبەنەوە بــۆ مــاڵەکەی خــۆی، لە کاتێکـدا خـوێنی لێدەڕۆشــت و بێهۆش کـەوتبـوو، عــومەر دوای ئـەوەی بە هــۆش خــۆی دێتەوە، یەکـەم پــرســیاری ئـەمـە دەبێـت و دەڵێـت: کــێ بــریندار کـــردم؟ پێـی

دەڵێن: بەندەیەکی مەجوسی برینداری کردیت.
ئیدی عومەر کڕنوشی شوکرانە بۆ خودای میهرەبان دەبات، کە بە دەستی غەیرە موسوڵمان لێی دراوە، لەو ساتەوەختەدا کە خوێنە پاکەکەی دەڕژێت و مەرگی نزیك دەبێتەوە، دەڵێت بە عەبدوڵڵای کوڕی: ئەی عەبدوڵلا.. سەرم بەرز بکەوە لەسەر پشتییەکە و بیخەرە سەر زەوی، بەشکوم خودا بە نیگایەکی پڕ لە سۆز سەیرم بکات و ڕەحمم پێ بکات.
عومەر شەهید کرا و ماوەی خەلافەتەکەی دە ساڵ و شەش مانگ و چوار ڕۆژ بوو.[1]

## با سوك نەبیت!

موقاتلی کوڕی موحەممەد دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ باوکم و براکەمدا لە خزمەت ئەبی ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی حەربیدا (رحمه الله) ئامادە بووین، ئیبراهیم وتی بە باوکم: ئەمانە کوڕی خۆتن؟ باوکم وتی: بەڵێ. ئیبراهیم وتی: وریابە.. با لە سەرپێچی خوادا نەتبینن، هەتا لەبەر چاویان سوك نەبیت.[2]

## ساتەکانی دەم شۆردن

دایکی ئیمانداران عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنهما) دەڵێت: سەیرە..! هەر یەکێك لە ئێوە پاش خواردنێکی پاك و جوان دەست و دەمی دەشواتەوە، بەڵام بۆ قسەگەلێکی پیس و خراپ دەمی ناشواتەوە..!![3]

(١) (أنيس المؤمنين/٤١)
(٢) (التصنيف الموضوعي لتاريخ بغداد/١٨٠)
(٣) (حرمة أهل العلم: ٢٨)

# بە نوری خودا

عەلی کوڕی ئەبوطالب (عليه السلام) دەڵێت: لە ســەردەمی خەلافەتی عومەردا بووین.. لە خەونمدا بینیم نوێژی بەیانی دەکەم لە پشــت رســول الله وە (ﷺ) کە لــە نوێژەکــە بــووینەوە، لــە مــزگــەوت چــوومــە دەر، دەبــینم ئافرەتێك وەســتاوە و قاپێك خورمای پێیە و پێی وتم: ئەی عەلی.. ئەمە ببە بۆ رســول الله (ﷺ) کاتێك بــردم بــۆ خزمــەتی، بە دەســتی مــوبــارەکی خورمایەکی دەرهێنا و خســتییە دەمم، کە هەســتم بە شــیرینی خورماکە کرد وتم: خورمایەکی دیکەم بۆ زیاد بکە یارسول الله (ﷺ). بەڵام بەر لەوەی خورمایەکی دیکە وەر بگــرم، خەبــەرم بــوویــەوە و گــوێم لە بانگبێــژ بــوو بانگی بەیانی دەخوێند لە مزگەوتی رسول الله دا (ﷺ).

عەلی دەڵێت: ڕۆشــتم لە مزگەوت لە پشــت عومەرەوە نوێژی بەیانیم کرد، کە لە نوێــژ بــووینەوە، چوومــە دەر بینیم ئافرەتێــك لە بەردەم مزگــەوت وەســتاوە و قاپێك خورمای بە دەستەوەیە..!!

ئافرەتەکە وتی: ئەی عەلی.. ئەم خورمایە ببە بــۆ عومــەری ئەمیری ئیمانداران. کاتێك خورماکەم برد بۆ عومەر، بە دەســتی خــۆی خورمــایەکی دەرهێنا و خســتییە دەمم، کە هەســتم بە شــیرینی خورماکە کرد، وتم: ئەی ئەمیری ئیمانداران.. خورمایەکی دیکەم بۆ زیــاد بکە.

عومەریش وتی: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بــۆی زیــاد بکردبــایت.. منیش بــۆم زیاد ئەکــردیت..!! عەلی زۆر بە لایەوە ســەیر دەبــێت و دەڵێت: ئــەی ئەمیری ئیمانداران.. ئەمە خەونە بینیووتە؟! یان لە غەیبەوە زانیت؟!!

عومەریش دەڵێت: نە خەونم دیوە.. نە غەیب دەزانم!! بەڵام ئەگەر باوەڕدار دڵسۆزانە دڵی پاڵفتە بکاتەوە بۆ اللَّهُ عزوجل.. ئەوا ئەو کەســە وای لێدێت کە بــە نوری خودا ببینێت.[1]

---

(١) (أنيس المؤمنين/ ٤٧ـ٤٨)

## به‌ تۆ چی؟!

شـــوره‌یك ده‌ڵێت: ده‌ربـاره‌ی ئـه‌وه‌ی ڕوویدا له‌ نێـوان عـــه‌لی و معـاویـه‌دا، پرســـیارێكم كـرد لـه‌ ئیبـراهیمی كـوڕی ئـه‌ده‌هـم ( رحمه الله ) ئیبـراهیم وه‌ڵامـی نـه‌دامـه‌وه‌ و ده‌ســتی كــرد بــه‌ گــریــان..!! منـیش په‌شـیمـان بـــووم لـه‌و پرســـیاره‌ی كـه‌ لێم كـرد، دواتـر ئیبــراهیم ســـه‌ری بـــه‌رز كـــرده‌وه‌ و، گــوتی: بـه‌ڕاســتی ئــه‌وه‌ی نـه‌فــسی خــۆی بناســـێت، ئــه‌وا مـه‌شغــوڵ ده‌بــێت به‌ خـۆیـــه‌وه‌، وه‌ هـــه‌ر كه‌سێـــك په‌روه‌ردگـــاری بناســـێت، ئـــه‌وا ســـه‌رقـــاڵی خواپـه‌رستی ده‌بـێت و كـاری به‌ســـه‌ر كه‌ســانی تــره‌وه‌ نـامێـنێت.[1]

## هه‌ناســـه‌ی دایك

بیـــشری كــوڕی حاریـــس ( رحمه الله ) ده‌ڵـــێت: ئـه‌گـــه‌ر كـه‌ســێــك نــزیــك بــێت لـه‌ دایـكـیـیـه‌وه‌ و گــوێـڕایـه‌ڵی بــێت، بـــه‌ڕێـزتـره‌ لـــه‌وه‌ی لـــه‌ ڕێــی خــوادا جیـهـاد ده‌كـات، وه‌ ســـه‌یـر كـردنی دایــك بـه‌ سـۆز و میهـره‌بـانـییه‌وه‌ لـه‌ هـه‌مــوو شــتێك بـاشـــتره‌.[2]

## ترســـان.. له‌ لافـاتی زمـان!

جــونه‌یدی بـه‌غــدادی ( رحمه الله ) ده‌ڵێـت: منداڵــێكی حه‌وت ســـاڵان بـــووم، له‌بـه‌ر ده‌ســتی ســیـڕی ســـه‌قه‌تی دا، یـاریم ده‌كـرد.. كۆمـه‌ڵێكیش له‌به‌ر ده‌ســتیدا بـــوون، باســی (شــوكـر) یان ده‌كـرد، ســیــڕی پێـی وتـم: ئــه‌ی منـداڵ.. (شــوكــر) چییه‌؟ وتـم: شـوكـر ئـه‌وه‌یه‌.. كه‌ بـه‌ نیعمه‌ته‌كانی خوداوه‌ ســـه‌رپێچی نه‌كه‌یت. ســیـڕی پێی وتـم: ئه‌ترسم بـه‌خـت و شانســت له‌ خـوداوه‌ زمـــانـت بێـت!

ئیدی من هه‌تا ئه‌م كاته‌ش بـۆ ئه‌و قسه‌یه‌ ده‌گـریه‌م، كه‌ سیڕی پێی وتــم.[3]

---

(١) (حرمة أهل العلم: ٤٣)
(٢) (التبصرة:ج١/١٨٨)
(٣) (صفة الصفوة/٤٦٥)

## ئاه..!! لەی نەفسە خەواڵووەکەم

موحەممەدی کوڕی مونکەدر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: شەوێك تەمیمی داری (ﷺ) خەوت و شەوەکەی زیندوو نەکردەوە هەتا بانگی بەیانی درا، ئیدی تەمیم یەك ساڵی ڕێك شەوانە نەخەوت..! وەك سزایەك بۆ ئەو تەنها شەوەی کە زیندووی نەکردەوە.

## با قوتیلە چرایەکیش بێت!

شەوێك لە شەوان عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) دانیشتووە و.. مووچەی فەرمانبەرەکانی دەنووسێت، لە پاڵ دەستی دا.. قوتیلە چرایەك دانراوە، کە بە زەیت دەگرا، ئیمامی عەلی (ﷺ) دەچێتە ژوورەوە بۆ خزمەتی، ئیمامی عومەر دەڵێت: بۆ کاری تایبەتی هاتوویتە لامان یاخود بۆ کاری موسوڵمانان؟ ئیمامی عەلی دەڵێت: بۆ ئەم پرسیارەم لێدەکەیت؟! !

ئیمامی عومەر دەڵێت: ئەگەر کاری موسوڵمانانە ئەوا با قوتیلە چراکە بگرێت، ئەگەر کاری تایبەتی خۆتە با قوتیلەکە بکوژێنمەوە و ماڵی موسوڵمانان بێجگە لە بەرژەوەندی موسوڵماناندا بە کار نەهێنین.[1]

## گوێڕایەڵ بوونی پەروەردگار

ئیمام جەعفەری کوڕی موحەممەد (ﷺ) دەڵێت: هەر کەسێك.. لە زەلیلی سەرپێچی کردنەوە، پەروەردگار بیبات بۆ شکۆمەندی گوێڕایەڵ بوون، خوای گەورە دەوڵەمەندی دەکات بەبێ سەروەت و سامان، شادمانی دەکات بەبێ هاودەم، ڕێزدار و شکۆمەندی دەکات بەبێ عەشرەت.

(١) (أنيس المؤمنين/٤٨)



## له‌فۆرانی بوون

ڕۆژێـك تاووسـی كـوڕی كه‌یسـان ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) له‌ حـه‌ره‌مـی پـیرۆزدا و له‌ كـۆڕێكی گـه‌وره‌دا، ئامـۆژگـاری خـه‌ڵك ده‌كـات و درێـژه‌ به‌ ئامـۆژگـاری كردنـه‌كـه‌ی ده‌دات، حه‌سـه‌نی به‌سـری ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌چـێـت لێـی نـزیـك ده‌بـێـته‌وه‌ و ده‌چـپـێـنـێت به‌ گـوێـیدا و پێی ده‌ڵێت: ئـه‌گـه‌ر موعجه‌بـیت به‌ نـه‌فسـی خـۆت، ئه‌وا هـه‌سـته‌ ئـه‌م كـۆڕه‌ جـێ بهێڵـه‌. ئـیدی ده‌سـتـبه‌جێ تاووس هـه‌ڵده‌سـتێت و كـۆڕه‌كـه‌ی بـه‌جێ ده‌هـێڵێت.

## ڕه‌فتاری هاوسه‌ران

پیاوێـك ده‌چـێته‌ خزمـه‌ت عومه‌ری كوڕی خه‌تاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بـۆ ئـه‌وه‌ی شـكاتی هـه‌ڵسـوكه‌وتی خـراپی ژنـه‌كـه‌ی بكات، به‌ڵام ده‌بینێت عومـه‌ر خـۆی له‌ماڵه‌كه‌ی خۆی كێشه‌ی هه‌یه‌، بـۆیـه‌ به‌ بێ هیچ قسـه‌یه‌ك ده‌ڕوات..!! عـومه‌ر بـانگی لـێ ده‌كـات و پێـی ده‌ڵێـت: ئـه‌ی پـیاو.. تـۆ بـۆچی هـاتبـوویت؟ پیـاوه‌كه‌ش به‌ڕاشـكاوی ده‌ڵێت: هـاتم گله‌یی هـه‌ڵسـوكه‌وتی خـراپی ژنـه‌كـه‌مت بـۆ بكه‌م، به‌ڵام دیتم تـۆش هـه‌مـان گازنده‌ت هـه‌یه‌ كه‌ من هـه‌مـه‌، ئیتر ده‌نگـم نه‌كـرد و گـه‌ڕامـه‌وه‌.

عـومه‌ر وتـی: ئـه‌ی بـراكـه‌م.. ژنـه‌كه‌م چـێشـتم بـۆ لێـده‌نێت، به‌رگـه‌كانم ده‌شـوات، پێداویسـتییه‌كانم فـه‌راهـه‌م ده‌هێنێت و، شـیرده‌دات به‌ منـداڵه‌كانم و گـه‌وره‌یان ده‌كات، ئیدی ئـه‌گـه‌ر جـارێك خـراپ هـه‌ڵسـوكه‌وتی كـرد، یـاخود هاواری كرد به‌سه‌رماندا، نابێ باسـی بكـه‌ین و هـه‌مـوو چـاكه‌كانی تـری له‌ بـیر خۆمـان به‌رینـه‌وه‌، ئـه‌وه‌ش بـزانـه‌ ئـه‌ی بـرای مـوسـوڵمانم.. ئـه‌وه‌ی له‌ نـێوان ژن و مـێرد دایـه‌، دوو ڕۆژێكه‌ و تـه‌واو ده‌بێت، یا ئێمه‌ ده‌مـرین و ئیسـراحـه‌ت ده‌كه‌ین له‌ ده‌سـتی، یا ئـه‌و ده‌مـرێت و ئیسـراحه‌ت ده‌كات له‌ ده‌سـتی ئێمه‌.

ئیدی پیاوه‌كه‌ به‌ دڵێكی خـۆش و ئـارامـه‌وه‌ ده‌ڕواتـه‌ ده‌رێ، پـاش ئـه‌وه‌ی كه‌ به‌ دڵێكی تـه‌نگه‌وه‌ هـاتـه‌ ژوور.[1]

(١) (أنيس المؤمنين/٣٨)



## بۆ دوو درهه‌م سوێند ده‌خۆیت؟! !

جارێكیان كه‌سێك درۆیه‌ك ده‌داته‌ پاڵ موحه‌ممه‌دی كوڕی سیرین ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) و پێی ده‌ڵێت: دوو درهه‌مم له‌ لاته‌، بمده‌وه‌.
موحه‌ممه‌د ده‌ڵێت: هیچت له‌ لام نییه‌. پیاوه‌كه‌ واده‌زانێت كه‌ موحه‌ممه‌د سوێند ناخوات، بۆیه‌ پێی ده‌ڵێت: ئایا سوێند ده‌خۆیت كه‌ هیچم له‌ لات نییه‌؟! موحه‌ممه‌د ده‌ڵێت: به‌ڵێ.. سوێند ده‌خۆم كه‌ تۆ هیچت له‌ لام نییه‌. خه‌ڵكی پێی ده‌ڵێن: ئه‌ی ئه‌بابه‌كر.. ئایا سوێند بۆ دوو درهه‌م ده‌خۆیت؟! له‌ كاتێكدا دوێنێ وازت له‌ چل هه‌زار درهه‌م هێنا له‌به‌ر گومانێك.. كه‌ به‌س ته‌نها تۆ گومانی وا ده‌به‌یت..!!
موحه‌ممه‌دی كوڕی سیرین ده‌ڵێت: به‌ڵێ سوێند ده‌خۆم بۆ دوو درهه‌م.. چونكه‌ نامه‌وێ حه‌رامی ده‌رخوارد بده‌م، له‌ كاتێكدا كه‌ دڵنیام ئه‌و دوو درهه‌مه‌ هی ئه‌و نییه‌ و حه‌رامه‌ بۆی.[1]

## بریا.. وه‌ك تۆ بوومایه‌

ئه‌بوبه‌كری صدیق (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) باڵنده‌یه‌ك ده‌بینێت، به‌سه‌ر چڵی دره‌ختێكه‌وه‌، ده‌ڵێت: چ نیعمه‌تێكه‌ تۆی تێدایت ئه‌ی باڵنده‌..!! ده‌خۆیت و ده‌خۆیته‌وه‌ و له‌م چڵ بۆ ئه‌و چڵ ده‌فڕیت و سبه‌ینێیش هیچ لێپرسینه‌وه‌یه‌كت له‌سه‌ر نییه‌، بریا منیش وه‌ك تۆ بوومایه‌، غه‌می لێپرسینه‌وه‌ ژیان سه‌خت ده‌كات.

## غه‌یبه‌تی دایك و باوك!

عه‌بدوڵڵای كوڕی موباره‌ك ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر غه‌یبه‌تی كه‌سێكم بكردایه‌، ئه‌وا غه‌یبه‌تی دایك و باوكم ده‌كرد، چونكه‌ ئه‌وان له‌به‌رترن بۆ چاكه‌كانم.[2]

(١) (صور من حياة التابعين/١٢٩)
(٢) (حرمة أهل العلم: ١٢٣)



## پێم خۆش نیه پێکەوەبین

فاتمەی کچی عەبدولمەلیك (رحمها الله) هەندێ گەوهەری هەبوو کە باوکی پێی دابوو.. عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی مێردی پێی وت: یا ئەوەتا ئەو گەوهەرانە دەنێریتە بەیتوماڵ یا ڕێدەدەیت لێك جودابینەوە؟ چونکە پێم ناخۆشە من و ئەو گەوهەرانە لە یەك خانوودا پێکەوەبین..!! فاتمە وتی: گەوهەرەکان دەخەمە بەیتوماڵ و.. تۆ هەڵدەبژێرم.

ئیدی گەوهەرەکانیان خستە بەیتوماڵەوە.

عومەر مرد و یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك ڕۆشتە سەر کورسی دەسەڵات، ڕۆژێك بە فاتمەی خوشکی وت: ئەگەر بتەوێ گەوهەرەکانت بۆ دەگێڕمەوە. فاتمە وتی: شتێك لە ژیانی عومەردا نەمویستبێت، ئەوا دوای مەرگیشی نامەوێت.[1]

## ڕقم لە کارە خراپەکەیەتی

ڕۆژێك ئەبودەرداء (رضي الله عنه) بە لای پیاوێکدا گوزەری کرد کە گوناهێکی کرد بوو، خەڵکی جنێویان پێدەدا، بەڵام ئەو ڕێگری لێکردن و پێی وتن: ئەگەر ئێوە ئەم پیاوەتان لە چاڵێکدا بدیبایە، ئایا ڕزگارتان نەدەکرد؟!

خەڵکەکە وتیان: بەڵێ بێ گومان.. هاوکاریمان دەکرد تا ڕزگاری دەبوو. ئەبودەرداء وتی: کەواتە جنێوی پێ مەدەن و سوپاسی خودا بکەن کە ئێوەش هەمان گوناهتان ئەنجام نەداوە و خودا پاراستوونی لەو گوناهە.

وتیان: کەواتە تۆ ڕقت لەم پیاوە گوناهکارە نییە؟!! وتی: من ڕقم لە کارە خراپەکەیەتی، ئەگەر وازی لێهێنا.. ئەوا برامە. ئیدی پیاوە گوناهکارەکە بە بیستنی ئەو قسەیە، دایە پرمەی گریان و.. تۆبە و پەشیمانی خۆی دەربڕی لەو گوناهەی کە کردبووی.[2]

(١) (الف قصة و قصة/٢٩٣)
(٢) (صور من حياة الصحابة/٢٠٩ــ ٢١٠)

## کەسێك قەدری خۆی بزانێت

هــەواڵ گەشـــت بە عـومەری کـوڕی عەبـدولعەزیز ( رحمه الله ) کە یەکێـك لە کوڕەکـانی ئـەنگوســتیلەیەکی نـقێمداری کـڕیـوە بــە هــەزار درهــەم، بـــۆیە عـومـــەر نامـەیــەکی بـــۆ دەنـــووسێت و پێــی دەڵێـت: ســـوێندت دەدەم کە ئـەنگوســتیلەکەت بفـرۆشــیت و بە نـرخـەکەی هـەزار فـەقیری پێ تێـر بکەیت، وە ئـەنگوسـتیلەیــەك بکـڕە بە یەك درهــەم و لە ســـەری بکـۆڵە: ڕەحـــمەتی خـــوا لەو کـــەسـە بێت، کـــە قـــەدری خـــۆی دەزانـێـت!![1]

## ڕۆژووی نهێنیت گرتووە؟! !

هەروەك چـۆن کەسانێـك خەریکـی بەخشـــین بـــوون بە نهێنـی.. ئاوەهــاش کەسـانێـك هـەبوون کە بـــەڕۆژوو بـــوون بە نهێنـی، داوودی کـوڕی ئــەبی هینـد چـل ســاڵ بە ڕۆژوو بـووە، کەس پێی نـەزانیـوە..!!

داوود ( رحمه الله ) دوکانـدار بـــووە و خەریکـی ئـاوریشـــم فـرۆشـــتن بـــووە.. بـەیــانیان کە لە مـــاڵ ڕۆشـــتـــووەتە دەر، خـــواردنی ڕۆژەکـــەی لەگەڵ خـــۆی بـــردووە و بە مـــاڵـەوەی وتـووە: مـــن لـــە دوکـــان نـــان دەخـــۆم. کە هـــاتـۆتـــە دەریـــش خـــواردنـــەکەی بەخـشـــیوە بە هـــەژارێـك، ئــەهلی بـازاڕیـــش وایـــان زانـــیوە کــە لە مـــاڵەوە نـــانی خـــواردووە، بـەمشـــێوەیە بــە ڕۆژوو بـــووە هەتـا ئێـوارە ڕۆشـــتووەتەوە بـــۆ مـــاڵەوە، لەوێ ڕۆژووەکەی شــــکاندووە، بـێ ئــەوەی کەس پێی بـــزانـێت..!![2]

## زەماوەند لە بەهەشتە

عوتبەی غـولام ( رحمه الله ) لەو هــەمـــوو خـــواردنـــە جـــۆراوجـــۆرەدا، نـــان و خـوێـی دەخـوارد و دەیـگوت: زەمـاوەنـد لـە بـــەهـــەشـــتـــە.

(١) (انیس مومنین/١٢٣)
(٢) (صفة الصفوة/٦٥٧)

## زیاتر لێم بدە.. گەورەم!!

هیشـامی کوڕی عەمـمار، مـامۆسـتای بـوخـاری و ئەبـوداوود (رحمهـم الله) دەڵـێت: مـن هـێشـتا منداڵ بـووم، باوکم خـانـوویـەکی هـەبـوو فـرۆشـتی بـە بیسـت دیـنار و تـەیاری کـردم بـۆ حـەج، کاتێـك چـوومـە مـەدینە، ڕۆشـتمە خـزمـەت مـالیکی کوڕی ئەنـەس و پـێم وت: فـەرمـوودەم بـۆ بگـێڕەوە.

مـالیك ( رَحِمَهُ اللهُ ) وتی: بخـوێـنە.

وتـم: ناخـوێنم.. بـەڵکـو تـۆ فـەرمـوودەم بـۆ بگێـڕەوە.

مـالیك وتی: بخـوێـنە. منـیش هـەمان قسـەم دووبـارە کـردەوە.

ئیدی مالیك وتی: ئـەی غـولام.. وەرە، ئـەم مـنداڵـە بـبە و پـازدە داری لێـدە. غـولامـەکـە هـات، بـردمی و پـازدە داری لێدام، پاشـان هـێنامـیەوە بـۆ خزمـەتی مـالیك و پـێی وت: پـازدە دارەکـەم لێـدا. ئـیدی مـن وتـم: تـۆ زوڵـمت لێکـردم، پـازدە دارت لـێدام، بـەبێ هـیچ تـاوانێـك..! گـەردنت ئـازاد نـاکـەم. مـالیك وتی: دەی باشـە پـێم بڵێ: کەفـارەتـەکـەی چـییە؟

وتـم: کەفـارەتـەکـەی ئـەوەیـە.. لـەبـری پـازدە دارەکـە، پـازدە فـەرمـوودەم بـۆ بگێـڕیتەوە. ئیدی مـالیك پـازدە فـەرمـوودەی بـۆ گـێڕامـەوە، دواتـر پـێم وت: لێـدانـەکـەم زیـاد بکـە و.. فـەرمـوودەی زیـاتـرم بـۆ بگـێـڕەوە. مـالیك دەسـتی کـرد بـە پـێکـەنین و وتی: بـڕۆ.[1]

## منداڵەکان ناچار مەکەن!

ئیمامی عـەلی کـوڕی ئـەبـوطالـب (عليه السلام) دەڵـێت: منداڵـەکانـتان نـاچـار مـەکـەن بـە داب و نـەریـتی خـۆتـان، چـونکـە ئـەوان بـۆ زەمـانـێکی جـیاوازتـر لـە زەمـانی خـۆتـان خـولقـاون.

---

(١) (سـیر اعلام النبلاء ١١ / ٤٢٢ــ ٤٢٩ )



## نه‌عله‌كانت داكه‌نه

ته‌یبی كوڕی ئیسماعیل (رحمه الله) بینایی چاوه‌كانی له‌ ده‌ست دابوو، ڕێنیشانده‌ره‌كه‌ی ده‌یبرد بۆ مزگه‌وت و ده‌یهێنایه‌وه‌، ڕۆژێك كه‌ ده‌گه‌نه‌ مزگه‌وت پێی ده‌ڵێت: نه‌عله‌كانت دابكه‌نه‌. ته‌یب ده‌ڵێت: بۆچی؟! ڕێنیشانده‌ره‌كه‌ی ده‌ڵێت: چونكه‌ نه‌عله‌كانت پیساییان پێوه‌یه‌.
ئیدی ته‌یب ده‌سته‌كانی به‌رز ده‌كاته‌وه‌ و چه‌ند دوعایه‌ك ده‌كات و ده‌سته‌كانی ده‌هێنێت به‌ ڕوخساریدا.. خوای گه‌وره‌ش بینایی چاوه‌كانی بۆ ده‌گێڕێته‌وه‌.
ته‌یب ئه‌هلی قورئان بوو، بۆیه‌ ده‌ڕۆشت بۆ ئه‌و شوێنانه‌ی كه‌ قورئان خوێنی لێ نه‌بوو، هه‌تا خه‌ڵكان فێری قورئان بكات، وه‌ كاتێك خه‌ڵكه‌كه‌ی فێر ده‌كرد، ئه‌و شوێنه‌ی جێ ده‌هێشت و ده‌ڕۆشت بۆ شوێنێكی دیكه‌ و هه‌مان كاری ده‌كرده‌وه‌، ئیدی به‌رده‌وام هه‌تا ئه‌و ڕۆژه‌ی كۆچی دوایی كرد، خه‌ریكی قورئان وتنه‌وه‌ بوو.[1]

## له‌حواڵی دڵ و.. خه‌ڵات وه‌رگرتن!

ئیبن شه‌وزه‌ب ده‌ڵێت: ئه‌میری به‌سره‌، پاره‌ی دابه‌شكرد به‌ سه‌ر ئه‌هلی به‌سره‌دا، بڕێكیشی نارد بۆ مالیكی كوڕی دینار، ئه‌ویش قبوڵی كرد، موحه‌مه‌دی كوڕی واسع (رحمه الله) هاته‌ لای و پێی وت: ئه‌ی مالیك.. خه‌ڵاته‌كانی سوڵتانت، قبوڵ كرد؟! مالیك وتی: ئه‌ی ئه‌بابه‌كر.. له‌وانه‌ بپرسه‌، كه‌ له‌ لام دانیشتوون. هاوه‌ڵه‌كانی مالیك وتیان: ئه‌ی ئه‌بابه‌كر.. مالیك به‌ خه‌ڵاته‌كه‌ چه‌ند كۆیله‌یه‌كی كڕی و ئازادی كردن. موحه‌مه‌دی كوڕی واسع وتی: ده‌ی به‌ خودا سوێندت ئه‌ده‌م، دڵت ئێستا وه‌ك به‌ر له‌ وه‌رگرتنی خه‌ڵاته‌كه‌ وایه‌؟! مالیك وتی: سوێند به‌ خودا.. نه‌خێر. موحه‌مه‌د وتی: بینیت.. چ شتێك هاتۆته‌ ناخته‌وه‌؟! ! مالیك (رحمه الله) وتی به‌ هاوده‌مه‌كانی: به‌ ڕاستی مالیك گوێدرێژه‌، خوداپه‌رستن به‌و شێوازه‌ی موحه‌مه‌دی كوڕی واسع ده‌بێت.[2]

---

(١) (سلوة الأحزان/٥٥)
(٢) (صفة الصفوة/٦٤٢ـ ٦٤٣)

## ئێستا.. ساتەوەختی غەفڵەتە!

موسای کوڕی موغیرە دەڵێت: موحەممەدی کوڕی سیرینم بینی ( رحمه الله ) دەمەو نیوەڕۆ هاتە ناو بازاڕ، بە دەنگی بەرز.. ئەڵڵاهو ئەکبەر و سوبحانەڵڵا و.. زیکری خودای دەکرد، پیاوێك پێی وت: ئەی ئەبا بەکر.. ئا لەم سات و شوێنەدا و زیکر کردن؟! !

ئیبن سیرین وتی: ئێستا.. ساتەوەختی غەفڵەتە.[1]

## پلە و پایە و ڕەچەڵەك

حەسەنی کوڕی عەلی (عليهما السلام) چووە بازاڕ بۆ کڕینی پێویستییەك، نرخی شتەکەی لە دوکاندارەکە پرسی، دوکاندارەکەش نرخی گشتی شتەکەی پێگوت، بەڵام کاتێك زانی کە کڕیارەکە حەسەنی کچەزای رسول الله یە (صلى الله عليه وآله وسلم) وەك ڕێز و گەورە ڕاگرتنێك نرخەکەی کەم کردەوە، ئیدی حەسەن لە کڕینی شتەکە پەشیمان بوویەوە و وتی: نامەوێت لە شتێکی پووچی دنیاییدا، سوود لەوە وەربگرم کە لە بنەماڵەی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وآله وسلم).

## پێچەوانەی هەوای نەفس

ئەبوسولەیمانی دارانی ( رحمه الله ) دەڵێت: باشترینی کردەوەکان ئەوەیانە کە بە پێچەوانەی هەوا و ئارەزووی نەفسەوە ئەنجام درابێت.[2]

(١) (حلية الاولياء٢/٢٧٢)
(٢) (حياة السلف/٤٩)

## خۆت نزا بۆ خۆت بکە

عەبدوڵلای کوڕی ئەبی صاڵحی مەککی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: نەخۆش کەوتم و تاووسی کوڕی کەیسان هات بۆ سەردانم، پێم وت: ئەی ئەباعەبدولڕەحمان لە خوا بپاڕێوە هەتا شیفام بدات. تاووس (رحمه الله) وتی: خۆیشت نزا بۆ خۆت بکە، چونکە خوای گەورە نزای بێ دەرەتان و موحتاجان.. ناداتە دواوە.[1]

## باشتر لە حەجی ماڵی خوا!

حەسەنی بەسری (رحمه الله) کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی خۆی دەنێرێت بۆ جێبەجێ کردنی کاری پیاوێك، وە پێیان دەڵێت: لە ڕێگەتانا بڕۆنە لای سابتی بونانی و ئەویش لەگەڵ خۆتانا ببەن. ئەوانیش دەڕۆن، سابت پێیان دەڵێت: من لە ئیعتیکافدام، ئێوە بڕۆن. دووبارە دەچنەوە بۆ لای حەسەن و هەواڵەکەی سابتی پێدەڵێن، ئەویش دەڵێت بچنەوە پێی بڵێن: ئەی نازانیت ئەگەر حەج لە دوای حەجی ماڵی خوا بکەیت، هێندەی ڕۆشتنت بۆ ڕاپەڕاندنی کاری برایەکت خێرت دەسگیر نابێت؟! ئەوانیش دەگەڕێنەوە لای سابت و قسەکەی حەسەنی بۆ باس دەکەن، ئەویش واز لە ئیعتیکافەکەی دەهێنێت و دەڕوات لەگەڵ هاوەڵەکانیدا.[2]

## پزیسکی ئاگر

ئەبودەرداء (رضي الله عنه) دەڵێت: ئامان براکەم..! خۆت بپارێزە لە دۆعای مەزڵومان، چونکە وەك پزیسکی ئاگر.. لە گشت لایەکەوە بەرز دەبێتەوە بۆ خزمەت خودای (عز وجل).

(١) (صفة الصفوة/٤٠٩)
(٢) (اقوال السلف/٧٧)

## دادوەری لە ئیسـلامدا

دوو ئافرەت بۆ داواکردنی بژێوی، دەچنە خزمەت عەلی کوڕی ئەبو طالب، ئافرەتێکی عەرەب و خزمەتکارەکەی، ئیمامی عەلی (عليه السلام) بۆ هەر یەکێکیان مەنێك[1] خواردن و چل درهەم جیا دەکاتەوە، خزمەتکارەکە بەشەکەی خۆی دەبات و دەڕوات، ئافرەتە عەرەبەکە دەمێنێتەوە و دەڵێت بە ئیمامی عەلی: ئەی ئەمیری ئیمانداران! چەنێکت بەخشی بە من، بێ کەم و زیاد هێندەیشت بەخشی بە ئەو، لە کاتێکدا من عەرەبم و ئەو ئافرەتێکی عەجەمی خزمەتکارە؟!!

ئیمامی عەلی پێی دەڵێت: من بەوردی لە کتێبی خوادا گەڕام و نەمبینی نەوەی ئیسماعیل ڕێزیان لە نەوەی ئیسحاق زیاتر بێت، تەنها بە تەقوا نەبێت.

وە جوعدەی کوڕی هوبەیرە دەچێتە خزمەت ئیمامی عەلی و پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران! دوو پیاو دێنە خزمەتت، یەکێکیان تۆی لە خۆی و سەروەتی و خاوخێزانی خۆشتر دەوێت، ئەوی دیکەیان ئەگەر بۆی بلوێ سەرت ببڕێت، ئەوا دریغی لەو کارەدا ناکات، کەچی تۆ لە بەرژەوەندی نەیارەکەتدا دادوەریان دەکەیت!! بۆ وەها کارێك دەکەیت؟! ئیمامی عەلی دەکێشێت بە سینەی جوعدەدا و دەڵێت: دادوەری کردن کارێکە ئەگەر بۆ خۆم بووایە، ئەوا لە بەرژەوەندی لایەنگرکەمدا کارەکەم تەواو دەکرد، بەڵام دادوەری کارێکە لە خواوەیە.[2]

## بیانوو هێنانەوە

ئبن عەون دەڵێت: پیاوێك عوزری بۆ ئیبراهیمی نەخەعی هێنایەوە، ئیبراهیم (رحمه الله) پێی وت: ئەوا قبوڵمان کرد.. چیدی تۆش بیانوو مەهێنەوە، چونکە بیانوو هێنانەوە درۆی تێکەڵ دەبێت.[3]

---

(١) (مەن: کێشانەیەکی خەڵکی عێراقە، بریتییە لە سێ کیلۆ)
(٢) (التاريخ الاسلامي ج١١/٣)
(٣) (من روائع اقوال الصالحين:ج١٨٤/١)



## سـه‌ره‌خۆشی دنیایی

حاتـه‌می ئـه‌صه‌م ده‌ڵێت: ڕۆژێـك نوێـژێكی جه‌ماعـه‌تم له‌ كیـس چـوو، تـه‌نها ئـه‌بـوئیسحاقی بـوخاری ( رحمه الله ) سـه‌ره‌خـۆشـی لێكـردم، به‌ڵام ئـه‌گـه‌ر كـوڕێكم بمردبـا له‌ ده‌ هـه‌زار كـه‌س زیاتـر پرسـه‌ و سـه‌ره‌خـۆشـیان لێده‌كـردم..!! چـونكه‌ موسـیبه‌تی دیـن سـوك و ئـه‌هـوه‌نـتره‌ له‌ لایـان هـه‌تا موسـیبه‌تی دنـیایی!(١)

## گـه‌ڕان به‌ دوای زانسـت دا

عه‌بدولڕه‌حمانی كـوڕی قاسـمی عـوتقی میسـری.. كه‌ یه‌كـێكه‌ له‌ شـاگـرده‌ پێشـكه‌وتووه‌كانی مـالیكی كـوڕی ئـه‌نه‌س ( رحمه الله ) كه‌ چیـرۆكه‌كه‌ی زۆر سـه‌رسـوڕهێنه‌ره‌..!! میسـر جێ ده‌هێڵێت و سـه‌فـه‌ر ده‌كات بـۆ مـه‌دینه‌، خـۆی ده‌یگێـڕێـته‌وه‌ و ده‌ڵێت:

بـه‌ تـاریكی ده‌هـاتمه‌ خـزمـه‌ت مـالیك..!! دوو تـا چـوار پرسـیارم ئـاڕاسـته‌ ده‌كـرد، من له‌و كاتانه‌دا هـه‌سـتم به‌ ئـارامی و ده‌روون گـوشـادی ده‌كـرد، ئیـدی به‌ر له‌ نـوێـژی به‌یـانی ده‌ڕۆشـتمه‌ خـزمـه‌تی، جـارێكیان پاڵمدا به‌ ده‌رگـاكـه‌یه‌وه‌ و خـه‌و بـردمییه‌وه‌..!! مالیك هـاته‌ ده‌ر و هـه‌سـتم پێنه‌كـرد.. كـه‌نیزه‌كێكی ڕه‌ش پێسـتی مالیك، هات شـه‌قێكی لێدام و پێی وتـم: هـه‌سـته‌، گه‌وره‌كه‌ت ڕۆشـته‌ ده‌ر، ئـه‌و وه‌ك تـۆ غـافڵ نابێـت، ئـه‌مـڕۆ.. چـل و نـۆ سـاڵه‌ به‌ ده‌سـتنوێـژی شـه‌وان نوێـژی به‌یـانی ده‌كات، مه‌گـه‌ر چۆنهـا نه‌بێت.

ئیبن قاسـم، هێنده‌ زوو زوو ده‌چووه‌ خزمـه‌ت مالیك بـۆ به‌ده‌سـتهێنانی عـیلم و ئـاداب.. كه‌نیزه‌كه‌كه‌ وایده‌زانی كه‌ ئیبن قاسـم خزمـه‌تكاری مالیكه‌..!!!

ئیبن قاسـم به‌ شـوێن زانسـت دا.. ئـاواره‌ و دوور له‌ مـاڵ بـوو، وه‌ كاتێـك مـاڵ جێ ده‌هێڵێت، خێزانه‌كه‌ی سـه‌رپشـك ده‌كات بـۆ دانیشـتن و ئـارام گـرتن تـا گـه‌ڕانـه‌وه‌ی، یاخـود ته‌ڵاق وه‌رگـرتن و ده‌سـتپێكـردنی ژیـانێكی نـوێ بـۆ خـۆی.. ئـه‌و كاتـه‌ ژنـه‌كه‌ی دووگیان ده‌بێت، بـۆیـه‌ بـڕیـاری مـانه‌وه‌ و چـاوه‌ڕێ كـردنی مێرده‌كـه‌ی ده‌دات.

ئیبن قاسـم ده‌ڵێت: حه‌ڤده‌ سـاڵ له‌به‌ر ده‌رگـای مالیكدا مـامـه‌وه‌.. هیچ كـڕین

(١) (المسـتطرف ٨/١)



و فرۆشتنێکم تیا ئه‌نجام نه‌دا، ڕۆژێك له خزمه‌ت مالیکدا بووم، حاجییانی میسر هاتن بۆ مه‌دینه.. گه‌نجێك خۆی کرد به ژووردا، سلاوی له مالیك کرد و وتی: ئیبن قاسم لێره‌یه؟

ئاماژه‌یان بۆ من کرد، گه‌نجه‌که هات و.. نێو چاوانی ماچ کردم، منیش بۆنێکی زۆر خۆشم هه‌ست پێکرد، له بۆنی کوڕ ده‌چوو..!! دوایی زانیم ئه‌وه کوڕه‌که‌ی خۆم بوو!

هه‌سته‌کانی ئیبن قاسم هه‌له نه‌بوون. ئه‌وه کوڕه‌که‌ی خۆی بوو.. که به‌ر له حه‌ڤده سال له سکی دایکیدا بوو.. باوکی جێی هێشت و ئاواره‌ی شاران بوو بۆ فێربوونی زانست..!!![1]

## بازرگانییه‌ك بۆ هه‌ژاران

حه‌سانی کوڕی ئه‌بی سینان (رحمه الله) که یه‌کێك بووه له بازرگانه خوداناسه‌کانی شاری به‌سره، ده‌لێت: ئه‌گه‌ر هه‌ژاران نه‌بوونایا.. ئه‌وا بازرگانیم نه‌ده‌کرد.

وه‌لیدی کوڕی یه‌سار ده‌لێت: ئافره‌تێك.. کراسێکی ڕه‌نگ کالۆ بووی له به‌ردا بوو، هات و سوالی له حه‌سان کرد، حه‌سان به دوو په‌نجه‌ی شایه‌تمان و ناوه‌ڕاسته‌ی ئاماژه‌ی بۆ هاوکاره‌که‌ی کرد، هاوکاره‌که‌ی دوو درهه‌می بۆ جیاکرده‌وه.

به‌لام حه‌سان وتی: دوو سه‌د درهه‌می بۆ جیا بکه‌وه..!!

پێیان وت: ئه‌ی حه‌سان به‌و بڕه پاره‌یه ئه‌وه‌نده و ئه‌وه‌نده سوالکه‌رت پێ ڕازی ده‌کرد. حه‌سان وتی: من بۆ شتێك ڕۆشتم ئێوه په‌یتان پێ نه‌برد، ئه‌و ئافره‌ته شتێك له گه‌نجی تێدا مابوو، ترسام نه‌بوونی و نه‌داری شتانێکی خراپی فێر بکه‌ن!![2]

(١) (ترتيب المدارك ٣/٢٥٠)
(٢) (حلية الاولياء ٣/١١٦)

## بزانە کێ دەبینیت؟!

شێخ عەبدولقادری گەیلانی (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێت: خەڵك.. پەردەیەکە لە نێوان خۆت و نەفستدا، وە نەفست.. پەردەیەکە لە نێوان خۆت و پەروەردگارتدا، هەتا سەرقاڵ بیت بە خەڵکییەوە.. نەفست نابینیت، وە هەتا سەرقاڵ بیت بە نەفستەوە.. پەروەردگارت نابینیت.

## خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست

عومەری کوڕی خەطاب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بە پێی ڕێز و پایە و نازەحەتی چەشتنیان، لە پێناو خوا و پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) شتومەکی بەیتولمالی بە سەر خەڵکیدا دابەش دەکرد.

ڕۆژێك سەرقاڵی دابەشکردن بوو، نۆرەی عەبدوللای کوڕی هات و بەشی خۆی وەرگرت، پاشان نۆرەی ئوسامەی کوڕی زەید (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) هات، عومەر دوو هێندەی عەبدوللای کوڕی خۆی پێدا..!!

عەبدوللا لەوە دەترسا شوێن و جێی لە ئیسلامدا لە دواوە بێت، لە کاتێکدا ئومێدەوار بوو بە هۆی گوێڕایەڵی و تێکۆشان و دنیا نەویستی و پارێزکارییەوە، لە لای خوا لە موسوڵمانە پێشەنگەکان بێت، بۆیە وتی بە باوکی: فەزڵی ئوسامەت دا بە سەر مندا.. لە وەختێکدا ئەوەی من لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بینیوومە ئەو نەیبینیووە؟! !

عومەر وتی: کوڕم، ئوسامە لە تۆ خۆشەویست تر بوو لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە باوکیشی لە باوکت خۆشەویستر بوو لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ). ئیدی عەبدوللا لە مەبەستەکەی باوکی تێگەشت و، ڕازی بوو.[١]

---

(١) (أسد الغابة/٢٩)



## ڕزگارکردنی توسته‌ر و.. گریانی ئه‌نه‌س!!

ئه‌نه‌سی کوڕی مالیك (ﷺ) هه‌رکاتێك یادی ڕزگارکردنی توسته‌ری ده‌کرده‌وه ده‌گریا..!!

توسته‌ر شارێکی فارسی به‌هێز بوو، موسوڵمانه‌کان ساڵ و نیوێکی ڕێك ده‌وری شاره‌که‌یاندا ئه‌مجا بۆیان ڕزگار کرا، ئه‌ویش چ ڕزگار کردنێك؟! سه‌خترین ڕزگارکردنێك بوو که موسوڵمانه‌کان دیبێتیان. ده‌ی ئه‌گه‌ر ڕزگار کردنێك ئاوه‌ها بێت، ده‌بێت گریانی ئه‌نه‌س هۆکاره‌که‌ی چی بێت؟!!

کاتێك ده‌رگای قه‌ڵاکه‌ی توسته‌ر کرایه‌وه، چه‌ند کاتژمێرێکی که‌می مابوو بۆ نوێژی به‌یانی، ئیدی له ناو قه‌ڵاکه‌دا پێکدادانێکی سه‌خت و ترسناك، له نێوان سی هه‌زار سه‌ربازی موسوڵمانه‌کان و سه‌د و په‌نجا هه‌زار سه‌ربازی فارسه‌کاندا ڕوویدا، جه‌نگێك بوو له‌و په‌ڕی ناڕه‌حه‌تیدا.. هه‌ر له‌حزه‌یه‌کی مه‌رگه‌ساتێك بوو، به تایبه‌ت بۆ سوپای ئیسلام، به‌ڵام له کۆتاییدا خوای گه‌وره له ساته‌وه‌ختی هه‌ڵهاتنی خۆردا، سه‌رکه‌وتنی کرده نسیبی موسوڵمانه‌کان، ئه‌و کاته بۆیان ده‌رکه‌وت که نوێژی به‌یانییان له کیس چووه، به هۆی ئه‌و جه‌نگه سه‌خته‌وه که ڕووبه‌ڕووی بوونه‌وه، ئیدی ئه‌نه‌س بۆ یه‌که‌مجار له ته‌مه‌نیدا، بۆ له‌ده‌ستدانی نوێژی به‌یانی ده‌گریه‌ت و ده‌ڵێت: چی له توسته‌ر بکه‌م؟! من نوێژی به‌یانییه‌کم فه‌وتا.. که حه‌زم نه‌ده‌کرد هه‌موو دنیا هی من بێت و ئه‌و نوێژه‌م بفه‌وتێت.[1]

## قه‌رزاری و.. داوای لێخۆش بوون

موعته‌مر ده‌ڵێت: باوکم[2] قه‌رزار بوو و (أستغفر الله) ی ده‌کرد..! پێیان وت: داوابکه له خوای گه‌وره تا قه‌رزه‌که‌ت له‌سه‌ر نه‌هێڵێت. ئه‌ویش وتی: ئه‌گه‌ر خودا لێم خۆش ببێت، ئه‌وا قه‌رزه‌که‌شم له‌سه‌ر ناهێڵێت..![3]

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/١٣٥ ـ ١٣٦)
(٢) (واته: سوله‌یمانی کوڕی ته‌رخانی ته‌یمی ( رحمه الله ))
(٣) (حلية الاولياء ٣٢/٣)



## ئەم هۆدەیە کەی دروست کراوە؟!

عـەبدولجەباری کوڕی نەزری سـەلمی دەڵێت: حەسـانی کـوڕی ئەبـی سـینان بە لای هـۆدەیەکدا تێپەڕی، وتی: ئـەم هـۆدەیە لە کەیـەوە دروســت کــراوە؟! پاشــان هەڵوێستەیەکی کـرد و وتی: ئـەی نەفسـەکەم بە تـۆ چـی لە کەیــەوە دروســت کــراوە؟! بـۆ پـرسـیاری شــتێك دەکەیت کە پـەیـوەندی بە تــۆوە نییە؟!
ئیـدی حەســان ( رحمه الله ) ڕۆژووگــرتنی یــەك ســالی کــردە ســزایــەك بــۆ نـەفسی، لەبـەر پـرســیارێـك کە پـەیـوەندی بــەوەوە نـەبــوو.. ســاڵێك بــە ڕۆژوو بــوو!![1]

## چۆن هاوڕێتی خۆشەویستانت دەکەیت؟!

جـونەیدی بـەغدادی دەگـێڕێتەوەو دەڵێت: سـیڕی سـەقەتـی ( رحمه الله ) لـەدوا سـاتەکانی ژیـانیدا بـوو، ڕۆشـتمەخـزمـەتی و لەنزیکـیەوەدانیـشتم، گـوێم نوسـاند بـەگـوێیەوەو چـاوانم فـرمێـسکیان بـاراندەسـەر گـۆنای، لەو سـاتەدا سـیڕی چـاوە کانی کـردەوەو گوتی: تـۆ کێـیت؟ وتم: من جونـەیدی خـزمەتکارتم. گوتی: بـەخـێر بێیت. پێم گوت: یاشـێخ.. ئـامـۆژگارییەکم بکەتا لەدوای خـۆت سـوودمـەندبم پێـی. گوتی: هـەرگیز هـاوڕێتی خـراپـەکاران مـەکـەو.. هـەرگیـز نــەکـەیـت بـەهــاوڕێتی دۆسـتان و خـۆشـەویـستانت لەخـوای (عزوجل) دابـبڕێیت.[2]

## کێ دەیـەوێت بچێتە ژوور؟!

ڕۆژێـك صـاڵحی مــوڕری لەبــەر دەسـتی ڕابـیعەی عەدەویەدا دەڵـێت: ئــەو کـەســەی زۆر لــە دەرگــا بـدات، ئــاکام دەرگــای بــۆ دەکـرێــتەوە. ڕابـیـعــەی خــوانـاس (رحمها الله) دەڵـێـت: دەرگـا هـەمـیـشـە کـراوەیە بـــۆ هــەمـــووان، بــەڵام بـاســەکە ئــەوەیـە کـێ دەخــوازێـت بـچـێتە ژوورەوە؟![3]

(١) (حلية الاولياء ٣/١١٥)
(٢) (صفة الصفوة/ ٤٥١)
(٣) (مواعظ الصالحين والصالحات/٥٢٠)



## لاینەکەی خۆی.. بۆ دنیای تۆ نافرۆشـێت!

مـــەروانی کاربەدەســـتی معــاویەی کــوڕی ئـەبـوســـوفیان لە مـــەدینە، نـامـەیـەکـی لە لایەن معـاویــەوە بــۆ هــات، کـە بـڕیــاری دابـــوو بــە زەبــری شـــمشـــێر پەیمان بۆ یەزیـدی کـوڕی وەربگرێـت، لە نـامەکەدا معـاویە فەرمـانی کـردبـوو بە مەروان پەیمان لە موســولْمانان وەربگــرێت بــۆ یەزیـد..! مــەروان لە مـزگـەوتدا بـەڵێننـامـەکـەی دەخـوێندەوە، بەر لەوەی تەواو بێـت عەبـدولڕەحمانی کــوڕی ئـەبـوبەکــری صـدیق (ﷺ) هـەســـتایەوە و بە دەنگــی بـــەرز وتــی: ســـوێند بە خــودا چاکەتـان بــۆ ئــوممەتی مـوحەممــەد (ﷺ) نەویســـتووە.. بەڵکـو دەتـانەوێ خەلافەت بگــۆڕن بــۆ هــەرقـلیــەت، هـــەرکە هــەرقلێـك مــرد.. هـەرقلێکی دیکە بچێتە شـــوێنەکەی..!!.

ئیدی معـاویـــە.. نێردراوێــك بە ســــەد هـــەزار درهـــەمەوە دەنێرێـت بـــۆ لای عەبـــدولڕەحمان، دەیەوێـــت بە هـــۆی دنیـــاوە کەمـەندکێشـــی بکـــات، بــــەڵام عەبدولڕەحمان قبـوڵی ناکات و بە نێردراوەکە دەڵێـت: بگەڕێــوە بــۆ لای معـاویە و پێی بڵێ: عەبدولڕەحمان ئـاینەکـەی خــۆی بــۆ دنیای تۆ نـافــرۆشـــێت..!!

وە کاتێـك دەزانێت کە معاویـە خـۆی ســاز کــردووە بێـت بـــۆ مـــەدینە، ئــەو مـــەدیـــنە جــێ دەهێڵێــت و.. دەســـت بـــەجێ بـــەرە و مـــەککە دەڕوات، لـــەو دەمـــەدا بگـاتـە دەوروبـــــەری مـەککـە، گیانی پاکی دەسـپێرێت و دەگــەڕێتەوە بـۆ خـزمـەتی خـوای گەورە!![1]

## زۆربـەی سـاتـەکان

حەســـەنی بەسری (رحمه الله) دەڵێــت: لـــە مـاڵـەکانـــتانا، لـەســـەر سفـــرە و خوانـەکـانـتانـــا، لــــە ڕێـگـەتـانــــا، لــــە بـازاڕکـردنـتـانـــا، لـــە کـــــۆڕ و کــۆبـــوونـــەوەکـانـتـانا و لـــە هـــەر کــوێـیــەك بـــــوون.. ئـیـستـیغـفــاری زۆر بـکـەن، چــونـکـە نـازانـن چ کـاتـێـك خـــوای عزوجل لـێـتـان خــۆش دەبـێـت.[2]

(١) (رجال حول الرسـول/خالد محمد خالد)
(٢) (أقوال السلف/٩١)

## بیســت ســاڵ بۆ پەروەردەی زمان!!

عەبدوڵڵای کوڕی ئـەبـو زەکەریـا (رحمه الله) دەڵێت: بیســـت ســـاڵ خەریکـی پـــەروەردەی زمــانـم بـــووم، بـەر لـەوەی بـۆم ڕاسـت بێـتەوە!
ئـەبـو جـەمـیلـە دەڵـێت: ئـەبـــو زەکـەریـا لـە کـــۆڕ و دانـیـشـــتـنـەکـانیدا باســی کەسـی نـەدەکـرد و بـــە هـاودەمـەکانی دەوت: ئـەگـەر یـادی خـودا بکـەن، ئـەوا هـاوکـاریتان دەکەیـن.. وە ئـەگـەر بـاســـی خـەڵکـیتان کـرد ئـەو کـاتـە بـەجـێـتان دەهـێـڵـیـن.[1]

## داوای چی دەکـەیت بۆتی دێنم!

موحەممەدی کوڕی سـیرین دەڵێت: لە ســـەردەمی عوســمانی کوڕی عەففـان دا (رضي الله عنه) نـرخی یــەك دارخــورمـا گـەیشــتە هـەزار درهـەم، ئـوسـامــەی کـوڕی زەیـد ڕۆشـــت دارخـورمـــایـەکی بـــڕیندار کــرد و نـــاو کـرۆکـەکـەی دەرهێـنـا و کـردیـە نـۆشـــی گیانی دایکی.
پێیـان وت: ئـەی ئـوســـامە.. چـی وای لێکـردیت ئـــەو کـــارە بکــەیت؟! لە کـاتێکدا دەزانـیت نـرخی دارخـورمـــایـەك گـەیـشـــتۆتە هـــەزار درهـــەم؟!
ئـوســـامە (رضي الله عنه) وتـی: دایکـم داوای لێکـردم، وە دایکـم هــەر شــتێکم لـێ بـخـوازێ و مــن لــە تـوانامدا هــەبێت بـــۆی ئـامـادە بـکەم، ئـــەوا هـــەرگیز درێـغی نـاکەم.[2]

## دیـاری بە هەمـوو کەس نـادەم!

پـیاوێــك دەڵێـت بە حەســـەنی بـەســری (رحمه الله): تـــۆ غـەیـــبەتی منـت کـــردووە. حەسـەن پـێی دەڵێـت: پلە و پـایـەت هێـنـدە بـــەرز نـیـیە لە لام، هــەتـا مـن چـاکـەکـانی خـۆمت بــۆ بکەمـە دیــاری.

---
(١) (صفة الصفوة/٨١١ ـ ٨١٢)
(٢) (صفة الصفوة/١٩٠)

## له‌ حوزوری شافیعی دا

صاڵحی کوڕی ئه‌حمه‌دی کوڕی حه‌نبه‌ل ده‌گێڕێته‌وه‌ و ده‌ڵێت: شافیعی (رَحِمَهُ اللهُ) به‌سه‌ر ئێستره‌که‌یه‌وه‌ بوو و باوکم به‌ پیاده‌ به‌ ته‌نیشتی ئێستره‌که‌یه‌وه‌ ده‌ڕۆشت، دواتر یه‌حیای کوڕی موعین به‌ باوکمی وت: ئه‌ی ئه‌با عه‌بدوڵلا..! هیچ کارێك نه‌بوو بیکه‌یت، ئه‌وه‌ نه‌بێت که‌ به‌ ته‌نیشت ئێستره‌که‌ی شافیعییه‌وه‌ بڕۆیت؟!

باوکم وتی: ئه‌ی ئه‌با زه‌که‌ریا.. ئه‌گه‌ر تۆش له‌ ته‌نیشته‌که‌ی تری ئێستره‌که‌یه‌وه‌ به‌ پیاده‌ بڕۆشتیتایه‌، سوودی زیاتری هه‌بوو بۆت.[1]

## بۆ شیعر ناهۆنیته‌وه‌؟!

ماوه‌ی بیست ساڵ ڕه‌بیعی کوڕی خوسه‌یم (رَحِمَهُ اللهُ) بێجگه‌ له‌ وته‌ی باش هیچ قسه‌یه‌کی بێ واتای نه‌کردووه‌..!! جارێکیان پێی ده‌ڵێن: بۆچی شیعر ناهۆنیته‌وه‌؟! خۆ هاوڕێکانت شیعریان ده‌هۆنییه‌وه‌؟!

ڕه‌بیع ده‌ڵێت: هیچ شتێك نییه‌ بوترێت و فریشته‌کان نه‌ینووسنه‌وه‌.. منیش پێم ناخۆشه‌ له‌ به‌ڵگه‌نامه‌که‌ی ڕۆژی دواییمدا، دێڕه‌ شیعر بخوێنمه‌وه‌..!![2]

ئیمامی غه‌زالی ده‌ڵێت: وتیان: ڕه‌بیعی کوڕی خوسه‌یم بیست ساڵ قسه‌یه‌کی دنیایی نه‌کردووه‌، وه‌ ڕۆژانه‌ سه‌ر له‌ به‌یانییه‌که‌ی شوشه‌ی جه‌وهه‌ر و قه‌ڵه‌م و کاغه‌زی ئاماده‌ ئه‌کرد.. هه‌ر قسه‌یه‌کی بکردایه‌ ده‌ینووسییه‌وه‌، پاشان ئێواره‌ نووسراوه‌که‌ی ده‌هێنا و لێپرسینه‌وه‌ی خۆی ده‌کرد، له‌و قسانه‌ی که‌ کردبوونی.[3]

(١) (التصنیف الموضوعی لتاریخ بغداد/٥٥٥)
(٢) (حلیة الاولیاء ٢/ ١١٣)
(٣) (إحیاء علوم الدین ٣/ ١٢١)

## بە قەرزەکەتەوە بمرە!!

عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی زیاد دەڵێت: باوکم هاوەڵی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو (رحمه الله) قەرزاری زۆری بۆ هێنا و منی نارد بۆ لای ئیمام ئەحمەد هەتا ڕاوێژی پێ بکەم، کە ئایا باوکم دەتوانێت لەگەڵ سوڵتان و داروودەستەکەی کار بکات، هەتا قەرزەکەی لەسەر نامێنێت؟

ئیمام پێی وتم: پێی بڵێ: با لەگەڵ ئەوان کار نەکات، با بە قەرزەکەیەوە بمرێت و.. هەر بە قەرزەکەیەوە بگاتەوە بە خزمەت خوای (عزوجل).[1]

## سەرخەو دەشکێنی؟! !

کاتێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رحمه الله) خەلافەت کرایە گەردنی.. هەر لەسەرەتاوە یەکەم ڕۆژی بە ماندوو بوون و ناڕەحەتی دەست پێکرد، کفن و دفن و پرسەی خەلیفە سولەیمان و، وەرگرتنی خەلافەت لە ڕۆژێکدا زۆر ماندووی کرد، هاتەوە بۆ هۆدەکەی خۆی، ویستی کەمێك پشوو بدات.. بەڵام فریای ئەوە نەکەوت سەر بنێتەوە و لە جێگاکەیدا ڕابکشێت..!!

عەبدولمەلیکی کوڕی کە لەو کاتانەدا تەمەنی بەرەو حەڤدە ساڵی دەڕۆشت، هات و وتی بە باوکی: بە نیازی چیت ئەی ئەمیری ئیمانداران؟!!

عومەر وتی: ئەی کوڕم. بە نیازم سەرخەوێك بشکێنم، چونکە بەدەنم وزە و گڕوتینێکی تیا نەماوە. وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران. دەتەوێ سەرخەو بشکێنیت بەر لەوەی مافی زوڵم لێکراوان بگێڕیتەوە؟!

عومەر وتی: کوڕەکەم.. دوێنێ شەو بە هۆی سولەیمانی مامتەوە.. نەخەوتم، وە نوێژی نیوەڕۆش ئیمامەتم بۆ موسوڵمانان کرد، هەق و مافی زوڵم لێکراوانیش دەگێڕمەوە، إن شاء الله. عەبدولمەلیك وتی: ئەی کێ زامنی مانەوەتە تا دوای نیوەڕۆ؟! !

ئەم وشانە عەزمێکی بە عومەر بەخشی و.. خەوی لە چاوانی تۆراند و.. گڕ و تین و هێزی لە جەستەی هیلاکی عومەردا زیندوو کردەوە و

(١) (زهرة البساتين ج٢/٣٦٢)



وتـی: ئــادەی لـێــم نـزیك بــەوە كــوڕەكــەم. ئـەویش لێـی نـزیك بـــوویەوە، عـــــومەر كوڕەكەی لە ئـامێز گـرت و نێـو چـاوانی مــاچ كـرد و وتی: ســوپاس بـۆ ئـەو خـودایــەی كە لە پشـــتی خـۆم كـوڕێكی پێبەخشـــیم، كە یاریـدەدەر و پشــتگیرم بێت بـۆ دینەكەم!!

پاشــان هـەسـتا و فەرمانیـدا. جـاڕ بـدرێت بەنــاو خەڵكیـدا: كــێ زوڵـــمی لێكــراوە بـا داوایەك بەرز بكاتـــەوە بــۆ ئـەمـیـری بـاوەڕداران، بــۆ ئـــەوەی ئــەمـیری بـاووەڕداران بـە پـشـتیوانی خـوا مـافـەكـەی بـۆ بگـێـڕێـتەوە.[1]

## موحتاجبـوون بەخـەڵكـی.. ناڕەحـەتییە

موســای كـوڕی تەریـف دەڵێـت: ئیبـــراهیمی كـوڕی ئـەدهـــەم (رحمه الله) لە ســـەفەرێكی نـاو دەریـادا بـــوو، ڕەشـــەبا و گێـژەڵـوكەیەكی ســـەخت ڕووی تێكـردن، كە خەریك بـوو بە هـەلاكەتیا دەبـردن، ئیبـراهیم بە عـەبـایەك ســەری خـۆی داپـۆشی و ویســتی بنـووێت! پێیـان وت: ئـایا تــۆ نـابینیت ئێــمە لــە چ نـاڕەحـەتـیـیـەكـدایـن، وا بـێ خــەم دەتــەوێ بـنـووی؟!

وتی: مـن وای نـابـیـنـم كـە ئــەمـە نـاڕەحـــەتی بـێـت. وتیـان: ئـەی ئـەگــەر ئـەمـــە نـاڕەحـەتــی نـەبـێــت.. كــەواتە چــی نــاڕەحەتییە؟!! ئیبـــراهیم وتـــی: موحتاجبـــوون بە خەڵكــی نــاڕەحەتییە، نەك موحتاجبـــوون بە خـــودا. پاشـــان دەســتی كــرد بە پاڕانـــەوە و وتـی: پـەروەردگــارا.. قــودرەتی خــۆتت پـیشـــان داین، دەی ئـێســـتا عەفـوی خـۆتمان پـیـشــان بـدە.

ئیدی دەریــا.. وەك زەیتی نـاو پـەرداخـێكی لێهـات، ئـــارام و بـێ شەپـۆل!![2]

## هـەمـوو كـات.. نـا!

بـە ئـامـادە بــوونی سـوفیانی كوڕی عویەینە، پـرسـیارێـك ئـاڕاسـتەی عەبدوڵڵای كـوڕی مـوبــارەك دەكــرێت، عــەبدوڵڵا (رحمه الله) دەڵێـت: ئـێـمــە فــەرمـانمــان پـێكـراوە لە حــوزوری گــەورەكانماندا وەڵام نــەدەیـنەوە.[3]

---

(١) (صور من حياة التابعين/٨٢ـ٨٣)
(٢) (الأتقياء الأخفياء/٢٤٣)
(٣) (حياة السلف/٥٩)

## نوێـژکـردن و.. خـەیاڵ ڕۆشـــتن!

مەیمـونی کـوڕی حەییـان دەڵێـت: نـەمدیـــوە موســـلیمی کـوڕی یەســـار ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) لە نـوێــژدا بــە کەمتریــن لەحــزە نیگـای ئـەمــلاولا بکـات، تـەنـانــەت ڕۆژێـك لایەکی مـزگـەوتـەکـە ڕووخـا و ئـەهلی بـــازاڕ و دوکاندارەکـان لە نـــاڵەی ڕووخـانـەکـە تـرســان، بەڵام موســـلیم کە لە مـزگـەوتـەکـەدا بـــوو نـوێـژی دەکـرد، نـوێـژەکەی نـــەبـڕی![1]

## قوتابخـانەی خاچپەرســتان

عیسای برای مەعروفی کەرخی دەڵێت: ئێمە سـەرەتا لەســەر دینـی مەســیحی بـــووین، مـــن و مەعـــروفی بـــرام لە خـــوێندنگەی کەنیســــــە دەمـانـخـــوێند، مامۆســتاکـە بــابـەتی "خــوای بـاوك و خــوای کـوڕ" ی بە منداڵــەکان دەوتـــەوە، مـەعروفی بـرام هـاواری دەکـرد و دەیوت: أحَدٌ.. أحَدٌ.. خـوا تـاك و تـەنهـایـە، خـوا تـاك و تـەنهـایـە.

ئیدی مامـۆسـتاکە لەســـەر ئـەوە زۆری لێ ئـەدا، ڕۆژێــك زۆر بە ســــەختی لێیدا، ئـەویش لە دەسـتی هـەڵهـات و ڕۆشـــت، چەند سـاڵێـك نەگەڕایـەوە!

دایکم هـەمیشـــە دەگـریـا و دەیگوت: ئـەگــەر خــوای گەورە مەعروفـی کـوڕم بگەڕێـنێـتەوە بـۆم، لەســــەر هـەر دینێك بێـت ئـەچمە ســــەر دینـەکەی. دوای ســــاڵانــێکی زۆر مـەعـــــروف گــەڕایــــەوە بـــۆ مـــاڵ، دایکـم پێـی وت: ئـەی کـــوڕی شـــیرینـم.. لـەســـەر چ دیـنـێکیت؟ مـەعـروف ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) وتی: لەســـــەر دینی ئیســـلامم. دایـکـم وتی:

أشـــهَدُ أَن لا إلهَ إلا الله .. وَ أَشـــهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَ رســولُهُ.

ئیدی لەپاش موســـوڵمانبـوونی دایکم، هـەمـوومـان مـوســـوڵمان بـــوویـن.[2]

---

(١) (حلية الاولياء ٢/٢٩١)

(٢) (صفة الصفوة/٤٢٣)

## چاکی مه‌که با فراپ نه‌بێت!!

عومه‌ری کوڕی عه‌بدولعه‌زیز (رحمه الله) ده‌ڵێت: ئه‌وه‌ی به‌بێ زانست کارێك ئه‌نجام بدات، چه‌نده چاکسازی تێدا بکات، له‌وه زیاتر ده‌یشێوێنێت.[1]

## وته‌یه‌کی دروست و.. بڕیارێکی دادوه‌رانه

ئه‌میری باوه‌ڕداران عومه‌ری کوڕی خه‌طاب (رضي الله عنه) ئه‌سپێکی کڕی له پیاوێکی ده‌شته‌کی و پاره‌که‌ی کاش پێدا، پاشان سواری ئه‌سپه‌که بوو و پێی ڕۆشت، به‌ڵام زۆر دوور نه‌که‌وته‌وه، ئه‌سپه‌که په‌کی که‌وت و نه‌یتوانی به‌رده‌وام بێت له غاردان، ئیدی عومه‌ر به ئه‌سپه‌که‌وه گه‌ڕایه‌وه بۆ ئه‌و شوێنه‌ی که لێی ده‌رچوو بوو و به پیاوه‌که‌ی وت: ئه‌وه‌تا ئه‌سپه‌که‌ت ببه‌وه بۆ خۆت، چونکه په‌کی که‌وتووه، پیاوه‌که وتی: وه‌ری ناگرمه‌وه، ئه‌ی ئه‌میری باوه‌ڕداران.. من ئه‌سپێکی ته‌ندروست و بێ خه‌وشم پێ فرۆشتوویت.

عومه‌ر وتی: با که‌سێك له نێوانماندا دادوه‌ر بێت. پیاوه‌که وتی: شوره‌یحی کوڕی حارسی کیندی دادوه‌رمان بێت. عومه‌ر وتی: ڕازیم. ئیدی هه‌ردووکیان پێکه‌وه چوونه لای شوره‌یحی قازی..

کاتێك قازی گوێی له قسه‌ی پیاوه‌که بوو، ڕووی کرده عومه‌ر و پێی وت: ئه‌ی ئه‌میری باوه‌ڕداران، ئایا ئه‌سپه‌که‌ت به ساغله‌می وه‌رگرت؟

عومه‌ر وتی: به‌ڵێ.

شوره‌یح وتی: ئه‌ی ئه‌میری باوه‌ڕداران.. ئه‌وه‌ی کڕیوته بیپارێزه بۆ خۆت، یاخود وه‌ك چۆن به ساغی وه‌رت گرت، ئاوه‌ها به ساغی بیگێڕه‌وه..!!

عومه‌ر به سه‌رسوڕمانه‌وه سه‌یری شوره‌یحی کرد و وتی: دادوه‌ری ئاوه‌ها نه‌بێت ئه‌ی چۆن ده‌بێت..!! وته‌یه‌کی دروست و.. بڕیارێکی دادپه‌روه‌رانه، ئه‌ی شوره‌یح.. بڕۆ بۆ کوفه و کاروباری قه‌زایان بۆ به‌ڕێوه ببه.[2]

---

(١) (حياة السلف/٦٣)

(٢) (صور من حياة التابعين/١١١ـ١١٢)

## حه‌وت ڕۆژه میوانم نه‌هاتووه!

ڕۆژێك عه‌لی كوڕی ئه‌بو طالب (عليه السلام) ده‌ستی كرد به گریان..! پێیان وت: چی ده‌تگریه‌نێت؟ عه‌لی وتی: ئه‌وه بۆ ماوه‌ی حه‌وت ڕۆژه هیچ میوانێكم نه‌هاتووه.. ئه‌ترسم خوا بێ ڕێز و ڕیسوای كردبم..!![1]

## خوداناسێكی بازرگان و.. بازرگانێكی خوداناس

موحه‌ممه‌دی كوڕی سیرین (رحمه الله) زیانێكی گه‌وره‌ی لێ كه‌وتبوو له بازرگانیدا، ڕۆژێك بڕێك زه‌یتی (یاخود ڕۆنی) كڕی كه له ناو هیزه‌دا[2] هه‌ڵگیرا بوو، به چل هه‌زار درهه‌می دواخراو.. بۆ ماوه‌یه‌كی دیاریكراو، كاتێك ده‌می یه‌كێك له هیزه‌كانی كرده‌وه، مشكێكی تۆپیوی تێكچووی تێدا بینی.

له دڵی خۆیدا وتی: ئه‌م پیساییه له ناو هه‌موو زه‌یته‌كه‌دا بووه ئه‌نجا جیاكراوه‌ته‌وه، كه‌واته زه‌یتی ناو هه‌موو هیزه‌كان پیسه، ئه‌گه‌ر بیگێڕمه‌وه بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی، پێده‌چێت پیساییه‌كه‌ی لێ ده‌ربهێنێت و هه‌مووی بفرۆشێته‌وه به خه‌ڵكی، ئه‌مه‌ش زیان به ته‌ندروستی خه‌ڵك ده‌گه‌یه‌نێت. بۆیه موحه‌ممه‌دی كوڕی سیرین له‌گه‌ڵ ئه‌و باره دژواره‌ی كه هه‌یبوو.. هه‌موو زه‌یته‌كه‌ی له‌ناو برد..!! پاش ماوه‌یه‌ك.. فرۆشیاری زه‌یته‌كه داوای پاره‌كه‌ی كرد، به‌ڵام موحه‌ممه‌د پاره‌ی نه‌بوو قه‌رزه‌كه‌ی بداته‌وه، ئیدی فرۆشیاره‌كه شكاتی برده لای والی و.. موحه‌ممه‌دی كوڕی سیرین خرایه زیندانه‌وه، دوای مانه‌وه‌یه‌كی زۆر، كاربه‌ده‌ستی زیندانه‌كه.. پاش ئه‌وه‌ی له حاڵی موحه‌ممه‌د گه‌یشت و خوداپه‌رستی به‌رده‌وام و خۆپارێزی تێدا به‌دی كرد، پێی وت: یاشێخ.. كه شه‌و داهات بڕۆره‌وه لای خاوخێزانت، كه ڕۆژ بوویه‌وه وه‌ره‌وه بۆ زیندان، به‌رده‌وام ئاوابه، تا ئه‌و كاته‌ی ئازاد ئه‌بیت.

موحه‌ممه‌د وتی: نا سوێند به خودا واناكه‌م. كاربه‌ده‌سته‌كه وتی: سبحان الله..!! بۆچی واناكه‌یت؟! وتی: بۆ ئه‌وه‌ی هاوكارت نه‌بم له خیانه‌ت كردن له كاره‌كه‌تدا.

---

(١) (إحياء علوم الدين ٣/٢٥٢)

(٢) (هیزه: هه‌روه‌ك مه‌شكه و كونده له پێسته‌ی حه‌یوانی ورده دروست ده‌كرێت، مه‌شكه بۆ دۆ، كونده‌ش بۆ ناو به‌كاردێت، به‌ڵام هیزه ڕۆنی تیا هه‌ڵده‌گیرێت.)

ئـه‌نه‌ســی کوڕی مــالیك (رضي الله عنه) هــاوه‌ڵ و خزمه‌تکاری رســول الله (ﷺ) له ســـه‌ره مه‌رگیدا وه‌ســیّت ده‌کات، له پاش مـردنی.. موحه‌ممه‌دی کـوڕی ســیرین بیشــوات و نوێژی له‌ســـه‌ر بکات.

ئـه‌نه‌س کۆچی دوایی کـرد و موحه‌ممه‌دی کوڕی سـیرین.. هێشـــتا له زینـدان بــوو، خه‌ڵکـی ڕۆشـــتنه لای والـی و وه‌ســیّته‌که‌ی ئـه‌نه‌سـیان پـێ ڕاگــه‌یاند و.. داوایـان لێکـرد که مـۆڵه‌تی مـوحه‌ممه‌د بـدات، تـا بیشـــوات و نوێــژی له‌ســـه‌ر بکات، والی مــۆڵــه‌تی مـوحه‌ممه‌دی دا، به‌ڵام مـوحه‌ممه‌د وتـی: نایـه‌مــه ده‌ر.. تـا خــاوه‌ن قـــه‌رزه‌که مــۆڵــه‌تم نـــه‌دات، چـــونکه مـــن له‌ســـه‌ر داوای ئـــه‌و کــراومــه‌تــه زیـندان!!

ناچــار ڕۆشـــتن مـــۆڵه‌تی خــاوه‌ن قـه‌رزه‌که‌شـــیان بـــۆ وه‌رگــرت، ئیــدی موحه‌ممه‌د ڕۆشـــت ئـه‌نه‌سی شـــۆرد و کفنـی کـرد و نـوێــژی له‌ســـه‌ر کـرد، پاشـــان چـۆن ڕۆشـــت.. ئاوه‌هــاش گه‌ڕایــه‌وه بــۆ زینـدانه‌که‌ی و ســـه‌ردانێکی که‌سوکاره‌که‌شـی نـه‌کـرد..!![1]

## ڕۆشـــنایی ماڵه‌کەم!

ئـه‌بــوهوره‌یره (رضي الله عنه) بــه‌رده‌وام چـــاك بـــوو بـــۆ دایکـی، هـه‌رکاتێــك ده‌یـویســـت له مـــاڵ بچێـته ده‌رێ، ده‌چـــوو له بـه‌رده‌م ده‌رگـای ژووره‌کــه‌یدا ده‌وه‌ســتا و ده‌یگوت: ســه‌لام و ڕه‌حمه‌ت و بــه‌ره‌کاتی خـوات لێ بێـت ئــه‌ی دایه گـیان.

ئـه‌ویش ده‌یگوت: ســه‌لام و ڕه‌حمه‌ت و بــه‌ره‌کاتی خــواش له تـۆ بێـت، ئــه‌ی کـوڕه‌کەم. ئـه‌بـوهوره‌یره ده‌یگوت: خـوا ڕه‌حمت پێ بکـات، وه‌ك چـۆن به منـداڵی گـه‌وره‌ت کـردم. دایکیشـــی ده‌یگوت: خـوا ڕه‌حم به تـــۆش بکـات، وه‌ك چـۆن له پیـریمدا باشــیت بـۆم.

وه هـه‌رکاتێك ده‌گـه‌ڕایه‌وه بــۆ مــاڵ، ئــه‌م گفتوگـۆیــه‌ی دووبــاره ده‌کــرده‌وه له‌گه‌ڵ دایکیدا.[2]

وه دایکـی له جـێگه‌دا کـه‌وتــبوو، ئـه‌بــوهوره‌یره خـۆی به بــاوه‌ش ده‌یــبرده ده‌سـتـشـۆر و ده‌یهێـنایـه‌وه.

---

(١) (صور من حياة التابعين/١٣٢ـ ١٣٣)
(٢) (صور من حياة الصحابة/٤٨٧)

## له دووریدا نزیکی و.. له تاریکیدا نورێك!

جه‌عفه‌ری کوڕی زه‌ید ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ سوپایه‌کی موسوڵماناندا چوومه غه‌زا، بۆ ڕزگارکردنی شاری کابول له ئه‌فغانستان.. صیله‌تی کوڕی ئه‌شیه‌م ئاماده‌ی ناو سوپا بوو، له ڕێگادا.. تاریکی داهات، سه‌ربازه‌کان کوڵ و باریان خست و نانی شێوانیان خوارد، پاش ئه‌داکردنی نوێژه فه‌رزه‌کان هه‌ر که‌سه و به ئومێدی پشوودانێك له جێیه‌کدا لێی ڕاکشا، بینیم صیله‌تی کوڕی ئه‌شیه‌م (رحمه الله) هه‌ر وه‌ك ئه‌وانی دی به ته‌مای خه‌وتنه، له دڵی خۆمدا وتم: ئه‌مه کوانێ خواپه‌رستی و شه‌ونوێژی ئه‌م پیاوه؟! ئاوه‌هاش ده‌یانگوت: هێنده شه‌ونوێژ ده‌کات، تا قاچه‌کانی تووشی په‌نه‌مین و هه‌ڵاوسان ده‌بن..!! سوێند به خودا ئه‌م شه‌و ناخه‌وم و تێبینی ئه‌و ده‌که‌م، هه‌تا بزانم چی ده‌بینم.

کاتێك سه‌ربازه‌کان غه‌رقی نووستن بوون، بینیم ئه‌و هه‌ستا و به‌ره‌و شوێنێکی دوور له سه‌ربازگه‌که‌وه ده‌ڕوات، منیش به په‌نهانی له دوویه‌وه ڕۆشتم، چوویه ناو دارستانێکی چڕ و پڕ.. له لق و پۆپی دره‌خت و گژوگیا، ده‌تگوت ده‌مێکه که‌س به‌م گوزه‌ره‌دا تێنه‌په‌ڕیوه..!!

له شوێنێکی دارستانه‌که‌دا وه‌ستا.. ڕوویکرده قیبله و ته‌کبیره‌ی نوێژی خوێند، له نوێژه‌که‌یدا زۆر مایه‌وه، من له دووره‌وه ته‌ماشام ده‌کرد، بینیم..

ڕوخساری گه‌شاوه و جوان..!

ئه‌ندامه‌کانی جه‌سته‌ی، خامۆش و بێ بزووت..!

ڕۆحی ئارام..!

وه‌ك بڵێی له ته‌نیایی دا، هاوده‌مێك و خۆشییه‌کی دۆزیوه‌ته‌وه و..!

له دووریدا.. نزیکی و

له تاریکیدا.. نورێك!!

ئاله‌م ساتانه‌دا له ڕۆژهه‌ڵاتی دارستانه‌که‌وه، شێرێکمان لێ په‌یدا بوو، من که دیم.. دڵم داکه‌وت و ترسێکی زۆرم لێنیشت، ئیتر بۆ خۆحه‌شاردان سه‌ر که‌وتمه سه‌ر دارێکی گه‌وره و چڕ تا پارێزراو بم، شێره‌که هه‌نگاو به هه‌نگاو نزیك بوویه‌وه له صیله‌ت، به‌ڵام ئه‌و به شێوازێك له نوێژه‌که‌یدا ڕۆچوو بوو، سوێند به خودا لای نه‌کرد به لای شێره‌که‌وه و هیچ گرنگییه‌کی پێنه‌دا..!! له نوێژه‌که‌ی به‌رده‌وام بوو.. تا سوجده‌ی برد، وتم: ئێستا په‌لاماری ده‌دات. سه‌ری له سوجده به‌رز کرده‌وه و دانیشت.. شێره‌که له به‌رده‌میدا وه‌ستا، وه‌ك بڵێی لێی ڕاما بوو!!

هـیچ پەلامـــارێکی نــەدا..! کە لە نوێـــژەکە بـــوویـــەوە، بە هێمنـی ســـــەیری شـــێرەکەی کـرد و لێوەکانی جـوڵاند و چەند قســـــەیەکی کـرد، کە من گـوێم لێـی نـەبـوو.. ئیدی شـــێرەکە زۆر بە هێمنی صیلەتی جێهێشـــت و.. لە کـوێـوە هـــات، هـەر لەوێـیشـــەوە ڕۆشـــت..!!

کاتێـك بـەرەبـەیـان هـات، هـەسـتا نوێـژی بـەیانی کـرد، بە جـۆرێ ســـەنــا و سـوپاســی خـودای کـرد، کە پێشـــتر نەمبیســتبـوو.

پاشـــان وتــی: پـەروەردگـــارا.. داوات لێـدەکەم لە ئـاگــری دۆزەخ بمپارێـــزی، پـەروەردگـارا.. بەندەیـەکی گـوناهکاری وەك من، چـۆن جـورئـەتی ئـەوەم هـــەبێت داوای چـوونـە بەهـەشـــتت لێبکەم؟! هێـنـدە ئـەمەی دووبـــارە کــردەوە.. هـــەتا گــریـا و منیشـی گـریـاند، ئیدی گـەڕایـــەوە بــۆ نـــاو ســوپـــاکە بـێ ئــەوەی کەس پێی بـزانـێت، بەڵکو خـەڵکی وایـانـدەزانی کـە لــە نــێو نـوێــنـی نــەرم و شـــــل دا خــەوتــووە! منـیش بە دووی ئـــەودا هـــاتمەوە و مـەگــەر خــودا بزانــێت چـیم بە ســـــەردا هـــات؟! لە شـــــەو بێــداری و.. هـیلاك بـــوونی جەســـتە و.. تـــرس و لـەرزی شـــێری دڕنــدە..!![1]

## لە بـەردەم کێدا دەوەســـتم؟! !

عەلـی زەینولعابـدینی کـوڕی حوســـەینی شــەهید (ﷺ) کاتێـــك دەســـت نـوێـژی دەگـرت، ڕەنگی زەرد هـەڵدەگـەڕا و لەرزینێـك دایدەگــرت.. ئـەم حـــاڵەتە هێـنـدە چـەندبـارە دەبـێـتەوە هـەتـا ڕۆژێـك خــێـزانـەکـەی لێی دەپـرسـێت: ئــەم حـاڵـەتـە چـییە وا بــۆتـە خـووت.. لە کـاتی دەســـت نـوێـژگـرتندا؟! ! عــەلی لــە وەڵامـدا پێی دەڵـێت: ئـــێوە گــەر بتانـزانـیبایــە مــن دەمــەوێ لەبـــەر دەســـتی کـــێدا ڕابـــووەســـتم؟! و مــونـاجـــاتی کـێ بکــەم؟! ئـــەوا ئـــەو پـرســـیارەتان نـەدەکــرد.[2]

(١) (صفة الصفوة/٦١٦)
(٢) (صفة الصفوة/٣٢٤)

## خواردن نییه له خوزوری خوێندندا

موحه‌ممه‌دی كوڕی سه‌حنون ( رحمه الله ) كه‌نیزه‌كێكی ده‌بێت، به "دایكی مودام" بانگی ده‌كات، ڕۆژێك موحه‌ممه‌د سه‌رقاڵی دانانی كتێبێك ده‌بێت.. هه‌تا شه‌وی به‌سه‌ردا دێت، دایكی مودام خوانی بۆ ئاماده ده‌كات و بۆی ده‌بات، ئه‌ویش ده‌ڵێت: من ئێستا سه‌رم قاڵه و بواری خواردنم نییه. كاتێكی زۆر تێپه‌ڕ ده‌كات و ئه‌و له هه‌مان حاڵدا ده‌بێت، ئیدی دایكی مودام تیكه‌ی بۆ ده‌كات و خواردنه‌كه ده‌كات به ده‌میه‌وه، ئه‌و ده‌مه‌ی بانگی به‌یانی ده‌درێت، موحه‌ممه‌د ده‌ڵێت به دایكی مودام: ئه‌مشه‌و سه‌رقاڵ بووین و ئاگامان لێت نه‌بوو، ئێستا چیت ئاماده‌یه بیهێنه با بیخۆین.

دایكی مودامیش ده‌ڵێت: سوێند به خوای گه‌وره خواردنه‌كه‌م كرد به ده‌مته‌وه. ئه‌ویش ده‌ڵێت: هه‌ستم پێ نه‌كردووه ..!![1]

## سوێندێك.. به دینارێكی ئاڵتون!

ئه‌بو حه‌نیفه ( رحمه الله ) په‌یمانی دا ئه‌گه‌ر له كاتی قسه‌كردندا، سوێندی خوارد ئه‌وا بۆ هه‌ر سوێندێك درهه‌مێك بكاته خێر، سوێند بۆ قسه‌ی ڕاست نه‌ك بۆ درۆ..!! ئیدی ئه‌مه بوویه خوویه‌ك لای ئه‌بو حه‌نیفه، بۆیه ئه‌مجار په‌یمانی دا ئه‌گه‌ر سوێند بخوات.. ده‌بێت بۆ هه‌ر سوێندێك یه‌ك دیناری ئاڵتون بدات..!! به‌و شێوه‌یه خۆی له سوێند خواردن پاراست.

## ناسینی خوا

ئه‌حمه‌دی كوڕی عاصمی ئه‌نتاكی ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: پێم خۆشه نه‌مرم.. هه‌تا خوای (عزوجل) ده‌ناسم، ناسینی دانپیانان.. نا، به‌ڵكو ئه‌و ناسینه‌ی كه بتوانم شه‌رمی لێ بكه‌م.

---

(١) (ترتيب المدارك: ج٣/١١٤)



## ڕازیبوون.. بێ باسکردن!!

شەقیقی بەڵخی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەبدولعەزیزی کوڕی ئەبی ڕواد بینایی چاوێکی نەما، ماوەی بیست ساڵ کەس لە خانەوادەکەی پێی نەزانی!! هەتا ڕۆژێك کوڕێکی لێی ورد بوویەوە و پێی وت: بابە گیان چاوێکت نابینێت؟!! عەبدولعەزیز (رَحِمَهُ اللَّهُ) وتی: بەڵێ کوڕی شیرینم، ڕازیم بە بەشی خوا.. ئەوە ماوەی بیست ساڵە چاوێکم کوێرە.[1]

## بۆ کەسە نزیکەکانت

ئەنەس دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەبوتەڵحە (رضي الله عنه) دەوڵەمەندترینی خەڵکی مەدینە بوو، وە خۆشەویسترینی سەروەتەکەی لە دڵیدا.. باخچەیەك بوو بە ناوی (بیرحا) کە لە ڕووگەی مزگەوتەکەوە بوو، پێغەمبەر دەڕۆشتە ناویەوە و لە ئاوە سازگارەکەی دەخواردەوە.

کاتێك ئایەتی..

﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ ﴾[2] هاتە خوارەوە، واتە: ئێوە هەرگیز بە خێر و چاکە ناگەن و دەسگیرتان نابێت، هەتا بەختی نەکەن هەندێ لەو داراییەی کە خۆشتان دەوێت.[3] ئەبوتەڵحە وتی: یارسول الله (ﷺ) خۆشەویسترین سەروەتی من باخچەی بیرحایە.. لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە دەیکەمە خێر و دەیدەمە دەستی تۆ.

رسول الله (ﷺ) فەرمووی: بەخ بەخ..! چ سەروەتێکی بەسوودە، چ سەروەتێکی بەسوودە!! من وایدەبینم بیبەخشیتە کەسە نزیکەکانت. ئەبو تەڵحە وتی: وای لێدەکەم کە تۆ بە باشی دەزانیت یارسول الله (ﷺ). ئیدی باخچەکەی دابەشکرد بەسەر کەسە نزیك و ئامۆزاکانیدا.[4]

(١) (صفة الصفوة/٣٨٢)
(٢) (آل عمران/٩٢)
(٣) (پەختەی تەفسیری قورئان/٦٢)
(٤) (موسوعة الأخلاق ج١/١١٧ـ١١٨)

## مەرجی گەردن ئازادی

عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی زیاد دەڵێت: لە خزمەت ئەحمەدی کوڕی حەنبەلدا بووم (رحمه الله) پیاوێك پێی وت: ئەی ئەبا عەبدوڵڵا.. حەڵاڵم کە چونکە غەیبەتم کردوویت. ئیمام ئەحمەد وتی: گەردنت ئازاد بێت ئەگەر دووبارەی نەکەیتەوە. منیش پێم وت: ئەو غەیبەتی کردوویت و تۆش گەردنی ئازاد ئەکەیت؟! ئیمام ئەحمەد وتی: ئەی ئاگات لێ نەبوو کە من مەرجم بۆ دانا؟![1]

## بەمجۆرە وەڵامی بدەوە

ئەبی یەعقوبی مەدەنی وتی: لە نێوان حەسەنی کوڕی حەسەن و عەلی کوڕی حوسەینی ئامۆزایدا (علیهما السلام) ناکۆکییەك ڕوویدا.

عەلی لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە مزگەوت بوو، حەسەن هات و شتێکی نەهێشتەوە کە پێی نەڵێت، بەڵام عەلی بەبێدەنگی مایەوە!! ئیدی حەسەن کە قسەکانی تەواو کرد ڕۆشت.

کاتێك شەو داهات، عەلی ڕۆشت بۆ ماڵی حەسەن، تەقولبابی کرد، حەسەن هاتە دەرێ، عەلی پێی وت: ئەی برام.. ئەوەی پێت وتم، ئەگەر ڕاست بوو ئەوا خودا لێم خۆش بێت.. وە ئەگەر درۆت کرد ئەوا خوای گەورە لێت خۆش بێت.. والسلام علیکم.

ئیدی عەلی پشتی هەڵکرد و ڕۆشت، حەسەنیش بە گریانەوە کەوتە دوای عەلی، هەتا بەزەیی پێدا هاتەوە، پاشان حەسەن وتی: گومانی تیا نییە جارێکی تر ناگەڕێمەوە بۆ کارێ کە تۆ پێت ناخۆش بێت.

عەلیش وتی: تۆش گەردنت ئازاد بێت لەوەی کە پێت وتم.[2]

---

(١) (حرمة أهل العلم/ ١١٥)
(٢) (صفة الصفوة/٣٢٤_٣٢٥)

# گوێڕایەڵت نابم!

ئەبو عوبەیدەی جەڕاح (رضي الله عنه) زۆر بە باشی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودای (عز وجل) و پێغەمبەر (ﷺ) و ئەمیرەکانی بوو.

پاش ڕزگارکردنی وڵاتی شام، لەسەر دەستی ئەبو عوبەیدەی سەرکردەدا، نەخۆشی تاعون لەو وڵاتەدا تەشەنەی کرد و خەڵکێکی زۆری بە هەلاکەتا برد، عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) نەیدەویست پاڵەوانێک و خوداپەرستێک و خۆپارێزێکی وەک ئەبو عوبەیدەی لە دەست بچێت، کە زۆر پێویست بوو بۆ ئیسلام، بۆیە نامەیەک دەنێرێت بۆ ئەبو عوبەیدە و داوای لێدەکات کە:

هەر کاتێک نامەکەی پێگەشت، ئەگەر شەو بوو ڕۆژ نەکاتەوە، وە ئەگەر ڕۆژ بوو شەو نەکاتەوە هەتا دەکەوێتە ڕێ بۆ مەدینە.

بەڵام ئایا ئەبو عوبەیدەی ئەمینی ئەم ئوممەتە.. سەربازەکانی جێدەهێڵێت؟! و خۆی دەرباز دەکات؟!

کاتێک نامەکەی عومەر دەگاتە دەستی، ئەبو عوبەیدە دەڵێت: ئەمیری ئیمانداران دەیەوێت کەسێک بمێنێتەوە.. کە ناتوانێت بمێنێتەوە! بۆیە بەمجۆرە وەڵامی نامەکەی عومەر دەداتەوە و بۆی دەنووسێت:

ئەی ئەمیری ئیمانداران.. لە دڵسۆزیت گەشتم، بەڵام من یەکێکم لە سەربازەکان و نامەوێت خۆم بپارێزم لەوەی کە تووشیان دەبێت، وە من نامەوێت لێیان جیا ببمەوە، هەتا خوای گەورە کاری خۆی تێدەپەڕێنێت، بۆیە گەردنم ئازادکە بۆ سووربوونت لە دەرچوونم و مۆڵەتی مانەوەم پێبدە.

کاتێک عومەر نامەکە دەخوێنێتەوە، فرمێسکەکانی بە خوڕ دێنە خوار و دەگریەت.. پێی دەڵێن: ئایا ئەبوعوبەیدە مردووە؟!

عومەر دەڵێت: نەخێر.. بەڵام مردنی نزیکە. هەرواش بوو کە فاروق وتی، ئەبوعوبەیدە مایەوە هەتا تووشی تاعون هات و هەر بەو نەخۆشییە کۆچی دوایی کرد.[1]

(١) (صور من حياة الصحابة/٩٥-٩٦)



## بەشـێك لە دڵمی داگـیر کردبوو!

وەهیب دەڵێت: عـەبدوڵڵای کـوڕی عـومەر (رضي الله عنهما) وشـــترێکی فـرۆشـــت، پێیان وت: ئـەگـەر نەتفرۆشـــتایـە باشـــتر نـەبـــوو بـــۆت؟! عەبـدوڵڵاش وتـی: بـەڕاسـتی وشـــترێکی زۆر ڕێـك و چـــاك بـــوو بـــۆم.. بەڵام بەشـــێك لە دڵمی داگـیر کـرد بـــوو، منـیش پـێم خـۆش نەبـــوو بێجگـە لـە یـــادی پــەروەردگار، دڵـم بە هیچ شـــتێکی دیکەوە ســــەرقاڵ بکەم!![1]

## قاچ شـێلانی دایـك.. یان شـەونـوێـژ؟!

عومەری کوڕی مونکەدر ( رحمه الله ) بەردەوام شـــەوەکانی زینـدوو ڕادەگـرت و شـــەونوێـــژی دەکـــرد.. دایکـی پێـی دەوت: ڕۆڵـــە گـــیان.. ئـــارەزووم ئـــەوەیە شـــەوێـك بە نـووســـتوویی بتبینم..!!

موحەممەدی کوڕی مونکەدر دەڵێت: شـەوێك. عومەری بـرام بە درێژایی شــــەو خەریکی شـــەو نوێـژ بـوو، منیش نەخـەوتم و خـەریکی قـاچ شـێلانی دایکم بـووم، وە من پێم خـۆش نییە شەوەکەی خـۆم بگۆڕمەوە بە شەوەکەی ئەو.!![2]

وە هـەروەهـا موحەممەد سـەری دەخـستە سـەر زەوی و دەیـوت بە دایکـی: ئـەی دایـە گیان.. هـەسـتە قـاچـەکـانـت بخە سـەر کوڵمم.

## هـەڵـەی مامـۆسـتا

شـێخ عەبـدولقادری گـەیلانی ( رحمه الله ) دەڵێت: ئـــەی کـــوڕی شـــیرینم.. وا مـەزانـە کە مـامـۆسـتاکەت دووره لە هـەڵـە و گـونـاهـ چـونکە ئـەویـش مـرۆڤە، هـەندێ جار هـەڵـە و هـەندێ جـار ڕاسـت دەکـات، ئـەگـەر هـەڵـەیەکت لـێ بینی، بـیانـوویـەکی شـەرعی بـۆ بـدۆزەوە، ئـەگـەر بـیانــووی نـەبـــوو، ئـــەو کـاتە داوای لێخـۆشـبـوونی بـــۆ بکە لە خـزمـەت پـــەروەردگاردا.

---

(١) (صفة الصفوة/ ٢٠٨)
(٢) (صفة الصفوة/٣٤٦)



## قسەکەت پێ ناڵێمەوە!

ڕەبیعەی کوڕی کەعب (رضي الله عنه) دەڵێت: خۆشەویست (ﷺ) زەوییەکی پێدام، بە تەنیشت زەوییەکی ئەبوبەکرەوە، ئیدی دنیا ڕووی تێکردم و لەسەر دارخورمایەك جیاڕا بووم لەگەڵ ئەبوبەکردا، ئەو دەیوت: دارخورماکە لە زەوییەکەی مندایە. منیش دەموت: نەخێر دارخورماکە لە زەوییەکەی مندایە. پێداگیریم کرد و ئەبوبەکر قسەیەکی پێ وتم، کە پێم خۆش نەبوو.. دوای ئەوە هەر زوو پەشیمان بوویەوە و پێی وتم: ئەی ڕەبیعە قسەکەم پێ بڵێرەوە.. تا ببێتە سزایەك بۆم. وتم: نا سوێند بە خودا.. قسەکەت پێ ناڵێمەوە.

ئەبوبەکر (رضي الله عنه) وتی: کەواتە دەچمە خزمەتی رسول الله (ﷺ) و.. عەرزی دەکەم کە تۆ ناتەوێ هەقی خۆتم لێوەرگریتەوە. پاشان ئەبوبەکر ڕۆشت. رسول الله ی هێنا و وەك خۆی باسەکەی بۆ گێڕایەوە.

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرمووی: ئەی ڕەبیعە تۆ و ئەبوبەکر چیتانە؟ وتم: یا رسول الله (ﷺ) ویستی ئەو قسەیەی پێ بڵێمەوە کە ئەو پێی وتم، منیش بە باشم نەزانی و قسەکەم پێ نەوتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ.. ئەوەی پێ مەڵێرەوە کە پێی وتوویت، بەڵکو پێی بڵێ: خوا لێت خۆش ببێت ئەی ئەبوبەکر.

منیش وتم: خودا لێت خۆش ببێت ئەی ئەبوبەکر. ئیدی ئەبوبەکر ڕۆشت و چاوانی ئەسرینیان دەباراند و.. دەیگوت: خوا لە بری من پاداشتی خێرت بداتەوە، ئەی ڕەبیعەی کوڕی کەعب.. خوا لە بری من پاداشتی خێرت بداتەوە، ئەی ڕەبیعەی کوڕی کەعب.[1]

## ئەدەب و زانست

ئیمامی عەلی (عليه السلام) دەڵێت: هەتیو ئەو کەسە نییە کە دایك و باوکی نییە! بەڵکو هەتیو کەسێکە کە ئەدەب و زانستی نییە.

---

(١) (صور من حياة الصحابة/٣٦٧-٣٦٨)

## پێکه‌وه‌ ساتێکمان به‌سه‌ر بردووه‌

موحه‌ممه‌دی کوڕی واسیع ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: مرۆڤی باوه‌ڕدار ناگاته‌ پله‌ی ئیحسان، هه‌تا چاکه‌ی نه‌بێت بۆ هه‌موو ئه‌وانه‌ی که‌ هاوه‌ڵێتیان ده‌کات، ئه‌گه‌ر بۆ ده‌مێکی که‌میش بێت.
جارێکیان موحه‌ممه‌دی کوڕی واسیع بزنێك ده‌فرۆشێت، ئامۆژگاری کڕیاره‌که‌ی ده‌کات و پێی ده‌ڵێت: ئه‌م بزنه‌ چه‌ند ساتێکی له‌ته‌کماندا به‌سه‌ر بردووه‌، بۆیه‌ داوات لێ ده‌که‌م که‌ چاك بیت له‌گه‌ڵیدا و خزمه‌تی بکه‌یت.[1]

## چوار دۆعای وه‌رگیراو.. به‌ چوار درهه‌م!

پیاوێکی عاره‌ق خۆر. کۆمه‌ڵێك له‌ هاوڕێکانی داوه‌ت کرد و دانیشتن بۆ خواردنه‌وه‌، پاشان بانگی خزمه‌تکاره‌که‌ی کرد، چوار درهه‌می پێدا هه‌تا بچێت هه‌ندێ میوه‌جاتیان بۆ بکڕێت.
خزمه‌تکاره‌که‌ ڕۆشت.. له‌ ڕێگادا گه‌شت به‌ مه‌نسوری کوڕی عه‌مماری خواپه‌رست ( رحمه الله ) که‌ داوای خێری ده‌کرد بۆ هه‌ژارێك که‌ له‌ته‌کیدا بوو، ده‌یگوت: کێ چوار درهه‌م ده‌دات به‌م به‌نده‌ هه‌ژاره‌، تا چوار دۆعای بۆ بکه‌م؟!
غوڵامه‌که‌ چوار درهه‌مه‌که‌ی دا به‌ مه‌نسور، مه‌نسور وتی: چ نزایه‌کت بۆ بکه‌م؟ غوڵامه‌که‌ وتی:

یه‌که‌م: گه‌وره‌یه‌کی دڵڕه‌قم هه‌یه‌ ده‌مه‌وێ ڕزگارم بێت له‌ ده‌ستی.
دووه‌م: خوای گه‌وره‌ جێی چوار درهه‌مه‌که‌م بۆ پڕ بکاته‌وه‌.
سێیه‌م: خوای گه‌وره‌ له‌ گه‌وره‌که‌م ببورێت و له‌ گوناهانی خۆش ببێت.
چوارەم: خوای گه‌وره‌ له‌ من و گه‌وره‌که‌م و له‌ تۆش و کۆمه‌ڵه‌که‌ش ببورێت!

مه‌نسوری کوڕی عه‌ممار نزاکانی بۆ خزمه‌تکاره‌که‌ کرد و ڕۆشت، خزمه‌تکاره‌که‌ش دره‌نگ که‌وت له‌ گه‌ڕانه‌وه‌یدا.. کاتێك ڕۆشته‌وه‌، گه‌وره‌که‌ی به‌ تووڕه‌بوونه‌وه‌ پێی وت: بۆچی دره‌نگ هاتیته‌وه‌؟ ئه‌ی کوانێ میوه‌که‌؟!
غوڵامه‌که‌ به‌ سه‌رهاته‌که‌ی بۆ گێڕایه‌وه‌، گه‌وره‌که‌ی که‌مێك هێمن

(١) (حرمة أهل العلم: ٣٦٢)



بــوویــەوە و وتی: دەی پێم بڵێ بــزانم نــزاکانت چی بــوون؟! !
وتی: نـزای ئـازاد بــوونی خـۆمم کـرد لە کـۆیلایـەتی.
گــەورەکـەی وتی: ئــــەوا تــۆم ئـــــازاد کـرد لـە ڕێی خـوادا.. دووەمـــیان چـــی بـــوو؟! وتـی: پــڕ بـــوونـەوەی جێی چـــوار درهـەمـەکـە، کە بـەخـشـــینم بــە مـەنســور. گــەورەکـەی وتی: لە مـنەوە چـــوار هـەزار درهـەمیش بـــۆ تــۆ.. ئــەی ســێیەم چی بـوو؟! وتی: خـوای گــەورە لــە تـــۆ خـۆش ببێت .
گەورەکە ســــــەری ڕاوەشــــاند و.. گـریـــا، شـــەرابــەکەی ڕژانــــد، پێکەکـانی شـــــکاند و، وتــی: تــەوبــەم کــرد و چـــیتر نـاگــەڕێمەوە بـــۆ ئـــەم کـارە.. ئــەی چـــوارەم نــزات چـی بـــوو؟! وتــی: خـــوا لە مـــن و لە تـــۆ و لە مـەنســـور و لەم کــۆمەڵە خـۆش ببێت. گــــەورەکە وتـی: ئـــیدی ئـــەوەیـــان بـــە دەســــت خـــوای لێبـوردە و بـەســــــۆزە.. نـــەك مـن.
ئـەو شـــەوە کاتێـك گــەورەی غـوڵامـەکـە دەخـــەوێت، گـــوێی لە دەنگێکەوە دەبێت پێی دەڵێت: ئـــەوەی تـــۆ لە ســــــەرت بـــوو کــردت.. گـومــان دەبەیـت ئـەوەی لەســــــەر ئێمەیە نەیکـەین؟! خـوای گـەورە لە تـۆ و لە غـوڵامــەکــە و لە مـەنســـور و لە کــۆمـەڵـە هـــاوڕێکانت خـۆش بـــوو.[1]

## لەسرینم پێ دەبارێنێ

یـــەحیای کـوڕی عەبدولحەمیـد دەڵێـت: ڕۆژانــە ئیمام ئـەبـــوحەنیفە دەبـــرایە زیندان و لێی دەدرا بـۆ ئــەوەی کاروبـــاری قـــەزا.. بگـــرێتە دەســـت، بــەڵام ئــەو وەری نــەدەگــــرت، کاتێــــك لە ســــــەری درا و بــــرینەکەی پــێوە دیــــار بـــــوو، دەســـتی کـرد بــە گــریـان..!!
وتیـان: بـــۆ دەگـــریـەیــت؟ ئـەبـــوحەنیفە وتـی: ئـەگــەر دایکـم بـریــنەکەم ببینێت.. دەگـریـەت و تـــووشـــی غـەم دەبـێـت، منیش هیچ شــتێـك ئــــەندازەی غـەمی دایکم ئـــازارم نـــادات..!!
ئـەبـوحەنیفە ( رحمه الله ) زۆر بـاش بـــووە بـــۆ دایـك و بـاوکی، بـــەردەوام نـــزای خـێری بـــۆ دەکـردن، وە مـانگـانە بـیســـت دیناری بـــۆ دەکـردن بـە خـێر.[2]

(١) (إحياء علوم الدين ٤/١٥٤)
(٢) (ابـوحنيفة النعمان/١٠٢)

## خوا حەرامی کردووە

ئیبن عەون دەڵێت: وتیان بە موحەممەدی کوڕی سیرین ( رحمه الله ): ئەی ئەبابەکر.. پیاوێك غەیبەتی کردیت، تۆش حەڵاڵی بکە و گەردنی ئازادکە. ئیبن سیرین وتی: شتێك حەڵاڵ ناکەم.. کە خودا حەرامی کردووە.[1]

## زیاتر گریاندت!

شەوێك موحەممەدی کوڕی مونکەدر ( رحمه الله ) نوێژ دەکات، لەناکاو دەست دەکات بە گریان و گریانەکەی هێندە توول دەکێشێت، هەتا خانەوادەکەی دەترسن و پرسیاری لێدەکەن: چشتێك دەتگریەنێت؟!! موحەممەد ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە و بەردەوام دەبێت لە گریانەکەی! ئیدی دەنێرن بە شوێن سەلەمەی کوڕی دیناردا، سەلەمە دێت و پێی دەڵێت: چشتێك دەتگریەنێت ئەی براکەم؟! وا خانەوادەکەت تۆقیون لەتاو گریانی تۆ! ئازارێکت هەیە، یاخود شتێکت بەسەر هاتووە؟! موحەممەد دەڵێت: گەشتم بە خزمەتی ئایەتێك بۆیە گریام، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَبَدَا لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ﴾[2] واتە: ڕۆژی قیامەت، لە لایەن خواوە شتانێکیان بۆ دەرکەوت کە بیریان لێ نەکردۆتەوە و گومانیان بۆی نەچووە.

ئیدی سەلەمەیش دەست دەکات بە گریان و هەردووکیان زۆر دەگریەن! خانەوادەکەی موحوممەد دەڵێن بە سەلەمە: تۆمان هێنا هێوری بکەیتەوە، کەچی زیاتر گریاندت!

ئەویش هۆکاری گریانەکەیان بۆ باس دەکات.[3]

(١) (حلية الاولياء ٢/٢٦٣)
(٢) (الزمر/٤٧).
(٣) (من روائع اقوال الصالحين:ج١/٤٧)



## وریابە.. قسە بە کەس مەڵێ

موحەممەدی کوڕی سیرین ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) گوێی لە پیاوێك دەبێت جنێو بە حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی دەدات، ئیبن سیرین پێی دەڵێت: وریابە، ئەی پیاو..! کاتی لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی، بچوکترین گوناهی خۆت لەسەر شانت، قورسترە لە گەورەترین گوناهی حەججاج، چونکە بەڕاستی خوای گەورە حاکمێکی دادپەروەرە، وەك چۆن هەقی ئەو کەسانە دەسەنێتەوە کە حەججاج زوڵمی لێکردوون، ئاوەهاش هەقی حەججاج لەو کەسانە دەسەنێتەوە کە زوڵمیان لێکردووە، بۆیە نەفسی خۆت.. بە قسەوتن بە خەڵکییەوە سەرقاڵ مەکە.[1]

## لەمیرێکی فاکی

سابت دەڵێت: کاتێك سەلمانی فارسی (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئەمیری مەدائن بوو.. پیاوێك لە ئەهلی شام هات و بارێك (کا) ی پێ بوو، سەلمانیش کراسێکی خەتدار و بالاپۆشێکی لەبەردا بوو، مۆڵێك گەنمی کۆکراوەی پێ بوو، پیاوەکە سەلمانی نەدەناسی و بە جلوبەرگیدا وایدەزانی حەماڵە، بۆیە پێی وت: وەرە ئەم کایەم بۆ هەڵگرە.

سەلمانیش داواکەی قبوڵ کرد و بارەکەی بۆ هەڵگرت..!! خەڵکی بینیان و پێیان وت: ئەی پیاو.. ئەوە تۆ چی دەکەیت؟! مەگەر نازانیت ئەوە ئەمیرەکەمانە!! پیاوەکە بە داوای لێبوردنەوە وتی: ئەی ئەمیر.. بمبەخشە نەمناسیت، تکایە بارەکەم لەسەر شانت داگرە!!

سەلمان وتی: نا.. زۆر ئاساییە براکەم، من نیەتم هێناوە داینەنێم، هەتا دەگەینە ماڵەوەتان.[2]

---

(١) (حلية الاولياء ٢/٢٧١)
(٢) (صفة الصفوة/١٩٦)

## زونارەکەی.. پچڕاند!

حەســـەنی بەسـری ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دراوســـێیەکی نەســرانی دەبێـت.. لەســـەر بانەکەیـدا ئـاودەســـت خـانـەیـەك دروســـت دەكـات، بە بـێ مەبەســـت و بـە هـۆی ئـاودەســتەکەوە کـون دەبێـتە ســـەقفی خـانـوەکەی حەســـەن و، مـیز و ئـاوی پـیس تـك تـك دەچـۆڕێـتە خـوارەوە بـۆ نـاو ژوورەکەی، بەڵام دراوســـێ نەســـرانییەکە بەمـــە نازانـێت.. حەســـەنیش قـاپێـك لە ئـاســـت کـونـەکەدا دادەنێـت و ئـەوەی تێـی دەچـێت شـەوانـە لە تاریکیـدا دەیـڕێـژێت..! چـەند سـاڵێـك بە ســـەر ئـەمـەدا گـوزەر دەکات..!!

پـاشـان ڕۆژێـك حەسـەن نەخـۆش دەکەوێـت، دراوســـێ نەســـرانییەکە دێـتە ســـەردانی حەســـەن و بە چـاوی خـۆی حـاڵـەکە دەبیـنێت، دراوســـێ نـەسـرانییەکە دەڵێت: چـەنێکە ئـەم ئـەزیـەتـەی منتان لەســـەرە؟!!

حەســـەن پێی دەڵێت: ماوەی ئـەوەندە سـاڵـە.

ئیدی نـەسـرانییەکە.. زونـارەکـەی[1] دەپچـڕێـنێت و موسـولْمان دەبێت!![2]

## دەسـەڵات.. غـەم هێنەرە!

کاتێـك عومەری کـوڕی عەبـدولعەزیز ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) لە کفـن و دفنـی ســـولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك دەگـەڕێـتەوە و بـەیـعـەتی پـێدەدرێت.. غـــوڵامێکی عـومـــەر پێی دەڵێت: بـــۆ وا غـەمگین دەتبینم؟! !

عـومـەر دەڵێت: وێنەی ئـەم حـاڵـەی منی تێدام.. کـەسـان غـەمبار دەکـات، مـن دەمـەوێت هـەر تاکـێکی ئــوممەتی مـوحەممەد (ﷺ) لە ڕۆژهـــەڵاتی زەوی تـا ڕۆژئـــاوای.. هـــەقی خـــۆی بـدەمێ، بە بـێ ئــەوەی کەس لە کیتابێکـدا بـــۆمی بنووسـێت، یـاخـۆ داوای بکات لێـم..!![3]

(١) (زونـار: پشـــتوێنێکی تایبەتە نەســرانییەکان دەیبەســتن.)
(٢) (الف قصة وقصة/٣٩)
(٣) (صفة الصفوة/٣٣٥)

## تۆ دز نیت.. لەی قەلەڕەشی فۆشەویست!

مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) دەڵێت: بە نیازی حەجکردن چوومە دەرەوە، لە کاتێکدا لە دەشتاییەکدا بووم، قەلەڕەشێکم دیت کولێرەیەکی بە دەمەوە بوو، وتم: ئەو قەلەڕەشە بەو کولێرەی دەمییەوە کارێکی هەیە، بۆیە دوای کەوتم، تا لە ئەشکەوتێك نیشتەوە.

بەرەو ئەشکەوتەکە کەوتمە ڕێ، لەوێ دیتم پیاوێك بەستراوەتەوە و ناتوانێت خۆی ڕزگار بکات و کولێرەکەش لە بەر دەمیدا دانراوە! پێم وت: تۆ کێیت و خەڵکی کام شاریت؟!

وتی: من لە حاجییانی ماڵی خودام، دز و چەتەکان پارە و کەلوپەلەکانیان بردم و وەك دەبینی لێرە بە بەندکراوی جێیان هێشتووم، چەند ڕۆژێك بەسەر برسێتی بەرگەم گرت.. پاشان ڕووم کردە پەروەردگارم و، وتم: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت دەفەرموویت: ﴿ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ ﴾[1]

واتە: ئایا پەرستراوێکی تر هەیە، بێجگە لە زاتێك کە دێت بە هاواری ناچار و داماوەوە، کاتێك هاواری لێدەکات، وە ناخۆشی و بەڵاکان لادەبات.. خودایا.. من ناچار و بێ دەرەتانم ڕەحمم پێ بکە. ئیدی خوای گەورە بەم قەلەڕەشەدا خواردنی بۆ ناردم.

مالیك دەڵێت: ئیدی پیاوەکەم ڕزگار کرد و، پێکەوە کەوتینە ڕێ، تینوومان بوو و ئاومان پێ نەبوو، بە دەشتاییەکەدا ڕوانیمان.. بیرێکمان دیت ئاسکێك لە کەناریەوە بوو، لێی نزیك بووینەوە، ئاسکەکە کەمێك دوور کەوتەوە، کاتێك گەشتینە لای بیرەکە دیمان ئاوی بیرەکە لە قوڵاییدایە، ئاومان دەرهێنا و تێرمان خواردەوە.. دواتر من سوور بووم لەسەر ئەوەی کە نەڕۆین تا ئاسکەکەش ئاو دەدەین، ئیدی من و هاوڕێکەم چاڵێکمان کەند و پڕمان کرد لە ئاو و خۆمان دایە کەنار.. ئاسکەکەش هات و تێر ئاوی خواردەوە.[2]

(١) (النمل/٦٢)
(٢) (الف قصة و قصة/٢٨٢)

## خودی دەرد دەبێتە دەرمان؟!

جونەیدی بەغدادی ( رحمه الله ) دەڵێت: شـەوێکیان خـەوم لـێ زڕا، ویسـتم ئـارام بم نەمتوانی، پاشـان هـەوڵمدا ویـردێکی لە کیس چـووم بە قـەزا بگێـڕمـەوە بەڵام نەمتوانی، پاشـان ویسـتم دیراسـەی بابـەتێك بکەم لە قـورئـان ئـەویـشـم نـەتـوانی و، بێـتاقـەتییەکی سـەخت ڕووی تـێ کـردم..!! ئیـدی پـۆشـاکەکەم دابـەشـانمدا و بـەو کـۆتا بـەشـەی شـەو ڕۆشـتمە دەرێ، کاتێـك گەشـتمە ناوەڕاسـتی کـۆڵانـەکە، پیاوێکم پێگەشـت، عـەبـایـەکی بەخـۆیـەوە پێچابـوو، سـەری بـەرز کـردەوە و وتی: بـۆ نـەهـاتیتە دەر، هـەتا ئـەم کـاتـە درەنگـە؟!

وتـم: گـەورەم هیچ وادەیـەکمان هـەبـووە؟! وتـی: نـەخـێر.. بەڵام داوام کـرد لەو کەسـەی کە دڵـەکـان دەجـووڵـێـنـێت، دڵی تـۆم بـۆ بجـووڵـێـنـێت!! وتـم: ئـەوەتا جـووڵاندی و بـەم شـەوە درەنگە هـێـنامیە دەر، کارێکت هـەیـە؟! وتـی: بـەڵێ. وتـم: کارەکەت چـییە؟ وتـی: ئـەی ئـەبـاقـاسـم.. چ کـاتێـك خـودی دەرد ئـەبـێتە دەرمـان؟! وتـم: ئـەگـەر نـەفـس مـوخـالـەفـەی خـۆی جـووڵایـەوە، ئـەوکـاتـە دەردەکـەی دەبـێتە دەرمـانی.

ئـیدی پـیاوەکە هـەناسـەیەکی هـەڵکێـشـا و وتـی: هـەر ئـەمشـەو حـەوت کـەڕەت ئـەم وەڵامـەم دایـەوە بـە نـەفـسـم، بـەڵام نـەفـسـم دەیـوت: نـەخـێر.. هـەر دەبـێت لە جونـەیدەوە بیبیسـتم، دە ئـەی نـەفـسـەکـەم.. ئـەوەتـانێ بـیـسـتت لە جونـەیدەوە، ئیتر واز دەهێـنیت؟!!

پاشـان پیاوەکە تێـپەڕی کـرد و لە دوای ئـەوە جـارێکی تر نەمبینییەوە.[1]

## خاوەنی وەرع

ئەبوعەبـدولڕەحمانی عـومەری ( رحمه الله ) دەڵێـت: کـەسێـك خـاوەن وەرع بێت.. واز لـە شـتێك دەهـێـنێت کە گـومانی تێدایە، بـۆ شـتێك کـە گـومانی تێدا نـییە.

(١) (صفة الصفوة/٥٠٤)



## کوڕم.. مرۆڤی باوەڕدار درۆ ناکات

پارچەیەك زەوییان هەبوو لە "گەیلان".. کشتوکاڵی تێدا دەکرد و مانگایەکیان هەبوو لەگەڵ خۆی دەیبردە کێڵگە، ئەو هێشتا لە سەرەتای تەمەنیدا بوو، ڕیشی تەواو دەر نەهاتبوو، باوکی کۆچی دوایی کرد بوو، لەگەڵ دایك و برایەکیدا پێکەوە دەژیان.. ئەو کەسە شێخ عەبدولقادری گەیلانی بوو ( رحمه الله ) کە هەستی دەکرد ئەوە کاری ئەو نییە و پێویستە بچێتە " بەغداد " بۆ خوێندن.

دایکە دڵسۆزەکەی گەرچی پێی ناخۆش بوو کوڕە لاوەکەی لێی دوور بکەوێتەوە، بەڵام لەولاشەوە نەیدەویست حەز و خولیای کوڕەکەی لەناو ببات، بۆیە خواستی خۆی واز لێ هێنا بۆ خواستی کوڕەکەی.. وە حەزی خۆی کردە قوربانی حەزی کوڕەکەی..! هەر بۆیە تەیاری کرد بۆ سەفەر و لە دارای دنیا تەنیا هەشتا دیناریان هەبوو هەمووی پێدا، بەڵام عەبدولقادری تازە پێگەشتووی خۆپارێز، چل دیناری وەرگرت و چل دینارەکەی دیکەشی جێهێڵا بۆ براکەی! دایکی دڵسۆزی کە ئافرەتێکی خۆپارێز و خواپەرست بوو.. ناوی فاتمەی کچی عەبدوڵلای سەومەعی بوو ( رحمها الله ) بەر لە هەموو شتێك ئامۆژگاری کوڕە ئازیزەکەی کرد و پێی وت: ئامان کوڕی شیرینم.. درۆ نەکەیت، چونکە مرۆڤی باوەڕدار درۆ ناکات، هەمیشە ڕاستگۆبە کوڕی نازدارم، هەروەك چۆن لە سەر ڕاستگۆیی پەروەردەم کردوویت، هەموو هیوا و ئومێدێکم ڕاستگۆییتە. پاشان دینارەکانی بۆ کردە کیسەیەکی بچووك و لە بن باڵیدا گیرفانێکی بۆ دووری، هەتا لە چاوی دز و جەردان دوور و نادیار بێت.

کوڕی لاو.. ماڵئاوایی کرد و لەگەڵ کاروانێدا کەوتە ڕێ بەرەو بەغداد، کاروانەکە گەشتە شاری هەمەدان و لەوێ چەند ڕۆژێك پشوویان دا و دووبارە کەوتنەوە ڕێ، لە ڕێگەیاندا کۆمەڵێك دز و جەردەیان لێ پەیدا بوو، بە سواری ئەسپە تیژ ڕەوەکانیانەوە، دەوری کاروانیاندا و دەستیان کرد بە تاڵانی، یەك بە یەکی ڕێبوارەکانیان دەپشکنی و هەرچییان پێ بووایا دەیانبرد.

جەردەی پشکنەر گەشتە لای عەبدولقادر و هەروا بێ گوێ پێدان لێی پرسی: چیت پێیە؟ چونکە دڵنیا بوو لاوێك لەو تەمەنەدا شتێکی وەهای پێ نییە شایانی بردن بێت، بەڵام لەپڕ گوێی لە وەڵامێك بوو کە لە شوێنی خۆی وشکی کرد، دەم و گوێی باز و چاوانی زاق و تووشی شۆکی کرد..!! وەڵامەکەش ئەوە بوو کە عەبدولقادر وەسێتەکەی دایکی لە بیر نەکرد و

ڕاستگۆیانە وتی: چل دینارم پێیە.

جەردەکە باوەڕی بە گوێکانی نەکرد و دووبارە لێی پرسییەوە، بەڵام ئەمجارەش بە هەمانشێوە هەمان وەڵامی گوێ لێ بوویەوە، بۆیە بردییە لای گەورەکەیان، لەوێ سەردەستەی دز و جەردەکان لێی پرسی: چیت پێیە؟!

شێخی تازە پێگەشتوو وتی: چل دینارم پێیە.

سەردەستەکە وتی: کوانێ دینارەکانتم پیشان بدە؟

ئەویش دینارەکانی لە گیرفانی بن باڵیدا دەرهێنا و وتی: ئەوەتانێ.. ئەوە دینارەکانمە. سەردەستەی دزەکان بە سەرسوڕمانەوە وەری گرت و ژماردی دەبینێت چل دینارە، بۆیە پێی وت: چی وای لێ کردیت شوێنی پارەکانت ئاشکرا بکەیت، لە کاتێکدا ئەگەر درۆیەکت بکردبا و بتوتبا: هیچم پێ نییە، ئێمە باوەڕمان پێ دەکردیت و وازمان لێ دەهێنایت..!!

شێخ وتی: لەبەر ئەوەی دایکم وەسێتی بۆ کردووم، کە هەرگیز درۆ نەکەم و ڕاستگۆ بم، چونکە مرۆڤی باوەڕدار درۆ ناکات، ئەم پیاوەش پرسیاری لێ کردم و منیش ڕاستگۆیانە وەڵامیم دایەوە.

ئەم قسانەی شێخ زۆر کاریگەرییان هەبوو بۆ سەر دەروونی سەردەستەکە.. ئەو کە نەیدەزانی گریان چییە، لەو کاتەدا چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و بە عەبدولقادری وت: تۆ دایکت وەسێتێکت بۆ دەکات و بە گوێی دەکەیت، ئەگەرچی بە لە دەستدانی هەموو پارەکانیشت بێت، ئێمەیش چەندین ساڵە ڕێگا لە خەڵکی دەگرین و دزی و تالانی دەکەین و ئارامی خەڵکان دەشێوێنین و لەگەڵ هەموو ئەم کارە خراپانەشدا خۆمان بە موسوڵمان دەزانین، ئێستا تۆ بە شایەت ئەگرم ئەی کوڕەکەم.. ئەوا من لەسەر دەستی تۆدا تۆبە دەکەم.

پاشان سەردەستەکە هەموو هاوەڵەکانی بانگ کرد و بەسەرهاتەکەی شێخی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش هەموویان چۆن لە دزی و جەردەییدا شوێنی کەوتبوون، بۆ تۆبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاریش شوێنی کەوتن.

ئیدی بە پشتیوانی خودا و بە بەرەکەتی شێخ عەبدولقادری لاو، دز و جەردەکان هەرچییان لابوو گێڕایانەوە بۆ خاوەنەکانیان و، بۆ خۆیان بوونە پاسەوانی کاروانەکە، هەتا بە سەلامەتی گەیاندیانە شاری " بەغداد " لە ساڵی ٤٨٨ کۆچیدا، لەو دەمەیدا کە شێخ عەبدولقادر لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو.[١]

(١) (الشيخ عبدالقادر الجيلاني/ ٩٤ ـ ١٠١)



## گوێم ڕاکێشە.. ئەی غولام!!

عوسمانی کوڕی عەفان (رضي الله عنه) ڕۆژێك تووڕە دەبێت لە خزمەتکارێکی و گوێی ڕادەکێشێت تا ئازاری پێدەگەیەنێت.. دواتر زۆر بەزوویی غولامەکەی بانگ دەکات و داوای لێدەکات تۆڵەی خۆی بکاتەوە و گوێی ڕابکێشێتەوە، بەڵام غولامەکە نایەوێت تۆڵە لە گەورەکەی بکاتەوە.
عوسمانیش پێداگیری دەکات و دەڵێت: گوێم ڕاکێشە ئەی غولام.. چونکە تۆڵەی ئەم دنیا زۆر بە سۆزترە، لە تۆڵەی ئەو دنیا!

## ئەدەبی گوێ گرتن

مەعنی کوڕی عیسا دەڵێت: مالیکی کوڕی ئەنەس (رحمه الله) کاتێك دەیویست فەرموودەیەکی ئازیزمان (ﷺ) بۆ بگێڕێتەوە، خۆی دەشوشت و بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا، وە ئەگەر کەسێك دەنگی بەرز بکردایەتەوە، پێی دەوت: دەنگت نزم بکەوە.. چونکە خودای (عزوجل) دەفەرمووێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ ﴾[1]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، دەنگتان بەرز مەکەنەوە بە سەر دەنگی پێغەمبەردا (ﷺ).[2] بۆیە هەر کەس لە کاتی گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەردا دەنگی بەرز بکاتەوە.. وەك ئەوە وایە کە دەنگی بە سەر خودی دەنگی رسول الله دا (ﷺ) بەرز کردبێتەوە.[3]

(١) (الحجرات/٢)
(٢) (پوختەی تەفسیری قورئان/٥١٥)
(٣) (صفة الصفوة/٣٦١)

## فۆت لێره‌یت و.. به‌شێكت له‌ به‌هه‌شته‌!

له‌ جه‌نگی یه‌مامه‌دا توفه‌یلی ده‌وسی شه‌هید بوو.. وه‌ عه‌مرووی كوڕیشی (ﷺ) ده‌ستی ڕاستی له‌ خوار قۆڵییه‌وه‌ بڕایه‌وه‌..!!

ڕۆژانێك تیپه‌ڕین و.. عه‌مرووی كوڕی توفه‌یل هاته‌ خزمه‌تی عومه‌ری فاروق، كه‌سانێك له‌ لای دانیشتبوون، خواردنێكیان هێنا، عومه‌ر خه‌ڵكه‌كه‌ی داوه‌ت كرد بۆ خواردن.. له‌و ئان و ساته‌دا عه‌مرو كشایه‌ دواوه‌!!

عومه‌ری فاروق (ﷺ) پێی وت: ئه‌وه‌ تۆ چیت لێ به‌سه‌ر هاتووه‌؟! ! وا بزانم له‌ شه‌رمی ده‌ستت كشایته‌ دواوه‌ له‌ خواردنه‌كه‌! عه‌مرو وتی: به‌ڵێ ئه‌ی ئه‌میری باوه‌ڕداران.

عومه‌ری جیاكه‌ره‌وه‌ی هه‌ق و باتڵ وتی: وه‌ڵلاهی.. تامی ئه‌م خواردنه‌ ناكه‌م، هه‌تا به‌و ده‌سته‌ بڕاوه‌ت، خواردنه‌كه‌ تێكه‌ڵ نه‌كه‌یت..!! وه‌ڵلاهی.. له‌م كۆمه‌ڵه‌دا بێجگه‌ له‌ تۆ كه‌سێكی دیكه‌ی تێدا نییه‌، خۆی لێره‌ بێت و به‌شێكی له‌ به‌هه‌شت بێت. (مه‌به‌ستی ده‌سته‌ بڕاوه‌كه‌ی بووه‌، كه‌ له‌ پێناوی دینه‌كه‌ی خوادا له‌ شه‌ڕی یه‌مامه‌ دا په‌ڕێندرا بوو) ئیدی عه‌مرو ده‌چێته‌ پێشه‌وه‌ و ئه‌وه‌ ده‌كات كه‌ عومه‌ر داوای لێ ده‌كات .

به‌ڵام ڕۆح و، پارچه‌كانی تری جه‌سته‌ی عه‌مرووی كوڕی توفه‌یل له‌ دنیادا ده‌مێننه‌وه‌، تا له‌ شه‌ڕی یه‌رموك دا پله‌ی شه‌هاده‌ت وه‌رده‌گرێت و به‌ یه‌كجاری.. جه‌سته‌ و ڕۆحی ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ به‌هه‌شت.[١]

## دڵم لای پاره‌كانمه‌

یوسفی كوڕی ئه‌سبات ده‌گێڕێته‌وه‌ و ده‌ڵێت: ده‌رباره‌ی شتێك پرسیاریان كرد له‌ سوفیانی سه‌وری (رحمه الله) له‌ كاتێكدا كه‌ خه‌ریكی شت كڕین بوو، سوفیان وتی: ئێستا وازم لێ بهێنه‌، چونكه‌ من دڵم له‌ لای درهه‌مه‌كانمه‌.[٢]

(١) (صور من حياة الصحابة/١٥ـ٣٢)
(٢) (حياة السلف/٨٥)

## په‌یامنێری شه‌یتان

مونیری خزمه‌تکاری فه‌زلی کوڕی ئه‌بی عه‌بیاش ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ وه‌هبی کوڕی مونه‌بیهدا ( رحمه الله ) دانیشتبووم، پیاوێك هاته لای و پێی وت: به‌لای فلانه که‌سدا تێپه‌ڕیم و گوێم لێی بوو، قسه‌ی ناشیرینی پێده‌وتیت. وه‌هب توڕه بوو و وتی: ئه‌وه شه‌یتان هیچ په‌یامنێرێکی نه‌دۆزیه‌وه ته‌نها تۆ نه‌بێت؟!

مونیر ده‌ڵێت: من له‌وێ مامه‌وه هه‌تا ئه‌و پیاوه‌ی که جنێوی به وه‌هب دابوو، هات و سه‌لامی کرد له وه‌هب، وه‌هبیش وه‌ڵامی دایه‌وه و ده‌ستی بۆ درێژکرد و ته‌وقه‌ی له‌گه‌ڵ کرد و.. له ته‌نیشت خۆیه‌وه داینیشاند.[1]

## هات.. ئافیره‌تم لێ تێك بدات

ئه‌میری ئیمانداران عومه‌ری فاروق (رضي الله عنه) به شاندێك له باوه‌ڕ پێکراوانی ئه‌هلی (حمص) ی وت: ناوی هه‌ژاره‌کانتانم بۆ بنووسن.. هه‌تا پێداویستییه‌کانیان بۆ دابین بکه‌م. ئه‌وانیش لیستێکیان به‌رز کرده‌وه بۆ لای عومه‌ری فاروق، که ناوی هه‌ژاره‌کانی تێدا بوو، یه‌کێك له‌و ناوانه سه‌عیدی کوڕی عامر بوو (رضي الله عنه).

عومه‌ر وتی: سه‌عیدی کوڕی عامر کێیه؟! وتیان: ئه‌میره‌که‌مانه. عومه‌ر وتی: ئه‌میره‌که‌تان فه‌قیره؟! وتیان: به‌ڵێ.. سوێند به خودا ڕۆژانێکی دوور و درێژ تێده‌په‌ڕێنێت و.. له ماڵه‌که‌یدا ئاگر ناکاته‌وه.

ئیدی عومه‌ر گریا..!! تا ئه‌سرینی چاوه‌کانی ڕدێنی ته‌ڕ کرد، پاشان هه‌زار دیناری خسته ناو کیسه‌یه‌که‌وه و وتی: سه‌لامی منی پێ بگه‌یه‌نن و پێی بڵێن: ئه‌میری باوه‌ڕداران ئه‌م هه‌زار دیناره‌ی بۆ ناردوویت.. هه‌تا پێداویستییه‌کانتی پێدابین بکه‌یت.

شانده‌که گه‌شتنه لای سه‌عیدی کوڕی عامری والی حمص و، کیسه‌که‌یان پێدا، کاتێك سه‌عید سه‌یری کرد و زانی پڕه له دینار،

(١) (صفة الصفوة/٤١١)



یەکســـــەر پارەکـانی دوور خســـتــەوە لـــە خــۆی و، وەك بــلّێی تــووشـــی مـوســـیبەتێك هـاتبێت، دەیـوت: انـا لله وانـا الـیه راجـعـون.

ژنەکەی ســـەعید بە ترسـێکەوە ڕاپـەڕی و وتی: ئـەوە چیتە ئـەی ســـەعید.. ئـایـا ئـەمیری بـاوەڕداران مـردووە؟! !

ســـەعید وتـی: بـەڵکـو لــەوە گــەورەتر ڕوویــداوە..!! ژنـەکــەی وتـی: ئــەی موســوڵمانان تــووشـی نارەحەتییێك هـــــاتوون؟! ســـەعید وتـی: بـەڵکــو لەوە گـــەورەتریـش ڕوویداوە..!! ژنــەکــەی وتی: دەی چ شــتێك هـەیە کە لە مـــانــە گـەورەتـر بێت؟!! ســـەعید وتی: دنیا هـــات بـۆ لام بــۆ ئــەوەی ئـاخـیرەتــم لـێ تـێك بـدات و، فـیتنـە جـێی بــۆ خـــۆش بــوو لـە مـاڵـەکـەمدا.

ژنــەکـەی بێ ئــەوەی بــە دینارەکـان بـزانێت، وتی: ئێ باشـــە خــۆت ڕزگـــار بکــە لێـی. ســـەعید وتــی: دەی تـــــۆ یــارمــەتــیم دەدەیــت لەو کـــارەدا؟ ژنــەکــەی وتی: بـەڵێ.. یارمـەتـیت دەدەم.

ئیدی ســـەعید هـەواڵـەکـەی بـۆ باسـکـرد و هــەزار دینـارەکەی کـردە نــاو چـەند کـیســـەیەکەوە و.. دابـەشـــی کـرد بەســـەر هـــەژاراندا، ژنـەکـەیـشی یارمــەتیدەری بـــوو لــەو کارەدا.[1]

## دیـوارێك.. لە ئـاســن

مالیکی کـوڕی دینـار ( رحمه الله ) دەڵێـت: لەســـەر شـاخێـك ڕاهیبێکم بینـی.. چــوومـــە لای و پـێم وت: ئـامـــۆژگـارییێکم بـکە.. کــە بــزانم چــۆن واز لــە دنیـا بهێـنم و ببمـە خـواپـەرســت.

ڕاهیبەکە وتی: ئــەی تـــۆ مـەگــەر خـاوەنی قـــورئـــان و فـــورقــان نــیت؟! وتـم: بـەڵێ وایـــە.. بـەڵام پـێم خـۆشـــە لـە تـۆیـشـــەوە شـــتێکی بـــەســـوود وەرگــرم.

وتی: ئـەگـەر تـوانیت لـە نـێوان خــۆت و ئـارەزووەکـانتا دیـــوارێـك دروســـت بکــەیت لـە ئـاســـن، ئـــــەوا دروســتی بکـە!![2]

---

(١) (صور من حياة الصحابة/١١-١٢)
(٢) (حلية الاولياء ٢/٣٦٥)

## لە ئاوەدانییەوە بۆ وێرانە!

سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك پرسیار دەكات لە سەلەمەی كوڕی دینار و پێی دەڵێت: ئەی ئەبا حازم، ئێمە چیمانە وا ڕقمان لە مردن دەبێتەوە؟!! ئەبا حازم (رحمه الله) دەڵێت: چونكە ئێوە دواڕۆژتان وێران كردووە و دنیاتان ئاوەدان كردۆتەوە، ئیتر پێتان ناخۆشە لە ئاوەدانییەوە بڕۆن بۆ وێرانە.[1]

## حورمەتی ئال و بەیت

زانای پایە بەرز زەیدی كوڕی سابت (رضي الله عنه) دەیەوێت سواری وڵاخەكەی ببێت، عەبدوڵڵای كوڕی عەباسی ئامۆزای خۆشەویست (ﷺ) دەڕوات وەك خزمەتكارێك لەبەر دەمیدا دەوەستێت و وڵاخەكەی بۆ دەگرێت، بۆ ئەوەی بە ئاسانی سوار ببێت، زەید پێی دەڵێت: خۆت ئەزێت مەدە.. ئەی كوڕە مامی رسول الله (ﷺ).

عەبدوڵڵا دەڵێت: فەرمانمان پێدراوە ئاوابین لە خزمەت زاناكانماندا. زەیدیش دەڵێت: بێنە دەستت.

عەبدوڵڵا دەستی دەخاتە ناو دەستی زەید، زەید دادەنەوێت و دەستی عەبدوڵڵا ماچدەكات و دەڵێت: فەرمانمان پێدراوە ئاوەهابین لە خزمەت ئال و بەیتی پێغەمبەرەكەماندا (ﷺ).[2]

عومەری كوڕی خەطاب دەربارەی عەبدوڵڵای كوڕی عەباس، دەڵێت: بەڕاستی لاوێكی پیرە.. خاوەن زمانێكی بە پرس و بیرە.. خودانی دڵێكی ژیرە.[3]

(١) (الأتقياء الأخفياء/ ١٨٩)
(٢) (صور من حياة الصحابة/ ١٨٠)
(٣) (صور من حياة الصحابة/ ١٧٤)

## قورئانه‌كه‌ی داپۆشی

ئه‌عمه‌ش ده‌ڵێت: له لای ئیبراهیمی نه‌خه‌عی بووم خه‌ریكی قورئان خوێندن بوو.. پیاوێك مۆڵه‌تی هاتنه ژووره‌وه‌ی خواست، به‌ر له‌وه‌ی بێته ژووری ئیبراهیم (رحمه الله) قورئانه‌كه‌ی داپۆشی و وتی: با وا نه‌زانێت من هه‌موو كاتێك سه‌رگه‌رمی قورئان خوێندنم..!![1]

## لافر.. مه‌ڕه‌كان هی من نین!!

هه‌ر له منداڵییه‌وه یه‌كێك بوو له ئه‌مانه‌ت پارێزه‌كانی مه‌ككه.. به‌یانییان زوو ده‌بووه شوانی مێگه‌ل و ده‌یبردنه ده‌ره‌وه‌ی مه‌ككه و، ئێواران دره‌نگانێك ده‌یهێنانه‌وه، ئه‌مه سه‌ره‌تای ژیانی عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعود بوو (رضي الله عنه) بۆیه به هۆی منداڵی و دووره‌په‌رێزییه‌وه له كۆمه‌ڵگه، زۆر گوێی به ڕووداوه‌كانی مه‌ككه نه‌ئه‌دا، كه ده‌نگۆی به پێغه‌مبه‌ر بوونی فه‌خری كائیناتیش (صلى الله عليه وسلم) یه‌كێك بوو له‌و ڕووداوانه‌ی كه عه‌بدوڵڵا ده‌یبیست و خۆی پێوه‌ی سه‌رقاڵ نه‌ده‌كرد.

ڕۆژێك له بیابان دوو پیاوی به ته‌مه‌ن و به ویقار، به‌ره‌و ڕووی هاتن، هیلاك و شه‌كه‌ت.. تینوێتی لێو و گه‌رووی وشك كرد بوونه‌وه..!! نزیك بوونه‌وه و سه‌لامیان كرد، وتیان: لاوۆ.. له‌م بزنانه كه‌مێك شیرمان بۆ بدۆشه، تا تینوێتی ڕێگای پێ بشكێنین و گه‌روومانی پێ ته‌ڕ بكه‌ینه‌وه.

عه‌بدوڵڵا وتی: ناتوانم..!! چونكه مێگه‌له‌كه هی خۆم نییه و ئه‌مانه‌ته له ده‌ستی مندا. دوو پیاوه‌كه نیشانه‌ی ڕه‌زامه‌ندی له ڕوخساریاندا ده‌ركه‌وت و.. دووربینی خێر و چاكه‌یان له دوا ڕۆژی لاوه‌كه‌دا كرد و خۆشیان ویست.

یه‌كێكیان وتی: بزنێكم پیشان بده كه سابرێن نزیكی نه‌كه‌وتبێته‌وه، (جووتی نه‌گرتبێت و نه‌زابێت). عه‌بدوڵڵا ئاماژه‌ی به بزنێكی بچووكدا كه له نزیكیانه‌وه بوو، پیاوه‌كه گرتی و بسم الله‌ی كرد و ده‌ستی هێنا به گوانیدا..!! عه‌بدوڵڵا به سه‌رسوڕمانێكه‌وه ده‌یڕوانی و له دڵی خۆیدا ده‌یگوت: ئه‌وه مه‌حاڵه چۆن گوانی كارێكی بچووك، شیری لێدێت؟!! به‌ڵام زۆری نه‌برد گوانی كاره‌كه هه‌ڵاوسا و شیرێكی زۆری لێهات، دوو پیاوه‌كه

---

(١) (الأتقیاء الأخفیاء/ ١٢٨)



تیریان لێ خواردەوە و بەشـی عەبدوڵلاشـیان دا، لە کاتێکدا عەبـدوڵلا بـاوەڕی بە چـاوەکـانی نـەدەکـرد..!

پاشـان پیاوە مـوبـارەکەکە بە گوانـەکەی وت: بچۆرەوە یـەك..! ئیتر گـوانـەکە ڕۆشـتەوە یـەك و، وەك یـەکەم جـاری لێهـاتـەوە.

عەبدوڵلا وتـی بە پـیاوە مـوبـارەکەکە: لەو قسـانـەم فێـربکە کە فـەرمـووت. پیاوە مـوبـارەکەکە فـەرمووی: تـۆ لاوێکـی فـێرکـراویت.

دواتـر عـەبدوڵلا بـۆی ڕوون بـوویـەوە کە دوو پـیـاوە بـاویقـارەکـە، یـەکـێکیان رسـول الله بـوو (ﷺ) ئـەوی دیکەشـیان ئـەبوبـەکـری صـدیقی هـاوەڵی بـوو (رضي الله عنه) کە لە ڕێگەیـاندا بـوون بـۆ شـاری یـەسـرب.

پاشـان مـاوەیەکی زۆری بە سـەردا نەچـوو، عەبـدوڵلا موسـڵمان بـوونی خـۆی ڕاگـەیاند و داوای کـرد کە لە نـزیکەوە خزمـەتی رسـول الله (ﷺ) بکـات، خـۆشـەویسـتیش (ﷺ) ڕازی بـوو کە عەبـدوڵلا لە نـزیکی خـۆیـەوە بێـت، ئـیتر عەبـدوڵلای لاو.. خـاڵی وەرچـەرخـانێکی گـرنگ لە ژیـانیدا ڕوویـدا و.. وەك سـێبەری ئـازیـزی لـێهـات، بـۆ هـەر کـوێـیەك دەچـوو ئـەو لـە خـزمـەتـیدا بـوو.[1]

## نە دەرفـی دەکـەین.. نە کاری پێدەکـەین!!

حەسـەنی بەسـری دەڵێت: عـومـەری کـوڕی خـەطاب لە ویـردی شـەوانەیدا کە دەگـەشـت بـە ئـایـەتێـك لـە قـورئـانی پـیـرۆز هـێـندە دەگـریا هـەتا دەکەوتە سەر زەوی.. نەخـۆش دەکەوت و لـە مـاڵـەوە دەمـایـەوە و خەڵکـی دەچـوونـە عـیادەی!

وە عـەبدوڵلای کـوڕی عـومەر (رضي الله عنهما) دەڵێـت: لەم سـەردەمـەدا هـاوەڵـە بـەڕێـزەکانی رسـول الله (ﷺ) یـەك دوو سـورەت زیـاتـریـان لـەبـەر نییە لـە قـورئـان، بـەڵام کـار بـە هـەمـوو قـورئـان دەکـەن.. لـە ئـاخـر زەمـانی ئـەم ئـوممـەتـەشـدا، دەرخکـردنی قـورئـانیان بـۆ ئـاسـان دەبێت، تەنـانـەت مـنداڵ و نـابیناکـانیش هـەمـوو قورئـان لەبـەر دەکـەن، بـەڵام کـاری پێنـاکـەن.[2]

(١) (صور من حياة الصحابة/ ٩٧ــ ٩٨ــ ٩٩)
(٢) (موسوعة الأحزان ج١/١١٢)

## ئازاره‌كه‌ی بیر بردمه‌وه!

ژنه‌كه‌ی فه‌تحی موسڵی (رحمهما الله) ده‌كه‌وێت و نینۆكی په‌نجه‌ی لێ ده‌بێته‌وه، له‌و ساته‌وه‌خته پڕ له‌ ئازاره‌دا.. ده‌ست ده‌كات به‌ پێكه‌نین! پێی ده‌ڵێن: ئایا تۆ هه‌ست به‌ ئازار ناكه‌یت، وا پێده‌كه‌نیت؟! ژنه‌كه‌ی فه‌تح ده‌ڵێت: به‌ڕاستی پاداشتی برینه‌كه‌م، ناڕه‌حه‌تی و ئازاره‌كه‌ی له‌بیر بردمه‌وه!![1]

## نابینایه‌كی دڵ ڕۆشن!

چاوانی نابینا بوو.. به‌ڵام ماڵی دڵی ڕۆشن و ڕووناك..!! ده‌یتوانی له‌ ماڵه‌وه‌ دابنیشێت و به‌شداری غه‌زاكان نه‌كات، كه‌سیش لۆمه‌ی نه‌كات، به‌ڵام نه‌فسی گه‌وره‌.. هه‌میشه‌ به‌ دووی كاری گه‌وره‌وه‌یه‌، بۆیه‌ خۆی ته‌یار كرد و به‌ هاوه‌ڵه‌ به‌ڕێزه‌كانی وت: منیش دێم بۆ غه‌زا، له‌گه‌ڵ خۆتان ببه‌ن، له‌وێ له‌ مه‌یدانی جه‌نگدا به‌یداخی.. لا الـهَ الا الله مُحَمَّـد رَسـولُ الله.. بده‌نه‌ ده‌ستم، هه‌تا ده‌توانم به‌رز ڕایده‌گرم و پارێزگاری لێده‌كه‌م، چونكه‌ من نابینام و ناتوانم ڕابكه‌م..!! ئه‌وه‌ وته‌ و هیممه‌تی به‌رزی عه‌بدوڵڵای كوڕی ئوم مه‌كتوم بوو (رضي الله عنه).

جه‌نگی قادسیه‌ ڕوویدا..

سوپای ئیسلام ڕووبه‌ڕووی ده‌وڵه‌تی زلهێزی فارسه‌كان بوویه‌وه.. پاش چه‌ند ڕۆژێك.. به‌یداخی یه‌كتاپه‌رستی، له‌ ئه‌رزی بت و ئاگرپه‌رستیدا شه‌كایه‌وه.. خوێنی سه‌دان شه‌هید، ئاگری نه‌فامی و زوڵم و فه‌سادی كوژانده‌وه، یه‌كێك له‌و شه‌هیدانه.. عه‌بدوڵڵا بوو كه‌ له‌ گۆڕه‌پانی جه‌نگدا.. به‌ لاشه‌یه‌كی خه‌ڵتانی خوێنه‌وه‌ كه‌وتبوو، و به‌یداخه‌كه‌ی له‌ ئامێز گرتبوو!![2]

---

(١) (إحياء علوم الدين ٧٣/٤)

(٢) (صور من حياة الصحابة/ ١٥٣ـ ١٥٤)

## دوكانداریی و چوارسەد ڕكات

جونەیدی بەغدادی ( رحمه الله ) هەموو ڕۆژێك دەچوویە بازاڕ.. دوكانەكەی دەكردەوە، پەردەی دائەدایەوە و چوار سەد ڕكات نوێژی ئەدا ئەكرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە..!!![1]

## هەورێك.. بۆتە سەیوانی!

ئەبو سولەیمانی ئەلمەكتەب دەڵێت: جارێكیان بوومە هاوسەفەری كورزی كوڕی وەبەرە ( رحمه الله ) كە بەرە و مەككە دەڕۆشتین، لە هەر شوێنێك كاروان دابەستایە بۆ پشوودان.. كورز پاش ماوەیەك دەچووە كەنارێكەوە بۆ نوێژكردن، هەر ساتێ گوێی لە دەنگی وشترەكان بووایە، دەهاتەوە..!!
ڕۆژێكیان كات تێپەڕی كرد و.. كورز دیار نەبوو، ئیدی هاوەڵەكانی بڵاو بوونەوە بۆ گەڕان بە شوێنیدا، منیش كەوتمە گەڕان، دیتم لە شوێنێكی نزمدا بەو كاتە گەرمە خەریكی نوێژ كردنە و.. هەورێك بە ڕاسەریەوە وەستاوە و بۆتە سەیوانی..!!
كاتێك منی دیت پێی وتم: ئەی ئەبا سولەیمان.. پێویستییەكم پێت هەیە. وتم: بلێ.. من لە خزمەتی تۆدام، پێویستییەكەت چییە؟!! وتی: پێم خۆشە ئەوەی كە دیت بیشاریتەوە. وتم: باشە، ئەمەش با بۆ تۆ بێت. وتی: دەی بەڵێنم بدەرێ.
منیش سوێندم بۆ خوارد.. لای كەس باسی نەكەم، تا دوای مردنی نەبێت.[2]

---

(١) (الأتقياء الأخفياء/٢٤٥)
(٢) (صفة الصفوة/٥٧٢)

## ڕێگای ماڵەکەم هەوراز و سەفتە!

ئەبوودەرداء (ﷺ) دەڵێت: ماڵی ئێمە لەوێیە.. بۆ ئەوێ کۆ دەکەینەوە و.. هەر بۆ ئەوێیش دەگەڕێینەوە، بۆ ئەوێ کۆچ دەکەین و.. بۆ ئەوێیش کار دەکەین..!!

شەوێك بوو لە شەوە ساردەکان..!!

کۆمەڵێك بوونە میوانی ئەبوودەرداء، ئەویش خواردنی گەرمی بۆ هێنان، بەڵام بۆ کاتی نووستن هیچ بەتانی و لێف و داپۆشەرێکی بۆ نەهێنان! یەك لە میوانەکان وتی: دەچم و قسەی لەگەڵ دەکەم. یەکێکی دیکەیان وتی: مەڕۆ.. وازی لێ بهێنە.

بەڵام ئەو ڕۆشت و لە بەردەم ژوورەکەی ئەبوودەرداءدا وەستا.. بینی ئەبوودەرداء پاڵ کەوتووە، ژنەکەی لە تەنیشتییەوە دانیشتووە و تەنها چەرچەفێکی تەنکیان پێیە.. کە نە دادی گەرما دەدات، نە سەرما..!! ئیدی میوانەکە وتی: دەبینم تۆش وەك ئێمە دەنوویت و ڕۆژ دەکەیتەوە..!! ئەی کوانێ جێگە و بانەکانتان؟! !

ئەبودەرداء وتی: لەوێ.. ماڵێکی دیکەمان هەیە، هەر کەلوپەلێکمان دەست کەوێت دەینێرین بۆ ئەوێ، ئەگەر لێرە شتێکمان بمابا.. بێگومان دەمان نارد بۆ ئێوە، پاشان ئەو ڕێگایەی دەچێت بۆ ماڵەکەی ترمان، هەورازە و سەرکەوتنی سەختە..!! کەسێك بارەکەی سوك بێت باشترە لەوەی کە بارەکەی قورسە، ئێمەش ویستمان بارمان سوك بکەین، بەڵکو بتوانین ڕێگاکەمان تێپەڕێنین.

پاشان وتی بە پیاوەکە: ئایا تێگەشتیت؟! !

پیاوەکە وتی: بەڵێ تێگەشتم و خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە.[1]

## بافەوانی دڵ

عەلی کوڕی ئەبوطالب (ﷺ) دەڵێت: زۆر خۆری دڵ دەمرێنێت، وەك چۆن ئاودانی زۆریش، دەبێتە هۆی خراپ بوونی باخ و زەرعات.

(١) (صور من حياة الصحابة/٢٠٧ـ ٢٠٨)



## ترسی درۆ کردن

ڕۆژێکیان تەڵحەی کوڕی موسەڕیف (رحمه الله) گوێی لێ دەبێت پیاوێک زۆر داوای لێبووردن لە پیاوێکی تر دەکات، تەڵحە پێی دەڵێت: زۆر داوای لێبووردن مەکە، دەترسم بە هۆی زۆر داوای لێبووردنەکەتەوە تووشی درۆکردن ببیت.[1]

## ئایا دوو ڕوویەک هەیە؟!

حوزەیفەی کوڕی یەمان (رضي الله عنه) بە (نهێنی پارێزی پێغەمبەر) (ﷺ) ناوبانگی دەرکرد بوو.. خۆشەویست (ﷺ) ناوی هەموو دووڕووەکانی پێوتبوو، وە بەڵێنی نەدرکاندنی لێ وەرگرتبوو، کە لەلای کەس ناویان نەهێنێت.

عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) کاتێک موسوڵمانێک دەمرد، دەیپرسی: ئایا حوزەیفە ئامادەی نوێژ لەسەر کردنی بووە؟! ئەگەر بیانوتایە: بەڵێ. ئەوا عومەریش نوێژی لەسەر مردووەکە دەکرد، بەڵام ئەگەر بیزانیبا کە حوزەیفە نوێژی لەسەر نەکردووە، ئەویش گومانی دەبرد و نوێژی لەسەر نەدەکرد.

پاشان عومەر لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا.. لە حوزەیفە دەپرسێت: ئایا دووڕوویەک لە ناو کاربەدەستەکانمدا هەیە؟ حوزەیفە دەڵێت: بەڵێ یەکێک هەیە. عومەر دەڵێت: پێم بڵێ کێ یە؟ حوزەیفە دەڵێت: پێت ناڵێم، چونکە بەڵێنی نەدرکاندنی ناوەکانیانم داوە بە پێغەمبەر (ﷺ).

وە دواتر حوزەیفە دەڵێت: هەرچەندە من قسەم بۆ نەکرد، بەڵام خوا هیدایەتی عومەری دا بۆ دۆزینەوەی، چونکە هێندەی نەبرد دووڕووەکەی ناسییەوە و لە کارەکەی دووری خستەوە!![2]

(١) (حلية الاولياء ١٧/٥)
(٢) (صور من حياة الصحابة/ ٢٩٩)

## بێ نیازی

ئەبو سەعیدی خدری (رضي الله عنه) دەڵێت: ڕۆژم کردەوە و هیچ خواردنێکمان نەبوو کە بیخۆین..!! ئیدی لە برسانا بەردێکم بەست بە سکمەوە.. خێزانەکەم وتی: بچۆرە خزمەت رسول الله (ﷺ) و داوای شتێکی لێبکە، چونکە فلان و فلان و فلان ڕۆشتنە خزمەتی و داوایان لێکرد، ئەویش پێی بەخشین.
وتم: ئارام دەگرم، بەڵکو شتێکم دەست بکەوێت. بەڵام هیچم دەست نەکەوت، بۆیە چوومە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) لەو کاتەدا وتاری دەدا و لە فەرمایشتەکانی ئەمەم بەر گوێ کەوت کە دەیفەرموو: هەرکەس خۆی دوور بگرێت لە ڕووزەردی سواڵکردن و داواکردن لە خەڵکی، خوا لە هەردوو جیهاندا ڕووسوور و سەربەرزی دەکات، وە هەر کەسێکیش چاوی تێر و بێ نیاز بێت و چاوی لە دەستی ئەم و ئەو نەبێت، خوای گەورە دەوڵەمەند و بێ نیازی دەکات..
ئیدی لە دوای ئەوەوە داوام لە هیچ کەسێک نەکردووە و بەردەوام خوای گەورە ڕۆزی داوم، هەتا وام لێهات لەنێو ئەنسارەکاندا کەسم نەدەناسی لە من سەروەتی زۆرتری هەبێت.[١]

## ستەمی ڕۆژووگرتن

حەسەنی بەسری (رحمه الله) لە مەجلیسێکدا دەڵێت: ڕۆژوو بگرە و ستەم لە ڕۆژوو گرتنەکەتدا مەکە. پێی دەڵێن: باشە ستەمی ڕۆژوو گرتن چییە؟! حەسەن دەڵێت: ستەم و زوڵم کردن لە ڕۆژوو گرتندا، وەك ئەوەی. پیاوێك بڵێت: ئەو شتە و ئەو شتەم بۆ ئامادەکەن، من دەمەوێت بەیانی بەڕۆژووبم، ئەو فەرمان کردنە یەکێکە لە زوڵمەکانی ڕۆژوو گرتن، بۆیە هەوڵ بدە تەنانەت بە هۆی ڕۆژووگرتنیشتەوە ئەرك و ئەزیەتت بۆ کەس نەبێت.[٢]

---

(١) (صفة الصفوة/٢٥٨ـ ٢٥٩)
(٢) (من روائع أقوال الصالحين: ج١/٢٥)

## عەبایەكی ئاوریشمین

موئملی كوڕی ئیسماعیل دەڵێت: پیاوێكی ئەهلی شامم بینی، هات بۆ بازاڕی ئاوریشم فرۆشەكان و دەیوت: عەبایەكی ئاوریشمینم دەوێت بە چوار سەد درهەم. یونسی كوڕی عوبەید ( رَحِمَهُ اللهُ ) وتی: ئێمە هەمانە بە دوو سەد درهەم. لەو كاتەدا بانگیدا بانگبێژ بۆ نوێژ كردن.. یونس بۆ بازاڕی جێهێشت و كەوتە ڕێ بۆ ئەوەی ئیمامەت بۆ بەنی قشیر بكات، كاتێك گەڕایەوە دیتی خوشكەزاكەی عەباكەی فرۆشتووە بە پیاوەكە بە چوار سەد درهەم، یونس وتی: ئەم درهەمانە چین؟! ! خوشكەزاكەی وتی: نرخی عەباكەیە، فرۆشتم بەم پیاوە.

یونس بە پیاوەكەی وت، (كە هێشتا لەو ناوەدا بوو): ئەی بەندەی خوا.. ئەو عەبایە بە دوو سەد درهەمە، ئەگەر دەتەوێ ببە و ئەم دوو سەد درهەمەی تریش هەڵگرەوە بۆ خۆت، ئەگەر ناتەوێ داینێرەوە..!! پیاوەكە وتی: تۆ كێیت؟ یونس وتی: پیاوێكم لە موسوڵمانان. پیاوەكە وتی: توخوا پێم بڵێ تۆ كێیت و ناوت چییە؟ وتی: من یونسی كوڕی عوبەیدم.

پیاوەكە وتی: دەی سوێند بە خوا.. ئێمە كاتێك لە جەنگ و كوشتاری دوژمندا، تووشی نارەحەتی دەبین، نزا دەكەین و دەڵێین: ئیلاهی.. ئەی پەروەردگاری یونسی كوڕی عوبەید، غەممان بڕەوێنەوە و لە نارەحەتی خەڵاسمان بكە، پەروەردگاریش بە هانامانەوە دێت.

یونس وتی: سبحان الله.. سبحان الله..[1]

## تەیری ناو قەفەس

نەزالی كوڕی سەبرە ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەڵێت: دووڕووەكان لە مزگەوتدا.. وەك تەیری ناو قەفەس وەهان.. نائارام و بێ ئۆقرەن!

(١) (صفة الصفوة/٦٥٨)



## ویستتان.. خواردن نەخۆم!

مەیمونی کوڕی مهران دەڵێت: گلە و گازندەی ژنەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان کرد وتیان: بۆ باش خزمەتی عەبدوڵلا ناکەیت؟! وتی: دەی من چی بکەم، خواردنێکمان بۆ ئامادە نەکرد و ئەو کەسانێك بانگ نەکات بۆ خواردنی؟!

کەسانێکی هەژار هەبوون لەسەر ڕێگاکەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنهما) دادەنیشتن. کاتێك لە مزگەوت دەهاتەوە، دەیهێنانەوە و لە خواردنەکەی خۆی پێدەدان، ڕۆژێکیان.. ژنەکەی خواردن دەبات بۆ هەژارەکان و پێیان دەڵێت: لەسەر ڕێگاکەی عەبدوڵلا دامەنیشن و.. ئەگەر ناردی بە دووتانا ئێوە بەدەم داواکەیەوە مەیەن.

پاشان عەبدوڵلا دێتەوە و لە ڕێگاکەیدا هەژارەکان نابینێ، بۆیە دەنێرێت بە دوایاندا و بەماڵەوە دەڵێت: بڕۆن فلان و فلانم بۆ بانگ بکەن. بەڵام ئەوان نانیان خواردبوو و لەسەر داوای ژنەکەی نەهاتن بەدەم داواکەی عەبدوڵلاوە، ئیتر عەبدوڵلا ئەو شەوە نان ناخوات و دەڵێت: ئێوە ویستتان من ئەمشەو خواردن نەخۆم!

جارێکیان ئیبن موتیع عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەبینێ، جەستەی لەڕ و لاواز و بێ هێز بووە، بە صەفیەی خێزانی عەبدوڵلا دەڵێت: ئایا ناتوانی باشتر خزمەتی بکەیت، بەڵکو کەمێك بێتەوە سەرەخۆ؟! صەفیە دەڵێت: ئێمە هەر خواردنێکی بۆ ئامادە دەکەین، خۆی تێری لێ ناخوات و کەسانی تری بۆ داوەت دەکات، بەڵکو تۆ قسەیەکی بۆ بکەیت و بە گوێت بکات.

ئیبن موتیع بە عەبدوڵلا دەڵێت: ئەی ئەبا عەبدولڕەحمان.. ئەگەر تێر خواردن بخۆیت، تا جەستەت ئەوەی بۆ بگەڕێتەوە کە لە دەستی داوە، باشترە. عەبدوڵلا پێی دەڵێت: وا خەریکە دەبێتە هەشت ساڵ.. تەنیا بۆ یەك جار تێرم نەخواردووە!! ئێستا تۆ دەتەوێت من تێر بخۆم، لە کاتێکدا بەقەد نێوان دوو ئاو خواردنەوەی گوێدرێژێك[١] تەمەنم ماوە؟![٢]

---

(١) (گوێدرێژ بەوە ناسراوە کە زۆر بەرگەی تینوێتی ناگرێت و ماوەی نێوان دوو ئاو خواردنەوەی هێندە کەمە، بە نموونە دەهێنرێتەوە. صفة الصفوة/٢٠٧)

(٢) (صفة الصفوة/٢٠٧)



## تۆبه له هه‌موو ئاره‌زووه‌کان

موحه‌ممه‌دی کوڕی واسع ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: چل شه‌و به‌سه‌ر یه‌که‌وه هه‌موو شه‌وێك ئاره‌زووی جگه‌ری برژاوم ده‌کرد، وتم: ده‌چمه جیهاد.. به‌ڵکو بزنێکم به‌رکه‌وێت و ئه‌م ئاره‌زووه‌می پێ بشکێنم، ئیدی ڕۆشتینه جه‌نگه‌وه و.. ده‌ستکه‌وتمان هه‌بوو و بزنێکم به‌رکه‌وت، داوام کرد له یه‌کێك له هاوه‌ڵه‌کانم که جگه‌ره‌که‌یم بۆ ببرژێنێت، خه‌و زۆری بۆ هێنام و خه‌وتم، دیتم فریشته گه‌لێك له ئاسمان دابه‌زین و نووسییان: فلان بۆ جیهاد ڕۆشته ده‌ر و.. فلان بۆ ده‌ستکه‌وت و.. فلان بۆ شانازی کردن به خۆوه.. پاشان به‌ڕاسه‌ری منه‌وه وه‌ستان و وتیان: ئاره‌زووبازێکی داماوه..!! ئاره‌زووی له جگه‌ری برژاو بوو!! ئیدی له‌و کاته‌دا وتم: توخوا وامه‌که‌ن.. من زۆر په‌شیمانم و تۆبه ده‌که‌م. پاشان وتم: ئه‌ی په‌روه‌ردگارم چیتر ناگه‌ڕێمه‌وه بۆ وه‌ها کارێك، من تۆبه ده‌که‌م له هه‌موو ئاره‌زووه‌کانم.[1]

## سزا.. له جنسی خودی تاوان

مه‌کحولی شامی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: پیاوێکم بینی نوێژی ده‌کرد.. له هه‌ر رکوع و سجودێکدا ده‌گریا، به خۆمم وت: ئه‌مه بۆ ڕیا ده‌گریه‌ت..!! ئیتر هه‌ر به هۆی ئه‌و گومانه خراپه‌مه‌وه، خوای گه‌وره بۆ ماوه‌ی یه‌ك ساڵ گریانی لێ قه‌ده‌غه کردم و سزای دام و نه‌مده‌توانی بگریه‌م..!!

## به‌سۆزترین

سوفیانی سه‌وری ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: پێم خۆش نییه حیساب و کیتابم بدرێته ده‌ست دایك و باوکم..!! چونکه هیچ که‌سێك نییه.. له په‌روه‌ردگارم به‌سۆزتر و میهره‌بانتر بێت بۆم.

---

(١) (حدائق الأولياء ج١/٤٣ـ٤٤)



## دایەگیان.. بم بەفشە

عەبدوڵڵای کوڕی عەون (رحمه الله) دەڵێت: سەیر کردنی دایك و باوك عیبادەتە، جارێکیان عەبدوڵڵا دایکی بانگی دەکات، بە دەنگی بەرز وەڵامی دەداتەوە، ئیدی وەك پەشیمان بوونەوە و سزایەك بۆ ئەو دەنگ بەرز کردنەوەی بەسەر دایکیدا، دوو کۆیلە دەکڕێت و ئازادیان دەکات..!![1]

## بردیان.. تا بیکەن بە نان

جەعفەری کوڕی سولەیمان دەڵێت: گوێم لێبوو حەبیبی فارسی (رحمه الله) دەیوت: عومرەتی خێزانم.. هەویری شێلا و ڕۆشت ئاگری بۆ بهێنێت، لەو کاتەدا سواڵکەرێك هات داوای خێری دەکرد، منیش پێم وت: ئەو هەویرە هەڵگرە و.. بیبە، نۆشی گیانتان بێت.

عومرەت هاتەوە و پرسی: کوانێ هەویرەکە؟! وتم: بردیان.. هەتا بیکەن بە نان. بەڵام کاتێك زۆری بۆ هێنام، ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: سبحان الله..! ئەی نابێت شتێکمان هەبێت بیخۆین؟! ! منیش بێدەنگ بووم، هێندەی نەبرد پیاوێك هات، قابلەمەیەکی گەورەی پێ بوو، کە پڕی بوو لە نان و گۆشت، ئەو کاتە عومرەت وتی: چ زوو بۆیان هێنایتەوە !! کردوویانە بە نان و.. گۆشتیشیان خستۆتە پاڵ؟!

عومرەتیش خۆی یەکێك بووە لە ئافرەتە خۆپارێز و خودا ناسەکان.[2]

ئەگەر شەوانێك حەبیب درەنگ هەستایە بۆ خواپەرستی، عومرەت بە خەبەری دەهێنایەوە و پێی دەوت: هەستە ئەی پیاو.. کاروانی چاکان بەڕێ کەوتن و بە جێیان هێشتین، ڕێگایەکی دوورمان لە پێشە و توێشوومان ئامادە نییە..!!

(١) (صفة الصفوة/٦٦٢)
(٢) (صفة الصفوة/٦٦٥)

## ترسێك لەودیوی دەرگاکە!!

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (رضي الله عنهما) دەڵێت: ئەگەر لە ژوورێکدا خەریکی گوناهێك بوویت و دڵت دانەچڵەکی بۆ ئەوەی کە خوا دەتبینێت، بەڵام ڕەشەبا دەرگاکەی جوڵاندەوە و ترسایت.. ئەو ترسەت زۆر گەورەترە لە گوناهەکەت.[1]

## وانەیەك بۆ پیاوانی دوو ژنە

یەحیای کوڕی سەعید دەڵێت: مەعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه) دوو ژنی هەبوو، ئەگەر سەرە ڕۆژی یەکێکیان بووایە ئەوا لە ماڵی ئەوی تریان تەنانەت نە ئاوی دەخوارد.. نە دەست نوێژی هەڵدەگرت!!
پاشان لە شام دەردێك بڵاو بوویەوە و خەڵکی سەرقاڵ بوون پێوەی، هەر دوو ژنەکەی مەعازیش مردن و پێکەوە خرانە گۆڕێکەوە، مەعاز بۆ ئەوەی بزانێت کامیان لە پێشدا دابهێڵێتە ناو گۆڕەکەوە، هەستا تیر و پشکی بۆ کردن!
وە ئەنەس دەیگێڕێتەوە کە رسول الله (ﷺ) فەرموویەتی: زاناترینی ئوممەتەکەم بە حەڵاڵ و حەرام.. مەعازی کوڕی جەبەلە.[2]

## هەست بە تامەکەی دەکەم

ئەبوسولەیمانی دارانی (رحمه الله) دەڵێت: کاتێك تیکەیەك دەکەم بۆ برایەکم و دەیخوات.. هێندە دڵخۆش دەبم هەست بە تامەکەی دەکەم لە دەمی خۆمدا.

(١) (أين نحن من هؤلاء: ج٢/٢٦٧ ـ ٢٦٨)
(٢) (صفة الصفوة/١٧٩)

## لەمڕۆ پەلکەدارخورماکان نەهاتن!

ئیبراهیمی خەواص (رحمه الله) دەڵێت: کاتێکی بێ ئیشـیم هەبوو. ڕۆژانە دەچوومە دەرێ بۆ کەنار ڕووبارێکی گەورە، بە دەوریدا پەلکی دارخورما هەبوو، منیش شتێکم لەو پەلکانە لێ دەکردەوە و سەفتەم دەکردن و دەمدانە دەم ئاوی ڕووبارەکە.. بەم کارە خۆم سەرگەرم کردبوو، هەر دەتگوت داوام لێکراوە کە ئەم کارە بکەم!! چەند ڕۆژانێکی زۆر کاتی خۆمم ئاوەها بردە سەر.

هەتا ڕۆژێکیان بیرم کردەوە و وتم: با بەم کەناراوەدا بچم بزانم سەفتەی پەلکە دارخورماکان بەرە و کوێ ڕۆشتوون؟!

ئیدی ئەو ڕۆژە ئیشەکەم نەکرد و چەند سەعاتێك بە ڕۆخی ڕووبارەکەدا ڕۆشتم.. بینیم ئافرەتێکی بە تەمەن لە کەناری ئاوەکەدا دانیشتووە و دەگریەت!

وتم: ئەوە بۆچی دەگریەیت؟!

وتی: پێنج منداڵم هەیە، باوکیان مردووە، ئیدی نارەحەتی و هەژاری زۆری بۆ هێناین، ڕۆژێك هاتمە ئەم شوێنە دەبینم لە ئاوەکەدا پەلکە دارخورمای سەفتە کراو دێت، منیش گرتمەوە و بردم فرۆشتم و خەرجی منداڵەکانم پێ دەرهێنا..! ئیتر چەند ڕۆژێك خەرجیمان لەسەر ئەم کارە بوو، بەڵام ئەمڕۆ پەلکە دارخورماکان نەهاتن!

ئیبراهیم دەڵێت: دەستم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و وتم: ئەی پەروەردگارم.. ئەگەر بمزانیبا پێنج منداڵم بە سەرەوەیە، ئەوا کاری زیاترم دەکرد..!!

ئیبراهیم دەڵێت: ئیدی وتم بە ئافرەتە بە تەمەنەکە: هیچ خەم مەخۆ.. من ئەو کارەم دەکرد.

ئیتر هەر خۆم بە پشتیوانی خوای گەورە، بۆ چەند ساڵێك خەرجی خۆی و منداڵەکانیم دابین دەکرد.[1]

---

(١) (صفة الصفوة/٧٤٩)



## ته‌مه‌نێك پڕ له‌ په‌شیمانی

سه‌لامی كوڕی ئه‌بی موتیع ده‌ڵێت: شه‌وێكیان چووینه‌ سه‌ردانی مالیكی كوڕی دینار ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ماڵه‌كه‌ی تاریك و بێ چـرا بـوو..!! خه‌ریكی خواردنی وشكه‌ نانێك بوو..!! پێمان وت: ئه‌ی ئه‌با یه‌حیا.. بۆچی چرایه‌ك هه‌ڵ ناكه‌یت؟! ئه‌ی بۆچی شتێك به‌ نانه‌كه‌ته‌وه‌ ناخۆیت؟! مالیك وتی: وازم لێ بهێنن، سوێند به‌خوا.. زۆر په‌شیمانم له‌و ته‌مه‌نه‌ی كه‌ گوزه‌راندوومه‌ و تێپه‌ڕیوه‌.[1]

## نرخه‌كه‌ی چه‌نده‌؟!

عه‌لی كوڕی حوسه‌ینی كوڕی حه‌رب ده‌ڵێت: سیری سه‌قه‌تی تووشی كۆكه‌ هاتبوو، باوكم هه‌توانێكی كۆكه‌ی پێدام كه‌ بیبه‌م بۆی، كاتێك هه‌توانه‌كه‌م بۆ برد، سیری وتی: ئه‌ی نرخه‌كه‌ی چه‌نده‌؟ وتم: باوكم باسی نرخه‌كه‌ی نه‌كردووه‌، دیاره‌ هه‌روا بۆی ناردووی.
سیری ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) وتی: ده‌ی بگه‌ڕێوه‌ بۆ خزمه‌تی باوكت.. سڵاوی منی پێ بگه‌یه‌نه‌ و پێی بڵێ: ئێمه‌ ماوه‌ی په‌نجا ساڵه‌ خه‌ڵكی فێری ئه‌وه‌ ده‌كه‌ین كه‌ له‌سه‌ر حیسابی دینه‌كه‌یان هیچ شتێك نه‌خۆن، ئه‌مڕۆ تۆ وایده‌بینیت.. كه‌ ئێمه‌ له‌سه‌ر حیسابی دینه‌كه‌مان شتێك بخۆین![2]

## ته‌وقه‌یه‌ك له‌ دڵه‌وه‌

عومه‌ری كوڕی خه‌طاب (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر مرۆڤه‌كان به‌نهێنییه‌كانی دڵی یه‌كتریان بزانیبایه‌، ئه‌وا ته‌نانه‌ت ته‌وقه‌شیان له‌گه‌ڵ یه‌كتردا نه‌ده‌كرد!!

---

(١) (صفة الصفوة/٦٤٦)
(٢) (تهذيب حلية ألاولياء: ج٣/٢٨٤)

## ویردی شەوانە

ئەبی عیسمەتی بەیهەقی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: شەوێك لە خزمەت ئەحمەدی كوڕی حەنبەلدا (رحمه الله) مامەوە، كاتێك ویستم بنووم لە دەفرێكدا ئاوی هێنا و لە نزیكمەوە داینا، دەمەو بەیانی ئیمام هات و.. كە بینی ئاوەكە وەك خۆی ماوەتەوە و هیچ دەستنوێژی پێ نەگیراوە، وتی: سبحان الله..!! چۆن دەگونجێت پیاوێك فێرخوازی زانست بێت و هیچ ویرد و شەونوێژێكی نەبێت؟!![1]

## هەر بە گریان كردیە دەرێ!

عەبدولڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێت: عەتای كوڕی یەسار و سولەیمانی كوڕی یەسار (رحمه الله) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەكانیاندا، لە مەدینەی رسول الله (ﷺ) چوونە دەرێ بە مەبەستی حەجكردن، كاتێك گەشتنە (الابواء) لە ماڵێك دابەزین بۆ حەوانەوە، سولەیمان و هاوەڵەكانی چوونە دەرێ بۆ دابین كردنی هەندێ پێداویستی.. بەڵام عەتا لە ماڵەوە مایەوە و خەریكی نوێژكردن بوو، ئافرەتێكی دەشتەكی جوان، چووە ژوورەوە.. عەتا لە نوێژەكەی بوویەوە و بە ژنەكەی وت: بڵێ بزانم چ پێویستیەكت هەیە تا بۆتی جێبەجێ بكەم؟ ئافرەتەكە وتی: هەستە لەگەڵم جووت بە، بەڕاستی من پیاوم نیە و بێتاقەتیم زۆری بۆ هێناوم. عەتا وتی: دووركەوە لێم.. منیش و خۆیشت مەسوتێنە بە ئاگر. بەڵام ئافرەتەكە وازی نەدەهێنا..!! عەتا كە بینی ئافرەتە جوانەكە سوورە لەسەر داواكەی و واز ناهێنێ.. دەستی كرد بە گریان و پێی وت: بەڵا لێت دا.. دووركەوە لێم..!!

عەتا.. گریان و ترس زۆری بۆ هێنا، كاتێك ئافرەتەكە ترس و گریانی بە كوڵی عەتای بینی.. ئەویش دەستی كرد بە گریان..!! سولەیمان هاتەوە، كە بینی عەتا دەگرییێت و ئافرەتێكیش لە سوچێكدا دانیشتووە دەگری، ئەمیش بێ ئەوەی بزانێت ئەوان بۆچی دەگرین، دەستی كرد بە گریان بۆ گریانەكەی ئەوان..!! ئیدی یەك لە دوای یەك هاوەڵەكانی دەهاتنەوە و كە

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/١٠٢)

ئەو حاڵەیان دەبینی ئەوانیش بۆ ئەوەی پرسیارێ بکەن دەستیان دەکرد بە گریان..!! تا وای لێ هات دەنگی گریانەکەیان بەرز بوویەوە.. ئیدی کاتێک ئافرەتەکە ئەو هەموو گریانەی دی، هەستا و ڕۆشتە دەرەوە!!

پاشان سولەیمان لەبەر گەورەیی و ڕێزێک، دەربارەی ئافرەتەکە پرسیاری لە عەتا نەکرد.. تا بۆ هەندێ پێویستی خۆیان دەگەنە میسر، لەوێ شەوێکیان عەتا لە خەو ڕادەپەڕێ و دەست دەکات بە گریان، سولەیمان پێی دەڵێت: چی دەتگرێنێت براکەم؟! عەتا زیاتر دەگرییێت و سولەیمان پرسیاری لێدەکاتەوە، عەتا دەڵێت: پێت دەڵێم بەلام لای کەس باسی مەکە تا من زیندووم.. یوسفی پێغەمبەرم بینی لە خەونمدا، جوان تەماشایم کرد کە جوانییەکەیم بینی گریام، یوسفی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بۆچی دەگرییێت ئەی پیاو؟! وتم: بە دایک و باوکمەوە فیدات بین ئەی پێغەمبەری خوا.. بیری تۆ و خێزانەکەی عەزیز و ناڕەحەتییەکانی زیندان و دووری یەعقوبم کردەوە و.. زۆر سەرسام بووم پێی، بۆیە گریام. پێغەمبەر یوسف فەرمووی: ئەی بۆ سەرسام نابی بەو پیاوە و ئافرەتە دەشتەکییەکەی (الابواء)؟! ئیدی زانیم کە مەبەستی خۆمە، دەستم کرد بە گریان و بە گریان بێدار بوومەوە.

ئەو کاتە سولەیمان وتی: ئەی براکەم.. دەی ئێستا باسی ئەو ئافرەتەم بۆ بکە، بزانم چی بوو؟ ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، دوای ئەوەی کە عەتا مرد.. سولەیمان بۆ یەکێک لە ئەهلەکەی خۆی گێڕایەوە، ئەویش تا سولەیمان نەمرد، بۆ کەسی نەگێڕایەوە.[1]

## خۆزگەت پێ بێت!

پیاوێک وتی بە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (رحمه الله): خۆزگەم پێت بێت.. هەر بە ڕەبەنی خۆت تەرخان کردووە بۆ خواپەرستی. ئیبراهیم وتی: تەنها یەک ترس کە بە هۆی پەروەردەکردنی منداڵەکانتەوە دێتە دڵتەوە.. لە هەموو ئەم ئەحواڵ و خواپەرستییەی من گەورەترە.[2]

(١) (صفة الصفوة/٣١٨-٣١٩)
(٢) (أين نحن من هؤلاء: ج٣/٣٤)

## بۆ پارچە قوڕێك دەگریەم!

عەممارەی کوڕی زازان دەڵێت: کەهمسی کوڕی حەسەن (رحمه الله) پێی وتم: ئەی ئەبا سەلەمە.. گوناهێکم کردووە و چل ساڵە بۆ ئەو گوناهەم دەگریەم. وتم: ئەو گوناهە چی بوو ئەی ئەبا عەبدوڵلا؟! وتی: برایەکم سەردانی کردم، منیش ماسییەکم بۆ کڕی بە یەك دانق، کاتێك کە لە خواردنی بوویەوە، هەستام لە بندیواری دراوسێکەمان پارچەیەك قوڕم بۆ هێنا و دەستی پێ شۆرد، ئیتر ئەوە چل ساڵە من بۆ ئەو پارچە قوڕە دەگریەم، نازانم بۆچی بەبێ پرسی خاوەنەکەی هێنام؟!![1]

## بۆنی سێو دێت

ئەلفەهری لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز سێوی دابەش دەکرد.. سێوی دەستکەوتی بێ شەڕ و کوشتاری موسڵمانان، کوڕێکی بچوکی عومەر سێوێکی هەڵگرت و بردی بۆ دەمی، عومەر بە جۆرێ لە دەمی کوڕەکەی سەندەوە کە ئازاری پێ گەیاند، ئیدی مناڵەکە بە گریانەوە ڕۆشتەوە بۆ لای دایکی.. ئەویش ناردی لە بازاڕ سێوی بۆ کڕی..!!
دواتر عومەر (رحمه الله) کاتێك گەڕایەوە بۆ ماڵ، هەستی بە بۆنی سێو کرد..!! بۆیە بە فاتمەی خێزانی وت: ئەی فاتمە.. شتێکت لەو دەستکەوتی بێ شەڕ و کوشتارە هێناوە؟! فاتمە وتی: نەخێر.
ئیدی گریانی منداڵەکە و کڕینی سێوەکەی بۆ گێڕایەوە، عومەر وتی: وەڵلاهی کە لە دەمی منداڵەکەمم فڕاند. وەمزانی لە دڵی خۆمی دەستێنم، بەڵام پێم ناخۆش بوو بەشی خۆم لای پەروەردگار بە زایە بدەم بۆ تەنیا سێوێك لەو دەستکەوتەی کە موسوڵمانان بە بێ شەڕ و کوشتار دەستیان کەوتووە!![2]

---

(١) (صفة الصفوة/٦٦٤)
(٢) (صفة الصفوة/٣٣٦)

## نان و زەیت

مالیك دەڵێت: سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر.. پۆشاکێکی کەم نرخی دەپۆشی کە بایی دوو درهەم بوو، سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك، سالمی بینی سیمایەکی جوانی هەیە، پێی وت: تۆ چ خواردنێك دەخۆیت؟! سالم ( رحمه الله ) وتی: نان و زەیت.. ئەگەر گۆشتیش هەبوو دەیخۆم. سولەیمان پێی وت: دەی ئایا چۆن ئارەزووت دەچێتە سەر نان و زەیت؟! ! سالم وتی: ئەگەر ئارەزووم لێی نەما.. نایخۆم، خۆم برسی دەکەم هەتا ئارەزووم دەچێتەوە سەری.[1]

## بابە گیان.. بڕۆم یاری بکەم؟

ڕەبیعی کوڕی مونزیر دەڵێت: گوێم لە باوکم بوو دەیگوت: کۆمەڵێك خزم و خوێش لە دەوری ڕەبیعی کوڕی خوسەیم ( رحمه الله ) کۆ بوو بوونەوە، کچەکەی هات و پێی وت: بابە گیان.. بڕۆم یاری بکەم؟

ڕەبیع وتی: بڕۆ و قسەی خێر بکە کچم..!!

چەند جارێك ئەم گفتوگۆیە دووبارە بوویەوە، لە نێوان ڕەبیع و کچەکەیدا، ئیدی خزمەکانی پێیان وت: خودا چاکت بۆ بکات، ئەی ڕەبیع.. تۆ هێندەت لەسەرە کە پێی بڵێی: بڕۆ یاری بکە، خۆ کچەکەت شتێکی خراپی نەوتووە، وا هێندە دەڵێیت: قسەی خێر بکە کچم!!

ڕەبیع وتی: بەڵکو هێندەم لەسەرە نەهێڵم ئەو ڕستە لەپەڕاوەکەمدا بنووسرێتەوە، هەتا سبەی لە نامەی ئەعمالمدا، (بڕۆ یاری بکە) نەخوێنمەوە!![2]

(١) (صفة الصفوة/٣٢٣)
(٢) (صفة الصفوة/٥٤٤)

## ڕه‌حمه‌تی خوا له‌وه بێت.. ئاو ده‌خواته‌وه

موحه‌ممه‌دی کوڕی سوبح ده‌ڵێت: مه‌عروفی که‌رخی ( رحمه الله ) به‌ڕۆژوو بوو (ڕۆژووی سوننه‌ت) به‌لای ئاوگێڕێکدا تێپه‌ڕی، ئاوگێڕه‌که ده‌یوت: ڕه‌حمه‌تی خوا له‌وه بێت که ئاو ده‌خواته‌وه. مه‌عروف ڕۆژووه‌که‌ی شکاند و ئاوه‌که‌ی خوارده‌وه و وتی: به‌ڵکو خوا پاڕانه‌وه‌که‌ی وه‌ربگرێت.[1]

## ئاره‌زووی خواردن و خواردنه‌وه‌م نه‌ما

شه‌قیقی کوڕی ئیبراهیمی به‌ڵخی ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: له ساڵی سه‌د و چل و نۆدا.. به نیه‌تی حه‌جکردن ڕۆشتمه ده‌ر، له قادسیه دابه‌زیم، له کاتێکدا سه‌یری جوانی و زۆری ئه‌و خه‌ڵکه‌م ده‌کرد.. گه‌نجێکی سیما جوانی ڕه‌نگ ئه‌سمه‌ری تۆخی، به‌ده‌ن باریکم به‌رچاو که‌وت.. به‌سه‌ر پۆشاکه‌کانییه‌وه به‌رگێکی خوری له‌به‌ر کرد بوو، به به‌رگێکی فراوان خۆی پێچابوویه‌وه، جووتێ نه‌علی له پێدا بوو، به ته‌نیا دانیشتبوو، له دڵی خۆمدا وتم: ئه‌و گه‌نجه له سۆفییه‌کانه و ده‌یه‌وێ ببێته پاسه‌وانی خه‌ڵکه‌که له ڕێگه‌یاندا، وه‌ڵڵاهی ده‌چم بۆ لای و سه‌رزه‌نشتی ده‌که‌م! که نزیك بوومه‌وه لێی، بینیمی و پێی وتم: ئه‌ی شه‌قیق.. خوای گه‌وره ده‌فه‌رمووێ:

﴿اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ﴾[2]

واته: خۆتان له زۆرێك له گومانه‌كان بپارێزن، چونكه به ڕاستی هه‌ندێك له گومانه‌كان تاوانن.[3]

پاشان جێی هێشتم و ڕۆشت! له دڵی خۆمدا وتم: ئه‌مه کارێکی زۆر سه‌رسوڕهێنه‌ره، ئه‌وه‌ی له دڵما بوو وتی و ناوی هێنام..! دیاره ئه‌مه پیاوچاکه، به دوایدا ده‌ڕۆم و داوای لێده‌که‌م تا نزام بۆ بکات و له گومانه‌که‌م ببورێت، به‌ڵام ئه‌و له چاوانم ون بوو و نه‌مبینی.. تا کاتێك له دۆڵی (فضة) دابه‌زین، بینیم ڕاوه‌ستاوه نوێژ ده‌کات، وتم: ئه‌مه هاوڕێکه‌مه، ده‌چمه لای و

(١) (صفة الصفوة/٤٢٥)
(٢) (الحجرات/١٢)
(٣) (پوخته‌ی ته‌فسیری قورئان/٥١٧)

داوای گەردن ئازادی لێدەکەم.. بۆیە ئارامم گرت تا دانیشت و لە نوێژەکەی بوویەوە، پاشان ڕووی تێکردم و، پێی وتم: ئەی شەقیق.. فەرموودەی خوای گەورە بخوێنەوە کە دەفەرمووێت:

﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى﴾[1]

واتە: وە بە ڕاستی من زۆر لێبووردووم لەو کەسەی تەوبەی کردبێت، وە باوەڕی هێنابێت و کردەوەی چاکی کردبێت، پاشان بەردەوام بووبێت لەسەر ئەو ڕێبازە.[2]

پاشان هەستا ڕۆشت و جێی هێشتم.

وتم: بە ڕاستی ئەم گەنجە لە (ئەبدال)[3]ەکانە، ئەوە دوو کەڕەت نهێنی دڵمی باسکرد. کاتێك گەشتینە (الابواء) بینیم.. گەنجەکە لای بیرێکدا وەستاوە و گۆزەیەکی بە دەستەوەیە و بە نیازی ئاو خواردنەوەیە، گۆزەکەی دەستی کەوتە ناو بیرەکەوە و من تەماشام دەکرد.. بینیم چاوی بڕییە ئاسمان و دەیگوت: عەشق و یادی تۆ خواردنەوەی منە، ئەگەر تینوی ئاوم بوو.. وە قووتی منە، ئەگەر خواردنم ویست.

پاشان وتی: ئەی خودایا.. ئەی گەورەم.. تەنیا ئەوەم هەیە با لە کیسم نەچێت. شەقیق دەڵێت: دەی سوێند بە خودا.. بینیم ئاوی بیرەکە هاتە سەرەوە، ئەویش دەستی درێژکرد و گۆزەکەی گرتەوە و پڕی کرد لە ئاو و دەست نوێژی گرت و چوار ڕکات نوێژی کرد!! پاشان شتێکی هێنا و توند لە نێو چنگی گوشی و خستییە ناو گۆزەکەوە، گۆزەکەی ڕادەوەشاند و گیراوەکەی ناوی دەخواردەوە، ڕوو بە ڕووی ڕۆشتم و سەلامم لێکرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دامەوە، پێم وت: لەو فەزڵ و نیعمەتەی خودا پێی بەخشیویت.. بمدەیە تا بیخۆم.

وتی: ئەی شەقیق.. نیعمەتانی خودا بەردەوامە بۆمان بەدیار و نادیاریەوە، دە تۆش گومانی باشت بە خودات هەبێت.

پاشان گۆزەکەی بۆ ڕادێرام، منیش لێم خواردەوە.. دە سوێند بە خودا قەت لەوە بە لەزەتتر و بۆن خۆشترم نەخواردۆتەوە..!! ئیتر تێرم خوارد و تینوێتیم شکا، چەند ڕۆژێك مامەوە نە ئارەزووی خواردنم هەبوو.. نە ئارەزووی خواردنەوە..!! پاشان نەمبینییەوە تا داخڵی مەککە بووین.

---

(١) (طه/٨٢)

(٢) (پوختەی تەفسیری قورئان/٣١٧)

(٣) (ئەبدال: پلەیەکی زۆر تایبەتە لای ئەهلی تەسەوف.)



شـــــەوێکیان.. نیـــوە شــــەو بـــوو، لە تەنیشـــــت شــــوێنی ئـــــاو خــواردنـــەوەکـــەدا بینـیـم.. ڕاوەسـتا بـــوو، بە گـریـان و ملکەچی و ناڵیـنەوە نـوێـژی دەکـرد هـەتـا ڕۆشـــنایی بەیـان، پاشـــان هـەسـتا لە دەوری کەعـبە دوو ڕکات نـوێـژی کـرد و، هــەر لەوێ لەگەڵ خەڵکیـدا نـوێــژی بەیـانی کــرد، پاشـــان دەســـتی کــرد بە تەواف کــردن تـا دوای خــۆر هـەڵهـاتن، پاشـــان لە پشـــتی (مەقام)ەوە نـوێـژی کـرد و چـووە دەرێ، شـــوێنی کەوتـم، دەبینم..! خزمــەتکار و غــوڵام و خەڵکـی زۆری لە دەوروبـــەر کــۆ بـــوویـــەوە، دەهـــاتن و ســـــەلامیان لێدەکـرد..!! بە پێچەوانـەی ئـەو تـــەنیاییەی کە لە ڕێگـادا پــێوەم بـینی، بـۆیــە لە یەکێ لەوانــەی کە لێوەی نــزیك بـــوون، پـرسـیم: ئـــەم گەنـجــە کـێ یە؟ وتــی: ئـەمــە.. مـوســـای کـوڕی جەعـفەری کـوڕی مـوحەممەدی کـوڕی عەلـی کـوڕی حوسـەینی کوڕی عەلی کوڕی ئـەبـو طالـبە (عليهم السلام).[1]

ئیمام مــوســای کـازم.. لە مـەدینە لە ســـاڵی ســــەد و بیســـت و هـەشـــتی کـۆچی لە دایکبـووە.. ڕەشــید لە زەمــانی دەســــەڵاتی خۆیـدا، دێـتە مــەدینە و ئــیمام مـوســـا دەسگـیر دەکـات و لەگەڵ خــۆی دەیبـات، لە بەغـداد دەیــخاتە زیـندانــەوە، تـا لەوێ لە ســـاڵی ســـــەد و هـەشـــتا و ســێدا کــۆچی دوایـــی دەکـات.

## ئازادکـردنی تۆ، کەفارەتی گوناهی منە

ڕۆژێـــك عەبـدوڵڵای کــوڕی عــومەر (رضي الله عنهما) زللەیــەکی ســـوك دەدات لــە غـــوڵامێکی، عــەبدوڵڵا یـەکســەر پــەشـیمان دەبێـتەوە و پـێی دەڵێـت: ئـــەی غــوڵام ئــازارم دایت؟!

غــوڵامـەکەش دەڵـێت: نـەخـێر.. گــەورەم ئـــازارت نـــەدام.

عەبدوڵڵا دەڵێت: بـەڵێ.. ئـازارم دایت، بـــڕۆ ئـازادبـە لـە ڕێـی خــــوادا، وە ئــــەوەش بـــزانــە کە مـن هـیچ پاداشـتـێك وەرنـاگـرم لــە پـــای ئـــازادکـردنی تـــۆدا، بــەڵکــو ئــازادکــردنی تـــۆ.. تـەنـها کـەفـارەتـێکــە بــــۆ ئـــــەو گــونـاهــەی کـە مـن کــردم بــەرامـبــەرت.

---

(١) (نور ألابصار/١٤٩)

## خێر و شەڕ

ئەبوبەکری صدیق (ﷺ) دەڵێت: هیچ خێرێك لە شتێکدا نییە.. کە بە خێر دابنرێت، بەڵام ئاکامەکەی بۆ دۆزەخ بێت، وە هیچ شەڕێکیش لە بەلا و ناڕەحەتییەکدا نییە.. کە ئاکامەکەی بۆ بەهەشت بێت.

## خۆم دەبمە خزمەتکارت!

عەبدوڵلای کوڕی موبارەك (رحمه الله) دەڵێت: گەشتمە مەککە دەبینم.. خەڵکی بێ بارانی و وشکەساڵی ڕووی تێکردوون و لە (مسجد الحرام) دا نوێژەبارانە دەکەن، لە نێوان خەڵکەکەدا.. غولامێکی ڕەش پێست هات، کە دوو پارچە گوێنی پێوە بوو..!! بە پارچەیەکیان خۆی داپۆشی بوو، ئەوی دیکەیانی دابوو بە سەر شانیدا..!! ڕۆشتە شوێنێکی نەبینراو لە تەنیشتی منەوە، گوێم لێبوو دەیوت: ئیلاهی.. زۆری تاوان و خراپی کردەوەکان.. ڕەحمەتی ئاسمانی لێ گرتینەوە، بۆ ئەوەی خەڵکان پەروەردە بن، من داوات لێ دەکەم یاحلیم.. مۆڵەت بدە، ئەی ئەو کەسەی کە بەندەکانت بێ لە جوانی هیچیان لێ نەدیویت.. هەر ئێستا بارانی ڕەحمەتیان بۆ ببارێنە.. هەر ئێستا..!! بەردەوام دەیوت: هەر ئێستا، هەر ئێستا.

تا هەور ئاسمانی داگرت و لە هەموو شوێنێکەوە باران باری..!!

غولامەکە لە شوێنەکەیدا دانیشت و دەستی کرد بە تەسبیحات، منیش دەستم کرد بە گریان، پاشان کاتێك ڕۆشت کەوتمە شوێنی و شوێنەکەیم زانی.. دواتر چوومە لای فوزەیلی کوڕی عەیاز، پێی وتم: چییە وا غەمگین دەتبینم؟! وتم: کەسێك پێشمان کەوت و بە بێ ئێمە کارەکەی گرتە دەست..!!

وتی: ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟!

منیش ئەوەی ڕوویدا بوو بۆم گێڕایەوە.. ئیتر فوزەیل هاواری کرد و کەوت، دواتر وتی: هاوار لە دەستی تۆ..!! ئەی کوڕی موبارەك بمبە بۆ خزمەتی.

وتم: تازە کات نەماوە! دەچم لێی دەکۆڵمەوە تا بارودۆخ و پلە و پایەی بزانم!! بۆ بەیانی ڕۆشتمە ماڵەکە، پیاوێکی بە تەمەن لە بەردەرگا

دانیشـتبـوو، منـی دەناسـی، وتـی: مـەرحـەبـا ئـەی ئـەبا عەبـدولڕەحمان، پێویسـتیت چییە؟

وتـم: پێویسـتم بە غـوڵامێکی ڕەش هـەیە.

وتی: چەند غـوڵامێکم هـەیە، بە ئـارەزووی خـۆت هـەڵبژێـرە، دواتـر بـانگی کـرد ئـەی غوڵام. ئیتر غوڵامێکی بەهێـز و پتەو هـاتە دەر، وتـی: ئـەمـە ئـاکامێکی سـوپاسـکراوی هـەیە، بە باشـی دەزانم ئـەمـە ببەیت .

وتـم: پێویسـتم بەمە نییە. ئیدی غـوڵامـەکان یـەك لە دوای یـەك هـاتن، هـەر کە غـوڵامـەکـەم بینی چـاوم ڕۆشـن بـوویـەوە، پیاوەکە وتی: دیـارە ئـەمـەت دەوێـت؟ وتـم: بەڵێ. پیاوەکە وتی: بـەکەڵکی فـرۆشـتن نـایەت، چونکە توانـای کـاری نەمـاوە، خـواردن و خـواردنەوەی ڕۆژانەشـی لە ڕسـتن و بـادانی چەنـد قـەیتانێکەوەیە، کە ئـەگـەر بە نیو دانق کەمتر یان زیـاتر بیفرۆشـێت، ئـەگـەر نـا ڕۆژەکەی بە بـرسـێتی دەمێنێتەوە. غوڵامـەکانی تر وتیان: ئـەمە شـەوگاری درێـژ ناخەوێـت و تێکەڵـیمان ناکـات و گرنگـی بە خـۆی دەدات. منـیش دڵـم خۆشـیویسـت و کڕیم.

پاشـان بـەرە و مـاڵی فـوزەیلی کـوڕی عـەیـاز کـەوتیـنە ڕێ، دەمـێك ڕۆشـتین و.. غوڵامەکە پێی وتـم: ئـەی گـەورەم!

وتـم: گیـان.. سـەرم لـەڕێـتـە..!!

وتی: قـوربـان وامـەڵێ..!! ئـەوە بـۆ بـەنـدەکـان لـەبـەرتـرە، وا بە گەورەکانیـان بڵێن. وتـم: پێویسـتییەکەت چییە؟ بیڵێ.. ئـەی خۆشـەویسـتـم!

وتی: مـن بـەدەن لـەڕ و لاوازم و بـڕسـتی کارکـردنم نەمـاوە، غوڵامـەکانی دیکە زۆر لە من باشـتر بـوون، بـۆچی لەنـاو هـەموویاندا منت هـەڵبـژارد؟! !

وتـم: خـودا نـەمـژێـنێـت.. ئـەگـەر ویسـتبێتم بتکەمـە خـزمـەتکـار و کـارت پێ بکەم، بـەڵام مـن نـەمـرم خـانـووێکت بـۆ دەکـڕم و ژنـت بـۆ دەهێـنم و.. خـۆم دەبـمـە خـزمـەتـکارت..!!

غـوڵامـەکـە دەسـتی کرد بـە گـریـان..!! وتـم: بـۆچی دەگـریـەیت؟! ! وتـی: تـۆ ئـەمـەت بۆیـە کـرد چـونکە بە هـەندێ لە پـەیـوەندییەکانی مـن و پـەروەردگارمت زانیـوە.. ئـەگـەرنـا بـۆچی لـەنـاو هـەمـوو غوڵامـەکاندا تەنهـا منت هـەڵبژارد؟! ! وتـم: تـۆ پێویسـتت بە زانینی ئـەو شـتانە نییە. وتی: تـو خـوا پێـم بڵێ. وتـم: بە هـۆی گـیرا بـوونی نزاکەتـەوەیـە.

غوڵامەکە پێـی وتـم: وایدەبینـم ان شـاء الله تـۆ لە پیاوچـاکان بیـت، خـوای گەورە کەسانێکی بـژاردەی هـەیـە لە نێـو خەڵکیـدا.. ئـەحـواڵیان کەشـف ناکـات تەنهـا بـۆ بەندە باشـەکانی خـۆی نەبێـت..!! پاشـان وتـی: ئـەگـەر کەمێـك لە سـەرم بـووەسـتیت، چەند ڕکاتێکی دوێـنێم لەسـەر مـاوە؟ وتـم: ئـەوەتـانێ.. مـاڵی فوزەیل ئـەوەندەی نەمـاوە. وتی: نـا ئێـرەم پێ خـۆشـترە. فـەرمـانی خـوا دوا

ناخرێت. ئیدی له ده‌رگای (الباعه)وه ڕۆشته ناو مزگه‌وت و به‌رده‌وام نوێژی کرد.. تا ئه‌وه‌ی ویستی بۆی هات، ئه‌وکاته ڕووی تێکردم و وتی: ئه‌ی ئه‌با عه‌بدولڕه‌حمان هیچ پێویستییه‌کت نییه؟

وتم: بۆ؟

وتی: ده‌مه‌وێ ئێره جێ بهێڵم و بڕۆم!

وتم: بۆ کوێ؟

وتی: بۆ ئه‌و دنیا!!

وتم: وامه‌که.. بهێڵه با به خزمه‌ت کردنت دڵشاد ببم.

وتی: ژیان ئه‌و ساته خۆش بوو که هه‌ڵسوکه‌وتم له نێوان خۆم و خوادا بوو، به‌ڵام ئێستا که تۆ ئاگاداری، ئه‌وا که‌سانی تریش ئاگادار ده‌بن، منیش هیچ پێویستییه‌کم به‌وه نییه!!!

ئیدی به‌ده‌مدا که‌وت و ده‌یگوت: ئیلاهی.. هه‌ر ئێستا گیانم بکێشه.. هه‌ر ئێستا.. هه‌ر ئێستا..!! پاش که‌مێك لێی نزیك بوومه‌وه، ده‌مزانی مردووه..!! خودا ڕه‌حمی پێبکات، وه سوێند به خودا قه‌ت باسم نه‌کردووه، تا دڵته‌نگیم تولی کێشا و.. دنیا له چاومدا ته‌نگ و بچوك بوویه‌وه!![1]

## خراپترین ده‌رد

پیاوێك ده‌چێته خزمه‌ت عائیشه‌ی دایکی ئیماندااران (رضي الله عنها) و پێی ده‌ڵێت: من تووشی ده‌ردێك هاتووم، نازانم هیچ ده‌رمانێکت هه‌یه بۆم؟ عائیشه ده‌ڵێت: ده‌رده‌که‌ت چییه؟

پیاوه‌که ده‌ڵێت: تووشی دڵڕه‌قی هاتووم.

عائیشه ده‌ڵێت: خراپترین ده‌رد ئه‌م ده‌رده‌ی تۆیه..!! بڕۆ سه‌ردانی نه‌خۆشان بکه و.. شوێن جه‌نازه‌ی مردووان بکه‌وه و.. چاوه‌ڕێی ئه‌وه‌ش به که تۆش ده‌مریت.[2]

(١) (صفة الصفوة/٣٩٩ـ ٤٠٠ـ ٤٠١)
(٢) (موسوعة الأخلاق ج١/١٤٧)

## بیدەوە بەو کەسانەی لێت سەندوون

موحەممەدی کوڕی حەسان دەڵێت: مامەم بۆی گێرامەوە و وتی: موحەممەدی کوڕی قوحتبە گەشتە کوفە و وتی: پێویستم بە کەسێکە منداڵەکانم بۆ پەروەردە بکات، بە مەرجێك قورئانی دەرخ بێت و زانا بێت بە سوننەتی رسوول الله (ﷺ) و ئەسەری هاوەڵان و فیقە و نەحو و شیعر و سەربوردەی خەڵکی. پێیان وت: ئەو هەموو زانستە مەگەر تەنها لە داوودی طائیدا هەبێت.

موحەممەدی کوڕی قوحتبەیش خۆی ئامۆزای داوود بوو، بۆیە کەسێکی نارده لای و پێی ڕاگەیاند کە ئەو کارە بگرێتە ئەستۆ، لە بەرامبەردا ڕزق و ڕۆزی و سوودێکی زۆری دەست دەکەوێت، بەڵام داوود نەیویست، ئەمجار تورەکەیەکی بۆ نارد کە دە هەزار درهەمی تێدا بوو، داوود ئەویشی بۆ ناردەوە، دواتر دوو تورەکە و دوو غولامی بۆ نارد و بە غولامەکانی وت: ئەگەر داوود دوو تورەکەکەی وەرگرت، ئەوا ئێوە ئازاد بن.

غولامەکان پارەکەیان برد و ڕۆشتن بۆ خزمەتی.. بەڵام دیسان داوود وەری نەگرت، دوو غولامەکە پێیان وت: ئازاد بوونی ئێمە بەندە بە وەرگرتنی ئەو دوو کیسەوە، بۆیە تکات لێدەکەین وەری بگرە!

داوود (رحمه الله) پێی وتن: منیش دەترسم وەرگرتنیان گوریسێك بێت بکرێتە گەردنم و پێوەی فڕێ بدرێمە ناو ئاگرەوە، بیگەڕێننەوە و پێی بڵێن: ئەم پارانە بگێڕێتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لێی سەندوون باشترە لەوەی کە بیاندات بە من.[1]

## خەڵکی لە فێردان

پیاوێك هاتە لای مەیمونی کوڕی مهران و پێی وت: خەڵکی هەتا تۆیان لەناودا بێت، هێشتا لە خێر و خۆشیدان. مەیمون (رحمه الله) وتی: نەخێر.. خەڵکی هەتا لە خوا بترسن لە خێر و خۆشیدان، ئەگەر تەقوای خوایان نەبێت، خێر و خۆشییان نامێنێت.[2]

(١) (زهرة البساتين ج٢/٣٨٢-٣٨٣)
(٢) (من روائع أقوال الصالحين: ج١/٣٨)

## ڕۆژی شــادییە نەوەك گـریان

کاتێـك گەنـجینەکەی کیســرا دەهێنن بـۆ عـومەری کـوڕی خەطـاب، عەبـدوڵڵای کوڕی ئـەلئـەرقەم دەڵێت: ئـایا نایخــەیتە بەیتولماڵ، تا بەشـــی دەکەیت؟ عـومــەر دەڵێت: لە ژێـر سـێبەری ســەقـفێکدا دایـنانێم، هـەتا بەڕێی دەکەم.

ئیدی عـومەر (ﷺ) فـەرمان دەدات گەنـجینەکە بخرێـتە بــەردەم مــزگــەوت و ئــەو شــەوە پـاســەوانی بکـەن، کـە ڕۆژ دەبـێـتەوە، عـومــەر فــەرمــان دەدات و گەنـجینەکە دەر دەخەن، ســپی و ســووریکی وای تێدا دەبێت، کە چـاوانی بـــۆ دەدرەوشــێـتەوە، هــەر لـەوکاتەدا عومەر دەست دەکـات بە گـریان!

پێی دەڵێن: بـۆچی دەگـریـەیت؟! ئـەی ئـەمیری ئیمانداران.. ســوێند بــە خــودا ئـەمــە ڕۆژی شــوکـرە و ڕۆژی شـــادییە، نــەوەك گــریـــان ! عومــەری فــاروق دەڵێت: بـۆ ئــەوە دەگـریـەم.. چـونکە ئـەمـە هـەرگیز بــە قـەومــێك نـــەدراوە، دوژمنایـەتـی و ڕق و کـینـەی نـەخـســتبێـتە نێـوانـیانـــەوە.[1]

## گۆشـــت گران بـووە!

ئـەحمەدی کــوڕی ئــەبی حەواری دەڵێـت: ڕۆژێـکـیان وتــیان بــە ئیبــراهیمی کوڕی ئـەدهـەم: گــۆشــت گــران بــووە! ئیبـراهیم (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وتی: دەی خــۆتــان هـــەرزانـــی بـکـــەن.[2] واتە: مـــەی کـڕن تـا خواسـتی لەسـەر کەم دەبـێــتەوە و نرخەکەی دادەبەزێت.

## لەگـەر قیامـەت نەبـووایـە

پـیاوێـك جنـێو دەدات بـە عـومــەری کـوڕی عەبـدولعەزیز، عــومەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) پێی دەڵێت: ئەگەر ڕۆژی قـیامـەت نـەبـووایـە.. مـنیـش وەڵامم ئــەدایـتەوە.

(١) (الف قصة و قصة/١٨٠)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء: ج٢/٤٨٩)

## ته‌نیا نه‌زرێك

ئه‌بی عه‌مروی كوڕی عه‌لوان ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: ڕۆژێك بۆ پێداویستییه‌كم چوومه بازاڕی ڕه‌حبه.. جه‌نازه‌یه‌كم بینی، شوێنی كه‌وتم تا نوێژی له‌سه‌ر بكه‌م، له‌وێ له ناو خه‌ڵكه‌كه‌دا وه‌ستام تا دفن بكرێت. بێ مه‌به‌ست چاوم كه‌وته سه‌ر ئافره‌تێكی سفور و سور بووم له‌سه‌ر نه‌زه‌ر كردنه‌كه‌م.. دواتر گه‌ڕامه‌وه بۆ لای خودا و انا لله و انا الیه راجعون.. و.. أستغفر الله م وت، پاشان گه‌ڕامه‌وه بۆ ماڵ، خێزانه‌كه‌م پێی وتم: ئه‌ی گه‌وره‌م.. ئه‌وه چییه ده‌موچاوت ڕه‌ش بووه؟!! منیش خێرا ئاوێنه‌یه‌كم هێنا و سه‌یرم كرد، ده‌بینم ده‌موچاوم ڕه‌ش بووه..!! ئیدی پیاچوونه‌وه‌م بۆ نهێنییه‌كانم كرد، هه‌تا بزانم له كوێوه تووشی به‌ڵا هاتووم؟ بیری نه‌زه‌ری ئافره‌ته‌كه‌م كرده‌وه و ئه‌وه‌م به هۆكاره‌كه زانی، بۆیه ماوه‌ی چل ڕۆژ چوومه خه‌ڵوه‌ته‌وه.. أستغفر الله م ده‌كرد و داوای سڕینه‌وه‌ی گوناهه‌كه‌م و ئاكامه‌كه‌یم ده‌كرد له په‌روه‌ردگارم.

پاشان دڵم خه‌تووره‌ی كرد كه بچمه زیاره‌تی جونه‌یدی شێخم له به‌غداد، ڕۆشتم.. كاتێك گه‌شتمه حوجره‌كه‌ی، ته‌قولبابم كرد، جونه‌ید ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) هات و پێی وتم: وه‌ره ژووره ئه‌ی ئه‌با عه‌مرو.. تۆ له ڕه‌حبه گوناه ده‌كه‌یت و ئێمه له به‌غداد.. داوای لێخۆشبوونت بۆ ده‌كه‌ین.[1]

## دووكاری پێ ناكه‌ین

پیاوێك ده‌ڕوات بۆ ماڵی سه‌لمانی فارسی.. ده‌بینێت سه‌لمان خه‌ریكه خۆی هه‌ویر ده‌شێلێت، پیاوه‌كه پێی ده‌ڵێت: ئه‌وه چی ده‌كه‌یت؟! سه‌لمان (رضي الله عنه) ده‌ڵێت: خزمه‌تكاره‌كه‌مان نارد بۆ كارێك.. ئیدی پێمان ناخۆش بوو دوو كاری پێ بكه‌ین!![2]

(١) (صفة الصفوة/٤٦٦)
(٢) (صفة الصفوة/١٩٦)

## باوکی دڵسـۆز و غەمفۆر

ئـەو شـــەوە وادەی گـواســتنەوەی کچەکـەی بـــوو، بــۆ مـاڵی زاواکــەی.. عەبدوڵڵای کـوڕی جەعـفەر (رضي الله عنهما) وەك بـاوکـێکی دڵســـۆز کچـەکـەی بـانگ کــرد، چـەند ئـامـۆژگـاریـیەکی کـرد و پێی وت: ئـەی کچـەکـەم.. نـەکـەی غـیرە لـە پیاوەکـەت بکـەیت، چـونکە غـیرە کـلیلی جـودا بـــوونــەوە و تـەڵاقــە، وە نـەکـەیــت زۆر لـۆمــەی پیاوەکــەت بکــەیت، چـــونکە لـۆمـەکــردن ســـۆز و ئـەویـــن لە نــاو دەبــات، وە ئــەوەش بـزانـــە ئـــەی کچـەکـــەم.. ئـــــاو خـــۆشـــتریـن بــــۆنــە!![1]

## بردنی کـراسـێك و.. کوشـتنی کـوڕێك!

ســوپاکەی عەبدولمەلیکی کوڕی مـەروان، ڕووە و کـەعبەی پـیرۆز هــاتن.. بەڵام بــۆ حــەج.. نــا!!! بەڵکـو بـۆ ئـابلــۆقەدان و.. کوشـــتن و.. بــڕین و.. تاڵانکـاری، نــزیکەی شـــەش مـانــگ ئـابـڵۆقــەی مــەککەی پـیرۆزیـانــدا وپاشـــان چـوونە ناویەوە، چ چــوونـێك..!!

چــوون عەبدوڵڵای کوڕی زوبـەیـــریان شــەهید کـرد و بەوەشــەوە نەوەســتان، هـەتا جەســتەی ســـاردەوە بـــوویـــان لە خاچدا!!

حەججــاجی ســـــەقەفی کە ســەرکـــردەی ســـوپاکە بـــوو، بە هـــەموو ڕوویەکییەوە هـاتە خزمەتی دایکی عەبدوڵڵا ئـەســمای کچی ئـەبـوبەکـری صـدیقی (رضي الله عنهما) و پێی وت: دایکە..! عەبدولمەلیکی کـوڕی مــەروان ڕایســـپاردم کە چــاك بم بەرامبەرت، چ پێویســتییەکت هـەیە تا بـۆتی جێبەجێ بکەم؟

ئـەســما وتی: من دایکی تـۆ نیم..! دایکی ئـەو هـەڵـواســراوەم بەو بـەرزاییەوە، وە هـیچ پێویســتییەکیشـــم پێــتان نیـیە، بـــەڵام گــوێ بگــرە لە مـن، تـا بــۆت بگێـڕمــەوە.. لە پێغەمـبەری خــودام بیســـت (ﷺ) فـەرمــووی: لە ســــــەقیفدا درۆزنێـك و.. دڕندەیـەك، دەردەکەوێـت. درۆزنـەکەمان بینـی ودڕنـدەکەش، جـگە لە تـۆ وا نـازانم کەسێکی دیکە بێت!!!

کوڕی ئـەبی زیناد دەڵێت: کـراسـێــك لە کـراســـــەکانی رســـول الله (ﷺ) لە

(١) (أنيس المؤمنين/١١٦)

لای ئەسمای کچی ئەبوبەکر بوو، کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر شەهید کرا.. کراسە پیرۆزەکەش بەر تالان کەوت..!! ئەسما وتی: بردنی کراسەکەی رسول الله (ﷺ) سەختترە لە لام.. تا کوشتنی عەبدوڵڵای کوڕم. پاشان کراسەکە دۆزرایەوە و زانرا لای پیاوێکە لە ئەهلی شام، کاتێك داوای کراسەکەیان لێکردەوە وتی: نایدەمەوە.. هەتا ئەسما داوای لێخۆشبوونم بۆ نەکات. ئەسما وتی: چۆن داوای لێخۆشبوون بۆ بکوژی عەبدوڵلا بکەم؟! وتیان: دەی کراسەکە ناداتەوە. ئەسما وتی: پێی بڵێن با بێت. پیاوەکە کراسەکەی هێنا و عەبدوڵڵای کوڕی عوروەی لەگەڵدا بوو، ئەسما وتی: کراسەکە بدە بەعەبدوڵلا. پیاوەکەش کراسەکەی پێدا، ئەسما وتی: کراسەکەت وەرگرت.. ئەی عەبدوڵلا؟ عەبدوڵڵای کوڕی عوروە وتی: بەڵێ وەرمگرت. ئەسما وتی: خودا لێت خۆش بێت. ئەی بەندەی خودا. ئەسما مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی عوروە بوو.. نەوەك بکوژەکە.[1]

## نیوەی نرخەکەی بکە بەخێر

سولەیمانی کوڕی حەرب دەڵێت: ئەگەر سەیری جلوبەرگەکانی (شوعبە) ت بکردبا، عەبای سەرشان و کراس و پۆشاکەکانی هەمووی بایی دە درهەم نەدەبوون، وە کەسێکی زۆر خێرخواز بوو.

جارێکیان شوعبە (رحمه الله) سواری گوێدرێژەکەی دەبێت.. سولەیمانی کوڕی موغیرە دەیبینێت و گلە و گازندەی حاڵی خۆی دەکات، شوعبەش دەڵێت: وەڵڵاهی هیچ شتێك نابەم بێجگە لەم گوێدرێژە. پاشان لەسەر گوێدرێژەکە دادەبەزێت و دەیبەخشێت بە سولەیمان!

وە قیرادی ئەبو نوح دەڵێت: کراسێکم پۆشی بوو، شوعبە کە کراسەکەی بینی، پێی وتم: ئەو کراسەت بە چەند کڕیوە؟ وتم: بە هەشت درهەم. وتی: ئەی نە ئەبوو کراسێك بکڕیت بە چوار درهەم و چوار درهەمەکەی تریش بکەیتە خێر و بیدەیت بە برایەکت؟![2]

(١) (الف قصة وقصة/١٨)
(٢) (صفة الصفوة/٦٨٠_ ٦٨١)

## کچه شـــیرفرۆشـــه‌که

ئـه‌وه فاروقـه.. عومه‌ری کوڕی خه‌طاب (ﷺ) کاتێـك ته‌نها به‌گـوێگرتن له وته بـه‌نرخ و به بـه‌هـاکانی کچێکـی شـــیرفـرۆش، بـۆی ده‌رده‌که‌وێـت که ئــه‌و کـچه گه‌شـــتۆته پله‌ی ئیحسان له خـوداپه‌رسـتیدا، چونکه ئـه‌و کچه خـودا ده‌په‌رسـتێت و ده‌یبینێت، ئـه‌گـه‌ر نه‌یبینێت.. ئـه‌وا دڵنیایه که خـودا ئــه‌و ده‌بینێـت، هه‌ر بـــۆیه خێـرا بـڕیــار ده‌دات که بیخـــوازێ بـــۆ یه‌کێـــك له کوڕه‌کـانی، ئیـدی هـــه‌ژاری و بێکه‌سی کچه‌که هیچ گـرفتێکی بـۆ دروســـت نـه‌کـرد.

عومه‌ری فاروق.. بـۆ زانینی حاڵی مـیلله‌ته‌که‌ی، شـه‌وانه به‌نهێنـی ده‌گه‌ڕا و له هه‌ر کوێـیه‌ك هـــه‌ستی به‌گـرفتێـــك بکــردایه، ده‌ڕۆشـت و لێـی ده‌کـۆڵییه‌وه، شه‌وێــك که له‌گه‌ڵ (ئه‌سله‌م) دا بـوو، گوێبیستی وتووێـژی دایك و کچێك ده‌بێت.

دایك: هـه‌ســـته ئـاو بکه نـاو ئـه‌و شـــیره‌وه.

کچ: ئه‌ی دایه‌گیان، نازانی بڕیاری ئه‌میری باوه‌ڕداران له‌سه‌ر چی بـوو؟

دایك: ئـه‌و بـڕیـاره چی بـوو کچه‌که‌م؟

کچ: جاڕچـییه‌که‌ی عومه‌ر جـاڕیدا که ئـاو تێکه‌ڵی شـــیر نه‌که‌ن.

دایك: هـه‌ســـته کچـم ئــاو تێکه‌ڵـی شـــیره‌که بـکه، تــۆ له شــــوێنێکدایت نه عومه‌ر ده‌تبینێت، نه جاڕچـییه‌که‌ی.

کـچ: ئــه‌ی دایــه گیـان ئـه‌گــه‌ر عومـــه‌ر نامــابینێت، ئــه‌وا خــودای عـومـــه‌ر ده‌مانبینێت، وه‌ڵڵاهی کارێ ناکـه‌م که له‌نـاو کــۆڕ و کـۆمـه‌ڵدا گـوێـڕایه‌ڵی بـم و له چـۆڵـه‌وانیدا له فـه‌رمـانی ده‌رچم.

پاش بیـسـتنی ئـه‌م وتـووێـژه، ئیمامی عومه‌ر وتی به ئـه‌سـله‌م: مــاڵه‌که دیــاری بکه و شـــوێنه‌که بـزانـه. پاشـــان ده‌ســتی کـرده‌وه بـه گــه‌ڕان هــه‌تا بــه‌یانی، که ڕۆژبــوویــه‌وه ئـه‌ســله‌می نـــارد بـــۆ ئـــه‌وه‌ی هـــه‌واڵی دوو ئـافــره‌ته‌که‌ی بـــۆ بهێنێت، ئـه‌سـله‌م هـاتـه‌وه و وتی: دوو ئـافـره‌تـه‌کـه دایـك و کچـن، ئـافــره‌تـه‌کـه بێوه‌ژنـه و پیاویان له مــاڵـه‌وه نییه.

عومه‌ر که ئـه‌مه‌ی بیســت، کوڕه‌کانی بانگکـرد و پێی وتن: کامتان پێویســـتی به ژن هـه‌یه تا بـۆی بهێنم؟ خـۆ ئـه‌گـه‌ر باوکتان گــڕوتینێکی مایه بـۆ ئـافــره‌ت، ئـه‌وا نه‌مده‌هێڵا که‌ستان پێشـــم بکه‌ون.

عه‌بدوڵڵا وتی: من ژنـم هـه‌یـه.

عه‌بدولڕه‌حمان وتی: من ژنـم هـه‌یـه.

عاصم وتی: ئـه‌ی بـاوه گیان.. من ژنـم نییه، بـۆ منی بخـوازه.

عومه‌ر خـوازبێنی کچه‌که‌ی کـرد بـۆ عاصمی کـوڕی و هـاوســــه‌رگیرییان کــرد،

خـــوای گەورە کچێکـــی پێبەخشــــین، کچەکەشــــیان کچــێکی بـــوو، کچەزاکەشــــیان کـــوڕێکی بــــوو نــاوی عومـــەری کـــوڕی عەبـدولعەزیز بـــوو (رَحِمَهُ اللَّهُ) کە هـەندێـك لە زانـایـان بـە خـەلیفەی پێنجەمـی ڕاشــیدین نـاوی دەبـەن، دڵـە نـورینەکەی عومـەری کـوڕی خەطاب وەك هـەمیشـــە.. جـوانی بـۆچـوو و ڕاسـتی پێکا.[1]

## لە سـەرووو هەمـوو عەشـقێکەوە

عەبدولواحیـدی کـوڕی زەیــد (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەگێـڕێـــتەوە و دەڵێـت: چــوومــە نـاوچەی خەریبە.. لـەوێ گـەنجێکی ڕەش پـێسـتم بینـی، تـووشـــی گـەڕی بـــوو بــوو.. هەم چـاوانی کـوێـر بـوو هــەم لـەپێ کـەوتـبوو..! منداڵانیـش لـەو لاوە بـەردیـان تێدەگـرت و ڕوخسـاریـان خـوێـناوی کــرد بـــوو، دیـتـم لێوەکـانی دەجـووڵـێـنێــتەوە، ئیـدی لێـی نــزیك بـوومـــەوە، بیسـتم دەیــگوت: ئـــەی گــەورەم.. بـەڕاسـتی تـۆ دەزانیت، ئـەگـەر بـە مقەسـت گـۆشـتـم لـێ بکەیـتەوە و بـە مشــار ئـێسکەکانـم بـبڕیـتەوە.. بێجگە لــە خـۆشـەویـسـتیم بــۆت هیچــم زیــاد نـاکات..! دە ئـەی گـــەورەم.. چـیت پێ بـاشـــە وەهــام لێ بکە.[2]

## لێبـوردنی خـودایی

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: سەلمانی فارسی چـووە سـەردانی عـومەری کـوڕی خەطاب (ﷺ) عـومـەر شـانی دادابـووە سـەر بالیفێــك، بالیـفــەکەیدا بە سـەلمان، سـەلمان وتی: خـودا و پـێغـەمبەرەکـەی ڕاسـتیان فـەرمـووە.

عـومەر وتی: چـیت بـیـسـتووە بـۆمـان بـاس بکە ئـەی ئـەبا عەبدوڵلا.

ســـەلمان وتـی: چـوومـــە خـزمــەت رسـول الله (ﷺ) شـــانی دادابـــووە ســـەر بالیفێـك، بالیفەکەی دا بـە مـن و پاشــان فـەرمـووی: ئـەی ســـەلمان.. هــەر مـوسـوڵمانێـك بچێـتە ســـەردانی بــرا موسـوڵمانـەکەی.. ئــەویش وەك ڕێـزگــرتنێـك بالیفێکی بـۆ دانـا، ئـەوا خـودا لێی خـۆش دەبێت.[3]

(١) (الف قصة و قصة/٣٥٢-٣٥٣)
(٢) (حدائق الأولياء ج٨٢/١)
(٣) (حياة الصحابة ٣/ ١٧٢)

## لە کوچەکانی دنیادا میوانی غەمم!!

ئیبراهیمی کوڕی موسا دەڵێت: ڕۆژێك بوو لە ڕۆژانی جەژنی قوربان.. فەتحی کوڕی سەعیدی موسڵیم بینی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) بۆن و دوکەڵی گۆشتی برژاو ڕۆشتبوو بە سەریا.. خۆی کرد بەناو یەکێك لە کۆڵانەکاندا و گوێم لێبوو دەیگوت: نزیکەکان بە قوربانییەکانیان.. خۆیان نزیکتر دەکەنەوە و من بە تووڵکێشانی غەمم لێت نزیك دەبمەوە!! ئەی خۆشەویستم.. تاکەی لە کوچەکانی دنیادا میوانی غەمی دیدارت بم؟!!

ئیدی بینیم بێ هۆش کەوت..!! پاشان دوای سێ ڕۆژ بە یەکجاری گەڕایەوە بۆ لای خۆشەویستەکەی و بە خاکمان سپارد!![1]

✍... جەژنی قوربانە قوربان، خولیای من ویساڵی تۆیە

بێ لە گریان نیمە بۆ ژین، پێکەنینم درۆیە

غەم جەم لە دڵ، چڵ بە بێ گوڵ، چاوانم پڕ لە ئەسرین

خەزانی عومرم هات و گوڵزارم بێ ڕەنگ و بۆیە

## ئامۆژگارییەکی باشت کرا!!

ئەبوسولەیمان دەڵێت: ڕەبیعی کوڕی خوسەیم ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) لەبەر دەرگای ماڵەکەیدا دانیشتبوو.. لەپڕ بەردێك هات کێشای بە ڕوخساریدا و بریندار کرد، ڕەبیع بە خۆیی وت: ئامۆژگارییەکی باش کرایت ئەی ڕەبیع..!

ئیتر هەستا ڕۆشتە ژوورێ و دەرگاکەی داخست، دواتر هەتا مرد نەبینرا لەبەر دەرگا دابنیشێت.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٧٩٦)

(٢) (صفة الصفوة/٥٤٦)



## لەوەی وا دەزانێت باشترینە

پرسیار دەکەن لە حەسەنی بەسری (رَحِمَهُ ٱللَّهُ): خراپترینی ناو خەڵکان کێیە؟! حەسەن دەڵێت: ئەو کەسەی کە خۆی بە باشترین دەزانێت.. ئەوە خراپترینی ناو خەڵکە.

## لابردنی پووشێک

موحەممەدی کوڕی مەنسور دەڵێت: باوکم وتی: لە دانیشتنێکی ئیمام بوخاری موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلدا بووین (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) پیاوێك.. پووشێك بە ڕیشییەوە بوو لایبرد و فڕێی دایە سەر زەوی مزگەوتەکە، دواتر بینیم موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل جارێك سەیری پووشەکەی دەکرد و.. جارێك سەیری خەڵکەکە، لە دەرفەتێکدا کە خەڵکەکە بێ ئاگا بوون، دەستی برد پووشەکەی هەڵگرت و خستییە ناو قوڵی پۆشاکەکەی، ئەو وەختەی کە لە مزگەوت چووە دەرێ، بینیم پووشەکەی دەرهێنا و فڕێی دایە سەر زەوی..!![1]

## درەختی زەققوم

پیاوێك خواردن دەهێنێت و دەیخاتە بەردەم ڕیاحی قەیسی، ئەویش کەمێکی لێدەخوات و دەستی لێ هەڵدەگرێت، پیاوەکە پێی دەڵێت: دەبینم تێرت نەخواردووە، بۆچی زیاتر ناخۆیت؟!

ئیدی ڕیاح (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێت: چۆن بتوانم تێر بخۆم لەم ڕۆژگارەی دنیادا؟! ! کاتێك ترسی ئەوەم هەبێت سبەینێ لە دۆزەخدا درەختی زەققومم دەرخوارد بدرێت!

ئیتر پیاوەکە خواردنەکە هەڵدەگرێت و دەڵێت: تۆ لە کوێیت و ئێمە لە کوێین؟! !

---

(١) (صفة الصفوة/٧٨٧)



## تەوافێك بە خۆخشاندن!

ئیبراهیمی خەواص (رحمه الله) دەڵێت: بێجگە لە جادەی فەرمی، لە شازدە ڕێگەوە بیابانم گرتە بەر، سەرسوڕهێنەرترین شتێك كە دیم، پیاوێك بوو، هەر دوو دەست و هەر دوو قاچی نەبوو، تووشی نارەحەتییەكی گەورە بوو بوو، بە خۆخشاندن ڕێی دەبڕی، تووشی شۆكی كردم! لێی نزیك بوومەوە و سەلامم لێكرد، پێی وتم: وە عەلەیكە سەلام.. ئەی ئیبراهیم.

وتم: بە چیدا ناسیمت، كە تۆ پێشتر منت نەدیوە؟! وتی: ئەوەی تۆی هێنا بۆ ئێرە.. هەر ئەوە نێوان من و تۆی ئاشكرا كرد. وتم: ڕاستت وت، دەتەوێ بۆ كوێ بچیت؟ وتی: بۆ مەككە. وتم: خەڵكی كوێی؟ وتی: بوخارا.

ئیدی ماوەیەك بە سەرسوڕمانەوە سەیرم كرد..!! ئەویش نارەزایانە سەیرێكی كردم و وتی: ئەی ئیبراهیم.. سەرت لە خاوەنی هێز سوڕدەمێنێ، كە بێ هێزێك هەڵدەگرێت و بەزەیی پیا دێتەوە؟!

پاشان فرمێسك بە چاوانیدا هاتە خوار، منیش پێم وت: نا.. ئەی خۆشەویستم. ئیتر بەو حاڵەی خۆیەوە جێم هێشت و تێپەڕیم، كاتێك گەشتمە مەككە، دەبینم پیاوەكە لەوێیە و بەخۆخشاندن خەریكی تەوافكردنە بە دەووری حەرەمدا..!!![1]

## ڕازی تەنیایی

دەڵێن بە عامری كوڕی عەبد قەیس (رحمه الله): ئایا تۆ لە نوێژەكانتا هەڵە ناكەیت؟ عامر دەڵێت: بۆچی هیچ شتێك هەیە لە قورئان خۆشەویستر بێت لە لای من؟! تا هەڵەی تیا بكەم، هەیهات!! ڕاز و نیازی خۆشەویستەكەم هەموو هەستەكانم داگیر دەكات.[2]

(١) (صفة الصفوة/٧٨٧)
(٢) (الجزاء من جنس العمل: ١/٤٩٠)



## کەم بڵێ: بۆ دیار نیت؟!

عەبدوڵڵای کوڕی مەســعود (ﷺ) دەڵێـت: کە بـرایەکمان مـاوەیـەك دیــار نەئـەما، دەچـووینە لای، ئـەگـەر نەخـۆش بـــووایە.. چـوونـەکەمـان دەبـــوویـە عیـادەتی نەخــۆش و هــەواڵپرســـینی، ئـەگـــەر ســـەرگـــەرمی کارێـــك بـــووایە.. چـــوونـەکـەمـــان دەبـــوویە کۆمـــەك و هـــاوکاری کـــردنی، ئـەگـــەر ئـەوانـــەش نـەبـــووایە.. چـــوونـەکەمـان دەبـــوویە ســـەردانی بـراکەمـان.[1]

## بۆ نەوەکانی ئادەم دەگریەم

یـەکێــك لـــە پیاوچـــاکەکان، ڕۆژێـــك پیاوێـــك دەبـــینێت خەریـکە بە ســـەر ئـاگـرەوە گـۆشـت دەبـرژێـنێت.. ئیدی خـۆی پێ نـاگیرێت و دەســـت دەکـات بە گــریـــان..!! پیـاوەکە پێـی دەڵێـت: ئـــەوە بـــۆ دەگـریـــەیت؟ ئـایا پێویســـتت بە گـۆشـــتە؟ پیاوچاکەکە دەڵێت: نـا بـۆ گـۆشـت نـاگـریـــەم. پیـاوەکە دەڵێـت: ئـــەدی بـۆچـی دەگـریەیـت؟

پیاوچـاکەکە دەڵێـت: بـــۆ نـــەوەکانی ئـــادەم دەگـریـــەم.. حـەیــوانـــەکان بـــە مـردوویی دەخـرێـنە ســـــەر ئـاگـر و دەیــان بـــرژێـــنن، بـــەڵام نـــەوەکانی ئـــادەم ســـبەی بـە زیندوویی دەخـرێـنە نـاو ئـــاگـرەوە.[2]

## ڕەحمەت نەوەك زەحمەت

ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (رحمه الله) دەڵێت: چ ســـوودێکـت پێدەگـــات ئــەگـەر بـــراکـەت.. بـــەهـۆی تـــۆوە خـوای گـــەورە ســـزای بـــدات؟!! دەی هـــەر ئـێـستا.. بە دڵێکی پــاکەوە لە هـەڵـەی بـــراکـانـت بـــبورە، نـــزای لێخـۆشـــبوونیان بـــۆ بکە و گـــەردنـیان ئـــــازاد بکـە.

---

(١) (الف قصة و قصة/٢٠٧)
(٢) (أنيس المؤمنين/١٠٦)



## بە کردە باشەکانتەوە دەنازیت؟! !

ئەبوبەکری کوڕی شازان دەڵێت: گوێم لێ بوو، عەبدولعەزیزی مەقدسی (رَحِمَهُ اللَّهُ) (کە یەکێك بوو لە ئەبدالەکان) دەیوت: کاتێك تەمەنم گەشتە ساتەوەختی باڵغبوون، نەفسم گرت.. تا ڕایبهێنم و تاوان و خراپەی لێ قەدەغە بکەم، وە داوام لە خودا کرد کە سەرکەوتووم بکات و سەرکەوتووی کردم، وە پشتم بە خوا بەست و خوا یارمەتیدەرم بوو، وە لێپرسینەوەی نەفسی خۆمم کردووە، تا بە ئەمڕۆ هەڵە و گوناهەکانم ئەوەی خۆم پێی بزانم.. لە سی و شەش هەڵە تێناپەڕن!! بۆ هەر هەڵەیەکم.. سەد هەزار جار (أستغفر الله) م کردووە، وە بۆ هەر هەڵەیەکم هەزار ڕکات نوێژم کردووە!! لەهەر ڕکاتێکیادا خەتمێکی قورئانم کردووە!! لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا من هێشتا دڵنیا نیم لە دەسەڵاتی پەروەردگارم کە لێمی وەربگرێت..!! وە من ئێستا لەترسی قەبوڵ بوون یان قەبووڵ نەبوونی تەوبەکەمدام!![1]

عومەری فاروق (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەڵێت: ئەگەر بڵێن: تەنیا یەك کەس ماوە بخرێتە دۆزەخەوە، دەترسم ئەو کەسە من بم! وە ئەگەر بڵێن: تەنیا یەك کەس ماوە بچێتە بەهەشتەوە، ئومێدەکەم ئەو کەسە من بم.

## خەوتن لە غەزادا!

شەقیقی بەڵخی (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێت: لە غەزایەکدا بووین.. شەو و ڕۆژمان پڕ لە ترس بوو، پیاوێکمان بینی خەوتبوو!! بێدارمان کردەوە و پێمان وت: ئا لەم کات و شوێنە ترسناکەدا و نووستن؟!! پیاوەکە سەری بەرز کردەوە و وتی: شەرم دەکەم لەوەی پەروەردگارم بزانێت.. کە من بێجگە لە خودا خۆی، لە شتێکی دیکە دەترسم. پاشان سەری نایەوە و خەوت.[2]

(١) (صفة الصفوة/٨٢٨)
(٢) (الأولياء/٣٤)



## تۆ شایسـته‌تری بۆ خه‌لافه‌ت

شـه‌وێکی زۆر سـارد و تاریك بـوو..!! ئـه‌میری ئیمانداران عومـه‌ری کوڕی خه‌طاب له‌گه‌ڵ عه‌بدولڕه‌حمانی کوڕی عه‌وفدا بـوو (ﷺ) عـومـه‌ر ئـاگـرێکی به‌دی کـرد، لـه‌گـه‌ڵ هـاوه‌ڵـه‌که‌یدا ڕۆشـت بـۆ ئـه‌وه‌ی بـزانـێت ئـه‌و ئـاگـره چییه؟ بینی ئـافـره‌تێـك له بـه‌رده‌م ئـاگـره‌که‌دایـه و سـێ منداڵیـش بـه ده‌وری ئـاگـره‌که‌دا ده‌گـرین و.. هـه‌ر یـه‌کـه‌یـان بـه جـۆرێـك دایکی ئـه‌دوێنێ:

دایـه به‌زه‌ییت به ئـه‌شـکی چـاواندا بێته‌وه..!!

دایـه خه‌ریکه له‌بـرسـان ده‌مـرم..!

دایـه به‌ر له‌وه‌ی بمرم پـارووه نانێك نییه بیخـۆم؟!

عومه‌ر له به‌رده‌م ئـاگره‌که‌دا دانیشـت و وتـی: ئـه‌ی ئـافـره‌ت.. نـاڕه‌حه‌تیت چییه؟! ئـافـره‌ته‌که به توانـجێکه‌وه، وتی: الله.. الله.. له عومـه‌ر..! عومه‌ر وتـی: ده‌ی عـومه‌ر چـۆن بـه حاڵتـان بزانـێت؟! ! ئـافـره‌ته‌که وتـی: ده‌بـێته ئـه‌میـرمان و.. لێیشـمان غـافـڵ ده‌بێت؟!

ئیـدی عـومه‌ر به خێرایـی گه‌ڕایـه‌وه و ڕۆشـت بـۆ به‌یتولمـاڵ و ده‌رگـاکه‌ی کـرده‌وه، پـاسـه‌وانـه‌کـه وتی: خـێـره ئـه‌ی ئـه‌میری ئیمانداران؟

عومه‌ر وه‌ڵامی نه‌دایه‌وه، کیسـێکی پـڕ له ئـارد و قـاپێك زه‌یـت و قـاپێکی تـر هـه‌نگـوینی هێنـا و وتـی به پاسـه‌وانه‌که: بیـده به کـۆڵمدا. پاسـه‌وانه‌که ویسـتی بیدا به کۆڵی خـۆیدا، به‌ڵام عومه‌ر نه‌یهێڵا و پێـی وت: دایکـت ڕۆڵـه ڕۆت بـۆ بکات، ئـایا تـۆ لـه ڕۆژی په‌سـلاندا گـوناهـه‌کانی مـن هـه‌ڵده‌گـریت؟! پاشـان خـۆی کـۆڵه‌که‌ی هـه‌ڵگـرت و کاتێـك گـه‌شـته‌وه لای ئـافـره‌ت و منـداڵه‌کان، له به‌رده‌م ئـاگـره‌که‌دا دانیشـت، خـۆی ده‌سـتی کـرد به ئـاماده‌کـردنی خـواردنه‌که، پاشـان که خـواردنه‌که‌ی ئـاماده کـرد.. به ده‌سـته پاکه‌کانی خـۆی خـواردنی دا به منداڵه‌کان، دایکی منداڵه هـه‌تیوه‌کانیش ته‌ماشـای ده‌کـرد و ده‌یگـوت: وه‌ڵلاهـی تـۆ شـایسـته‌ی خـه‌لافـه‌تی.. نـه‌وه‌ك عـومـه‌ر!

عومه‌ر وتی: ئـه‌ی ئـافـره‌ت به‌یانی وه‌ره بـۆ لای عـومه‌ر، مـن له‌وێ ده‌بـم و له بـاره‌ی تـۆوه قسـانی بـۆ ده‌که‌م. پاشـان ڕۆشـت و له پشـت بـه‌ردێکه‌وه دانیشـت و سـه‌یری منـداڵه‌کانی ده‌کـرد، عه‌بـدولڕه‌حمان، پێـی وت: ده‌ی بـا بـڕۆین شـه‌وه‌که‌ی زۆر سـارده..!! عومه‌ر وتـی: وه‌ڵلاهـی ئـێره جـێناهێڵم، هـه‌تا منداڵـه‌کان پێده‌که‌نن، وه‌ك چـۆن ده‌گـریان کاتێـك هـاتـم.

به‌یانی ئـافـره‌ته‌که هـاته خـانه‌ی خه‌لافـه‌ت، بـینی پـیاوێـك له نێـوان عه‌لـی و ئیبن مه‌سـعود دا (ﷺ) دانیشـتووه و هـه‌ردووکـیان پێـی ده‌ڵـێن: ئـه‌میری

باوەڕداران، وە ئەو پیاوە. هەمان ئەو پیاوەیە کە دوێنێ شەو بە توانجێکەوە پێی وت: الله.. الله.. لە عومەر..!! بۆیە ئافرەتەکە تووشی ترس و لەرزێك بوو، عومەر وتی: گوێ مەدەیە ئەی ئافرەت. پێم بڵێ بە چەند ئەو زوڵم لێکردنەت دەفرۆشیت؟ ئافرەتەکە وتی: ببەخشە ئەی ئەمیری باوەڕداران. وتی: سوێند بە خودا.. ناڕۆیت، هەتا زوڵم لێکردنەکەتم پێدەفرۆشیت.

لە کۆتاییدا عومەر بێ ئاگابوونەکەی لە گوزەرانی ئافرەتەکە کڕی بە شەش سەد درهەم لە پارەی تایبەتی خۆی نەك هی بەیتولماڵ، وە فەرمانی کرد عەلی وەرەقە و قەڵەمێکی هێنا و نووسی: ئێمە (عەلی و ئیبن مەسعود) شایەتی دەدەین کە فلان ئافرەت زوڵم لێکردنەکەی فرۆشت بە عومەری کوڕی خەطابی ئەمیری باوەڕداران. پاشان عومەر وتی: ئەگەر مردم ئەم نوسراوە بخەنە ناو کفنەکەمەوە تا بە لیقای پەروەردگارم دەگەم.[1]

## بوەستە.. کارەکە خراپ مەکە

تاریقی کوڕی شیهاب دەڵێت: قسەگەلێك کەوتە نێوان سەعد و خالد ( رضي الله عنهما ) پیاوێك ڕۆشتە لای سەعد و قسەی بە خالد وت.. سەعدیش بە پیاوەکەی وت: بوەستە..!! کارەکە خراپ مەکە، ئەوەی لە نێوان خالد و مندایە، نە گەشتۆتە دینەکەمان![2]

## دراوسێی چاك

حەسەنی بەسری ( رحمه الله ) دەڵێت: دراوسێی چاك کەسێك نییە کە ئازاری بۆ دراوسێکانی نەبێت..!! بەڵکو دراوسێی چاك ئەو کەسەیە کە تەحەمولی ئازاری دراوسێکانی دەکات.

---

(١) (أنيس المؤمنين/٣١-٣٢)
(٢) (حياة الصحابة ١٤١/٣)



## كوانێ دڵم؟! ! دڵم كوانێ؟! !

یه‌كێك له هاوه‌ڵه‌كانی زینونی میسری ( رَحِمَهُ ٱللَّهُ ) به كۆڵانه‌كاندا ده‌ور ئه‌دات و بانگ ده‌كات: كوانێ دڵم؟!! كوانێ دڵم؟!! كێ دڵمی دۆزیوه‌ته‌وه؟!!
جارێكیان منداڵێك ده‌بینێت، ده‌گریه‌ت و دایكی لێی ئه‌دا، پاشان دایكه‌كه منداڵه‌كه‌ی ده‌كاته ده‌رێ و ده‌رگاكه‌ی به ڕوودا كڵۆم ده‌دات، منداڵه‌كه سه‌یری ڕاست و چه‌پی خۆی ده‌كات و نازانێت بۆ كوێ بڕوات و ڕوو له كوێ بنێت؟! بۆیه ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ به‌رده‌م ماڵ و له به‌ر ده‌رگاكه‌دا سه‌ری داده‌نێت و خه‌وی لێ ده‌كه‌وێت، كاتێك خه‌به‌ری ده‌بێته‌وه ده‌ست ده‌كات به‌گریان و ده‌ڵێت: ئه‌ی دایه گیان، ئه‌گه‌ر ده‌رگای تۆم له‌سه‌ر دابخرێت، ئیدی كێ ده‌رگام به ڕوودا بكاته‌وه؟! ئه‌گه‌ر تۆ ده‌رم بكه‌یت.. ئیدی كێ نزیكم بكاته‌وه له خۆی؟! وه ئه‌گه‌ر تۆ لێم زویر ببیت، ئیدی كێ بمگرێته خۆ؟!
كه دایكه‌كه گوێی له‌م قسانه ده‌بێت، به‌زه‌یی پیادا دێته‌وه و هه‌ڵده‌ستێت له درزی ده‌رگاكه‌وه سه‌یری ده‌كات.. ده‌بینێت كوڕه‌كه‌ی فرمێسك به‌سه‌ر گۆنایدا دێته خوارێ و خۆڵه‌كه ته‌ڕ ده‌كات.. ئیدی ده‌رگای لێ ده‌كاته‌وه، له ئامێزی ده‌گرێت و ماچی ده‌كات و پێی ده‌ڵێت: ئه‌ی ڕووناكی چاوان و ئازیزی گیانم، تۆ خۆت كارێكت كرد كه لێت زویر ببم و ئه‌مه‌ت به‌سه‌ردا بێت، خۆ ئه‌گه‌ر گوێڕایه‌ڵم بوویتایه، ئه‌وا له منه‌وه هیچ ناخۆشییه‌كت نه‌ئه‌بینی.
ئیتر هاوه‌ڵه‌كه‌ی زیننون دڵی بۆ ده‌دۆزرێته‌وه، پاشان هاوار ده‌كات و ده‌ڵێت: دڵم دۆزییه‌وه.. دڵم دۆزییه‌وه.[1]

## كێ زانایه؟!

سوفیانی كوڕی عویه‌ینه ( رَحِمَهُ ٱللَّهُ ) ده‌ڵێت: زانا ئه‌و كه‌سه نییه كه بزانێت كامه باشه و كامه خراپه! به‌ڵكو زانا ئه‌و كه‌سه‌یه كه بزانێت كامه باشه و شوێنی بكه‌وێت، وه بزانێت كامه خراپه و خۆی لێ دوور بگرێت.[2]

(١) (موسوعة اسماء الله الحسنى٧٨/٣)
(٢) (حياة السلف/٦٥)

## دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات!

عەقیلی کوڕی ئەبوطالب.. هاتە لای عەلی کوڕی ئەبوطالبی برای و پێی وت: ئەی عەلی تۆ تازە بوویتە ئەمیری باوەڕداران، ئەمەوێ هەندێ پارەم بدەیتێ!! ئیمامی عەلی (ﷺ) پێی وت: ئەی عەقیل.. بڕۆ کە ئێوارە داهات، ئەنجا بگەڕێوە..!! دنیا تاریك داهات.. ئیمامی عەلی هەندێ ئاسنی لە ناو ئاگردا داغکرد..!! عەقیل هات وتی: ئەی عەلی پارەکەت ئامادە کرد؟

ئیمامی عەلی ئاسنە داغکراوەکانی خستە ناو تورەکەیەکی ناسکەوە و پێی وت: هانێ ئەو تورەکە بگرە!! عەقیل دەستی هێنا و.. تورەکەکەی گرت، ئیدی دەستی سوتا و بێ هۆش کەوتە سەر زەوی..!! کاتێك هاتەوە هۆش خۆی ئیمامی عەلی پێی وت: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئەی عەقیل..!! ئەگەر حاڵت ئاوایە بۆ ئاگری دنیا، ئەی ئەبێت حاڵی من و تۆ چۆن بێت لە ڕۆژی دوایی؟! ! کاتێك پێکەوە کۆت و زنجیری ئاسنمان لێ دەبەستن و دەمانبەن بۆ ناو ئاگر؟!! ئەی عەقیل هەر کەس خیانەت لە موسوڵمانان بکات، بە درهەمێك یان دینارێك.. ڕۆژی دوایی لە سەر ئاگر پردێکی بۆ دادەنرێ، لەسەری دەوەستێت و پردەکە لە ژێر پێیەکانیدا دەڕمێت و حەفتا پاییز فڕێ دەدرێتە ناو قوڵایی ئاگرەوە.[1]

## داوەتییەك بۆ ڕیا!

ئیبن موحەیریز دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) داوەت کرا بۆ نانخواردنێك، دوای نانخواردن و هاتنە دەرەوە، وتی: پێم خۆش بوو ئامادەی ئەم داوەتییە نەبوومایە! پێیان وت: بۆچی ئەی ئەمیری ئیمانداران؟! عومەر وتی: چونکە وا هەستم کرد کە ئەم هاوەڵەتان، تەنها بۆ ڕیا و خۆدەرخستن ئەم داوەتییەی کردووە.[2]

(١) (أنيس المؤمنين/٤٧)
(٢) (حياة السلف/٢٢٦)

## تەڵە ڕێحانێکی تەڕ و بۆنخۆش

ڕۆژێــك كەنیزەكێکــی حوســـەینی کــوڕی عەلــی (عليه السلام) بە چەنــد تــەڵە ڕێحـانێكەوە ڕۆشـــتە ژوورەوە و وتـی: گـــەورەم ئـــەم ڕێحـانــە تــەڕ و بـــۆن خـۆشـــە بــۆ تــۆیـە. حوسـەین (ڕێحانــە بـۆنخـۆشـەکـەی پێغەمبەر (ﷺ)) پێی وت: بـڕۆ تـۆ ئـازادیـت! ئـەوانـەی کە لە خـزمـەتـیدا دانیشـتبوون، وتیـان: ئـــەی کــوڕی رســـول الله (ﷺ) لـەبـــەر خـــاتــری چـــەند تـەڵـــە ڕێحانێـــك ئـــازادی دەكــەیت؟! حوســەین وتی: خـوای گــەورە دەفـەرمووێ:

﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا﴾[1]

واتە: هـەر كـاتێـك ســـەلامێکــتان لێکـرا، ئـەوە بــە چـاكـتر لەو ســەلامــە، ســـەلام بـکەن.[2] منیش شـــتێکم نە دۆزیـیەوە لەو ڕێحـانە باشــــتر بێـت.. ئـازاد بـــوونی خـودی كەنیزەكەكە نـەبێت.[3]

## قامچییەك بۆ خۆم!

عوسـمانی کوڕی ئـەبی عاتیکە دەڵێت: ئەبـو مـوسـلیمی خــەولانی (رحمه الله) لــە مـزگــەوت قـامچیــیەکی هـەڵـواسیبــوو و دەیـوت: بــۆ ئــەم قــامچییە، مــن لەبـەرتـرم هەتـا ئـاژەڵان!!

ئیتر هــەر کاتێـك کەمتەرخەمی بکـردایـە لە خـواپەرسـتیدا، خێرا قـامچییەك یـان دوو قـــامچی دەكێشـــا بـــە قـاچـــیدا!! وە دەیـــوت: ئەگـــەر بـــە ئـاشكـــرا بـەهـەشـت یان دۆزەخ ببینم، ئـەوا نـاتـوانـم لـەمـە زیـاتـر هیچ بــۆ كـردەوەكـانـم زیـاد بکـەم.[4]

---

(١) (النسـاء/٨٦)
(٢) (پـوختەی تەفـسیری قـورئـان/٩١)
(٣) (أنیس المؤمنین/١٢٣)
(٤) (سـیر اعلام النبلاء ٤ /٩)



## بڕۆ به‌ده‌م کاری خۆته‌وه

ڕۆژێك داوودی طائی (رحمه الله) ڕۆشته بازاڕ.. خورمای جوان و ڕه‌سیوی بینی و نه‌فسی ئاره‌زووی کرد..!! چووه لای فرۆشیاره‌که و پێی وت: بایی درهه‌مێك خورمام بده‌یه هه‌تا به‌یانی.

فرۆشیاره‌که وتی: بڕۆ به‌ده‌م کاری خۆته‌وه.

له‌ولاوه که‌سێك که داوودی ده‌ناسی ئاگای له‌م باسه بوو، هاته لای فرۆشیاره‌که.. کیسه‌یه‌کی خسته ده‌ستی که سه‌د درهه‌می تێدا بوو، دواتر پێی وت: بچۆ به‌شوێن ئه‌و پیاوه‌دا.. ئه‌گه‌ر بایی درهه‌مێك خورمای برد، ئه‌وه سه‌د درهه‌مه‌که هه‌ڵگره بۆ خۆت.

فرۆشیاره‌که که‌وته شوێنی و پێی وت: بگه‌ڕێوه.. بایی درهه‌مه‌که خورما ببه!! داوود وتی: پێویستم پێی نییه، ئه‌وه ته‌نها ویستم نه‌فسی خۆم تاقی بکه‌مه‌وه، بینیم نه‌فسم نرخی یه‌ك درهه‌می نییه له‌م دنیایه‌دا، که‌چی سبه‌ینێ داوای به‌هه‌شت ده‌کات..!![1]

## جوانترین بیانوو بۆ براکه‌ت

ڕۆژێك ته‌ڵحه‌ی کوڕی عه‌بدولڕه‌حمانی کوڕی عه‌وف، ژنه‌که‌ی پێی ده‌ڵێت: که‌سم نه‌دیوه له براکانت سپڵه‌تر بێت!!

ته‌ڵحه (رحمه الله) پێی ده‌ڵێت: بوه‌سته بزانم.. بۆچی وا ده‌ڵێیت؟! ژنه‌که‌ی ده‌ڵێت: چونکه ده‌بینم کاتێك تۆ وه‌زعت زۆرباشه.. ئه‌وان زوو زوو دێنه سه‌ردانت، به‌ڵام ئه‌و کاتانه‌ی وه‌زعمان خراپه.. لێت دوور ده‌که‌ونه‌وه و واز له سه‌ردان کردنت ده‌هێنن!!

ته‌ڵحه ده‌ڵێت: وه‌ڵلاهی.. ئه‌وه له ڕه‌وشته جوانه‌کانیانه، ئه‌وان کاتێك دێنه سه‌ردانمان که ئێمه بتوانین میوانداریان بکه‌ین، وه کاتێك ئه‌و توانایه‌مان نییه، ئه‌وان نایه‌ن.. بۆ ئه‌وه‌ی بارگرانی نه‌خه‌نه سه‌رشانمان.[2]

---

(١) (طبقات الأولياء/٢٠٢)

(٢) (رفقاء طريق/٤١ـ ٤٢)



## مامۆستای فێر

بەر لە تۆبەکردن و گەڕانەوەی، خەریکی دزی و ڕێگە بڕین بوو لە خەڵکی..!! فوزەیلی کوڕی عەیاز (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) شەوێك بۆ دزی ڕۆشتە ماڵێك.. کاتێك لە پەیژەی ماڵەکەوە دەهاتە خوارێ، گوێی لێ بوو خاوەن ماڵەکە قورئانی دەخوێند، فوزەیلیش گوێی گرت:

﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ﴾[1]

واتە: ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران، کە دڵیان مل کەچ بێت بۆ یادی خودا و ئەو قورئانەی کە ناردوویەتییە خوارەوە؟![2] ئیدی سەدای خوێندەنەوەی قورئانەکە هات و، لە ڕێگای گوێیەوە گەشتە ماڵی دڵی فوزەیل.. ئیتر پێیەکانی داکوتا بە پەیژەکەدا و، ڕووی کردە پەروەردگار و وتی: ئەی پەروەردگارم، تۆ بە شاهێد ئەگرم، کەوا ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە دڵم مل کەچی یادی تۆ بێت..!! ئیدی هەر ئەم پیاوە بوویە یەکێك لە پێشەنگەکانی خواناسان.[3]

وە کاتێك فوزەیل ئامۆژگاری خەڵکانی ئەکرد، عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك.. نێو چاوانی ماچ دەکرد و دەیوت: ئەی مامۆستای خێر. کێ ئەمە بە باشی ئەنجام ئەدات بێجگە لە تۆ؟!!

فوزەیل دەڵێت: ئەگەر پیاو نزیك ببێتەوە لە لاشەیەکی گەنیو و بۆگەن، باشترە بۆی لەوەی نزیك ببێتەوە لە سوڵتانەکان..!!

هەروەها دەڵێت: پیاوێك تێکەڵی سوڵتانەکان نەکات و بێجگە لە فەرزەکان هیچ خێرێکی زیادەی نەبێت، لای ئێمە باشترە لە پیاوێك کە تێکەڵی سوڵتان بکات و بێجگە لە فەرزەکان، شەوەکەی شەونوێژ بکات و.. ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بێت و.. حەج و عومرە بکات و.. لە پێناوی خوادا جیهاد بکات..!!

---

(١) (الحديد/١٦)
(٢) (پوختەی تەفسیری قورئان/٥٣٩)
(٣) (أنيس المؤمنين/١٠٠)

## دەردێکی شـــاراوە

جونەیـدی بەغـدادی دەڵێـت: گــوێم لە ســیری ســـەقەتی بــوو ( رحمه الله ) دەیگـوت: مــاوەی ســی ســـاڵ دەردێکــم لــێ شــاردرایــەوە و پــێم نــەزانی..!! دەردەکەش ئـەوەبـوو کە ئێمە کۆمـەڵێـك بـووین زوو دەڕۆشـــتین بــۆ نـوێــژی هــەینی، هــەریـەکە و شـــوێنێکمان هــەبــوو کە چۆڵمان نـەدەکـرد و شـــوێـنـەکە بـە ئێمەوە دەناســرایــەوە!

ڕۆژێکـی هــەینی پــیاوێکی دراوســێمــان مـــرد.. منیــش پـێم خــۆش بــوو کە شـــوێن جەنـازەکەی بکەوم، ئیدی لە کاتی خـۆمم بـۆ ئـەو کارە بەخشـی و شـوێن جـەنـازەکـەی کـەوتـم، پـاشـــان هــاتمەوە بـــۆ نـوێــژی هــەینی، کـاتێــك نــزیك کەوتمەوە لە مــزگـەوت، نـەفســم پێـی وتــم: ئـێســـتا خــەڵکی دەتبیــنن کە لــە کـاتی خـۆتـت بـــۆ شـــتێکی دیـکە تـەرخـان کـــردووە و.. لە وادەی هـــاتنت بـــۆ مـزگەوت دوا کەوتـوویت..!! ئـەو قسـەی نەفســم زۆر ســەخت بــوو لە ســـەرم، بـۆیە منیش وتم بە نەفســی خــۆم: ئــەی نەفســەکەم..! دەتبینم مــاوەی ســی ســاڵـە تـۆ ڕیـاکـاریـت و مــن پێـت نــازانـم؟! ! ئـیتر ئـەو شـوێـنەم واز لـێ هێنــا کە هـەمــوو جـارێـك دەچـوومـە ئـەوێ و، لە شـــوێن گەلێکی جیـا جیـادا نـوێــژم دەکـرد، بـۆ ئـەوەی شـــوێنێـك بە مـنەوە نەنـاســرێــتەوە، یاخــود شـــتانێکی لەو بابـەتە ڕوو نـەدەن.[1]

## لە خوراسـانەوە بۆ شـام

حەسـەنی کـوڕی عـەرەفـە دەڵێت: عـەبدوڵڵای کـوڕی مـوبارەك ( رحمه الله ) پێـی وتــم: لــە وڵاتــی شـــام قـەڵـەمێکم وەرگـــرت و بـــیرم چـــوو بیدەمــەوە بــە خــاوەنــەکەی.. کـاتێــك گـەشـــتمەوە (مــەرو)[2]، ســـەیر دەکــەم هێشـــتا قـەڵـەمـەکـەم پێیە، ئیدی گـەڕامــەوە بـــۆ شــام و قـەڵـەمـــەکەم دایــەوە بــە خــاوەنـەکـەی..!![3]

---

(١) (تهذیب حلیة الأولیاء: ج٣/ ٢٩٠)
(٢) (مــەرو: شـــارێکە لە خـوراســان)
(٣) (التصنیف الموضوعی لتاریخ بغداد/٧١)



## بێدەنگ بە.. ئەوان وەڵامی دەدەنەوە

ئەبوهورەیرە دەڵێت: لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) بووین، پیاوێك قسەی وت بە ئەبوبەكر (رضي الله عنه) بەڵام ئەبوبەكر بێدەنگی هەڵبژارد، پێغەمبەر (ﷺ) كارەكەی بە دڵ بوو و زەردەخەنەی بۆ ئەكرد..! بەڵام كاتێك پیاوەكە درێژەی بە قسەوتنەكەی دا، ئەبوبەكر خۆی نەگرت و هەندێ لە قسەكانی پێ وتەوە، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) تووڕە بوو و هەستا ڕۆشت، ئەبوبەكریش شوێنی كەوت و عەرزی كرد: یا رسول الله (ﷺ) ئەو قسەی پێدەوتم و تەشریفت دانیشتبوو.. بەڵام كاتێك هەندێ لە قسەكانیم پێوتەوە، تووڕە بوویت و هەستایت؟!

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ فریشتەیەكت لەگەڵدا بوو، كە لە بری تۆ وەڵامی پیاوەكەی ئەدایەوە، بەڵام كاتێك هەندێ لە قسەكانیت پێوتەوە.. شەیتان كەوتە نێوانتانەوە، بۆ منیش نەبووە لەگەڵ شەیتان دانیشم، بۆیە هەستام.[1]

## مەرج بۆ خوا دامەنێ

ئیسرائیلی كوڕی یونس دەڵێت: كاتێك عەمروی كوڕی شورەحبیل خەرجییەكەی وەردەگرت، دەستی دەكرد بە بەخشینی، وەختێك دەگەشتەوە ماڵ، خاوخێزانەكەی پارەكەیان دەژمارد و دەیانبینی پارەكە وەك خۆی ماوەتەوە و كەمی نەكردووە..!! عەمرو (رحمه الله) بە برازاكانی دەوت: ئەی ناكرێ ئێوەش ئاوەها بكەن؟ ئەوانیش دەیانوت: ئەگەر بمانزانیبا پارەكە وەك خۆی دەمێنێتەوە و كەم ناكات، ئەوا ئێمەش لێمان دەبەخشی.

عەمرویش دەیوت: من مەرج بۆ پەروەردگارم دانانێم.[2]

(١) (حیاة الصحابة: ج ٣/١٤٠)
(٢) (سیر اعلام النبلاء ١٣٥/٤)



## گوێڕایه‌ڵی به‌.. بێدارت ده‌كاته‌وه‌

پیاوێك وتی به‌ ئیبراهیمی كوڕی ئه‌دهه‌م ( رحمه الله ): هه‌رچه‌ند ده‌كه‌م توانام نییه‌ شه‌وانه‌ هه‌ستم بۆ شه‌ونوێژ، به‌ڵكو ده‌رمانی ئه‌م ده‌رده‌م پێ بڵێیت..!! ئیبراهیم پێی وت: تۆ له‌ ڕۆژدا سه‌رپێچی فه‌رمانه‌كانی خودا مه‌كه‌، شه‌وانه‌ خودا خۆی بێدارت ده‌كاته‌وه‌ و له‌زه‌تی قیام و موناجاتت پێده‌به‌خشێت، چونكه‌ بێداری شه‌وانه‌ بۆ عیباده‌ت.. له‌ گه‌وره‌ترینی ڕێز و پایه‌ به‌رزییه‌كانه‌، بێ گومان كه‌سی سه‌رپێچیكاریش شایه‌نی ئه‌و ڕێزه‌ نییه‌.

وه‌ حه‌سه‌نی به‌سری ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: خه‌ڵكی به‌ هۆی گوناهه‌وه‌ توانای شه‌ونوێژیان نامێنێت، ده‌سا تۆ هه‌موو ڕۆژێك.. ده‌مه‌و مه‌غریب بیرێك له‌ خۆت بكه‌وه‌، بزانه‌ چ گوناهێكت كردووه‌، داوای لێ خۆشبوونی بۆ بكه‌ له‌ په‌روه‌ردگار، بۆ ئه‌وه‌ی شه‌ونوێژت به‌نسیب بكات.[1]

## با شه‌رمی داوا كردنت هه‌بێت

سالمی كوڕی عه‌بدوڵلا خه‌ریكی ته‌واف كردن بوو به‌ ده‌وری به‌یتا.. هیشامی كوڕی عه‌بدولمه‌لیكی خه‌لیفه‌ی ئه‌مه‌وییه‌كانیش هات، سالمی بینی و پێی وت: ئه‌ی سالم شتێكم لێ بخوازه‌، چیت ده‌وێ پێت ئه‌به‌خشم..!! سالم ( رحمه الله ) وتی: شه‌رم ده‌كه‌م له‌ ماڵی خوادا، داوا له‌ غه‌یری خوا بكه‌م.

دواتر كاتێك له‌ مسجد الحرام هاتنه‌ ده‌ر، هیشام وتی: تۆ له‌ ماڵی خوادا شه‌رمت كرد داوام لێ بكه‌یت، ئێستا له‌ ده‌ره‌وه‌ی مزگه‌وتین، چیت ئه‌وێ.. لێم بخوازه‌ تا بۆتی مسۆگه‌ر بكه‌م؟ سالم وتی: ئه‌ی هیشام.. ئه‌ته‌وێ له‌ كاروباری دنیاییت لێ بخوازم، یاخود له‌ كاروباری ئه‌و دنیا؟! هیشام وتی: به‌ڵكو له‌ كاروباری ئه‌م دنیایه‌، چونكه‌ من هیچ ده‌سه‌ڵاتی ئه‌و دنیام نییه‌. سالم پێی وت: ئینجا ئه‌گه‌ر من شه‌رم بكه‌م داوای دنیا بكه‌م له‌، الله‌.. كه‌ خاوه‌نیه‌تی، ئیتر چۆن له‌ تۆی داوابكه‌م كه‌ خاوه‌نی نیت؟![2]

---

(١) (صفقات رابحة/١٠١ ـ ١٠٢)
(٢) (أنيس المؤمنين/١٠٦)



## پێم خۆشبوو تەواوی بکەم

موحەممەدی کوڕی ئەبی حاتەمی وەڕاق دەڵێت: موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری ( رحمه الله ) داوەت کرا بۆ باخی یەکێك لە هاوەڵەکانی.. ئەو دەمەی کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات، بە جەماعەت نوێژی بۆ کردن، پاشان هەستا بۆ نوێژی سوننەت و زۆر لە نوێژەکەیدا مایەوە، کاتێك لە نوێژەکەی بوویەوە چمکی کراسەکەی بەرز کردەوە و وتی بە یەکێك لە ئامادەبووان: بزانە چ شتێکە لەژێر کراسەکەمدا ئازارم دەدات؟! پیاوەکە کە سەیری کرد، دەبینێت زەردەواڵەیەك لە شازدە یا حەڤدە شوێنەوە داویەتی بە ئیمام بوخارییەوە و جەستەی ئاوساوە.. وە شوێنی پێوەدانی زەردەواڵەکە بە ئاشکرا بە جەستەیەوە دیارە..!! پێیان وت: بۆچی هەر کە یەکەمجار زەردەواڵەکە پێوەیدایت، سەلامت نەدایەوە.. هەتا هێندە ئازارت نەدات؟! ئیمام بوخاری وتی: لە سورەتێکدا بووم پێم خۆشبوو کە تەواوی بکەم.[1]

## هاوڕێکانی باوکم

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ( رضي الله عنهما ) لە ڕێگەدا دەبێت بۆ مەککە.. پیاوێکی دەشتەکی دەبینێت، لەگەڵ کاروانەکەی خۆیدا سەری دەخات و عەمامەکەی سەری دادەگرێت و پێی دەبەخشێت.

هاوەڵەکانی پێی دەڵێن: ئەی ئیبن عومەر.. ئەوە پیاوێکی سادەی دەشتەکییە، هەرچییەکت پێبدایە ڕازی دەبوو، ئیتر بۆ عەمامەکەی خۆتت پێدا؟! عەبدوڵڵا دەڵێت: ئاخر ئەوە هاوڕێی باوکم بوو.

(١) (الامام البخاری أستاذ ألاستاذین/٦٠)

## جێیەکی سوودبەخش

چۆن ئازاردان لە مەزهەبی ئەولادی ڕەسولدا (صلى الله عليه وسلم) ڕێی دەبێتەوە؟! !

هیشامی کوڕی عوروە دەڵێت: عەلی کوڕی حوسەین (عليه السلام) بەسەر وڵاخەکەیەوە دەچوو بۆ مەککە، دەڕۆشت و دەهاتەوە.. نە لە وڵاخەکەی ئەدا و نە پیایدا ئەکێشا..!!

وە کاتێك عەلی دەڕۆشت لە لای ئەسلەمی ئازادکراوی عومەری کوڕی خەطاب دادەنیشت، پێیان دەوت: واز لە ئەشرافی قورەیش دەهێنیت و، دەبیتە هاوەڵی بەندەیەکی بەنی عەدی و لە کن ئەو دادەنیشیت؟! عەلی لەوەڵامیاندا دەیوت: پیاو لە جێیەك دادەنیشێت، کە سوودمەند بێت لێی.

هەروەها عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەردەك دەڵێت: عەلی داخڵی مزگەوت بوو.. تەنگی بە خۆی و خەڵکی هەڵچنی، هەتا لە کۆڕ و کۆمەڵی زەیدی کوڕی ئەسلەمدا دابنیشێت، نافیعی کوڕی جوبەیر پێی وت: خوا لێت خۆش بێت.. تۆ گەورەی خەڵکیت و هەنگاو هەڵدەگریت، هەتا لە کۆڕی ئەم کۆیلەدا دابنیشیت؟! عەلی وتی: زانست لە هەر کوێیەك و لە کن هەر کەسێك بێت.. هەر لەوێ ئارەزوو دەکرێ و دەخوازرێ و وەردەگیرێ.[1]

## لەهلی تەقوا

تاوسی کوڕی کەیسان ( رحمه الله ) دەڵێت: ئەوەی ئەهلی تەقوا بێت و ڕاستییەکان بدرکێنێت.. باشترە لەوەی کە ئەهلی تەقوایە و بێدەنگی هەڵدەبژێرێت.

---

(١) (سیر اعلام النبلاء ٣٩٠/٤)



## لێرە.. شاری من نییە!!

"هەر کەسە و بە جۆرێك عەشقی موستەفا (ﷺ) دەیگریەنێت"

کاتێك وەیسی قەرەنی (رحمه الله) دەچێت بۆ حەج کردن، دەڕواتە شاری مەدینە.. ئەو ساتەوەختەی کە لەبەردەم دەرگای مزگەوتەکەی فەخری عالەمدا (ﷺ) دەوەستێت، پێی دەڵێن: ئەوە گۆڕی پێغەمبەرە (ﷺ) یەکسەر وەیس بێ هۆش دەکەوێتە سەر زەوی..!! کاتێك دێتەوە هۆش خۆی، دەڵێت: لێرە بمبەنە دەرێ!! چونکە شاری من، شارێك نییە کە پێغەمبەری تێدا لە گۆڕ نرابێت..!![1]

وەئەبی عەلقەمەی مەدینی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: صەفوانی کوڕی سولەیم (رحمه الله) هێندە دڵ وابەستەی مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.. نەئەهاتە دەرەوە هەر کاتێك دەیویست بێتە دەر دەستی دەکرد بە گریان و دەیگوت: دەترسم جارێکی دیکە نەگەڕێمەوە بۆی!![2]

هەروەها ئیبن قەییم (رحمه الله) لە کتێبی (بدائع الفوائد) دا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پرسیار کرا لە ئیمام ئیبن عەقیلی حەنبەلی و پێیان وت: ئایا کەعبە پیرۆزترە یاخود حوجرەی شەریفە کە پێغەمبەری (ﷺ) تێدایە؟! ئیمام ئیبن عەقیل (رحمه الله) لە وەڵامدا وتی: ئەگەر تەنها مەبەستت دار و دیوار و بینای حوجرەکەیە، ئەوا کەعبە پیرۆزترە لە حوجرەی شەریفە، بەڵام ئەگەر مەبەستت حوجرەکەیە و پێغەمبەری تێدا بێت (ﷺ) ئەوا نەخێر، سوێند بە خوا.. نە کەعبە.. نە عەرش.. نە فریشتەی هەڵگری عەرش.. نە جەنەتی عەدن و.. نە هەموو کەونیش.. ناگەنە ئاست و پلە و پایەی ئەو جەستەیەی کە لە حوجرەکەدایە، چونکە ئەو حوجرەیە جەستەیەکی تێدایە، ئەگەر بخرێتە تای ترازوویەکەوە و هەموو کەونیش بخرێتە تاکەی تری ترازووەکەوە، ئەوا تای ترازووی ئەو جەستەیە سەنگینتر و قورستر دەبێت.[3]

(١) (تهذيب حلية الأولياء: ج٣/ ١٨٥)
(٢) (صفة الصفوة/٣٥٠)
(٣) (لە بەرنامەی (سایەی قورئان)ی د.عوسمان موحەممەد غەریبەوە وەرگیراوە (خوا بیپارێزێت)).



## هـەواڵی هـەردوو دنـیا

ئیمامی عەلی (عليه السلام) دەڕواتـە گـۆڕسـتانێـك و دەڵێت: ئـەی ئـەهلی گـۆڕسـتان، ئـەی ئـەهلی تـەنـیایی و نـاڕەحـەتی..!! لە دوای ئێـوە: مـاڵـەکـانـتان خـەڵکی تـری تێ ڕۆشـت و سـامـانـەکانـتان دابـەش کـرا و هـاوسـەرەکـانـتان شـوویـان کـردەوە، ئـەمـە هـەواڵی دنـیایـە لە پاش ئێـوە، ئـەی هـەواڵی ئـەو دنـیا چـۆنـە؟!! پـاشـان ئیمامـی عــەلی هــەر خــۆی دەڵێـت: ســوێند بــەو کەســەی نـەفـسی منـی بە دەســتە.. ئـەگــەر مــۆڵــەتی قسـەکـردنـــیان هـەبـووایـــە، ئــەوا دەیانــگوت: بـەڕاسـتی باشـترین تـوێـشوو.. تـەقـوایـە.

## دڵی مـەشـغوڵ کـردووم

حاریســی کوڕی نەبهان دەڵێت: لە مــەککە گـەڕامـەوە.. کونـدەیـەکــی ئــاوم بــەدیـاری بـرد بــۆ مـــالیکی کـــوڕی دیـنــار (رحمه الله) ماوەیــەك دوای ئــەوە، ڕۆژێـك چـووم و لە مەجلیســەکەیدا دانیشــتم، مالیـك پێـی وتــم: ئــەی حـاریس.. وەرە کــونـدەی ئـاوەکـەت ببەوە، چـونکـە دڵی مـەشـغوڵ کـردووم.
وتـم: ئـەی ئـەبا یەحیا.. مــن بـــۆ ئــەوە پێــشکەشم کردیـت، هــەتا بـەکــاری بهێنیت بــۆ دەســت نـوێـژ گــرتن و ئـاو خـواردنـەوە.
مـالیك وتی: ئـەی حاریـس.. مـن هـەرچـی دێمـە مـزگـەوت، شــەیـتان دێـتە لام و پـێم دەڵێـت: ئــەی مــالیك.. کــوندەی ئــاوەکەت دزراوە.. کونـدەی ئــاوەکەت دزراوە!! بـەڕاســتی دڵی مـەشـغوڵ کـردووم.[1]

## زاڵبـوون بەسـەر دوژمـندا

ئیمامـی عەلـی (عليه السلام) دەڵێـت: ئـەگــەر زاڵبـوویــت بـەســـەر دوژمنەکــەتدا، لێیخــۆش بــبە و لێخـــۆش بــوونـەکـــەت بکـــەرە ســوپـاســگـــوزارییەك بـــۆ پـــەروەردگـار، کـە ســەری خـستی بـەســەر دوژمنەکـەتدا.

(١) (صفة الصفوة/٦٥٠)

## ماڵی دنیا.. توێشووی ڕێبوارێك

ئه‌و له‌ مه‌دینه‌ی فه‌خری عاله‌مه‌وه (ﷺ) نه‌هاتووه‌ بۆ گه‌شت و سه‌یرانێك له‌ وڵاته‌ جوان و دڵڕفێنه‌كه‌ی شام..!! ئه‌وه‌ عومه‌ری كوڕی خه‌طابه (رضي الله عنه) كه‌ هاتووه‌ له‌ نزیكه‌وه‌ ژیان و گوزه‌رانی ئوممه‌ته‌كه‌ی ببینێت و ئاگاداری ئه‌حواڵی كاربه‌ده‌سته‌كانی بێت، ئه‌و پێی باش بوو، شه‌وه‌كه‌ی سه‌ردانی ئه‌بوده‌رداء بكات.. گه‌شته‌ به‌رده‌م ماڵ و له‌ ده‌رگای دا.. بینی ده‌رگا واڵایه‌ و.. ماڵ تاریكه‌ و خامۆش.. هیچ ڕووناكییه‌كی تێدا نییه‌..!! ئه‌بوده‌رداء هه‌ستی به‌ هاتنی عومه‌ر كرد، هه‌ستا پێشوازی لێكرد و له‌ ژووره‌كه‌یدا دایینیشاند، ئیدی ده‌ستیان كرده‌ وتووێژ و قسه‌ و باس.. له‌ ساتێكدا تاریكی باڵی كێشا بوو به‌ سه‌ریاندا، عومه‌ر ده‌ستی خشاند بۆ سه‌رینه‌كه‌ی ئه‌بوده‌رداء، بۆی ده‌ركه‌وت سه‌رینه‌كه‌ی بریتییه‌ له‌ جلی سه‌ر پشتی وڵاخێك..!! ئه‌مجار ده‌ستی خشاند بۆ جێگاكه‌ی، له‌ ورده‌چه‌و زیاتر، ده‌ستی به‌ر هیچی تر نه‌كه‌وت..!! ئه‌مجار ده‌ستی خشاند بۆ لێفه‌كه‌ی.. ئه‌ویش هێنده‌ ته‌نك بوو، له‌ به‌رامبه‌ر سه‌رمای دیمه‌شقدا هیچی پێنه‌ده‌كرا..!!

عومه‌ر وتی: خودا ڕه‌حمت پێبكات. ئه‌ی هێنده‌مان بۆ نه‌ناردیت هه‌تا حاڵی خۆتی پێ باش بكه‌یت، ئه‌مه‌ ئێستا چ حاڵێكه‌ تۆی تێدایت؟!!

ئه‌بوده‌رداء (رضي الله عنه) وتی: ئه‌ی عومه‌ر.. ئه‌و فه‌رمووده‌یه‌ت له‌ بیره‌ كه‌ رسول الله (ﷺ) بۆی باسكردین؟ عومه‌ر وتی: كام فه‌رمووده‌؟ ئه‌بوده‌رداء وتی: ئه‌ی خۆشه‌ویست (ﷺ) نه‌یفه‌رموو: با ماڵی دنیای هه‌ر یه‌كێكتان هێنده‌ی تووێشووی ڕێبوارێك بێت؟ عومه‌ر وتی: به‌ڵێ باشم له‌ بیره‌. ئه‌بوده‌رداء وتی: ئه‌ی پاش ئه‌وه‌ ئێمه‌ چیمان كرد ئه‌ی عومه‌ر؟! !

ئیدی عومه‌ر گریا و.. ئه‌بوده‌رداء گریا.. گریانیان بۆ یه‌كدی سه‌نده‌وه‌، تا ڕۆشنایی به‌یانیان لێ هه‌ڵهات.[1]

(١) (صور من حياة الصحابة/٢١١-٢١٢)



## فریشــتەکان گوێت لێدەگرن!

شـــەو داهــات.. خەڵکی خەوتـن، تەنیا عاشـــقەکان نەبێـت!! دنیا ئـارام و بێدەنگ.. ئـەسـتێرەکان لە ئـامێزی ئـاسـماندا، ورشـــەیان دەهـات..

ئوســـەیدی کـوڕی حـوزەیر (رضي الله عنه) لە فـەزای ئـازادی پشـــت خانـووەکەیدا دانیشـــتبـــوو، یەحیـای کـوڕی لەولاتـریەوە نووسـتبـــوو.. ئـەسـپەکەشـــی کە ئـامادەی کـرد بــوو بــۆ جیهــاد.. کەمێــك لە دووری خـۆیــەوە بەسـتبـوویــەوە، ئوســـەید ئـارەزووی کـرد ئـەو کەشـــە جـوانە گـوڵاوپـــڕژێن بکـات بە خـوێندنی ئـایاتێــك لە قـورئـــانی پـیرۆز، ئیـدی بە دەنــگە خـۆشــئـاواز و بە ســـۆزەکەی، دەسـتی کـرد بە خـوێندن:

﴿الم * ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ * الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ * وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾[١]

واتە: ئـەم قورئـانە هیچ گـومـانێکی تێـدا نییە، ڕێنیشـــاندەرە بــۆ پارێــزکاران، ئـەوانـەی کە بـڕوا دەهێنن بە شـــتە نـادیار و پەنهانـەکان، وە نوێــژ دەکەن و لەو ڕۆزییەی کە پێمان داون دەبـەخشـــن لەبـەر خـودا، وە ئـەوانەی کە بـڕوا دەهێـنن بەو قورئـــانەی کە بــۆ تــۆ نێـردراوە ئــەی مـوحەممەد، وە بەو کتێــبانەی کە بــۆ نێـردراوانی پـێش تـۆ نێردراونـەتـە خـوارەوە، وە بـڕوای تەواویــان هـــەیە بــە ڕۆژی دوایی.[٢]

ئوســـەید، بیسـتی و بینی.. ئـەسـپەکەی دەحیلێنێت و.. هێندە دەجـووڵێت خەریـکە پــەتی بەســـتنەوەکەی بپچڕێنـێت..!! بــۆیە ئوســـەید بێـدەنگ بــوو. ئـەسـپەکەش ئـارام و هێور بـــوویــەوە، دووبـــارە دەســـتی بە خـوێندنـــەوە کـــردەوە:

﴿أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[٣]

واتە: ئـەوانـە لەسەر ڕێی ڕاســتن لە لایـەن پەروەردگـاریانـەوە، وە هـەر ئـەوانن کە ڕزگارن.[٤]

---

(١) (البقرة/١ ــ ٤)
(٢) (پـوختەی تەفـسیری قـورئـان/٢)
(٣) (البقرة/٥)
(٤) (پـوختەی تەفـسیری قـورئـان/٢)

ئیدی دووبارە ئەسپەکە گەڕان و جوولانێکی بە هێزتر و خێراتری لە جاری یەکەم کرد، بۆیە ئوسەید دووبارە بێدەنگ بوو..! ئەسپەکەش ئارام و هێور بوویەوە..!!
چەند جارێك ئەمە ڕوویدایەوە، ئیدی ئوسەید لەوە ترسا کوڕەکەی ببێت بە ژێر ئەسپەکەیەوە، بۆیە ڕۆشت خەبەری بکاتەوە، لەم ساتەدا سەیرێکی ئاسمانی کرد.. پەڵە هەورێکی بینی وەك سەیوانێکی کراوە.. کە چاوان لەوە قەشەنگتر و لەوە گەشاوەتری نەدیبوو..!! نمونەی چراگەلێکی پێوە هەڵواسرا بوو، ئاسۆی پڕ کرد بوو لە ڕووناکی و درەوشانەوە.. دواتر وردە وردە بەرز دەبوویەوە بۆ بڵندایی ئاسمان و لە چاوانی ون بوو..!!
کە ڕۆژ بوویەوە ڕۆشت بۆ خزمەتی خۆشەویست (ﷺ) و ئەوەی ڕوویدا بوو بۆی گێڕایەوە، خۆشەویست (ﷺ) پێی فەرموو: ئەوە فریشتە بووە گوێی لە خوێندنەکەی تۆ گرتووە ئەی ئوسەید، وە ئەگەر بەردەوام بوویتایە لە خوێندنەکەت، ئەوا خەڵکی بە ئاشکرا دەیانبینی.[1]

## هاوسەفەری بەدخوو

ڕۆژێك عەبدوڵلای کوڕی موبارەك (رحمه الله) بوویە هاوسەفەری کەسێکی بەدخوو، لە سەفەرەکەیاندا عەبدوڵلا زۆر موراعات و خزمەتی هاوسەفەرکەی دەکرد، کاتێك لێك جیا بوونەوە، عەبدوڵلا دەستی کرد بە گریان..!!
پێیان وت: بۆچی دەگریەیت؟!
وتی: بۆ ئەوە دەگریەم کە من لە هاوسەفەرەکەم جیا بوومەوە، بەڵام ئەو هەر وەك خۆی.. لەگەڵ ڕەوشتە خراپەکانیدا مایەوە و لێکتر جودا نەبوونەوە.[2]

(١) (صور من حياة صحابة /١٦٨ـ ١٦٩)
(٢) (رفقاء طريق/٤٧)

## بەسەر پشكۆدا هەنگاو دەنێت!

ئەبو موسلیمی خەولانی[1] (رحمه الله) پیاوێكی دامەزراو و.. باوەڕ بەهێز بوو، هەمیشە سوور بوو لەسەر هەق وتن و ئاشكرا كردنی ڕاستی، دنیای فانی فرۆشت بوو بە دنیای باقی، دڵسۆزانە خۆی یەكلا كردبۆوە بۆ خوداپەرستی و بانگەواز بۆ دینەكەی، ئیدی لە لای خەڵك ڕێز و خۆشەویستی و پلەیەكی بڵندی هەبوو، وەك پیاوێكی نەفس پاك دەیانبینی و.. دەیانزانی كە نزا و پاڕانەوەكانی لای پەروەردگار گیران.

ئەسوەدی عەنسی درۆزن.. كە لە یەمەن بانگەشەی پێغەمبەرێتی دەكرد، ویستی زەبرێكی توند لەم پیاوە خوداپەرستە بووەشێنێت و.. ترس و بیم بخاتە دڵی نەیارانی خۆیەوە، بۆیە فەرمانی دا لە گۆڕەپانێكدا دارێكی ئێجگار زۆر كۆ بكرێتەوە و.. گڕی تێبەر بدرێت، هەتا كڵپە دەسەنێت، وە خەڵكی بانگهێشت كرد بۆ تەماشا كردنی زانا و خوداپەرستی یەمەن ئەبو موسلیمی خەولانی، كە چۆن تەوبە دەكات و دان بە پێغەمبەرێتی ئەسوەدی عەنسی دا دەنێت.

ئاگر كڵپەی سەند و.. خەڵكی كۆ بوونەوە، دار و دەستەی ئەسوەد ئەو ناوەیان تەنی بوو، ئەسوەدی درۆزن لە سەر كورسییەكی گەورە، كە لە دوورەوە ڕوو بە ڕووی ئاگرەكە بۆی دانرا بوو، دانیشت و ئەبوموسلیمیان هێنایە بەردەمی.

ئەسوەدی درۆزن پێی وت: شایەتی دەدەی كە موحەممەد (ﷺ) رسول الله یە؟ وتی: بەڵێ.. شایەتی دەدەم كە رسول الله یە و كۆتا پێغەمبەری خودایە.

ئەسوەد وتی: ئەی شایەتی دەدەی كە من پێغەمبەری خودام؟ وتی: ئەوەی كە تۆ دەیڵێیت من نایبیستم.

بەردەوام ئەم پرسیارانەی لێدەكرد و ئەویش بە هەمانشێوە وەڵامی دەدایەوە، تا ئەسوەد وتی: كەواتە فڕێت ئەدەمە ناو ئەو ئاگرەوە..!!وتی: ئەگەر وا بكەیت.. من بەم ئاگرەی كە بە دار خۆشت كردووە، خۆم دەپارێزم لەو ئاگرەی كە خوای گەورە بە مرۆڤ و بەرد خۆشی كردووە.

ئیدی تورەبوونی دوژمنی خودا.. گەشتە ئەوەی كە دەست و قاچی ئەبو موسلیم ببەستن و لە دوورەوە فڕێی بدەنە ناو ئاگرە گەورەكەوە، بەڵام ئەو كاتێك لە نێوان ئەرز و ئاسمان دا بوو، تەنها یادی خودای دەكرد و

(١) (أبومسلم الخولاني: (صور من حياة التابعين/٣٥٤، صفة الصفوة/٨٠٧))

دەیگوت:

حَسبیَ اللهُ وَ نعمَ الوکیل.. حَسبیَ اللهُ وَ نعمَ الوکیل

دڵی باوەڕداران خەریك بوو دەر دەهات..!! چاوەڕێیان کرد.. تا کەم کەم ئاگرەکە دامرکایەوە.. دیتیان ئەبو موسلیم کۆتەکانی دەست و قاچی سوتاون و.. بەڵام پۆشاکەکانی نەسووتاوە..!! بە پێی پەتی و بە زەردەخەنەوە بە سەر پشکۆدا هەنگاو دەنێت..!! ئیدی درۆزنەکە لە ترسی موسوڵمان بوونی خەڵکی، پەنای برد بۆ تۆقاندن و هەڕەشە کردن.

یەکێك لە داروەدەستەکانی وتی: باشترە ئەم پیاوە دوور خەیتەوە لێرە و خۆت لە شەڕی قوتار بکەیت. بەو جۆرە فەرمانی دوور خستنەوەی دەرکرد و ئەبو موسلیم بە خۆشییەوە بەرەو مەدینە کەوتە ڕێ.. بە ئومێدی دیداری ئەو رسول الله یەی (ﷺ) کە بەر لەوەی بە خزمەتی بگات.. باوەڕی پێ هێنابوو، بەر لەوەی بیبینێت.. عاشقی بوو بوو !!

بەڵام کاتێك گەشتە دەوروبەری مەدینە.. بەر لەوەی چاوانی گەش بێت بە دیداری و.. رۆحی شاد بێت بە هاوەڵێتی ئەو نازدارە (ﷺ) هەواڵی جەرگبڕی مەرگی پێغەمبەری پێگەشت و غەمێکی ئێجگار قووڵی خستە نێو دڵییەوە..!!! ئەبو موسلیم گەشتە مزگەوت، دەستنوێژی شووشت و.. لە ڕەوزەی شەریفەدا، دوو ڕکات نوێژی ئەدا کرد و.. ویردی دەخوێند و دەیگوت: انا لله و انا الیه راجعون.. أستغفر الله العظیم..

عومەری کوڕی خەطاب (ﷺ) لێی نزیك بوویەوە و پێی وت: تۆ لەچ شارێکەوە هاتوویت؟ وتی: لە یەمەنەوە هاتووم.. عومەر وتی: هەواڵی ئەو هاوەڵەمان دەزانیت، کە ئەسوەدی عەنسی فڕێیدایە ناو ئاگرەوە و خودای گەورە ڕزگاری کرد؟ وتی: ئەو باشە سوپاس بۆ خودا. عومەر وتی: سوێندت دەدەم بە خودا، تۆ ئەبو موسلیم نیت؟ وتی: بەڵێ. ئیدی عومەر گریا و.. نێو چاوانی ماچ کرد و وتی: ئایا دەزانیت ئەو دوژمنەی خودا چی بەسەر هاتووە؟! وتی: لە وەتەی لە یەمەن دەرچووم، هەواڵی نازانم. عومەر وتی: خوای گەورە بە دەستی چەند باوەڕدارێك ئەسوەدی کوشت و موڵکەکەی لەناو برد و خەڵکەکەی گەڕاندەوە بۆ ئیسلام. ئەبو موسلیم وتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی.. کە نەیمراندم تا کوشتنی ئەو زاڵمەم بیست و خەڵکەکەش جارێکی دی گەڕانەوە بۆ ئیسلام. عومەریش وتی: منیش سوپاسی ئەو خودایە دەکەم کە لە ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) کەسێکی پیشاندام، ئەوەی بە سەر هات.. کە بەسەر ئیبراهیمی خەلیل دا هات (ﷺ).

## نابێ لە مندا بوونی نەبێت

ئەبی یوسف دەڵێت: لە خزمەت ئەبوحەنیفەدا بووم، پێکەوە دەڕۆشتین، گوێم لێ بوو پیاوێك بە یەکێکی تری دەگوت: ئەوە ئەبوحەنیفەیە. شەوانە ناخەوێت و خواپەرستی دەکات!!
ئەبوحەنیفە (رحمه الله) وتوێژەکەی بیست و، وتی: وەڵاهی نابێ خێرێك دەربارەم بوترێت و لە مندا بوونی نەبێت! ئیدی ئەبوحەنیفە شەوەکانی بە نوێژ و پاڕانەوە و ملکەچی بۆ پەروەردگار زیندوو ئەکردەوە.
وە خێزانەکەی ئەبوحەنیفە دەڵێت: لەوەتەی بوومەتە هاوسەری، شەوانە لە جێگاکەیدا ڕانەکشاوە بۆ نووستن..!! خەوی هاوینانی لە نێوان نیوەڕۆ و عەسردا بوو.. زستانانیش لە مزگەوتەکەیدا، سەرەتای شەوەکەی دەخەوت.[1]

## بۆ قازانجیش بێت؟!

بەکری کوڕی مونیر دەڵێت: بارێك شتومەك هاتبوو بۆ موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری (رحمه الله) کە ئەحمەدی کوڕی بۆی ڕەوانە کرد بوو.
ئێوارەکەی هەندێك بازرگان هاتن بۆ لای، ویستیان کەلوپەلەکەی بکڕن بە پێنج هەزار درهەمی قازانج، ئیمامی بوخاری پێی وتن: جارێ ئەمشەو بڕۆن و.. چاوەڕێ بکەن.
بۆ بەیانییەکەی کۆمەڵێك بازرگانی تر هاتنە لای و داوای کەلوپەلەکەیان لێ کرد بە دە هەزار درهەمی قازانج، بەڵام ئیمام بوخاری پێی نەدان و وتی: من دوێنێ نیەتم هێنا کەلوپەلەکەم بدەم بەوانەی کە یەکەمجار بە پێنج هەزاری قازانج داوایان کرد!!
ئیدی فرۆشتی بە کۆمەڵە بازرگانەکەی یەکەم و وتی: پێم خۆش نییە پێچەوانەی نیەتەکەم بجوڵێمەوە!![2]

---

(١) (مناقب الامام ابی حنیفة/٢١)
(٢) (الامام البخاری أستاذ الاستاذین: ٦٨)

## ماسـییه‌کی تـازه

عـومه‌ری فـاروق (رضي الله عنه) ئـاره‌زووی چـووه سـه‌ر ماسـییه‌کی تـازه، خـزمـه‌تکاره‌کـه‌ی وشـترێکی ئامـاده کـرد و دوو شـه‌و.. ڕێـی بـڕی، هه‌تـا ماسییه‌کی تـازه‌ی بـۆ کـڕی و دوو شـه‌وی تـریـش ڕێی بـڕی هـه‌تا گـه‌ڕایـه‌وه.. وشـتره‌که هێنده مـاندوو بـوو بـوو ئاره‌قـه‌ی ده‌کـرد.

خـزمـه‌تکاره‌که بـردی هـه‌تـا به ئـاو فـێنکی بکاتـه‌وه.. عومـه‌ر تـه‌ماشـایـه‌کی کـرد و وتی: بـه هـۆی ئاره‌زوویـه‌کی عومـه‌ره‌وه، ئـه‌زیـه‌تی ئاژه‌ڵـێکـت دا، وه‌ڵڵاهـی.. عـومـه‌ر تـامـی ئـه‌و مـاسییه نـاکـات.[1]

## دوو هـاوڕێ و.. دوو ڕکـات!

عه‌بدوڵلای کوڕی مـوباره‌ك (رحمه الله) ده‌ڵێت: ئـه‌گـه‌ر دوو کـه‌س له ڕێگایـه‌کدا بـوونـه هـاوڕێ و یه‌کێکیـان ویـستی دوو ڕکـات نـوێـژ بکات، بـه‌ڵام لـه‌بـه‌ر هـاوڕێـکه‌ی وازی لێ هێنا ئـه‌وه ده‌بـێته ڕیـا، بـه‌ڵام ئـه‌گـه‌ر له‌بـه‌ر هـاوڕێکه‌ی دوو ڕکاتـه‌کـه‌ی ئـه‌دا کـرد ئـه‌و کاتـه ده‌بـێته شـیرك (پـه‌نا ده‌گـریـن بـه خـوا)، کـه‌واتـه: نـه لـه‌بـه‌ر خـاتـری کـه‌س وازی لێ بهێـنه.. نـه لـه‌بـه‌ر خـاتـری کـه‌س ئـه‌دای بکـه.[2]

## کلیلی یـادی خـوا عزوجل

ئیـبن مه‌سـعود (رضي الله عنه) ده‌ڵێـت: که‌سانێـك هـه‌ن کلیلـی یـادی خـودان، هـه‌رکـاتێـك ده‌بـینرێـن، یـادی الله جل جلاله ده‌کـرێت.[3]

---

(١) (موسـوعة الأحـزان ج٣٨١/١)
(٢) (حياة السلف/٢٣٢)
(٣) (حياة السلف/٢٢٤)

## دەهۆڵ و زوڕنا

فوزەیلی کوڕی عەیاز ( رحمه الله ) دەڵێت: ئەگەر دنیام بوێت.. ئەوا پێم خۆشە بە دەهۆڵ و زوڕناوە دەستم بکەوێت، نەوەك بە هۆی خواپەرستی و پیاوچاکیمەوە.[1]

## چیبکەم لەگەڵ ئێوە؟!

شەقیقی بەڵخی دەڵێت: وتیان بە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك: تۆ کە لە نوێژ بوویتەوە، بۆچی نایەیت لەگەڵ ئێمە دابنیشیت؟! عەبدوڵڵا ( رحمه الله ) وتی: دەچمەوە لە خزمەت هاوەڵان و شوێنکەوتووان دادەنیشم، تەماشای کتێبەکان و.. بەسەرهات و.. پاشماوە و ئاسەوارەکانیان دەکەم، ئیتر چی بکەم لە لای ئێوە؟! ! ئێوە خەریکن غەیبەتی خەڵکی دەکەن.[2]

## نەوەك دینارەکەی من نەبێت!

بیشری کوڕی حاریس دەڵێت: ڕۆژێك کەهمسی کوڕی حەسەن ( رحمه الله ) دینارێکی پێبوو، ڕۆشتە دەرێ، لە ڕێگەدا دینارەکەی لێ کەوت، گەڕا بە دوایدا و دۆزییەوە، بەڵام هەڵی نەگرتەوە و وتی: ئەترسم ئەمە دینارەکەی من نەبێت.[3]

---

(١) (حیاة السلف/٢٣٠)
(٢) (سیر اعلام النبلاء ٣٩٨/٨)
(٣) (صفة الصفوة/٦٦٤)



## بەشکردنی خۆشەویستی

کچەکەی فوزەیلی کوڕی عەیاز (رحمها الله) نەخۆش بوو.. فوزەیل ڕۆشتە ژووری بۆ لای، کچەکەی پێی وت: ئەی بابە گیان تۆ منت خۆش دەوێت؟! فوزەیل وتی: بێ گومان تۆم خۆشدەوێت.. کچم. کچەکەی وتی: لا إله إلا الله..!! وەڵلاهی گومانم وا نەبوو پێت بابە گیان، گومانم وا نەبوو کە لەگەڵ خوادا کەسێکی ترت خۆش بووێت، خۆشەویستییەکەت با تەنها و تەنها بۆ اللَّهُ عزوجل.. بێت و، خودا لە خۆشەویستییەکەتدا با تەنیا و تاك بێت، خۆشویستنەکەی منیش با لە ڕێی ئەو سۆز و میهرەبانییەوە بێت، کە خودا ئەیخاتە دڵی باوکەوە بۆ ڕۆڵەکەی، نەك بەشکردنی خۆشەویستییەکەت بێت لە نێوان اللَّهُ عزوجل و کەسانی تردا.

ئیبن قەیم (رحمه الله) دەڵێت: خودا مافێکی هەیە لە خۆشەویستیدا، کە نابێت هیچ کەس هاوبەشی بێت، وە خراپترین تاوانیش ئەوەیە کە ئەو خۆشەویستییە لە شوێنی خۆیدا دانەنێیت و، هاوبەش بۆ خودا دابنێیت لەو خۆشەویستییەدا.[1]

## خۆشەویستی بە قسەی بریقەدار نییە

حەسەنی بەسری (رحمه الله) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەفەرمووێت: (المَرءُ مَعَ مَنْ أَحَب) هەرکەس لەگەڵ خۆشەویستانی خۆی حەشر دەکرێ.

بەوە تووشی غورور نەبیت و بڵێیت: من پێغەمبەر و چاکانم خۆشدەوێت و سبەی لە خزمەت ئەواندا دەبم! چونکە جوولەکە و گاورەکان پێغەمبەرەکانی خۆیانیان خۆشدەوێت و سوننەتەکانیان پەیڕەو ناکەن، ئەگەر سوننەتی ئەو کەسانەت پەیڕەو کرد کە خۆشت ئەوێن.. ئەوکاتە لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێیت، چونکە خۆشەویستی تەنها قسەی بریقەدار نییە.

---

[1] () (روضة المحبين/ ٢٠٨)

## کاتژمێرێك بێره دوكانه‌كه‌م

فوزه‌یلی كوڕی موحه‌ممه‌دی ڕه‌قاشی ده‌ڵێت: ڕۆژێك مه‌عروفی كه‌رخیم بینی ( رَحِمَهُ اللهُ ) ده‌گریا، وتم: بۆچی ده‌گریه‌یت؟!!
وتی: برایان جێیان هێشتین و، خه‌ڵكی باوه‌شیان كردۆته‌وه بۆ دنیا و، چروكی بۆته خوویان، دڵیان ڕه‌ق بووه و.. ڕۆژی په‌سلانیان بیر چۆته‌وه. پاشان هه‌ستا و پێكه‌وه ڕۆشتین بۆ دوكانی (ئارد فرۆشی) براكه‌ی، سه‌لامی كرد و دانیشت.. براكه‌ی پێی وت: سه‌عاتێك لێره دابنیشه و ئاگات له دوكانه‌كه بێت، من كارێكم هه‌یه، ده‌ڕۆم و دێمه‌وه. مه‌عروف وتی: به مه‌رجێك داده‌نیشم، ده‌ست نه‌نێم به ڕووی سواڵكه‌رانه‌وه. براكه‌ی ڕازی بوو و ڕۆشت به ده‌م كاره‌كه‌یه‌وه، مه‌عروف ته‌ماشای كرد.. بێوه‌ژنان و منداڵان و كه‌م توانایان دانیشتوون، ئیتر ده‌ستی كرد به دابه‌شكردنی ئارد به سه‌ریاندا، هه‌تا دوكانه‌كه‌ی پاك كرده‌وه! كاتێك براكه‌ی هاته‌وه و دوكانی چۆڵی بینی.. هاواری كرد و، وتی: هه‌ژارت خستم..!!
ئیدی مه‌عروفیش هه‌ستا و گه‌ڕایه‌وه بۆ مزگه‌وته‌كه‌ی، برا دوكانداره‌كه‌شی سندوقی پاره‌كه‌ی واڵاكرد و بینی پڕه له درهه‌م..!! دواتر ڕۆشته لای مه‌عروف و پێی وت: به‌یانیش سه‌عاتێك بێره دوكانه‌كه‌م. ئه‌ویش وتی: شتی ئاوه‌ها به ته‌جروبه ڕوو نادات.
پاشان مه‌عروف وتی: پاكی و بێگه‌ردی بۆ خودانی هه‌موو شته‌كان، ده‌یبه‌خشێت به‌وه‌ی كه خۆی ده‌یه‌وێ.. وه ئه‌گه‌ر داوای هه‌موو دنیای لێ بكه‌ین، لێمان ناگرێته‌وه، به‌ڵام ئێمه داوامان لێكرد بمان پارێزێت له دنیا.. ئه‌ویش پاراستینی.[1]

## سه‌باره‌ت به شۆڕشه‌كان

ئیمامی غه‌زالی ( رَحِمَهُ اللهُ ) ده‌ڵێت: شۆڕشه‌كان.. بیرمه‌نده‌كان دروستی ده‌كه‌ن، فیداكاران هه‌ڵیده‌گیرسێنن، چڵكاوخۆر و كاسه‌لێسه‌كانیش ده‌یدزن.

(١) (مناقب معروف الكرخي/١٥١-١٥٢)

## گه‌وره نه‌کردنی موسیبه‌ته‌کان

ئیمامی عه‌لی (ﷺ) ده‌ڵێت: هه‌ر که‌س هێنده باسی موسیبه‌ته بچووکه‌کان بکات.. هه‌تا گه‌وره ده‌بن له‌به‌ر چاوی، خوای گه‌وره موسیبه‌تی گه‌وره‌تری تووش ده‌کات.

## کێوێک له ئارام گرتن!

عوروه‌ی کوڕی زوبه‌یر (ﷺ) قاچی تووشی شێرپه‌نجه بوو..!!
پزیشکه‌کان پێیان وت: چارت نییه ته‌نیا بڕینه‌وه‌ی قاچت نه‌بێت ئه‌ی عوروه! ئه‌ویش خۆی ته‌سلیمی قه‌زای خوا و.. کاری پزیشکه‌کان کرد، ئه‌و کاته‌ی بردیانه ژووری نه‌شته‌رگه‌ری بۆ بڕینه‌وه‌ی قاچی.. پزیشکه‌کان وتیان: ئه‌ی عوروه.. سه‌رکه‌رێک بخۆ هه‌تا هه‌ست به ئازاری بڕینه‌وه‌که نه‌که‌یت. عوروه وتی: په‌نا ده‌گرم به خوا له‌وه‌ی که شتێک بخۆم، بێهۆشم بکات له یادی په‌روه‌ردگار.
پزیشکه‌کان وتیان: ده‌ی چۆن به‌رگه‌ی قاچ بڕینه‌وه‌که‌ت ده‌گریت؟!
عوروه وتی: من نوێژ داده‌به‌ستم.. دوای ته‌کبیره‌تول ئیحرام و ڕکوع و سجود، ئه‌و کاته‌ی که داده‌نیشم بۆ خوێندنی ته‌حیات، ئێوه ئیشی خۆتان ئه‌نجام بده‌ن، چونکه له‌و ساتانه‌دا بیر له دنیا ناکه‌مه‌وه، ته‌نیا له‌گه‌ڵ خوای خۆمدا ده‌بم و هه‌ست به ئازار ناکه‌م..!!
عوروه ده‌ستی کرد به نوێژه‌که‌ی، کاتێک دانیشت بۆ خوێندنی ته‌حیات.. هه‌مان له‌حزه پزیشکه‌کان قاچیان بڕییه‌وه! عوروه سه‌لامی دایه‌وه، خوێن له قاچی ده‌ڕۆشت..!! هه‌ڵیان گرت و بردیانه‌وه بۆ ماڵ، میوان له ده‌وری دانیشتبوون و قاچه جیابووه‌که‌ی له به‌رده‌میدا دانرا بوو، عوروه دوو کوڕی هه‌بوو، بانگی کرد له کوڕه گه‌وره‌که‌ی، به‌ڵام وه‌ڵامی نه‌بوو..!! ئیدی عوروه وتی: انا لله وانا الیه راجعون.. بڕۆن بزانن چی بووه وا ده‌نگی نه‌بوو؟! چونکه ئه‌مه یه‌که‌م جاره بانگی بکه‌م و وه‌ڵامم نه‌داته‌وه..!!
دانیشتووان ڕۆشتن به ده‌م کوڕه‌که‌یه‌وه، ده‌بینن.. له سه‌ربان که‌وتۆته خواره‌وه و گیانی سپاردووه! هاتنه‌وه ژووری و پێیان وت: ئه‌ی عوروه خوای گه‌وره پاداشتی خێرت بداته‌وه، کوڕه گه‌وره‌که‌ت مردووه!
له‌و ساته‌وه‌ختە سه‌خته‌دا، عوروه قاچه بڕاوه‌که‌ی گرت به ده‌ستییه‌وه و،

وتی: ئـــەی پــەروەردگارم.. دوو قــاچت پـێ بـەخشــــیم، یــەکێکیانت بـــردەوە و ئـەویتریانت بــۆ هێشــتمەوە، ســوپاســی ئـەوەیـانت دەکـەم کـە بـردتــەوە و شــوکــری ئــەوەیــانتم کـــە بـــۆت هێشـتوومـەتـــەوە، وە دوو کـــوڕت پــێ بـەخشـــیم، گـەورەکـەیـــانت بـــردەوە و بچوکـەکـــەت بـــۆ جـێ هـێشــــتم، ســوپاســی ئــەوەیانت دەکـەم کـە بــردتـەوە و شــوکـرانــە بـژێــری ئــەوەیــانتم کـە بـــۆت جێ هـێشـــتووم.

دواتـر قـاچـەکـەی کـفن کـرد و وتی: ئــەی قـاچـەکـەم.. ســـوپاس بـــۆ خـــودا نـەم بـــردووی بـــۆ شـــوێـنێـك کـە خـودا تـــوڕە بکـات.[1]

## دیـوانی لـەمـیرەکـان

جەعفەری کوڕی بـورقان دەڵێت: ئـەمیری بەسـرە.. کەسێکی نـاردە لای عامــری کوڕی عەبد قەیـس و لێی پرســی: ئـەوە چـشـــتێکە کە وات لـێ دەکـات.. نایــەیتە دیـــوانی ئـەمـــیرەکان؟!! عامـــر (رَحِمَهُ اللهُ) وتـــی: ئـێـــوە لە بــەردەگـاتــــاندا مــوحـتـاجــان و نــەداران وەســتاون.. بـانگـیان بکــەن و پـێداویـسـتـیـەکـانـیان جێبەجێ بکەن.. ئیتر واز لــەو کەسـانـە بهێـنن کە پێویســتیان پـێــتان نـییە..!![2]

## بـەرەکـەت لە شــتی باشــدایە

ئەیـوبی ســختیانی دەڵێت: خــورمـایــەکی خـراپــم کـــڕی..! عەبـدوڵڵای کـوڕی زەیــدی جــرمی (رَحِمَهُ اللهُ) بـــینیمی و پێــی وتــم: وەمــــزانی بە هـاوەڵێـــتیمان ســـوودمـەند بـــوویـت، ئـەی نـەتــزانـیوە خـوای گــەورە.. لـە هــەمـوو شـتــێکی خـراپدا بـەرەکـەتی هــەڵگـرتـــووە؟![3]

---

(١) (أنيس المؤمنين/٦٨ـ ٦٩)
(٢) (سـير اعلام النبلاء ١٨/٤)
(٣) (روضة الزاهدين/٧٣)



## خوازیارە خەوتووەکان!!

ئیمامی شافیعی ( رحمه الله ) دەڵێت: چشتێکم نەدیوە وەك دۆزەخ.. ئەوەی لێی هەڵدێت خەوتبێت!! وە نەمدیوە وەك بەهەشتیش ئەوەی داوای دەکات خەوتبێت!!

## ڕێگایەك بوو پێی گەشتم بە خودا

نەعیمی کوڕی موحرزی کوڕی ئەبو هورەیرە، لە ئەبو هورەیرەی باپیریەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) پەتێکی باریکی هەبوو کە هەزار گرێی لێ درا بوو.. شەوانە نەدەخەوت هەتا تەسبیحاتی پێ نەکردایە.[1]

هەروەها عامری کوڕی شوعەیب دەڵێت: حەسەنی بەسری مامۆستامم بینی، تەسبیحێکی بە دەستەوە بوو، پرسیارم دەربارەی کرد، حەسەن ( رحمه الله ) پێی وتم: ئەی کوڕەکەم.. ئەوە شتێك بوو سەرەتاکان بە کارمان هێنا، ئێمەش لەو کەسانە نین کە لە کۆتاییەکاندا وازی لێ بهێنین، وە من پێم خۆشە بە دڵ و، بە دەست و، بە زوبانم.. یادی الله عزوجل بکەم.

هەروەها تەسبیحێك بە دەست جونەیدی بەغدادییەوە بینرا، بە سەرسوڕمانێکەوە پێیان وت: تۆ ئەو ڕێز و کەسێتییەت هەیە و دەبینین تەسبیح دەگریت بە دەستتەوە؟! !

جونەید ( رحمه الله ) وتی: ئەوە ڕێگایەك بوو، پێی گەشتم بە خودا.. لێی جودا نابمەوە!![2]

---

(١) (صفة الصفوة/٢٥٠)
(٢) (روضة الحبور /١١٨ـ ١١٩)

## دیارییەکانیشت خۆشەویستن

ئیمامی عەلی (عليه السلام) کراسێکی دەبێت کە زۆر جاران دەیپۆشێت، تا پێی دەڵێن: هۆی چییە کە ئەوەندە ئەم کراسە دەپۆشیت؟! ! ئیمامی عەلی دەڵێت: ئەوە هاوڕێی خۆشەویست و هەڵبژاردەم.. عومەری کوڕی خەطاب پێی بەخشیم، بۆیە هێندە حەزم لێیە کە بیپۆشم.

## مانگرتن لە گوێ گرتن!

پۆشاکێکی زۆر هات بۆ عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) هەموو پۆشاکەکەی دابەشکرد و هەر پیاوێك پۆشاکێکی بەرکەوت، پاشان عومەر سەر کەوتە سەر مینبەر و کراسێکی لەبەردابوو (کراسێکیش لە دوو پۆشاك پێکهاتبوو) وتی: ئەی خەڵکینە. ئایا گوێ دەگرن؟ سەلمانی فارسی وتی: نەخێر. گوێ ناگرین!! عومەر وتی: بۆچی ئەی ئەبا عەبدوڵلا؟!!

سەلمان وتی: هەر کەسە و پۆشاکێکت بە سەردا دابەش کردووین، بەڵام خۆت کراسێکت لەبەردایە؟ واتە دوو پۆشاکت بردووە.

عومەر وتی بە سەلمان: پەلە مەکە ئەی ئەبا عەبدوڵلا، پاشان بانگی کرد: ئەی عەبدوڵلا. بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، ئەمجار وتی: ئەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر. عەبدوڵلای کوڕی عومەر وتی: سەرم لە ڕێتە.. ئەی ئەمیری باوەڕداران. عومەر وتی: سوێندت دەدەم بە خودا.. ئەم پۆشاکەی خۆمم پێ داپۆشیوە، پۆشاکەکەی تۆ نییە؟ عەبدوڵلا وتی: بەڵێ سوێند بە خودا پۆشاکەکەی منە.

(عومەر بالا بەرز و کەڵەگەت بووە.. تەنیا پۆشاکێك بەشی نەکردووە، بۆیە عەبدوڵلای کوڕی پۆشاکەکەی خۆی پێدەدات، هەتا بە هەردووکیانەوە کراسێکیان لێ دەربێت بۆ ئەمیری باوەڕداران).

دوای ئەو ڕوون بوونەوەیە سەلمان، وتی بە ئەمیری ئیمانداران: دەی قسە بکە.. ئێستا گوێت لێ دەگرین.[1]

(١) (صفة الصفوة/١٩٤)



## دڵـی تەنـگ و.. دیـداری چـاکان

جـەعـفـەری کـوڕی سـولەیمان دەڵێت: هـەرکـاتێـك هـەسـتم بـە قـەسـوەت و دڵـڕەق بـوونی خـۆم دەکـرد، بـۆ ئـەوەی دڵـم نـەرم بـێـتەوە.. دەڕۆشـتم سـەیـری ڕوخـسـاری مـوحەممەدی کـوڕی واسـیعـم دەکـرد، هـەر دەتـگـوت کـوڕ مـردووێکی جـەرگ سـوتـاوە..!

هـەروەهـا عەبدوڵڵای کوڕی موبـارەك دەڵێت: کاتێـك سـەیری فوزەیلی کـوڕی عەیـازم دەکـرد، دڵتەنگـیم نـوێ دەبـوویـەوە و.. ڕقـم لە نـەفـسـی خـۆم هـەڵدەسـتا، دواتـر عەبدوڵلا لەم قسـانەیدا دەسـتی دەکـرد بە گـریـان..!

هـەروەهـا بیشـری کـوڕی حـاریس دەڵێـت: ئـێسـتا یـادی موعـافی کـوڕی عیمـران دەکەمـەوە و.. یـادی دیتـنی ڕوخـسـاری دەکەمـەوە، ئیـدی بـۆ خـۆم سـودمـەند دەبـم بـەم یـاد کـردنـەوەیـەم.[1]

چـاکان ئـاوەهـان، ئـەگـەر لە خزمـەتیاندا بـیت و سـەیـری ڕوخـسـاری پـڕ لە نـوریـان بکەیـت، بـەرەکەت وەردەگـریـت، وە ئـەگـەر لێیانـەوە دوور بـوویت یـادیـان بکەوە، سـودمـەند ئـەبیت بـە یـاد کـردنـەوەیـان.. هـەر بـۆیـە سـوفیانی کـوڕی عویـەینە دەڵێـت: کـاتێـك یـادی ئـەولیاکـانی خـوا دەکـرێتەوە، بـەرەکـەت و ڕەحمـەتی خـوا نـازڵ دەبێـت.[2]

## فـەمی کرێـچی

مـوحەممەدی کـوڕی سـیرین (رحمه الله) چـەند خـانـوویـەکی هـەبـوو بـۆ کـرێ، تـەنها بـە ئـەهلی زیمـمەی دەدا، پـێیان وت: بـۆچی خـەڵکی مـوسـوڵمانیـش نـاکـەیـتە کـرێچی خـۆت؟! وتـی: چـونکە هـەمـوو سـەری مـانگێك.. تـرس و خـەمێـك دەچـێتە دڵـی کـرێچییەوە، منیـش نـامـەوێت تـرس بخـەمـە دڵـی هیچ مـوسـوڵمـانێکەوە.[3]

---

(١) (حرمة أهل العلم: ١٤٣)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء ج٢/٤٣٤)
(٣) (رفقاء طريق/٥٧)



## تەنها یەك تەسبیحات!

عەبدولواحیدی کوڕی زەید دەڵێت: حەبیبی فارسی (رحمه الله) لە کاتی سەرەمەرگیدا، ترس و.. دڵەڕاوکێیەکی سەخت ڕووی تێکرد و.. بە زوبانی فارسی وتی: ئەمەوێت سەفەرێك بکەم، کە تا ئێستا نەمکردووە..!! دەمەوێت ڕێگایەك ببڕم، کە تا ئێستا نەمبڕیوە..!! بە نیازم بچمە خزمەت گەورە و خۆشەویستەکەم، کە هێشتا نەمدیوە..!! ئەمەوێ بڕوانمە ترس و نارەحەتییانێك، کە تا ئێستا وێنەیانم نەدیوە..!! بە نیازم بچمە ژێر خاك و لە ژێریدا بمێنمەوە، هەتا ڕۆژی پەسلان.. پاشان لە بەردەستی پەروەردگاردا ڕادەوەستێندرێم، ئەترسم پێم بڵێت: ئەی حەبیب.. تەنها یەك تەسبیحاتم بۆ بهێنە، لەو تەسبیحاتەی کە لە شەست ساڵی تەمەنتا بۆ منت کردووە و شەیتان نەیتوانی بێت هیچ زەفەرێکت پێ ببات. ئەو کاتە منی بەستەزمان چی بڵێم؟!! بێجگە لەوەی دەستەوسان بڵێم: ئەی پەروەردگارم.. ئەوەتام بە قاچی گیر بە زنجیر و.. بە دەستی کۆتکراومەوە، هاتوومە خزمەتت..!!

عەبدولواحید دەڵێت: حەبیب شەست ساڵ، سەرقاڵی خواپەرستی بووە و هیچ شتێکی دنیایی مەشغوڵی نەکردووە.. کەچی ئەوە حاڵیەتی!! ئەی ئەبێت حاڵی ئێمە چۆن بێت؟! ! پەنا دەگرین بە خوا.[1]

## بەربەرەکانێی دینی

ئیمام جەعفەری صادق (عليه السلام) دەڵێت: هەرگیز توند مەبن لە بەربەرەکانێی دیندا، چونکە دڵ دوور دەخاتەوە لە یادی خوا و.. دووڕوویی بەرهەم دەهێنێت.

---

(١) (الأتقياء الأخفياء/ ١٦٣)



## ڕۆشتم و هاتمەوە.. من هەر عومەرم

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ( رحمه الله ) شەوێك میوانێکی هات.. عومەر مەشغوڵی نووسین بوو، چراکەی خەریك بوو دەکوژایەوە، میوانەکە وتی: هەڵدەستم بەدەم چراکەوە هەتا نەهێڵم بکوژێتەوە. عومەر وتی: ئەوە لە ڕەوشت بەرزی پیاوان نییە.. کە کار بە میوانەکەیان بکەن. میوانەکە وتی: ئێ باشە.. با غوڵامەکە ئاگادار بکەمەوە..! عومەر وتی: ئەو تازە خەوی لێ کەوتووە. ئیدی عومەر خۆی هەستا چراکەی پڕ کرد لە زەیت. میوانەکە وتی: ئاخری خۆت هەستایت کارەکەت ئەنجامدا.. ئەی ئەمیری باوەڕداران؟! ! عومەر وتی: ڕۆشتم.. من عومەر بووم و، هاتمەوە.. من هەر عومەرم، هیچ کەمم نەکردووە، چاکترینی خەڵك کەسێکە خۆی بە گەورە نەزانێت لە حوزوری پەروەردگاردا.[1]

## تێر نابێت لە خەو!!

عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی لەیلا ( رحمه الله ) نوێژە سوننەتەکانی لە ماڵەوە دەکرد، کاتێك هەستی بکردایە کە کەسێك خەریکە دێتە ژوورەوە بۆ لای، نوێژەکەی دەبڕی و دەچووە ناو جێگاکەی و خۆی دەکرد بە نووستوو، دەیانگوت: ئەمە تێر نابێت لە نووستن، زۆربەی کاتەکەی خەوتووە!! ئیدی نەیاندەزانی کە بە نهێنی نوێژە سوننەتەکانی دەکات.

## شاردنەوەی گریان لە نوێژدا

ئەعمەش دەگێڕێتەوە و دەڵێت: حوزەیفەی کوڕی یەمان (رضي الله عنه) لە نوێژدا بوو دەستیکرد بەگریان، کاتێك سەلامی دایەوە بینی پیاوێك لە دوایەوە وەستاوە، حوزەیفە پێی وت: تکایە بەکەس مەڵێ کە حوزەیفە لە نوێژدا گریاوە.[2]

---

(١) (إحياء علوم الدين ٣٥٥/٣)
(٢) (حياة السلف/٢٥٢)

## چەوری پشتم ئاگرەکەی کوژاندەوە!!

خەبابی کوڕی ئەرەت.. ڕۆشـتە خزمەتی ئیمامی عومەر (ﷺ) عومەر بردیە سەرووی مەجلیسەکەیەوە و زۆر نزیکی کردەوە لە خۆی و پێی وت: کەسێك لە تۆ زیاتر شیاوی ئەم مەجلیسە نییە، بێجگە لە بیلال!

پاشان داوای لێ کرد نارەحەتترین ئەو ئازارانەی بۆ بگێڕێتەوە کە لە دەستی بێباوەڕەکان تووشی هاتبوو، بەڵام خەباب شەرمی کرد وەڵامی عومەر بداتەوە.. کاتێك عومەر مکوڕ بوو لەسەر وەڵام وەرگرتن، ئیدی خەباب پۆشاکەکەی لادا و پشتی وە دیار خست.. دیتنی ئەو دیمەنەی پشتی خەباب، عومەری تووشی ڕاچڵەکین کرد و، وتی: ئەوە چۆن ڕوویدا بۆم باس بکە؟!!

خەباب وتی: بێباوەڕەکان ئاگرێکیان بۆ کردمەوە و.. وازیان لێ هێنا هەتا پشکۆی گەشی لێ کەوتەوە.. پاشان جلوبەرگیان لە بەرمدا نەهێشت و ڕایانکێشام بە سەریدا..!! هەتا گۆشتی پشتم کەوتە خوارەوە و هیچ شتێك پشکۆکانی ڕەش نەکردەوە، ئەو چەورییە نەبێت کە لە جەستەمەوە دەچکایە سەری..!![1]

## ڕێگای دەرچوون

دزێك دەچێتە ماڵی ڕابیعەی عەدەویە (رحمها الله) شتێك دەدزێت، بەڵام کاتێك دەیەوێت بڕوات، ڕێگای دەرچوون ون دەکات و ناتوانێت بچێتە دەر!! هەر کە شتەکە دادەنێت.. ڕێگاکە دەدۆزێتەوە!! سێ جار ئەم کارە دووبارە دەکاتەوە، هەر سێ جارەکە ناتوانێت دەرگاکە بدۆزێتەوە، هەتا بە ناچاری واز لە دزیەکەی دەهێنێت و دەڕوات.[2]

(١) (صور من حياة الصحابة/٤١٧)
(٢) (الجزاء من جنس العمل: ج٢/٤٨٤)

## من بۆ خۆم دەگریەم

پرسیار دەکەن لە حەسەنی بەسری و پێی دەڵێن: هۆی چییە ئێمە ئامۆژگاری خەڵکی دەکەین و دەیانخەینە گریان، بەڵام تۆ کە ئامۆژگاری خەڵکی دەکەیت خۆت دەگریەیت؟!! حەسەن (رحمه الله) پێیان دەڵێت: شیوەن گێڕ و جەرگ سوتاو وەك یەك نین!! ئێوە شیوەن بە خەڵکی دەگێڕن.. بەڵام من جەرگم سووتاوە و بۆ خۆم دەگریەم.[1]

## لە هیچ شتێکدا.. پێشت نادەمەوە!

عومەری کوڕی خەطاب دەڵێت: ڕۆژێك رسول الله (ﷺ) فەرمانی پێکردین کە خێر و سەدەقە بکەین، منیش لەو کاتەدا پارەم هەبوو، وتم: ئەگەر بڕیار بێت ڕۆژێك پێشی ئەبوبەکر بدەمەوە، ئەوا ئەمڕۆ پێشی ئەدەمەوە. ئیدی ڕۆشتم نیوەی پارەکەم هێنا، رسول الله (ﷺ) فەرمووی: چیت هێشتۆتەوە بۆ خانەوادەکەت؟ وتم: هێندەی ئەوەی کە بۆم هێناویت. دواتر ئەبوبەکر هات و هەرچییەکی هەبوو هێنای..!! رسول الله (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبابەکر.. چیت هێشتۆتەوە بۆ خانەوادەکەت؟ ئەبوبەکر وتی: خوا و.. پێغەمبەرەکەیم بۆ هێشتوونەتەوە. عومەر دەڵێت: ئەو کاتە وتم: هەرگیز لە هیچ شتێکدا پێشی ئەبوبەکر نادەمەوە..!![2]

## چۆلەکەی مزگەوت

ڕەبیعی کوڕی خوسەیم (رحمه الله) دەڵێت: جریوە جریوی چۆلەکەکانی مزگەوت، لە خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانییەکانی خێزانەکەم.. زیاتر دڵخۆشم دەکات.

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/١٩٥)
(٢) (أبوبكر الصديق/١٣٦)



## من خراپترینم

مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) ده‌ڵێت: وه‌ڵڵاهی ئه‌گه‌ر که‌سێك له‌ ده‌رگای مزگه‌وتدا بووه‌ستێت و بڵێت: با خراپترین خه‌ڵك هه‌ستێته‌ سه‌ر پێ، ئه‌وا یه‌كسه‌ر مالیکی کوڕی دینار هه‌ڵده‌ستێت.

## سواڵکه‌ری زانست!

به‌قی کوڕی مه‌خله‌دی ناسراو به‌ ئه‌بو عه‌بدوڵڕه‌حمانی ئه‌نده‌لوسی قورتوبی (رحمه الله) تاسه‌ی بینینی ئه‌حمه‌دی کوڕی حه‌نبه‌ل ده‌كات و له‌ مه‌ککه‌وه‌ ده‌چێته‌ به‌غداد.. به‌ڵام له‌ به‌ختی ئه‌و هه‌واڵی قه‌ده‌غه‌ بوونی کۆڕ و کۆبوونه‌وه‌کانی ئه‌حمه‌دی پێده‌گات له‌ لایه‌ن ده‌سه‌ڵاته‌وه‌..!![1] بۆیه‌ غه‌مێکی زۆر دایده‌گرێت..!!

پاشان پرسیاری ماڵی ئیمام ئه‌حمه‌د ده‌كات و ده‌یدۆزێته‌وه‌ و له‌ ده‌رگاكه‌یان ئه‌دات.. ئیمام ئه‌حمه‌د دێته‌ ده‌رێ، ئه‌بو عه‌بدوڵڕه‌حمان ده‌ڵێت: وتم: ئه‌ی ئه‌با عه‌بدوڵڵا.. پیاوێکی غه‌ریب و دوور له‌ ماڵم..!! وه‌ ئه‌مه‌ یه‌که‌مین جارمه‌ دێمه‌ ئه‌م شاره‌، من فێرخوازی فه‌رمووده‌ و سوننه‌تم، وه‌ بۆ خزمه‌تی تۆ نه‌بێت بۆ هیچ شتێکی دیکه‌ نه‌ هاتوومه‌ته‌ به‌غداد..!! ئیمام ئه‌حمه‌د وتی: وه‌ره‌ په‌نای کۆڵه‌که‌که‌ با که‌س چاوی پێت نه‌که‌وێت.

پاش گفتوگۆیه‌ك ئیمام ئه‌حمه‌د بۆی ده‌ر ده‌که‌وێت، که‌ ئه‌م پیاوه‌ غه‌ریبه‌ له‌ وڵاتی ئه‌نده‌لوسه‌وه‌ ڕێگای دووری بڕیوه‌ بۆ زانست و.. له‌ مه‌ککه‌وه‌ هاتووه‌ بۆ به‌غداد، بۆیه‌ پێی خۆش ده‌بێت که‌ پشت و په‌نای بێت و یارمه‌تی بدات.. به‌ڵام ئیمام ده‌رس و ده‌وری لێ قه‌ده‌غه‌ کراوه‌..!

ئه‌بو عه‌بدوڵڕه‌حمان ده‌ڵێت: وتم: من ئه‌مه‌ یه‌که‌م جارمه‌ دێمه‌ ئه‌م شاره‌ و له‌ لای خه‌ڵکی نه‌ناسراوم، ئه‌گه‌ر ئیزنم بده‌یت، ڕۆژانه‌ له‌ شێوه‌ی ده‌رۆزه‌که‌رێکدا.. دێمه‌ به‌ر ده‌رگاکه‌ت و سواڵ ده‌که‌م (سواڵی زانست..!!) ئه‌و کاته‌ هه‌ر له‌ هه‌مان شوێنی ئێستاماندا، ئه‌گه‌ر ته‌نها یه‌ك فه‌رمووده‌شم بۆ بگێڕیته‌وه‌.. ئه‌وه‌ کیفایه‌ته‌ بۆ من. ئیمام ئه‌حمه‌د پێی وتم:

---

(١) (هه‌ر یه‌ك له‌ خه‌لیفه‌ (المأمون، المعتصم، الواثق) پشتگیری ئه‌و بیروڕایه‌ بوون که‌ ده‌یوت: قورئان مه‌خلوقه‌ (نعوذ بالله). بۆیه‌ ئازارێکی زۆری ئیمام ئه‌حمه‌د ئه‌درێت و زیندانی ده‌کرێت، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی که‌ ده‌یفه‌رموو: قورئان که‌لامی خوایه‌ و مه‌خلوق نییه‌.)

بەڵێ ئەوە بۆ تۆ بێت، بەڵام بەو مەرجەی کە خۆت لە لای خەڵك و ئەهلی فەرمووده ئاشکرا نەکەیت. منیش وتم: ئەو مەرجەش بۆ تۆ.
ئیدی ڕۆژانە عەسایەکم دەگرت بە دەستمەوە و.. مێزەرێکی پیسم دەبەست بە سەرمەوە.. قەڵەم و ئەوراقەکانیشم دەخستە ناو قۆڵی کراسەکەمەوە و.. دەهاتمە بەر دەرگاکەی ئیمام و.. هاوارم دەکرد: خێرێك، خوا ڕەحمتان پێ بکات..!! خێرێك.. لە ڕێی خوادا ئەی چاکەکاران..!!
ئیتر ئیمام دەهات، دەیبردمە پەناوە و دوو یان سێ فەرموودە یان زیاتری پێدەوتم.
ئیدی هەر بەو شێوەیە ئەبو عەبدولڕەحمان بەردەوام دەبێت، هەتا ئەو خەلیفە دەمرێت و کەسێکی تر دەچێتە شوێنەکەی، کە لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوونە دەبێت[1]، ئیمام ئەحمەدیش دەردەکەوێتەوە و، لە کۆڕەکانیدا ئەم بەسەرهاتەی ئەبو عەبدولڕەحمان دەگێڕێتەوە و سەبر و ئارام گرتنەکەی بەرز دەنرخێنێت.[2]

## لێوە بە کێ پێدەکەنن؟! !

ئیبن مەسعود (ﷺ) خەریکی لێ کردنەوەی سیواك بوو لە داری (الاراك)، قاچەکانی باریك و ناسك بوون.. ڕەشەبا پۆشاکەکەی بەری لادا و قاچەکانی دەرکەوتن، ئیدی ئەو خەڵکانەی کە بینیان پێی پێکەنین..!!
ڕسول الله (ﷺ) فەرمووی: بە چی پێدەکەنن؟!!
وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بە باریکی قاچەکانی پێدەکەنین.
ڕسول الله (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەوەی کە گیانی منی بە دەستە.. ئەو قاچانە لە تەرازووی پەروەردگاردا، قورس و سەنگینترن لە کێوی ئوحود.[3]

(١) (خەلیفە ( المتوكل: جعفر بن المعتصم) لە سالی ٢٣٢ك لەدوای (الواثق) ەوە هاتووە و لەسەر بیروڕای ئەهلی سوونە بووە، کە دەفەرموون: قورئان کەلامی خوایە. ئیدی ئیمام ئەحمەد و ئەهلی سوونە لەو میحنەتە ڕزگاریان بووە.)
(٢) (سیر اعلام النبلاء ١٣/٢٩٢ــ ٢٩٤)
(٣) (صفة الصفوة/١٤٥)

## خوا هاوبه‌شی ناوێت

ڕۆژێکیان عومه‌ری کوڕی خه‌طاب (رضي الله عنه) قامچییه‌ك ده‌دات له‌ پیاوێك..!! پاشان پێی ده‌ڵێت: هه‌قی خۆت بکه‌وه‌. پیاوه‌که‌ ده‌ڵێت: شتی وا ناکه‌م، به‌ڵکو له‌به‌ر خوا و.. پاشان له‌به‌ر تۆ، واز له‌ هه‌قی خۆم ده‌هێنم. عومه‌ر ده‌ڵێت: نه‌خێر کاره‌که‌ت به‌ باشی نه‌کرد..!! یان ئه‌وه‌تا ته‌نها له‌به‌ر من وازی لێ ده‌هێنیت، ئه‌و کاته‌ منیش پێی ده‌زانم. یاخود ئه‌وه‌تا ته‌نها له‌به‌ر خوا وازی لێ ده‌هێنیت و خوا خۆی پاداشتت ئه‌داته‌وه‌.

پیاوه‌که‌ ده‌ڵێت: ده‌ی ئه‌وه‌ منیش ته‌نها له‌به‌ر خوا وازم له‌ هه‌قی خۆم هێنا. عومه‌ریش ده‌ڵێت: به‌ڵێ، ئێستا کاره‌که‌ت به‌ باشی ئه‌نجامدا.[1]

## خاوه‌نی درێژترین ده‌ست!

عائیشه‌ی کچی ئه‌بوبه‌کر (رضي الله عنها) ده‌ڵێت: ره‌سول الله (ﷺ) فه‌رمووی به‌ هاوسه‌ره‌کانی: ئه‌و که‌سه‌تان که‌ خاوه‌نی درێژترین ده‌سته‌.. ئه‌وه‌ یه‌که‌مین که‌ستانه‌ که‌ پاش مه‌رگم پێم ده‌گاته‌وه‌!

ئیدی له‌ دوای مه‌رگی ره‌سول الله (ﷺ) کاتێك کۆ ده‌بووینه‌وه‌، ده‌ستمان درێژ ده‌کرد بۆ ئه‌وه‌ی بزانین کاممان ده‌ستی له‌ هه‌مووان درێژتره‌، به‌رده‌وام ئه‌و کاره‌مان ده‌کرد..! هه‌تا زه‌ینه‌بی کچی جه‌حش (رضي الله عنها) که‌ ئافره‌تێکی کورت بوو، وه‌ درێژترینمان نه‌بوو، کۆچی دوایی کرد..!! ئیدی ئه‌و کاته‌ زانیم که‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) مه‌به‌ستی له‌ درێژترین ده‌ست.. چاکه‌ کردن و خێرخوازی بووه‌، چونکه‌ زه‌ینه‌ب ئافره‌تێکی پیشه‌ساز بوو، به‌ ده‌سته‌کانی خۆی کاری ده‌کرد و ده‌ستکه‌وته‌که‌ی ده‌به‌خشییه‌وه‌ به‌سه‌ر هه‌ژاراندا.[2]

---

(١) (إحياء علوم الدين ٣/٢٩٦)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء: ج١/٢٧٦)



## سێ ڕۆژ پشوو

ئه‌بو عوسمانی سه‌قه‌فی ده‌ڵێت: عومه‌ری کوڕی عه‌بدولعه‌زیز غولامێکی هه‌بوو، به ئێسترێك کاری ده‌کرد و ڕۆژانه درهه‌مێکی بۆ ده‌هێنایه‌وه.. ڕۆژێکیان درهه‌م و نیوێکی بۆ هێنایه‌وه..! عومه‌ر ( رحمه الله ) وتی: ئه‌مه چییه ده‌یبینم به‌ ده‌سته‌وه‌؟! غولامه‌که‌ی وتی: له بازاڕ خه‌رجیم ده‌رهێناوه. عومه‌ر وتی: نا.. وانییه، به‌ڵکو تۆ ئێستره‌که‌ت زیاد له پێویست ماندوو کردووه، بڕۆ سێ ڕۆژ پشووی پێ بده..!![1]

## هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی مامه‌ڵه‌یه‌ك

ئه‌بو عه‌بدولڕه‌حمانی مازنی ده‌ڵێت: مه‌جمه‌عی ته‌یمی ( رحمه الله ) به دڵ و دایه‌ن. کراسێکی چنی و فرۆشتی، کڕیاره‌که نه‌نگییه‌کی تێدا بینی و کراسه‌که‌ی بۆ گێڕایه‌وه، مه‌جمه‌ع له‌و کاته‌دا ده‌ستی کرد به گریان..!! کڕیاره‌که پێی وت: مه‌گری.. من ڕازیم به کراسه‌که و نرخه‌که‌یشی بۆ خۆت!! مه‌جمه‌ع وتی: من ئه‌م کراسه‌م به شه‌وق و زه‌وقێکه‌وه چنی و به هۆی عه‌یبێکه‌وه لێم وه‌ر نه‌گیرا، له تۆش وایه بۆ پاره‌که‌ی ده‌گریم؟!! نا.. براکه‌م! وا نییه، من بۆ کرده‌وه باشه‌کانی خۆم ده‌گریه‌م، که له ماوه‌ی چل ساڵدا ئه‌نجامم داوه، ئه‌ترسم به هۆی که‌م و کوڕی و عه‌یبێکه‌وه، لێم وه‌رنه‌گیرێت و بدرێته‌وه به‌ناو چاوانمدا.[2]

## منت له یاد بێت

یه‌حیای کوڕی مه‌عاز ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: چ برایه‌کی خراپه..! ئه‌و برایه‌ی که پێویست به‌وه بکات پێی بڵێیت: له نزا و پاڕانه‌وه‌کانتا منت له یاد بێت!![3]

---

(١) (تهذيب حلية ألاولياء: ج٢/٢٠٠)
(٢) (مجموعة رسائل ابن الجوزى/٢٤٣)
(٣) (رفقاء طريق/٤٦)

## بەزەییتان بەودا بێتەوە!

ئیمام جەعفەری صادق (علیه السلام) دەڵێت: ئەگەر لە براییکتەوە شتێکت پێ گەشتەوە کە پێت ناخۆش بوو (باسی تۆی کردبوو بە خراپە) هیچ خەم مەخۆ، چونکە ئەگەر بەڕاستی وەها بێت کە ئەو وتویەتی، ئەوە سزایەکە و بۆت پێش خراوە، ئەگەر وەهاش نەبوو.. ئەوە دەبێتە چاکەیێک بۆت کە خۆت ئەنجامت نەداوە..!!

هەروەها وتیان بە عەمروی کوڕی عوبەید (رحمه الله): فلان کەس هێندە باسی خراپەی کردیت، هەتا بەزەییمان پێتا هاتەوە..!! عەمرو وتی: بەڵکو بەزەییتان بەودا بێتەوە..!![1]

## وشترێکی قەڵەو

ڕۆژێک عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) تەماشای وشترە خێرییەکان دەکات.. لە نێوانیاندا وشترێکی قەڵەو دەبینێت، پرسیار دەکات: ئەم وشترە باشە هی کێ یە؟! ! پێی دەڵێن: هی عەبدوڵلای کوڕتە!! عەبدوڵلا بانگ دەکات و پێی دەڵێت: ئەم وشترەت بە چەند کڕیوە؟ عەبدوڵلا دەڵێت: بە ئەوەندەم کڕیوە. عومەر دەڵێت: نرخەکەی هەڵگرەوە بۆ خۆت و.. وشترەکە واز لێ بهێنە بۆ بەیتولمالی موسوڵمانان..!! عەبدوڵلا دەڵێت: چۆن شتی وا دەبێت؟! ! من چەنێکە خەریکم خزمەتی دەکەم!

عومەر دەڵێت: ڕاستە خزمەتت کردووە، بەڵام لە کاتی خزمەتەکەدا دەڵێن: ئەمە وشتری کوڕی ئەمیری ئیماندارانە.. باش بیلەوەڕێنن و ئاگاداری بن، ئەمە وشتری کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە.. باش ئاوی بدەن، ئەمە وشتری کوڕی ئەمیری باوەڕدارانە.. مەی وروژێنن، کەواتە بە چەندت کڕیوە نرخەکەی هەڵگرەوە بۆ خۆت، تازە ئەم وشترە هی بەیتولمالی موسوڵمانانە..!![2]

(١) (حرمة أهل العلم: ١٢٢)
(٢) (انيس المؤمنين/٣٩)

## بۆنی میسکی لێوە دەهات!!

له ئیبراهیمی میسکی دەپرسن: تۆ بۆچی وا به بەردەوامی بۆنی میسکت لێوە دێت؟! ! ئیبراهیم ( رَحِمَهُ اللهُ ) له وەڵامدا دەڵێت: وەڵلاهی.. ساڵانێکی زۆرە میسکم بەکار نەهێناوە، بەڵام هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئافرەتێك بە فێڵ و تەڵەکە بردمیە ماڵەکەی خۆی و دەرگاکانی لەسەر داخستم و ویستی لەگەڵی جووت ببم، منیش لەو کارەدا دامام و نەمدەزانی چی بکەم؟! ! لەناکاو فێڵێك هات بە بیرمدا و بە ئافرەتەکەم وت: پێویستە من دەست بە ئاو بگەیەنم. ئیدی ئافرەتەکە لەگەڵ کەنیزەکێکیدا ناردمی.. کاتێك چوومە ناو توالێتەکەوە، پیسیم هەڵگرت و ماڵیم بە جەستەمدا..!! پاشان بەو حاڵەوە گەڕامەوە بۆ لای ئافرەتەکە، کاتێك بینیمی تووشی شۆك هات و فەرمانیدا بکرێمە دەرەوە، منیش گەڕامەوە بۆ ماڵ و خۆم شووشت، شەوەکەی له خەونمدا دەنگێك پێی وتم: "کارێك کە تۆ کردت، کەس نەیکردووە، بۆیە لە دنیا و لە ئاخیرەتدا بۆنخۆشت دەکەم." بۆ بەیانییەکەی کە هەستام بۆنی میسکم لێوە دەهات و هەتا ئێستاش ئەو بۆنە خۆشە بەردەوامە.[1]

## تۆ لە بەهەشت بوویت!!

پیاوێك بە عەلائی کوڕی زیاد دەڵێت: لە خەونمدا بینیم تۆ لە بەهەشت بوویت. عەلاء ( رَحِمَهُ اللهُ ) پێی دەڵێت: هەی بەلا لێت بدات..!! شەیتان کەسی نەدۆزیەوە پێی ڕابوێرێت من و تۆ نەبێت؟![2]

(١) (موسوعة الأخلاق ج٢٨١/١)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء ج٣٨٠/١)



## بزنێك ده‌ورێكی مه‌دینه‌ ئه‌دات

ئه‌عمه‌ش له‌ موجاهیده‌وه‌ ( رحمه الله ) ده‌گێڕێته‌وه‌ و ده‌ڵێت: له‌ مه‌دینه‌دا ماڵێكی كه‌مده‌ست و هه‌ژار هه‌بوو، ته‌نیا بزنێكیان هه‌بوو، جارێك خێرێكیان بۆ ڕۆشت و وتیان: باشتره‌ ئێمه‌یش ئه‌م بزنه‌ بنێرین بۆ كه‌سانێك كه‌ له‌ ئێمه‌ هه‌ژارتر بن.

ماڵه‌كه‌ بزنه‌كه‌یان برد و به‌ نێو ماڵه‌كانی مه‌دینه‌دا گه‌ڕاندیان، به‌ڵكو ماڵێكی هه‌ژار وه‌ری بگرێت و به‌خێوی بكات بۆ خۆی، به‌ڵام كه‌س خۆی به‌ شیاوتر نه‌ئه‌زانی هه‌تا بزنه‌كه‌ گل بداته‌وه‌، بۆیه‌ سه‌ره‌نجام بزنه‌كه‌ هاته‌وه‌ بۆ ئه‌و ماڵه‌ی كه‌ لێوه‌ی ده‌رچوو بوو.[1]

## ئه‌تناسم.. باشترین ناسین

ئه‌سمه‌عی له‌ باوكیه‌وه‌ ده‌گێڕێته‌وه‌ و ده‌ڵێت: موهه‌للەبی كوڕی ئه‌بی سوفره‌، به‌ فیزێكه‌وه‌ به‌ لای مالیكی كوڕی دیناردا تێپه‌ڕی كرد و خۆی با ئه‌دا..! مالیك پێی وت: ئایا نازانی ئه‌و جۆره‌ ڕۆشتنه‌ په‌سه‌ند نه‌كراوه‌.. ته‌نها له‌ نێوان به‌ره‌كانی جه‌نگدا نه‌بێت؟!!

موهه‌للەب وتی: ئه‌ی ئایا تۆ من ناناسیت؟!

مالیك ( رحمه الله ) وتی: ئه‌تناسم.. باشترین ناسین.

موهه‌للەب وتی: ده‌ی كه‌وایه‌ چی ده‌زانیت ده‌رباره‌م؟

مالیك وتی: سه‌ره‌تاكه‌ت، نوتفه‌یه‌كی پیس و بۆگه‌ن بوویت..!! كۆتاییه‌كه‌شت لاشه‌یه‌كی بۆگه‌ن كردوویت..!! ئێستاش تۆ له‌ نێوان سه‌ره‌تایه‌كی بۆگه‌ن و كۆتاییه‌كی بۆگه‌ندا.. پیسایی هه‌ڵده‌گریت..!!

موهه‌للەب وتی: ئێستا منت ناسی، باشترین ناسین.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٣٧٤)
(٢) (تهذيب حلية ألاولياء: ج١/٤٢٩)



## کوڕەکەت بۆچی دەگریەت؟!!

فوزەیلی کوڕی عەیاز ( رحمه الله ) دەڵێت: عەلی کوڕم گریا..!! پێم وت: ئەی کوڕەکەم بۆچی دەگریەیت؟! عەلی وتی: ئەترسم لە ڕۆژی دواییدا یەك نەگرینەوە!!

هەروەها فوزەیل دەڵێت: عەلی پێی وتم: ئەی بابە گیان، داوا لەو کەسە بکە کە لەم دنیا منی پێبەخشیویت.. با لەو دنیاش بمبەخشێتەوە پێت.

فوزەیل دەڵێت: عەلی کوڕم.. بەردەوام دڵشکاو و غەمبار بوو. پاشان فوزەیل بە گریانەوە دەڵێت: ئەو یارمەتی دەرم بوو لەسەر دڵتەنگی و گریان.. ئەی بەری دڵم.. خودا پاداشتی ئەو چاکانەت بداتەوە، کە خۆی زانایە پێیان.[1]

## باشترین پارێزەر

شێخ ئەبوبەکری کەتانی ( رحمه الله ) نوێژ دەکات و ئاگای لە دەوروبەری نابێت، دزێك دێت و پۆشاکەکەی دەبات و دەڕوات بۆ ئەوەی بیفرۆشێت، کاتێك دەیەوێت بیدات بە کڕیارەکە، دەستی وشك دەبێت و ناتوانێت بیجووڵێنێت!

ئیدی بێ دواکەوتن پۆشاکەکە دەباتەوە بۆ شێخ و بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش نزای بۆ دەکات و دەڵێت: ئەی پەروەردگارم.. ئەو شتەی کە لێمی برد بوو بۆی هێنامەوە، تۆش بەڕەحم و لوتفی خۆت، ئەوەی پێ ببەخشەوە کە لێت سەندەوە.

دوای پاڕانەوەکە، بە سۆز و میهرەبانی خوای گەورە دەستی دزەکە چاك دەبێتەوە.[2]

(١) (سير اعلام النبلاء ٤٤٤/٨ ـ ٤٤٥)
(٢) (الجزاء من جنس العمل: ج٤٨٤/٣)

## ترسی دووڕوو بوون

پیاوێك دەڵێت بە حوزەیفەی کوڕی یەمان (رضي الله عنه): دەترسم دووڕوو بم. حوزەیفە پێی دەڵێت: ئەگەر دووڕوو بوویتایە.. ترسی دووڕوو بوونت نەبوو، مادام ترست هەیە.. کەواتە دووڕوو نیت.

## باوکە.. هەژارت خستین!

ئەبی عەمروی کیندی دەڵێت: سەربازەکانی ڕۆم پەلاماری گامێشەکانی (بەشیری تەبەری) یان دا و.. بردیانن، کە نزیکەی چوار سەد گامێش دەبوون..!! بەشیر داوای کرد لێم هاوڕێتی بکەم، منیش بوومە هاوەڵی و لەگەڵ یەکێك لە کوڕەکانی خۆی، لە خزمەتیدا ڕۆشتین.

ئەو غوڵامانەی بەشیر کە لەگەڵ گامێشەکانیدا بوون پێمان گەشتنەوە، گۆچانەکانیان بە دەستیانەوە بوو، گوتیان: ئەی گەورەمان.. گامێشەکان ڕۆشتن..!! بەشیر (رحمه الله) وتی: دەی ئێوەش بڕۆن.. ئازاد و سەربەخۆ بن لە ڕێی خوادا. کوڕەکەی پێی وت: بابە گیان هەژارت خستین..!! بۆ وات کرد؟! ! بەشیر گوتی: بێدەنگ بە کوڕەکەم.. پەروەردگارم تاقی کردمەوە، منیش پێم خۆش بوو بۆی زیاد کەم.[1]

## لەهلی زانست

ئەبودەرداء (رضي الله عنه) دەڵێت: فێرخوازی زانست بن، ئەگەر بۆتان نەکرا ئەوا ئەهلی زانستتان خۆش بووێت، ئەگەر ئەوەشتان بۆ نەکرا.. ئەوا ڕقتان لێیان نەبێتەوە.[2]

(١) (الرضا عن الله /٥٤ ـ ٥٥)
(٢) (حياة السلف/٥٨)

## خانووه بێ سه‌قفه‌كان!

عه‌لقه‌مه‌ی كوڕی مه‌سـه‌د ده‌ڵێت: ڕۆژێك ئه‌بو موسلیمی خه‌ولانی چووه مزگه‌وت، سه‌یری كرد چه‌ند نه‌فه‌رێك كۆبوونه‌ته‌وه.. ئومێدی كرد له‌و كۆمه‌ڵه‌یه كه زیكری خێر و یادی په‌روه‌ردگار بكه‌ن، بۆیه ڕۆشته ناو كۆڕه‌كه‌یانه‌وه دانیشت.. به‌ڵام سه‌یری كرد یه‌كێكیان باسی غوڵامه‌كه‌ی ده‌كات و..!! یه‌كێكی دیكه‌یان باسی خزمه‌تكاره‌كه‌ی..!! به‌و شێوه‌یه هه‌موویان خه‌ریكن له مزگه‌وت دا باسی دنیا ده‌كه‌ن..!

ئیتر ئه‌بو موسلیم ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) سه‌یرێكی كردن و وتی: ئه‌زانن نموونه‌ی من و ئێوه وه‌ك چی وایه؟! وه‌ك ئه‌وه وایه پیاوێك، لێزمه بارانێكی به‌خوڕ لێی بدات، لایه‌ك بكاته‌وه.. دوو تاك ده‌رگای گه‌وره ببینێت و بڵێت: ئه‌گه‌ر بڕۆمه ئه‌و ماڵه باشتره بۆم.. هه‌تا ئه‌م بارانه خۆش ده‌كات. ئیدی ده‌ڕواته ماڵه‌كه‌وه و ده‌بینێت خانووه‌كه سه‌قفی نییه..!! منیش هاتم له لای ئێوه دانیشتم و ئومێده‌وار بووم كه له‌سه‌ر زیكر و خێربن، به‌ڵام ده‌بینم ئێوه هاوه‌ڵانی دنیان.. ئه‌گه‌ر چی له مزگه‌وتیشدان.[1]

## وه‌ڵامێك بۆ شه‌یتان

حاته‌می ئه‌صه‌م ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) ده‌ڵێت: به‌یانییه‌ك نییه شه‌یتان پێم نه‌ڵێت: ئه‌مڕۆ چی ده‌خۆیت؟ چی ده‌پۆشیت؟ له كوێ نیشته‌جێ ده‌بیت؟ منیش پێی ده‌ڵێم: ئه‌مڕۆ مه‌رگ ده‌چێژم.. كفن ده‌پۆشم و.. له گۆڕدا نیشته‌جێ ده‌بم.[2]

(١) (حلية الاولياء ٢/١٢٣)
(٢) (رفقاء طريق/٦٤ ـ ٦٥)

## قەزای خوام پێ باشترە

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) بە هۆی بەرەکەتی نزای پێغەمبەری نازدارەوە (ﷺ) دۆعاکانی گیرا دەبوون.. سەعد گەشتە مەککە و بینایی چاوەکانی لە دەست دا بوو.. خەڵکی بە هەڵەداوان دەڕۆشتنە خزمەتی، هەر یەکە و داوای دۆعایێکی لێدەکرد، ئەویش دۆعای بۆ ئەم و ئەو دەکرد و دۆعاکانی گیرا دەبوون لای پەروەردگار..!
عەبدوڵڵای کوڕی سائب دەڵێت: ئەو کاتە من لاوێك بووم، هاتمە خزمەتی و خۆم پێناساند.. سەعد ناسیمی و پێی وتم: تۆ قورئان خوێنەکەی مەککەیت؟ وتم: بەڵێ. پاشان دواتر پێم وت: مامۆ گیان.. تۆ دۆعا بۆ خەڵکی دەکەیت و دۆعاکانت گیرا دەبن لای پەروەردگار، باشتر بوو ئەگەر دۆعایێکیشت بۆ خۆت بکردبا، هەتا خودا بینایی چاوەکانتی بۆ دەگێڕایەتەوە! سەعد زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: ئەی کوڕەکەم.. قەزای خوام پێ باشترە هەتا ڕۆشنایی چاوەکانم..!![1]

## لە مردووانیش شەرمی دەکات!

عائیشەی دایکی باوەڕداران (رضي الله عنها) دەڵێت: پێشتر دەچوومە ئەوماڵەی کە رسول الله (ﷺ) و باوکمی تێدا دفن کرا بوون و، حیجابم لا دەبرد و دەمگوت: ئەمەیان مێردەکەمە و ئەمەشیان باوکمە، بەڵام دواتر کە عومەری کوڕی خەطابی تیا دفن کرا.. سوێند بە خوا هەرکات دەچوومە ژوورێ.. توند پۆشاکەکەم لە خۆم دەپێچا و حیجابم ڕیعایەت دەکرد، وەك شەرمێك لە عومەر..!![2]

---

(١) (مدارج السالكين ٢/٢٢٧)
(٢) (عائشة أم المؤمنين/١٦٥_ ١٦٦)

## دەتەوێت چیت بۆ بنووسن؟! !

ڕەبیعی کوڕی خوسەیم (رحمه الله) بەیانیان بەر لە هەموو شتێك دەیگوت: مەرحەبا.. لە فریشتەکانی ڕەحمان، ئادەی بۆم بنووسن.. بسم الله الرحمان الرحیم، سبحان الله.. والحمد لله.. ولا اله الا الله.. والله اکبر.[1]

## نزاکەی سەعید.. کوشتمی!

ئەو دەمەی سەعیدی کوڕی جوبەیر (رحمه الله) برایە بەردەم حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی زاڵم..

حەججاج پێی وت: ناوت چییە؟

سەعید وتی: سەعیدی کوڕی جوبەیر. (واتە: دڵخۆشی کوڕی چاککەرەوە.)

حەججاج وتی: بەڵکو تۆ چارەڕەشی کوڕی شکێنەری.

سەعید وتی: دایکم زاناترە بە ناوم، هەتا تۆ.

وتی: چارە ڕەش خۆت و دایکت.

سەعید وتی: غەیب خودا دەیزانێت، نەوەك تۆ.

حەججاج وتی: هەر لە دنیادا ئاگری کڵپەدارت پیشان دەدەم.

سەعید وتی: ئەگەر بمزانیبا ئەوە بە دەست تۆیە، ئەوا دەمکردیتە خودای خۆم.

حەججاج وتی: چی دەڵێیت سەبارەت بە موحەممەد (ﷺ)؟

سەعید وتی: پێغەمبەری ڕەحمەتە، ئیمامی ڕێنیشاندەرە، درووود و سەلامی لەسەر بێت، نێردراوی خودای جیهانیانە بۆ هەموو ئادەمیزاد بە گشتی، لە ڕێی چاکترین ئامۆژگارییەوە.

حەججاج وتی: ئەی عەلی کوڕی ئەبو طالب لە بەهەشتە؟ یان لە دۆزەخ؟

سەعید وتی: ئەگەر چوویتە ناوی، ئەهلەکەی دەبینیت و دەزانیت کێی تێدایە، ئیدی پرسی چیتە لە نادیارێك کە پەردە پۆش کراوە و پارێزراوە؟!

حەججاج وتی: ئەی بۆ خەلیفەکان چی دەڵێیت؟

سەعید وتی: من بریکاری ئەوان نیم، هەر کەسە و لە ڕەهنی

---

(١) (رفقاء طریق/٦٥)



کـرده‌وه‌کانیدایـه‌.

حه‌جاج وتی: قســــه‌یان پێ بڵێم یان مـه‌دحـیان بکه‌م؟

سـه‌عید وتی: ئـه‌وه‌ی نـایـزانـم نایڵێم، به‌ڵکو پـارێـزه‌ری نه‌فســی خـۆمـم.

حه‌جاج وتی: به کام له خه‌لیفه‌کان ســه‌رســامیت؟

ســـه‌عید وتی: ئـه‌وه‌یان زیـاتـر پـه‌روه‌ردگارم لێی ڕازییه.

حه‌جاج وتی: ده‌ی کامیان زیـاتـر پـه‌روه‌ردگار لێی ڕازییه؟

ســـه‌عید وتی: ئـه‌وه زانسـتی که‌سێکه، که دیـــار و نـادیـــاریـان ده‌زانێت.

حه‌جاج وتی: ئـه‌ی من چ پیاوێکم له ڕۆژی په‌ســلاندا؟

ســـه‌عید وتی: مـن ســوکترم له‌وه‌ی که خـودا غه‌یبم بـۆ دیـارخـات.

حه‌جاج وتی: نـاتـه‌وێ بـاوه‌ڕم پێبکه‌ی؟

ســـه‌عید وتی: به‌ڵکو نامـه‌وێت به درۆت بخه‌مـه‌وه.

حه‌جاج وتی: واز له‌هه‌موو ئه‌مانـه بهێنه، بزانم چیته وا قه‌ت پێنه‌که‌نیویت؟!

ســـه‌عید وتـی: شـــتێکم نه‌دیـــوه بمخاتــه پێکه‌نــین، چــۆن دروســتکــراوێ ده‌تخاتـه پێکه‌نـین که له گڵ دروســتکـراوه، گـڵیش ئـاگـر ده‌یخـوات..!!!

حه‌جاج وتی: ئـه‌دی ئـێمه بـۆ پێده‌که‌نین؟

ســـه‌عید وتی: دڵـه‌کان وه‌ك یـــه‌ك نـین.

حه‌جاج وتی: ئـایا شـــتێکت دیـوه له گـاڵته و گه‌پ؟

وتی: له‌و بـاره‌یـــه‌وه هیچ نـازانم.

حه‌جـاج فه‌رمانیـدا عـــود و شـــمشـــاڵیان هێنـا، عـــود لێدرا و فـــووکـــرا بـــه نـه‌یـدا، ئیدی ســـه‌عید گـریا..! حه‌جاج وتی: چ شـــتێك ده‌تگریـــه‌نێت؟!

ســـه‌عید وتی: ئـه‌ی حه‌جاج.. کارێکی گـه‌وره‌ت بـــیر هێنامـــه‌وه، ســوێــند به خـودا نه تـێر بـــووم و نه پـــاراوبـــووم و نه هـیچم ده‌ســـتکه‌وت، وه هـێشـــتا دڵته‌نگم بـۆ ئـه‌وه‌ی که بـینیم.

حه‌جاج وتی: ئـه‌ی ئـــه‌و بـــه‌زم و ڕه‌زمـــه‌ت نـه‌دی؟

سه‌عید وتی: ســوێند به خـودا.. ئـه‌ی حه‌جاج ئـه‌وه‌ی تــۆ ده‌ڵێی گـاڵته و گه‌پ، ئـه‌وه دڵته‌نگییه، فـووکـردن به نه‌یه‌که‌دا ڕۆژێکی گه‌وره‌ی بیر هێنـامه‌وه.. ئــه‌و ڕۆژه‌ی فـوو به که‌ڕه‌نادا ده‌کرێ، عوده‌که‌ش دره‌ختێکه بـۆ هـــه‌ق نه‌براوه‌تـــه‌وه، ژێـکانــیش ڕیخـۆڵـه‌ن، ڕۆژی پـــه‌ســلان له‌گه‌ڵتدا زیــندوو ده‌کـرێــنه‌وه.

حه‌جاج وتی: من له تـۆ خـۆشـــه‌ویســترم له لای خـودا.

ســـه‌عید وتی: که‌س پێشـــناخـرێ لای خـودا هـه‌تـا جـێگه‌ی خـۆی نـــه‌زانێ، تـه‌نـها خـودا زانـایه به غه‌یب.

حه‌جاج وتی: چۆن پێشـــناخرێم له‌لای خـودا که مـن له‌م پـله و پـایه‌دام، مـن له‌گه‌ڵ ئیمامی جه‌ماعه‌دام و تـۆ له‌گه‌ڵ ئیمامی جودایی و فیتنه‌دایت.

ســـه‌عید وتی: من له جه‌ماعه‌ت ده‌رنه‌چـووم، وه ڕازیـش نـیم به فـیتنه، به‌ڵام



قـەزای خـودا ناگەڕێـتەوە.
حەججاج وتی: ئـەوەی بـۆ ئـەمیری باوەڕدارانی کـۆ دەکەینەوە، چۆنی دەبینی؟
ســـەعید وتی: نـەمدیــوە.
حەججـاج فـەرمـانیدا.. ئاڵـتون و زیـــو و گەوهـــەر و مـــرواری و یـاقــوتــیان هـێنـا و لـە بـەر دەسـتی سـەعـیدی کـوڕی جـوبـەیـردا خـڕیان کـردەوە.
سـەعید وتی: ئـەمـە باشـە.. ئـەگـەر شـەرتەکەی بەجێ بهێنێت.
حەججاج وتی: شــەرتەکەی چییە؟
ســـەعید وتی: بـەوەی خـڕت کـردۆتـەوە، (ئـەمــان) بکـڕیت لە ترســی ڕۆژی دوایی، ئـەوە چـــاکە، دەنــا بە یەك تــرس خـۆشـــییەکانی هـەمـوو دنیـات بـیر دەبـاتــەوە.. خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾[١]

واتە: لەو ڕۆژەدا ئێـوە ئـەو بـومـەلـەرزە دەبـینن.. هــەموو دایکێکـی شـــیردەر کە مـەمکی لە دەمی کـۆرپــەکەیدایە، لە ترســی ئــەو ڕۆژە بـێ ئـاگا دەبێـت لەو منداڵـەی کە شـــیری پێداوە، وە هــەموو ئـافـرەتێکی دوو گیـان، کۆرپــەکەی نـاو سـکی لەبـار دەچـێت و فـڕێی دەدات، وە خەڵکی دەبینی ســـەرخـۆشـــن، بەڵام ســـەرخـۆشـــیش نـین، بەڵکـو ســـزای ســـەخت و بـــە تـینی خــودا وای لـێ کـردوون.[٢] وە بـێجگە لەوەی کە پاڵــفتە کـراوە لە هــەموو پیســـییەك، خێــر لە شـــتێکدا نییە کە بــۆ دنـیا کـۆ کرابێـتەوە.
حەججاج وتی: ئـەوەی کـۆمـانکـردۆتــەوە بـە چـاکە دەیبینی یـان بـە خـراپـە؟
ســـەعید وتی: بە بـیر و بــۆچــوونی خـۆت کــۆتکــردۆتـــەوە، کـەواتــە هــەر خـۆت دەزانـیت چـاکـە یـان خـراپە.
حەججاج وتی: پێـتخــۆشــە شـــتێکت لـەمــانـە هـەبـێت؟
ســـەعید وتی: ئـــەوەم خـۆشـــناوێ کە خـودا خـۆشـــی نـاوێ.
حەججاج وتی: بـــەڵا و ئـــازار لـێـت بـدا.
سەعید وتی: بـەڵا و ئازار بـۆ ئــەو کەسـەی دوور دەخرێـتەوە لە بـەهەشــت و دەخرێــتە نـاو ئـاگـرەوە.
حەججاج وتی: هـەڵبژێـرە ئـەی ســـەعید.. چ کـوشـتنێك بـتکـوژم؟
ســـەعید وتــی: هـــەڵبژێرە بـــۆ خــۆت ئـــەی حەججـاج!! وەڵڵاهــی بـــە چ

---

(١) (الحــج/٢)
(١) (پـوختەی تەفـسیری قـورئـان/٣٣٢)

کـوشــتنێـك بمكوژی، بـه‌ هـه‌مـان كـوشــتن خـودا ده‌تكـوژێـته‌وه‌ لـه‌ ڕۆژی دوایی.
حه‌ججاج وتی: ئـه‌ی ده‌ته‌وێ بتبه‌خشــم؟
ســـه‌عید وتـی: ئـه‌گــه‌ر به‌خشـــین بێـت ئــه‌وا له‌ خـوداوه‌یـــه‌، وه‌ تــۆ هــیچ ڕزگـاربــوون و بـیانــوویـه‌كت نییه‌.
حه‌ججاج وتی: ببه‌ن بیكـوژن.
كاتێـك سه‌عید له‌ ده‌رگاكه‌ چــووه‌ ده‌ر پێكه‌نـی، به‌ حه‌ججاجیـان گـوت: سـه‌عید پێده‌كه‌نـێت!! ئـه‌ویش گه‌ڕاندییه‌وه‌ و پێی وت: چـشتێـك خســتیتیه‌ پێكه‌نــین؟!
وتی: له‌ بـوێـری تـۆ بـه‌رامـبه‌ر بـه‌ خـودا و، لــه‌ حیلمـی خــودا لـه‌ســـــه‌ر تــۆ، ســـه‌رم ســـوڕمـاوه‌..!!
حه‌ججاج فــه‌رمـانیدا كه‌ بیكـوژن، سه‌عید وتی: فـرسه‌تێكم بده‌نێ تـا دوو ڕكـات نوێـژ ئـه‌داكه‌م. سه‌عید ڕوویكـرده‌ قیبله‌ و وتی:

﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾[١]

واته‌: به‌ڕاســتی من ڕووی خـۆم وه‌ر ئـه‌گێڕم بـۆ لای زاتێـك كه‌ ئـاســمانــه‌كان و زه‌وی به‌ ده‌ســـت هێنــاوه‌، جـگه‌ له‌ خــودا ڕووم له‌ هیچـی تــر نــاكه‌م، وه‌ بـێ گـومــان من له‌ هـاوبـه‌ش په‌یداكه‌ران نیم.[٢]
حه‌ججاج وتی: ڕووی وه‌رگـێــڕن لــه‌ قـیبله‌.
وه‌ریـانگـێـڕا و ســـــه‌عید وتـی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ﴾[٣]
واته‌: ڕوو بكه‌نـه‌ هـه‌ر لایـه‌ك ئـه‌وه‌ ڕووگــه‌ی خـودا له‌وێـیه‌.[٤]
وتی: بـیخه‌ن به‌ ده‌مدا.
ســـه‌عید وتی: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى ﴾[٥]
واته‌: له‌م زه‌ویـیه‌ دروســـتمان كــردوون، دووبـاره‌ ده‌تانگـێــڕینه‌وه‌ نــاو زه‌وی (به‌ مردوویــی) وه‌ جــارێكی تــر له‌و زه‌ویـیه‌ ده‌رتــان ده‌هێــنینه‌وه‌ (به‌ زینــدوویی بـــۆ لێپرســینه‌وه‌).[٦]
حه‌ججاج وتی: ســـه‌ری بــبڕن.

---
(١) (الأنـعام/٧٩)
(٢) (پوخته‌ی ته‌فسیری قـورئـان/١٣٧)
(٣) (البقـــرة/١١٥)
(٤) (پوخته‌ی ته‌فسیری قـورئـان/١٨)
(٥) (طـه/٥٥)
(٦) (پوخته‌ی ته‌فسیری قـورئـان/٣١٥)



سەعید وتی: من شایەتیت لەسەر دەدەم کە هیچ خودایەك نییە (ٱللَّهُ) نەبێت، تاك و تەنها و بێ هاودەمە و موحەممەد (ﷺ) بەندە و نێردراویەتی.. هەتا ڕۆژی دوایی یەك دەبینینەوە، ئەی حەججاج.

پاشان سەعید پاڕایەوە لە خوا و وتی: ئەی پەروەردگارم.. لە دوای من، دەسەڵاتی مەسەپێنە بەسەر کەسێتردا کە بیکوژێ.

سەعید بە سەربڕین شەهادەتی وەرگرت و پاش خۆی خودا پاڕانەوەکەی گیرا کردو ئەو دواهەمین کەس بوو کە حەججاج توانی بیکوژێت.

دەڵێن: حەججاجیش دوای ئەو.. ماوەی پازدە ڕۆژێك ژیا و بەردەوام تا لە ژیاندا بوو هاواری دەکرد: من چیم دابوو لە سەعیدی کوڕی جوبەیر؟! هەر کات دەمەوێ بنووم سەعید قاچم دەگرێت!

هەروەها دەڵێن: حەججاج تەنها چل ڕۆژ دوای سەعید ژیاوە، هەر کات خەوی لێدەکەوت، لە خەونیدا سەعیدی ئەبینی، جلکەکانی ئەگرت و پێی دەوت: ئەی دوژمنی خوا.. بە چ هەقێك کوشتمت؟! حەججاجیش دەیگوت: من چیم دابوو لە سەعیدی کوڕی جوبەیر؟! من چیم دابوو لە سەعیدی کوڕی جوبەیر؟![1]

## یەکەمین بیدعە

عائیشەی دایکی ئیماندارن (ﷺ) دەڵێت: یەکەم بیدعە کە هاتە ناومانەوە پاش مەرگی پێغەمبەر (ﷺ) تێر خواردن بوو، خەڵکی کاتێك تێر دەبن.. نەفس و هەوا و ئارەزوویان، ڕوو دەکاتە دنیا.

## دزی ڕۆژ و.. دزی شەو

حەسەنی بەسری (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) چەند جەندرمەیەك دەبینێت کە پەلی دزێکی ئاساییان گرتووە و دەیبەن بۆ لای حاکمی شار، حەسەن لەو ساتەدا دەڵێت: بەڕاستی زۆر سەیرە.. دزی شەو (کە پێدەچێت لەبەر موحتاجی دزی بکات) دەبرێت بۆ لای دزی ڕۆژ (کە بە ڕۆژی ڕوون قووتی میللەت دەخوات)..!!

---

(١) (الف قصة وقصة/٥٢ ـ ٥٦)



## لومێده‌واری جیا بوونه‌وه‌یت!

زورعه‌ی کوڕی ئیبراهیم ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: پیاوێك هاته لای عومه‌ری کوڕی خه‌طاب و پێی وت: من دایکێکی به ساڵاچووم هه‌یه، به کۆڵمه‌وه ده‌یگێڕم و ده‌یبه‌مه ده‌ستشۆر، هه‌ر خۆیشم پاکی ده‌که‌مه‌وه.. به‌ڵام له‌و کاتانه‌دا ڕووم وه‌رده‌گێڕم له دایکم بۆ ئه‌وه‌ی هه‌ست به شه‌رمه‌زاری نه‌کات، ئایا پاداشتی چاکه‌کانیم داوه‌ته‌وه؟

عومه‌ر (ﷺ) وتی: نه‌خێر.

پیاوه‌که وتی: من ئه‌و هه‌موو خزمه‌ته‌ی ده‌که‌م و تۆ ده‌ڵێیت: نه‌خێر؟!! عومه‌ر وتی: ئه‌وه‌ی که تۆ بۆی ده‌که‌یت، ئه‌و پێشتر بۆ تۆی کردووه و نزای مانه‌وه‌تی ده‌کرد له ژیاندا، تۆش هه‌مان شتی بۆ ده‌که‌یته‌وه، به‌ڵام ته‌مه‌نای جیا بوونه‌وه‌ی ده‌که‌یت و خواخواته زوو بمرێت.[1]

## شمشێرێك.. بێباوەڕ و باوەڕدار بناسێت

موحه‌ممه‌دی کوڕی سیرین ده‌ڵێت: وتیان به سه‌عدی کوڕی ئه‌بی وه‌قاص: تۆ له ئه‌هلی شورایت و هه‌قتره تۆ شه‌ڕ بکه‌یت (شه‌ڕی ناوخۆی موسوڵمانان) هه‌تا که‌سێکی دیکه، ئیتر بۆ شه‌ڕ ناکه‌یت؟!

سه‌عد (ﷺ) وتی: شه‌ڕ ناکه‌م هه‌تا شمشێرێکم بۆ نه‌هێنن که دوو چاو و.. دوو لێو و.. زوبانێکی هه‌بێت، مرۆڤی باوه‌ڕدار له بێباوه‌ڕ جیا بکاته‌وه!! چونکه من جیهادم کردووه و زۆر باش ده‌زانم جیهاد چۆنه!![2]

وه عه‌لی کوڕی ئه‌بوطالب (عليه السلام) ده‌ڵێت: هیچ کات گوێم لێ نه‌بووه که رسول الله (ﷺ) دایك و باوکی بکات به قوربانی هیچ که‌س، بێجگه له سه‌عدی کوڕی ئه‌بی وه‌قاص نه‌بێت، گوێم لێ بوو له جه‌نگی ئوحود دا ده‌یفه‌رموو: سه‌عد تیر بهاوێژه.. دایك و باوکم به قوربانت بێت.

---

(٢) (البر والصلة/٤٠)
(١) (حلية الأولياء: ج١/٩٥)

## فەرزەکان کەمن!

بیلالی کوڕی سەعد (رحمه الله) دەڵێت: وەڵلاهی.. ئەگەر لە دنیادا پاداشتی چاکەکانتان بۆ پێش بخرایە، ئەوسا ئەوەی لە سەرتان فەرز کراوە زۆر بە کەمتان دەزانی.

## ئاخوڕێکمان بۆ دروست بکەن!!

پرسیار دەکەن لە سەهلی توستەری (رحمه الله): ئەگەر کەسێك لە ڕۆژێکدا یەك ژەم نان بخوات، چۆنە بە لاتەوە؟ سەهل دەڵێت: ئەوە خواردنی ڕاستگۆکانە، کە پلەیەك لە خوار پێغەمبەرانەوەن. پێی دەڵێن: ئەی ئەگەر دوو ژەم نان بخوات؟ سەهل دەڵێت: ئەوە خواردنی ئیماندارانە. دەڵێن: ئەی ئەگەر سێ ژەم نان بخوات؟ سەهل دەڵێت: ئەوە بڵێن بە خانەوادەکەی: با ئاخوڕێکی بۆ دروست بکەن.[1]

## پارەی فۆت.. پارەی هاوڕێکەتە؟!

ڕەباحی کوڕی جەڕاح دەڵێت: فەتحی موسڵی (رحمه الله) چووە ماڵی هاوڕێیەکی کە ناوی عیسای تەممار بوو. عیسا لە ماڵ نەبوو، فەتح بە خزمەتکاری ماڵەکەی وت: بڕۆ کیسە پارەی براکەمم بۆ بهێنە..! خزمەتکارەکە کیسەکەی بۆ هێنا و.. فەتح دوو درهەمی لە ناو پارەکاندا دەرهێنا و ڕۆشت، کاتێك عیسا هاتەوە، خزمەتکارەکە بە سەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.. عیسا وتی: ئەگەر ڕاست بکەیت ئەوا تۆ ئازادیت. عیسا سەیری پارەکانی کرد، بینی کە خزمەتکارەکە ڕاستگۆیە، ئیتر ئازادی کرد!![2]

---

(١) (این نحن من هؤلاء: ج٥/٨)
(٢) (التبصرة لابن الجوزی ٢/ ٣٠٢)



## خواردنی سەرۆك

ئەبو ئومەیەی غولامی عومەری کوڕی عەبدولعزیز ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دەڵێت: ڕۆژێك فاتمەی خێزانی عومەر بۆ نیوەڕۆ نیسكی پێدام، منیش وتم: ئەمە چی بوو.. هەموو ڕۆژێك هەر نیسك؟! ! فاتمە وتی: ناشوكر مەبە، ئەی كوڕەكەم.. ئەمە خواردنی گەورەكەتە، كە ئەمیری باوەڕدارانە.[1]

## كەی دەگەڕێتەوە؟! !

ئەحمەدی كوڕی سالم دەڵێت: كەسێك دای لە دەرگای ماڵی ئیبراهیمی خەواص، مەیمونەی خوشكی ئیبراهیم ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) وتی: كێت دەوێ؟ وتی: ئیبراهیمی خەواصم دەوێ. مەیمونە وتی: ئیبراهیم ڕۆشتووەتە دەرێ. كەسەكە وتی: كەی دەگەڕێتەوە؟

مەیمونە وتی: كەسێك ڕۆحی بەدەست خۆی نەبێت، كێ دەزانێت كەی دەگەڕێتەوە؟!![2]

## هاوەڵی خراپ

سەگێكی گەورەی ڕەشی سامناك، لە تەنیشت مالیكی كوڕی دینارەوە دەبینرێت.. پێی دەڵێن: ئەی ئەبا یەحیا.. ئەوە ئەو سەگە ترسناكە نابینی لە كەنارتەوە، وەها بێخەم دانیشتوویت؟! مالیك ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) دەڵێت: ئەو سەگە زۆر لە هاودەمی خراپ باشترە.[3]

---

(١) (الف قصة وقصة/٤٩٥)
(٢) (صفة الصفوة/٥١٤)
(٣) (رفقاء طريق/١٩)

## گۆڕسـتانم بۆ بگەڕێن

ئیمام ئـەبو عەبدوڵلا موحەممەدی کوڕی خەفیفی شـیرازی ( رَحِمَهُ اللهُ ) تـووشی ئـازارێـك دێت و لە جـووڵـەی دەخـات، کاتێـك بـانگ دەدرێت بـۆ نـوێـژ، کەسـێـك بە کـۆڵ دەیهێنێـت بـــۆ مـزگـــەوت..! پێـی دەڵـێن: کـارەکــە هێنـدە قــورس نـەکـەیت و لە مـاڵـەوە نـوێـژەکـانت بکـەیت بـاشــتر نییە؟!

ئـەویـش دەڵێت: ئـەگەر جـارێـك گـوێـتان لە (حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ) بـــوو و منــتان لە ڕیـزی نـوێـژخـوێـنەکـاندا نـەبـینی، ئـەوا لـە گـۆڕسـتـاندا بـــۆم بگـەڕێـن.[1]

## مـردوو لەسـەر شـانی مـردوو!!

حەسەنی بەسری ( رَحِمَهُ اللهُ ) لە باسی مردندا دەڵێت: مردووی سـبەی.. خـەریکە مـــردووی ئـەمـڕۆ دەبـات بـــۆ گـۆڕسـتان و پـەندێـك وەرنـاگـرێـت!!

## بێتاقـەت نابـیت لەم مـاڵەدا؟!

شـــوعەیبی کوڕی حەرب دەڵێت: لە شـــاری کوفـە چـوومـە لای مـالیکی کـوڕی میغـوەل، خـۆی بە تـەنیا لە مـاڵەکەیدا دانیشـــتبـوو..! پـێم وت: ئـایا لەم مـاڵــەدا و.. خـۆت بـە تـەنیا، وەڕس و بێـتاقـەت نابیت؟!

مـالیك ( رَحِمَهُ اللهُ ) وتی: هـەرگـیز گـومـانـم نـەبـــردووە یـەکێـك لە خـزمـەت اللهُ.. دا بـێت و بـێـتاقـەت ببـێت.[2]

✍... دڵـێك ئـاوەدان بـە یـــادی تـــۆ بێ

نـــوری دیـــدارت لـە ســیـنـەی کـۆ بێ

چـلـۆن دەخـــوازێ بـەزمـی ڕەفـیـقـان؟!

مـەگـەر ئـەو عـەشـقە سـاختـە و درۆ بێ

(١) (موسـوعة الأخـلاق ج١/ ١٣٢)
(٢) (ألف قصة وقصة/١٩٦)



## بەهای مرۆڤان

پاشایەك و گەدایەك.. بەهای مرۆڤبوونیان وەك یەكە، بەڵام بەڕێزترینیان خواناسترین و خۆپارێزترینیانە، بیلالی حەبەشی (رضي الله عنه) بەندەیەك بوو، لەبەر موسوڵمان بوونی هێندە ئازار درا، هەتا كار گەشتە ئەوەی كە بەسەر لمی داغی بیابانەوە پاڵ خرا و.. لەبەر ئەو هەتاوە گەرمەی مەككەدا، كرا بەژێر بەردێكی گەورەوە..!! لای زاڵمان و دنیاویستان تەنیا هێز و سامان بەهای مرۆڤ دیاری دەكات، بۆیە بیلال لە لای ئەوان هیچ بەهایەكی نەبوو چونكە كۆیلەیەكی بێ سەروەت و سامان بوو، بەڵام بێ گومان.. لە لای خودا و خوداپەرستان كار پێچەوانەی ویستی ئەوانە.

قەیس دەڵێت: بیلال كرابوو بە ژێر بەردەوە، ئەبوبەكری صدیق (رضي الله عنه) هات، بە پێنج دراوی زێڕ ئازادی كرد، بتپەرستەكان پێیان وت: ئەگەر تەنیا یەك دراویشت بدایە، پێمان دەفرۆشتیت. ئەبوبەكر وتی: ئێوەش ئەگەر داوای سەد دراوی زێڕتان بكردبا، من هەر پێمدەدان و بیلالم ئازاد دەكرد..!![1]

## سوێندەكەی ناشكێنم

سەعیدی كوڕی جوبەیر (رحمه الله) دەڵێت: دووپشكێك دای بە دەستمەوە و دایكم سوێندی لەسەر خواردم، كە دەبێت فاڵچی نوشتەی بەسەردا بخوێنێت، منیش ئەو دەستەم كە دووپشك پێوەی نەدابوو. دامە دەست فاڵچییەكە!! چونكە پێم ناخۆش بوو سوێندەكەی دایكم بشكێنم..!![2]

(١) (تهذيب حلية ألاولياء: ج١/٦١)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء: ج٢/١٠٤)

## سەردەمی جاهیلی گوزەشت

ئەبوزەڕی غەفاری تانە دەدات دا لە بیلالی حەبەشی (رضي الله عنهما) بە هۆی ڕەنگە ڕەشەکەی پێستییەوە، پاشان پەشیمان دەبێتەوە.. خۆی دەخاتە سەر زەوی و سوێند دەخوات و دەڵێت: سەرم بەرز ناکەمەوە، هەتا بیلال پێی نەخاتە سەر کوڵمم!! ئیدی بەو شێوەیە سەری بەرز ناکاتەوە، هەتا بیلال قاچی دەخاتە سەر کوڵمی ئەبوزەڕ.[1]

## لەی زانایان.. قاچتان ڕاکێشن!!

شێخ سەعیدی حەلەبی (رحمه الله) (شێخی ئەزهەر و زانای گەورەی وڵاتی شام لە سەردەمی خۆیدا) خەریکی دەرس و دەوری خۆی بووە و هەردوو قاچی لێڕاکێشاوە.. ئیبراهیم پاشای کوڕی موحەممەد عەلی حاکمی میسر دەچێتە لای و شێخ سەعید قاچی هەڵناکێشێت!! ئیبراهیم پاشا زۆر نارەحەت دەبێت، بەڵام تووڕە بوونەکەی دەشارێتەوە و دەری نابڕێت، دواتر کە دەچێتە دەرەوە، کیسەیەکی بۆ دەنێرێت کە هەزار لیرەی ئاڵتونی تێدا دەبێت، بەڵام شێخ سەعید کیسە ئاڵتونەکە وەرناگرێت و دەیگێڕێتەوە و.. بە نێردراوەکەی دەڵێت: بگەڕێوە بۆ لای گەورەکەت و.. پێی بڵێ: ئەوەی قاچی ڕادەکێشێت، دەستی ڕاناکێشێت.[2]

## بەردەوام بە.. بەردەوام دەبێت

ئیمامی ئەحمەد (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر پێت خۆش بوو خوای عزوجل بەردەوام ئەوەت پێ ببەخشێت.. کە خۆت پێتخۆشە، ئەوا تۆش بەردەوام بە لەسەر ئەوەی کە خوا پێی خۆشە.

---

(١) (مدراج السالكين ٢/ ٣٣٠)
(٢) (موسوعة الأخلاق ج٢/٩٤)

## شــووم و نەگبەتی

ئــەبــو ســـولەیمانی دارانــی ( رحمه الله ) دەڵێــت: هـــەر شــتێــك.. ئیـــتر خانـەوادەکـەت بێت، یـان ســەروەت و سـامـانــەکەت، یـان منداڵــەکەت بــێت، ئـەگـەر غـافڵـیان کـردیت لـە یـادی خـوای (عزوجل) ئـەوە شــووم و نـەگبەتــییە بــۆت.[1]

## هاوەڵێتیمان تـوولی کێشـا

ئـەبـوبەکــری کــوڕی عەیــاش ( رحمه الله ) لە کــاتی ســـــەرەمەرگیدا بـــوو، خـوشــکەکەی دەســتی کـرد بە گـریان، ئـەبـوبەکـر پێی وت: خـوشـــکەکەم چـی دەتگریێنێت؟! تەماشـــای ئـەو گـۆشــەیـە بکە لــەم مـاڵەدا.. هــەر لــەوێدا ئــەم بـرایەت، هــەژدە هــەزار جـار خەتمـی قـورئـانی کـردووە.

وە ئـیســـحاقی کــوڕی حوســـەین دەگـێڕێــتەوە و دەڵـێــت: کاتـێــك ئـەبـوبـەکـری کوڕی عەیاش چـووە تـەمـەنـەوە و پـیر بـوو، لە مـاڵە تـاریکەکەیدا.. کـاتی ڕۆژوو شــکاندن بــەربـانگـەکــەی دەهـێــنا، دەیچـەقــاند بــە نـــاو ئـــاوی گـــۆزەکــەیدا و دەیــگوت: ئـــەی مــەلائیکەتـەکـانــم.. هــاوەڵـێتیمــان تـــوولی کێشـا، ئـەگـەر بـۆتـان دەکـرێت لـە خـزمــەت خـوای(عزوجل)شـەفاعـەتـم بــۆ بکـەن.[2]

## نامانجی خۆشـویسـتن

ئـەبـودەرداء (رضي الله عنه) دەڵێت: هـەژاریـم خۆشـدەوێت بــۆ خـۆبـەکــەم زانیـنم، مـەرگـم خۆشـدەوێت بـۆ لیقـای پـەروەردگـارم، وە نـەخـۆشـیم خـۆشـدەوێت بـۆ کـەفـارەتی گـونـاهـەکانـم.[3]

(١) (مواعظ الصالحين والصالحات/٢٣٠)
(٢) (صفة الصفوة/٥٩١)
(٣) (اين نحن من هؤلاء:ج٢٧/١)



## خۆشگوزەرانی.. پێشخستنی پاداشتەكانە؟!

ئیبراهیمی كوڕی عەبدولڕحمانی كوڕی عەوف دەگێڕێتەوە و دەڵێت: باوكم بەڕۆژوو بوو، خواردنی بەربانگیان بۆ هێنا، وتی: موصعەبی كوڕی عومەیر (رضي الله عنه) شەهید كرا كە زۆر لە من باشتر بوو، هیچ شتێكی نەبوو بیكەنە كفنی تەنها كراسێك نەبێت، ئەویش كاتێك سەریان پێدادەپۆشی قاچەكانی دەردەكەوتن، وە كاتێك قاچەكانیان پێدادەپۆشی سەری دەردەكەوت..!! پاشان ئێمە خۆشگوزەرانی ڕووی تێكردین، دەترسم پاداشتی چاكەكانمان بۆ پێش خرابێت. پاشان دەستی كرد بە گریان و خواردنەكەی نەخوارد..!![1]

## ژەهر خواردنەوەی خالد

خالدی كوڕی وەلید (رضي الله عنه) ئابلوقەی قەڵایەكی سەخت و قایمی دابوو.. خەڵكی قەڵاكە پێیان وت: هەتا تۆ ژەهر نەخۆیتەوە، ئێمە خۆ نادەین بە دەستەوە. خالدیش بە ناوی الله جل جلاله. ژەهرەكەی خواردەوە و هیچ زیانێكی پێنەگەشت..!! خەڵكی قەڵاكەش خۆیاندا بە دەستەوە.[2]

## بەبێ جوانكاری

ئبن تاوس دەڵێت: وتم بە باوكم (تاوسی كوڕی كەیسان ( رحمه الله )): بابە گیان.. دەمەوێت فلانە ئافرەت بكەمە هاوسەری خۆم. باوكم وتی: باشە كوڕم.. بڕۆ با یەكتر ببینن. ئیدی منیش هەستام، سەرم شۆرد و.. باشترینی پۆشاكەكانم پۆشی و.. ڕۆنم دا لە قژم، كاتێك باوكم بەو شێوەیە بینیمی، پێی وتم: دانیشە، مەڕۆ..!![3]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج٩٢/١)
(٢) (الف قصة وقصة/٥٩)
(٣) (صفة الصفوة/ ٤٠٨)



## ڕێگای سەرکەوتن

بەر لەوەی کە قوتەیبەی کوڕی موسلم بەڕێ بکەوێت بۆ فوتوحاتەکانی وڵاتی چین، بۆ ئەوەی یەکەمجار کەسانی ئەهلی تەقوا هەڵبژێرێت، کەسێك دەنێرێت بۆ مزگەوت هەتا بزانێت کێی لێیە، پیاوەکە لە مزگەوت دەگەڕێتەوە و دەڵێت: موحەممەدی کوڕی واسیعم بینی پەنجەی شایەتومانی بەرز کرد بوویەوە و دۆعای دەکرد. قوتەیبەیش دەڵێت: ئەو پەنجەیەی موحەممەدم پێ باشترە لە سی هەزار سوارچاك..!!
قوتەیبە هەمیشە سوور بووە لەسەر هاوەڵی کردنی موحەممەد (رحمه الله) لە جەنگەکاندا، بە هۆی چاکی و خۆپارێزییەوە.[1]

## کوڕەکانم لە ماڵەوەن

ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵڵای عجلی دەڵێت: ڕبعی کوڕی حیراش (رحمه الله) پیاوێکی باوەڕپێکراو بوو، هەرگیز درۆی نەدەکرد، ئەم پیاوە دوو کوڕی هەبوو کە لە حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی.. عاسی بوو بوون، وتیان بە حەججاج: ئەو دوو کوڕە باوکێکیان هەیە قەت درۆی نەکردووە، بنێرە بە شوێنیدا و پرسیاری کوڕەکانی لێبکە.. بێگومان ڕاستییەکەمان پێدەڵێت، ئێمەش کوڕەکانت بۆ دەستگیر دەکەین و سزایان دەدەین.
بە فەرمانی حەججاج، ڕبعی هات و لێی پرسی: کوڕەکانت لە کوێن؟
ئەویش لە وەڵامدا و بێ هیچ دوودڵییەك وتی: کوڕەکانم لە ماڵەوەن..!!
ئیدی حەججاج بەو هەموو ستەمکارییەوە.. کە زانی پیاوەکە ڕاستگۆیە، پێی وت: ئەوا لە بەر ڕاستگۆییت، لە کوڕەکانت خۆشبووم.[2]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/٨٦)
(٢) (الف قصة وقصة/٥٠-٥١)



## عەشقی زانست

عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی حاتەم ( رحمه الله ) دەڵێت: ماوەی حەوت مانگ لە میسر بووین، چێشتێکی شلەمەنیمان تێدا نەخوارد..!! هەموو ڕۆژەکەمان تەرخان کرد بوو بۆ ئامادە بوون لە کۆڕی زانایاندا، شەوەکەیشی سەرقاڵی لەبەرگرتنەوە و بەراورد کردنی ئەو زانستە بووین کە ڕۆژەکەی وەرمان گرتبوو!!
ڕۆژێك خۆم و هاوڕێیەکم چووینە خزمەت یەکێك لە شێخەکانمان بۆ وەرگرتنی زانست، وتیان: شێخ ناساغە.
ئیدی کاتی گەڕانەوەمان بۆ ماڵ.. لە ڕێگەدا ماسییەکمان بینی، حەزمان لێی کرد و کڕیمان، هەر کە گەشتینە ماڵەوە، کاتی ئامادەبوونمان هات لە یەکێکیتر لە کۆڕەکاندا، بۆیە نەمانتوانی ماسییەکە باش بکەین و بیخۆین! وازمان لێ هێنا و ڕۆشتین بۆ کۆڕەکە، ئا بەو شێوەیە بەردەوام بووین.. هەتا سێ ڕۆژ بە سەر کڕینی ماسییەکەدا گوزەشت و خەریك بوو ماسییەکە دەگۆڕا و خراپ دەبوو، ناچار بە کاڵی خواردمان، چونکە کاتێکی بێ ئیشمان نەبوو، هەتا هیچ نەبێت ماسییەکە بدەین بە کەسێك بۆمان ببرژێنێت..!!
پاشان عەبدولڕەحمان دەڵێت: ناگونجێت.. زانست وەربگریت و جەستەت لە خۆشگوزەرانیدا بێت.[1]

## شکاندنی شکۆی نەفس

عورووەی کوڕی زوبەیر دەڵێت: عومەری کوڕی خەطابم بینی کوندەیەکی ئاوی بەسەر شانەوە بوو..!! پێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران.. ئەم کارە بۆ تۆ شیاو نییە. عومەر (رضي الله عنه) وتی: وازم لێ بهێنە.. کاتێك وەفدەکان گوێڕایەڵ و مل کەچانە هاتنە لام، شکۆمەندییەك هاتە ناو دەروونمەوە، منیش دەمەوێت ئەو شکۆمەندییەی نەفسم بشکێنم..!![2]

---

(١) (سير اعلام ١٣/٢٦٥ـ ٢٦٦)
(٢) (مدراج السالكين ٢/ ٣٣٠)



## ساڵێکه چاوه‌ڕێی تۆ ده‌که‌م!

هیشامی کوڕی خالدی ڕبعی (رحمه الله) ده‌ڵێت: چوومه مزگه‌وت.. کیسه‌یه‌کی هه‌زار درهه‌میم پێ بوو، که له‌وه زیاتر هیچم شك نه‌ئه‌برد، له پاڵ پایه‌یه‌کدا دامنا و ده‌ستم کرد به نوێژکردن.. پاشان که له نوێژه‌که‌م بوومه‌وه، هه‌ستام ڕۆشتم و بیرم نه‌بوو کیسه‌ی پاره‌که‌م هه‌ڵگرمه‌وه!!

ئیدی پاره‌که‌م لێ ونبوو، ئه‌وه‌ش دڵته‌نگی کردم و باری گوزه‌رانی له‌سه‌ر قورس کردم! وه تا ماوه‌ی ساڵێك ئه‌وه‌م بۆ که‌س باس نه‌کرد، ڕۆژ به ڕۆژ باری ژیانم گرانتر ده‌بوو، بۆیه ڕۆشتمه‌وه په‌نای هه‌مان پایه‌ی مزگه‌وت..!! له‌وێ نوێژم کرد و له خودا پاڕامه‌وه که کیسه پاره‌که‌م بۆ بگێڕێته‌وه، له‌و کاته‌دا پیره‌ژنێك له ته‌نیشتمه‌وه گوێی له پاڕانه‌وه‌که‌م بوو.. پێی وتم: ئه‌ی به‌نده‌ی خودا.. ئه‌وه باسی چی ده‌که‌یت؟!!

وتم: یه‌ك ساڵ له‌مه‌وپێش کیسه‌یه‌ك پاره‌م له په‌نای ئه‌م پایه‌دا له بیر چوو. پیره‌ژنه‌که وتی: بێ خه‌م به! پاره‌کانت له لای منه، منیش یه‌ك ساڵه چاوه‌ڕێی تۆ ئه‌که‌م..!!

ئیدی پاره‌که‌ی بۆ گێڕامه‌وه و کۆتایی به ناڕه‌حه‌تییه‌کانم هێنا.[1]

## لیشکه‌ری شیرینیت

عومه‌ری کوڕی خه‌طاب (رضي الله عنه) هه‌ر کاتێك گه‌نجێکی ده‌بینی و پێی سه‌رسام ده‌بوو، پرسیاری ده‌رباره‌ی ده‌کرد و ده‌یگوت: ئه‌و گه‌نجه هیچ شاره‌زاییه‌کی هه‌یه له کارێکدا؟ ئه‌گه‌ر وه‌ڵامه‌که ئه‌رێنی بووایه زیاتر خۆشی ده‌ویست، به‌ڵام ئه‌گه‌ر نه‌رێنی بووایه گه‌نجه‌که‌ی له‌به‌ر چاو ده‌که‌وت.[2]

(١) (الف قصة و قصة ٢٠٤)
(٢) (موسوعة الأخلاق ج١/٥٨)



## كه‌سێكم كوشـتووه.. دایه گیان!

دایكی ڕه‌بیعی كوڕی خوسه‌یم ( رحمه الله ) ده‌ڵێت به ڕه‌بیع: ئه‌ی كوڕی شیرینم.. ئایا ناخه‌ویت؟! ! ڕه‌بیع پێی ده‌ڵێت: دایه گیان.. كه‌سێك تاریكی شه‌و باڵی به سه‌ردا بكێشێت و ترسی مه‌رگی شه‌وانه‌ی هه‌بێت، هه‌ق وایه نه‌خه‌وێت. دایكی كاتێك ده‌بینێت كوڕه‌كه‌ی چ گریان و شه‌ونخونییه‌ك ده‌كێشێت، پێی ده‌ڵێت: ئه‌ی كوڕه‌كه‌م.. پێده‌چێت كه‌سێكت كوشتبێت؟!!
ڕه‌بیع ده‌ڵێت: هه‌روایه دایه گیان.. كه‌سێكم كوشتووه.
دایكی ده‌ڵێت: ده‌ی ئه‌و كه‌سه كێ یه؟ هه‌تا له كه‌س و كاری بپاڕێینه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی لێت خۆش ببن، چونكه سوێند به خوا.. ئه‌گه‌ر بزانن تۆ چ شه‌ونخونی و گریانێك ده‌كه‌یت، به‌زه‌ییان پێتا دێته‌وه و لێت خۆش ده‌بن. ڕه‌بیع ده‌ڵێت: ئه‌ی دایكه خۆشه‌ویسته‌كه‌م.. كوژراوه‌كه، نه‌فسی خۆمه! من نه‌فسی خۆمم كوشتووه.[1]

## مه‌بادا فشه‌ی كاغه‌زه‌كه‌ی بێت!

ئیمامی شافیعی ده‌ڵێت: له‌به‌ر ده‌ستی مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س دا ( رحمه الله ) زۆر به‌ناسكی و له‌سه‌رخۆ په‌ڕه‌ی كتێبه‌كانم هه‌ڵده‌دایه‌وه.. وه‌ك ڕێزێك بۆ مامۆستاكه‌م، بۆ ئه‌وه‌ی خشه‌ی كاغه‌زه‌كان بێزاری نه‌كه‌ن..!!

## فه‌تاكه له دڵمانه‌وه نییه؟! !

ئه‌حمه‌دی كوڕی ئه‌بی حه‌واری ده‌ڵێت به ئه‌بوسوله‌یمانی دارانی ( رحمه الله ): فلان و فلان ناچنه دڵمه‌وه و خۆشم ناوێن! ئه‌بوسوله‌یمانیش ده‌ڵێت: هه‌روه‌ها ناچنه دڵی منیشه‌وه..!! به‌ڵام له‌وه ده‌چێت خه‌تاكه له دڵی من و تۆوه بێت و هیچ خێرێكمان تێدا نه‌بێت و چاكه‌كارانمان خۆشنه‌وێت.[2]

---

(١) (إحياء علوم الدين٤/٤١٠)
(٢) (مواعظ الصالحين والصالحات/٢٣٥)

## خاکێتی لە زانستدا

ڕەبیعی کوڕی سولەیمان دەڵێت: ئیمامی شافیعی (رحمه الله) لە دەر و هەیوانی مزگەوتەکەدا، دەرسی پێدەوتینەوە و دەمان نووسییەوە، خۆر هاتە ڕاسەری و ئەو لە جێی خۆیدا نەجوولا..!! یەکێک لە برادەرەکانی هات و پێی وت: ئەی ئەبا عەبدوڵڵا.. دەرس وتنەوە لەو بەر هەتاوە گەرمەدا؟! بۆ ناچیتە سێبەرەکە؟! شافیعی بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:

أهينُ لَهُم نَفسي فَهُم يُكرِمُونَها..... وَلَنْ تكرِمَ النَّفْس الَّتى لا تُهِينُها

واتە: نەفسی خۆم بە گەورە نازانم و دڵ نەرم و نیانم بۆیان، ئەوانیش ڕێزی لێ دەگرن.. وە هەر نەفسێک سوکی نەکەیت، ڕێزی لێ ناگیرێت. (سوك بە مانای خاکیتی و خۆ بە گەورە نەزانین، نەوەك ڕیسوایی).[1]

## کردەوەی باش

ئیمامی عەلی (عليه السلام) دەڵێت: کردەوەی باش ئەوەیە کە لە بەرامبەریدا چاوەڕێی سوپاس و پاداشت لە کەس نەکەیت، بێجگە لە پەروەردگار.[2]

## چۆن هاتووم.. ئاوەها دەڕۆم

مەعروفی کەرخی لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانیدا دەبێت و لە دارای دنیا تەنیا ئەو کراسەی دەبێت کە لەبەریدا بووە، بەکری زوجاجی پێی دەڵێت: وەسیەتێک بکە. مەعروف (رحمه الله) دەڵێت: کە مردم ئەم کراسەی بەریشم بکەن بە خێر، من دەمەوێت هەروەك چۆن بە ڕووتی لە دایك بووم، ئاوەها هیچ لە دوای خۆمەوە جێنەهێڵم و بە ڕووتی بگەڕێمەوە بۆ خزمەت پەروەردگارم.[3]

(١) (الف قصة و قصة/ ٤١٩)
(٢) (حياة السلف/٢٣٦)
(٣) (أين نحن من هؤلاء: ج٤/٢١٥)



## ئێرە بازاڕی ئاخیرەتە!

عەتای کوڕی یەسار ( رَحِمَهُ ٱللَّهُ ) پیاوێک دەبینێت لە مزگەوتدا شت دەفرۆشێت.. پیاوەکە بانگ دەکات و پێی دەڵێت: ئێرە بازاڕی ئاخیرەتە.. ئەگەر تۆ دنیات دەوێ، ئەوا بچۆ بۆ بازاڕی دنیا.[1]

## ئاوی زەمزەم

حەمیدی دەڵێت: لە لای سوفیانی کوڕی عویەینە بووین ( رَحِمَهُ ٱللَّهُ ) فەرموودەی پێغەمبەری (ﷺ) بۆ دەگێڕاینەوە، کە باسی لەوە دەکرد ئاوی زەمزەم بە هەر نیەتێک بیخۆیتەوە خوای گەورە نیەتەکەت دەهێنێتە دی، پیاوێک لە ناوماندا هەستا ڕۆشت و.. پاش مودەتێک هاتەوە و وتی بە سوفیان: ئەی ئەبا موحەممەد..! ئایا ئەو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئاوی زەمزم بۆت گێڕاینەوە، صەحیحە؟

سوفیان وتی: بەڵێ صەحیحە. پیاوەکە وتی: دەی من ئێستا ڕۆشتم لە ئاوی زەمزەمم خواردەوە، بەو نیەتەی کە تۆ سەد فەرموودەی حەزرەتم (ﷺ) بۆ بگێڕیتەوە..!! سوفیان پێی وت: دەی دانیشە. ئیدی پیاوەکە دانیشت و سوفیان سەد فەرموودەی بۆ گێڕایەوە.[2]

## چۆن تۆبە دەکەیت؟!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ( رَحِمَهُ ٱللَّهُ ) دەڵێت: ئەو کەسەی کە دەیەوێت تۆبە بکات.. با دوور بکەوێتەوە لەو شوێنەی زوڵم و گوناهی تیا کردووە و واز لە هاوڕێتی ئەوانە بهێنێت کە تێکەڵی دەکردن، ئەگەر.. نا، ئەوا ئەوەی دەست ناکەوێت کە دەیەوێت.

---

(١) (والثمن الجنة/٣٩)
(٢) (الف قصة و قصة/ ١٥٠)

## مانای ڕاستگۆیی

ڕۆژێــك ئیمامــی بــوخاری (رحمه الله) بــۆ وه‌رگــرتنی فه‌رمــووده ده‌چــێته خزمــه‌ت پیاوێــك، له‌وێ ده‌بیــنێت پیاوه‌كه ئه‌سپه‌كــه‌ی بــه‌ر بــووه، ئه‌ویــش چمكی كراســه‌كه‌ی بــۆ گــرتووه‌ته‌وه و واپیشــانی ده‌دات كه جــۆی تێدایــه، ئیدی ئه‌سپه‌كه‌ی دێت و ده‌یگرێته‌وه.

بوخاری له پیاوه‌كه ده‌پرسێت: ئــه‌رێ ئــه‌وه تــۆ جۆت پێبوو؟

پیاوه‌كه ده‌ڵێت: نه‌خێر.. به‌ڵام وامبرد به خه‌یاڵی ئه‌سپه‌كــه‌دا كــه جــۆم پێیه. ئیمامی بوخاریش پێی ده‌ڵێت: مــن هــاتم بــۆ خزمــه‌تت بــۆ ئــه‌وه‌ی فه‌رمووده‌ت لێوه‌رگرم، به‌ڵام من فه‌رمــووده له كه‌سێكه‌وه وه‌رناگــرم، كــه ته‌نانه‌ت له‌گه‌ڵ ئاژه‌ڵانیشدا درۆ بكات.

ئیدی ئه‌وه نمونه‌یه‌كی باڵا بــوو، بــۆ گــه‌ڕان بــه شــوێن ڕاســتگۆكــاندا، بـــۆ وه‌رگـــرتنی فه‌رمـــووده‌ی خۆشـــه‌ویســـت (ﷺ) لێیانـــه‌وه، بـــۆیـــه كتێبه‌كه‌ی بوخاری.. به ڕاسترین سه‌رچاوه‌ی فه‌رمووده داده‌نرێت.[1]

## پاره په‌رست!

حه‌سه‌نی به‌سری (رحمه الله) ده‌ڵێت: وه‌ڵڵاهــی.. ئــه‌وه‌ی دیــنار و درهـــه‌می زۆر به‌لاوه گــرنگ بێت، خــوای (عز وجل) زه‌لیلی ده‌كات.

## ئه‌ولیای خوا

ئه‌حمه‌دی كوڕی وه‌رد (رحمه الله) ده‌ڵێت: وه‌لی خوا كه‌سێكه، هه‌تا پله‌ی به‌رزتــر بــێت.. خۆبه‌كــه‌م زانینی زیاتــر ده‌بــێت، هه‌تــا ســه‌روه‌تی زیــاد بكات.. سه‌خاوه‌تی زیاتر ده‌بێت، وه كاتێكیش ته‌مه‌نی گه‌وره‌تــر ده‌بــێت. هه‌وڵ و كۆششی بــۆ عیباده‌ت زیاتر ده‌بێت.[2]

(١) (موسوعة الأخلاق ج٤١/١)
(٢) (أين نحن من هؤلاء: ج١٢٢/٥)



## ئاوات.. بۆنخۆش و خۆشەویست لەکەم

ئەیوبی عەتتار دەڵێت: بیشـری کوڕی حاریسـی حافی (رحمه الله) پێـی وتـم: باسـی سـەرەتای گەڕانـەوەمت بـۆ دەکـەم: ڕۆژێـك بـە ڕێدا ئەڕۆشـتم.. کاغـەزێکی کـەوتـووم بینی لەسـەر زەوی نـاوی الله.. ی تیا نـووسـرا بـوو..!! هـەڵمگـرتـەوە و چـووم لـە ڕووبـارەکـەدا پـاك شـۆردم.

له دارای دنیا پێنج دانـقـم شـك ئـەبرد، بـه چوار دانـقیان میسـکم کـڕی و بە دانقەکەی تـریان گـوڵاوم کـڕی و نـاوی الله.. م پێ بـۆنخـۆش کـرد.

پاشـان گـەڕامـەوە بـۆ مـاڵـەکـەم، کـاتێـك نـووسـتم.. گـوێـم لـە دەنگێکەوە بـوو، پێی وتـم: ئـەی بیشـر.. وەك چۆن نـاوی منت بـۆنخـۆش کـرد، ئاوەهـا نـاوت بـۆنخـۆش و خـۆشـەویسـت دەکـەم، وەك چـۆن نـاوی منت پـاك کردەوە، ئاوەهـا دڵت پـاك دەکـەمـەوە..!![1]

## کاتی تەواوی نییە بۆ خەوتن!

عومەری کـوڕی خـەطـاب (رضي الله عنه) کـاتی نـەبـوو تێر بـخـەوێـت و پـشـووی تـەواو وەربگـرێـت بـۆ جـەسـتـەی، ئیدی بـە دانیشـتنەوە وەنـەوزی ئـەدا..!!

کاتێك پێیان دەوت: ئـەی ئـەمیری ئیمانداران.. ئایا به باشـی نـاخـەویت؟!! عومـەر دەیـوت: چلـۆن بخـەوم؟! ئەگـەر بـە ڕۆژدا بخـەوم.. کـار و بـاری موسـوڵمانـانـم بـۆ جێبـەجێ نـاکـرێت و لە دەسـتم دەچێـت، وە ئـەگـەر بـە شـەودا بخـەوم.. بـەشـی خـۆمـم لە کیـس دەچـێت لـە خزمـەت پـەروەردگـارمـدا.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/ ٤٢٦)
(٢) (صفة الصفوة/٤٤٩)



## چراکانت دانەگیرساندووە

ئەبی عەبدوڵڵای کوڕی خەطیب دەڵێت: تەیبی کوڕی ئیسماعیل، پەڕە کاغەزێکی هەبوو، ناوی سێ سەد کەس لە هاوڕێکانی تیا نووسی بوو، هەموو شەوێک بەر لە خەوتن.. ناوەکانی دەخوێندەوە و دۆعای خێری بۆ دەکردن!

شەوێک بەر لەوەی دۆعایان بۆ بکات.. خەوی لێدەکەوێت، لە خەونیدا پێی دەڵێن: ئەی ئەبا حەمدون.. بۆچی ئەمشەو چراکانت دانەگیرساند؟! ئیدی تەیب ( رحمه الله ) هەڵدەستێت.. چرایەک هەڵدەکات و پەڕە کاغەزەکەی دەهێنێت و. دانە دانە نزای خێر بۆ هاوڕێکانی دەکات..!![1]

هەروەها ئوم دەرداء دەڵێت: ئەبودەرداء (رضي الله عنه) سێ سەد و شەست هاوڕێ و دۆستی هەبوو، کە لەبەر خوا خۆشی دەویستن و نزای خێری بۆ دەکردن، لەو بارەوە پرسیارم لێ کرد، لە وەڵامدا پێی وتم: هەر کەس لە پاشملە نزای خێر بۆ برایەکی بکات، خوای گەورە دوو فریشتە ڕادەسپێرێت، لەگەڵ هەر نزایەکیدا دەڵێن: هەمان خێر و چاکەش بۆ تۆ بێت. ئەدی ئایا من حەز ناکەم فریشتەکان نزای خێرم بۆ بکەن..؟!![2]

## بینێرە بۆ ماڵی من

عەلی کوڕی بەکار دەڵێت: پیاوێکی هەژار هاتە خزمەت ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم ( رحمه الله ) شکاتی حاڵ و گوزەرانی خۆی کرد و وتی: منداڵم زۆرە و مەسروفیان گرانە.

ئیبراهیم پێی وت: ئەی براکەم.. کاتێک ڕۆشتیتەوە بۆ ماڵ، بە وردی سەیرێک بکە و بزانە کام لە منداڵەکانت ڕزق ڕۆزی لەسەر خوا نییە..!! یەکسەر بینێرە بۆ ماڵی من، من بەخێوی دەکەم.

(١) (صفة الصفوة/٤٤٣)
(٢) (حرمة أهل العلم: ١٩٥)

## غافڵانە.. بە ڕێگادا ناڕۆم

موحەممەدی کوڕی خالد دەڵێت: گوێبیستی ئەیوبی حەماڵ بووم (رحمه الله) دەیگوت: بڕیارم دا لەسەر نەفسی خۆم.. کە غافڵانە بە ڕێگادا نەڕۆم، وە هەمیشە لە ڕۆشتنمدا لە یاد و زیکری پەروەردگارمدا بم، ڕۆژێك.. ڕۆشتنێك ڕۆشتم و تووشی شەل بوونێك هاتم..!! منیش زانیم ئەم شەل بوونەم لە کوێوە بۆ هاتووە؟! بۆیە دەستم کرد بە گریان و تۆبەم کرد و داوام لە پەروەردگار کرد بە هانامەوە بێت، ئیدی عیللەتم تیا نەما و گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی کە تووشی غەفڵەت هاتم تێیدا!! هەر لەو شوێنەدا.. گەڕامەوە سەر زیکر کردن و بە ساغلەمی دەستم کردەوە بە ڕۆشتن!![1]

## چەندی لێی ببەیت کەم ناکات

پیاوێك لە بەنی عەبس هاوەڵێتی سەلمانی فارسی کرد.. هەتا لێوەی فێر ببێت، لەگەڵ سەلماندا ڕۆشتە دەر و نەیتوانی لە کارێکدا لەو باشتر بێت، ئەگەر هەویری دەشێلا.. سەلمان (رضي الله عنه) دەهات و نانەکەی دەبرژاند!! وە ئەگەر ئاڵفی بە وڵاخەکان دابا.. سەلمان وڵاخەکانی دەبرد و ئاوی دەدان!! هەتا گەشتنە کەناری دیجلە کە ئاوەکەی لە حاڵەتی زۆر بوون و هەڵکشاندا بوو.. سەلمان بە پیاوە عەبسییەکەی وت: دابەزە ئاو بخۆوە.

پیاوەکە دابەزی و ئاوی خواردەوە. سەلمان وتی: زیاتر بخۆوە. پیاوەکەش زیاتری خواردەوە! سەلمان پێی وت: بە ڕای تۆ چەندت لە ئاوەکە کەم کردەوە؟! پیاوەکە وتی: دەی من ئەتوانم چەندی لێ کەم بکەمەوە؟!!

سەلمان وتی: زانستیش ئاوەهایە..!! لێی وەردەگریت و کەم ناکات، دەی تۆش زانستێك وەربگرە کە سوودمەند بیت لێی.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٤٥٥)
(٢) (صفة الصفوة/١٩٧)



## بۆ چشتێك كۆیان ده‌كه‌یته‌وه‌؟!

سابتی بونانی ده‌ڵێت: كاتێك شه‌وانه ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك (رضي الله عنه) نزیك ده‌بوویه‌وه له خه‌تم كردنی قورئان، سوره‌تیكی ده‌هێڵاوه.. بۆ ئه‌وه‌ی دواتر خاوخێزانه‌كه‌ی كۆ بكاته‌وه و له لای ئه‌واندا.. قورئانه‌كه‌ی خه‌تم بكات و نزای خێریان بۆ بكات.[1]

## بۆنی جگه‌ری برژاو دێت!

له دوای وه‌فاتی ئه‌بوبه‌كری جێنشینی رسول الله (ﷺ) عومه‌ری فاروق ده‌چێته لای ئه‌سمای كچی عومه‌یسی هاوسه‌ری ئه‌بوبه‌كر و پێی ده‌ڵێت: ئه‌بوبه‌كر چۆن خوداپه‌رستی ئه‌كرد له ساته‌وه‌خته‌كانی خه‌ڵوه‌تیدا؟! ئه‌سما ده‌ڵێت: كاتی به‌ره‌به‌یان.. ئه‌بوبه‌كر هه‌ڵده‌ستا و ده‌ست نوێژی ده‌گرت و نوێژی ده‌كرد.. پاشان به‌رده‌وام ده‌گریا.. قورئانی ده‌خوێند و ده‌گریا.. كڕنوشی ده‌برد و ده‌گریا.. نزای ده‌كرد و ده‌گریا.. منیش له‌وكاتانه‌دا بۆنی جگه‌ری برژاوم ده‌كرد له ماڵه‌كه‌ماندا..!!
ئیدی عومه‌ر ده‌ست ده‌كات به‌گریان و ده‌ڵێت: خواپه‌رستی ئه‌بوبه‌كر له كوێ و، خواپه‌رستی كوڕی خه‌طاب له كوێ؟!! بۆنی جگه‌ری برژاو له ماڵی ئه‌بوبه‌كردا..؟!![2]

## ئه‌هلی ئاگر

ئیمامی عه‌لی (عليه السلام) ده‌ڵێت: هه‌ر كه‌س ده‌یه‌وێت پیاوێك له ئه‌هلی ئاگر ببینێت، با سه‌یری پیاوێك بكات كه خۆی دانیشتووه و خه‌ڵكانێك له‌به‌ر ده‌ستیدا مل كه‌چانه ڕاوه‌ستاون.

(١) (صفة الصفوة/٢٥٨)
(٢) (خلفاء الرسـول / ٧٢)

## دڵخۆشم به‌ خه‌و!

پیاوێك ده‌ڵێت به‌ موه‌رقی عجلی: دڵم پڕ قه‌سوه‌ت بووه‌ و ناتوانم نه‌ نوێژ بكه‌م، نه‌ ڕۆژوو بگرم! (نوێژ و ڕۆژووی سوننه‌ت). موه‌رق (رحمه الله) پێی ده‌ڵێت: وه‌ك چۆن سست و لاوازیت بۆ خێر، ئاوه‌ها خۆت سست و لاواز بكه‌ بۆ شه‌ڕ، من زۆر دڵخۆش ده‌بم به‌ خه‌وتنێك كه‌ له‌ خراپه‌ دوورم ده‌خاته‌وه‌.[1]

## خۆڵ بكه‌ن به‌سه‌رما!

حه‌بیبی كوڕی ئه‌بی سابت ده‌ڵێت: ڕۆژێك عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعود (رضي الله عنه) ڕۆشته‌ ده‌ره‌وه‌ و خه‌ڵكانێك شوێنی كه‌وتن، عه‌بدوڵڵا پێی وتن: ئایا كارێكتان هه‌یه‌؟! وتیان: نه‌خێر.. ته‌نها ویستمان له‌گه‌ڵ تۆدا ڕێ بكه‌ین. عه‌بدوڵڵا وتی: بگه‌ڕێنه‌وه‌، چونكه‌ ئه‌م شوێن كه‌وتنه‌.. سوكی و ڕیسواییه‌ بۆ كه‌سی شوێن كه‌وتوو، وه‌ فیتنه‌یه‌كه‌ بۆ ئه‌و كه‌سه‌ی شوێنی ده‌كه‌ون.

هه‌روه‌ها ئیبن مه‌سعود ده‌ڵێت: ئه‌گه‌ر ئه‌و شتانه‌ی ده‌رباره‌ی نه‌فسی خۆم ده‌یزانم، ئێوه‌ش ده‌تانزانی، خۆڵتان ده‌كرد به‌ سه‌رمدا..!![2]

## خه‌وتن و په‌شیمانی.. باشتره‌!

موته‌ڕیفی كوڕی عه‌بدوڵڵا (رحمه الله) ده‌ڵێت: پێم خۆشه‌ به‌ درێژایی شه‌و بخه‌وم و خه‌به‌رم نه‌بێته‌وه‌ بۆ شه‌ونوێژ و به‌یانییه‌كه‌ی كه‌ هه‌ستام په‌شیمان بم بۆ خه‌وتنه‌كه‌م..!! نه‌وه‌ك به‌ درێژایی شه‌و عیباده‌ت بكه‌م و سبه‌ی كه‌ هه‌ستام له‌ خۆم ڕازی بم.

---

(١) (حياة السلف/٢١٦)
(٢) (الأتقياء الأخفياء/٦)



## گوێزێك بۆ نوێژێك

زوبه‌یدی یامی ( رحمه الله ) منداڵانی هان ده‌دا بۆ نوێژکردن و پێی ده‌وتن: ئێوه وه‌رن نوێژ بکه‌ن.. من گوێزتان ده‌ده‌مێ..!! ئیدی منداڵه‌کان ده‌هاتن نوێژیان ده‌کرد و ده‌وری زه‌یدیان ئه‌دا، بۆ گوێز وه‌رگرتن، پێیان وت: بۆچی وا ده‌که‌یت؟! زه‌ید وتی: ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر منه ئه‌وه‌یه.. ده‌چم به پێنج درهه‌م گوێزیان بۆ ده‌کڕم و، ئه‌وانیش ڕادێن له‌سه‌ر نوێژکردن.[1]

## هه‌رچی له فزمه‌تی تۆوه دێت

موسلیمی کوڕی یه‌سار ( رحمه الله ) ده‌ڵێت: به مه‌به‌ستی بازرگانی چوومه به‌حره‌ین و یه‌مامه، ده‌بینم خه‌ڵکی ڕووه‌و ماڵێك.. دێن و ده‌چن!! بۆیه منیش به‌ره‌و ئه‌و ماڵه ڕۆشتم، ده‌بینم ئافره‌تێك له نوێژگه‌که‌یدا دانیشتووه و به‌رگێکی ئه‌ستور و زبری له‌به‌ردایه، که‌م قسه و غه‌مگین و دڵته‌نگه..!! کوڕه‌که‌ی و ده‌ست و پێوه‌ند و کۆیله‌کانی و خه‌ڵکیش سه‌رگه‌رمی فرۆشتن و بازرگانی بوون، منیش کاره‌کانم جێبه‌جێ کرد و پاشان هاتمه لای و خوداحافیزیم لێ کرد، ئافره‌ته‌که وتی: ئه‌گه‌ر ڕێت که‌وته‌وه ئێره بۆ کاروبارێك، سه‌ردانمان بکه.

ئه‌وێم جێهێشت و ماوه‌یه‌ك مامه‌وه، پاشان بۆ کاروبارێك ڕێم که‌وته‌وه ئه‌و شاره‌ی ئافره‌ته‌که‌ی لێ بوو، ڕۆشتم بۆ سه‌ردانی، ئه‌وه‌ی پێشتر بینی بووم له حاڵی ئه‌و ئافره‌ته، بێجگه له ماڵه‌که‌ی هیچی ترم نه‌بینیه‌وه!! له ده‌رگام دا و بۆم کرایه‌وه، گوێم له پێکه‌نین و قسه‌ی ئافره‌تێك بوو!! که ڕۆشتمه ژووره‌وه ده‌بینم ئافره‌ته‌که دانیشتووه و به‌رگێکی ناسك و جوانی له‌به‌ردایه، وه ئه‌وه‌ی که بیستم قسه و پێکه‌نینی ئافره‌ته‌که بوو!! خۆی ته‌نیا له ماڵێکی چۆڵ و هۆڵدا.. به‌ڕاستی به‌لامه‌وه سه‌یر بوو..!! بۆیه پێم وت: تۆم له دوو حاڵه‌تی سه‌یردا بینی، ئه‌حواڵی جاری پێشووت و ئه‌م حاڵه‌ی ئێستات!!

ئافره‌ته‌که وتی: سه‌رت سوڕنه‌مێنێت..!! جاران له خێر و بێرێکی

---

[1] () (والثمن الجنة/١٥)

زۆردا بـووم، له کـوڕ و ده‌سـت و پێـوه‌ند و سـه‌روه‌ت و سـامـانمدا.. هـیچ کاره‌سـاتێـك ڕووی تێ نه‌ده‌کردم، بـازرگانیم ده‌کرد بـه‌بێ زیان.. شـتم ده‌کڕی و قازانـجم ده‌کـرد.. ئیدی ترسـام له‌وه‌ی که له لای پـه‌روه‌ردگار هـیچ خێـرێکم نه‌بێت، هـه‌ر بـۆیـه غـه‌مگین و دڵتـه‌نگ بـووم و ده‌مـگوت: ئـه‌گـه‌ر لای خـودا خـێرێکـم هـه‌بـوایـه، ئـه‌ڵـبه‌ت تـووشـی کاره‌سـات و مـوسـیبه‌تێـك ده‌هـاتم. ئیـدی دوای ئـه‌وه یـه‌ك له دوای یـه‌ك تووشـی مـوسـیبه‌ت هـاتم، کوڕه‌کـه‌م و ده‌سـت و پێـوه‌نده‌که‌م و سـه‌روه‌ت و سـامـانـه‌که‌م و هـه‌مـوو ئـه‌وانـه‌ی که جـاری پێشـوو بینیـت، هـه‌مـوویـم له‌ده‌سـت دا و هیچیم بـۆ نـه‌مـایـه‌وه، ئیدی ئـومێده‌وار بـووم کـه خـوای گـه‌وره خـێرداری کـردبـم، بـۆیـه مـوسـیبه‌تی بـۆ ناردووم و له یـادی نـه‌کـردووم، ئـه‌وه‌ش دڵخـۆشـی کـردم و نـه‌فـسی ئـارام کـردم..!!

کـاتێـك ئافره‌تـه‌کـه‌م جێ هێشـت.. عـه‌بدوڵڵای کـوڕی عومـه‌رم بینـی هـه‌واڵ و بـه‌سـه‌رهـاتی ئـافـره‌تـه‌کـه‌م بـۆ گـێڕایـه‌وه، عـه‌بدوڵڵا (ڕەزای خوای لێبێت) وتـی: خـودا ڕه‌حمی پێ بکات، هـیچی نـه‌مـاوه بـۆ سـه‌بـری پێغـه‌مـبه‌ر ئـه‌یـوب (علیه الصلاة والسلام) ئـه‌نـدازه‌یـه‌کی کـه‌م نـه‌بێت.[1]

## برسێتی و.. خوانی خه‌ڵکی

هیشـامی کـوڕی حه‌سـان ده‌ڵێت: هه‌رکاتێـك مـوحه‌ممه‌دی کـوڕی سـیرین (ڕحمه الله) بانگهێشت ده‌کرا بـۆ داوه‌تێك یـان بـۆ زه‌مـاوه‌ندێـك، ده‌ڕۆشـته‌وه مـاڵی خـۆیـان و ده‌یـگوت: شـۆربـایه‌کم بـده‌نێ بـا بـیخـۆم..!!

پێیان ده‌وت: ئـه‌ی ئـه‌بابـه‌کر تـۆ ئـێسـتا بـۆ داوه‌تی یان زه‌مـاوه‌ند ده‌ڕۆیت، ئـیتر بـۆچی شـۆربـا ده‌خـۆیـت؟! مـوحه‌ممه‌د ده‌یـگوت: مـن پـێم نـاخـۆشـه هـه‌موو بـرسـێتییه‌کـه‌م بـه‌رمـه سـه‌ر سـفـره و خـوانی خـه‌ڵکی.[2]

(١) (تهذيب حلية الاولياء: ج٣٩٦/١ ـ ٣٩٧)
(٢) (تهذيب حلية الاولياء: ج٣٨٨/١)



## کۆڵتان سوك بکەن

وتیان بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ﷺ): فڵان کەسی ئەنساری مرد. عەبدوڵڵا وتی: خودا ڕەحمی پێ بکات. وتیان: لە پاش خۆی سەد هەزاری جێ هێشتووە. عەبدوڵڵا وتی: بەڵام سەد هەزارەکە.. ئەوی جێ نەهێشتووە..!![1]

## زیندانی دنیا

کوڕی یەکێك لە پیاوانی سەلەف دەمرێت.. پیاوەکە بۆ لە دەستدانی کوڕەکەی زۆر دڵتەنگ و غەمبار دەبێت، سوفیانی کوڕی عویەینە و کەسانێکی تر سەرەخۆشی لێ دەکەن.. بەڵام ئەو سوکنایی نایەت!!

دواتر فوزەیلی کوڕی عەیاز (رحمه الله) دەچێت و پێی دەڵێت: ئەرێ براکەم.. ئەگەر خۆت و کوڕەکەت هەردووکتان لە یەك زیندانا بوونایە و، کوڕەکەت بەر لە خۆت ئازاد بکرایە، ئایا دڵخۆش نەدەبوویت بە ئازاد بوونی کوڕەکەت؟!

پیاوەکە دەڵێت: بێ گومان دڵخۆش دەبووم. فوزەیل دەڵێت: دەی ئێستاش هەر وایە براکەم، کوڕەکەت بەر لە خۆت لە زیندانی دنیا ئازاد کرا..!! ئیدی پیاوەکە بەم دڵنەواییەی فوزەیل سوکنایی بۆ دێت.[2]

## دوور کەوتنەوە

ئەبودەرداء (رضي الله عنه) دەڵێت: هەر کەس وەك خۆ بەگەورە زانینێك مۆڵەت بدات خەڵکانێك شوێنی بکەون، ئەو کەسە بەردەوام لە خوای (عزوجل) دوور دەکەوێتەوە.

---

(١) (صفة الصفوة/٢٠٩)
(٢) (إصبر واحتسب/ ١٠٢)



## سەرقاڵی بکە بە یادی خۆتەوە

عەلی کوڕی عەبدولحەمیدی غەزائری دەڵێت: ڕۆشتم بۆ سەردانی سیری سەقەتی، گەشتمە بەر دەرگاکەی و تەقولبابم لێ کرد.. سیری (رحمه الله) خۆی هات دەرگاکە بکاتەوە، گوێم لێ بوو لەو دیو دەرگاکەوە دەیگوت: پەروەردگارا.. ئەو کەسەی لە یاد و زیکری تۆم دەکات، سەرقاڵی بکە بە یاد و زیکری خۆتەوە..!![1]

## منیش دەستی تۆ دەبڕم!!

ئەو دەمەی کە عومەری کوڕی خەطاب، عەمروی کوڕی عاص دەکاتە ئەمیری میسر، پێی دەڵێت: ئەگەر کەسێکیان لەسەر دزیکردن گرت و هێنایانە بەردەستت، تۆ چی لێدەکەیت؟! عەمرو دەڵێت: دەستی دەبڕم. عومەریش (رضي الله عنه) دەڵێت: زۆرباشە.. بەڵام ئاگاداربە ئەی عەمرو..!! ئەگەر لەژێر دەسەڵاتی تۆدا کەسێك لە برسێتیدا هانای بۆ من هێنا، ئەو کاتە منیش دەستی تۆ دەبڕم، بۆیە مەهێڵە ئەوەی لەژێر دەسەڵاتی تۆدایە برسی ببێت.. هەتا پەنا بۆ دزی کردن نەبات.

## درۆ و ڕاستی

عامری کوڕی شراحبیلی شەعبی (رحمه الله) دەڵێت: هەمیشە ڕاستگۆبە، تەنانەت لەو کاتانەدا کە وا دەزانیت ڕاستگۆیی زیانت پێدەگەیەنێت.. چونکە ئاکام سوودت پێدەگەیەنێت، وە هەمیشە خۆت بە دوور بگرە لە درۆ کردن، تەنانەت لەو کاتانەدا کە وا دەزانیت درۆکردن سوودت پێدەگەیەنێت.. چونکە ئاکام زیانت پێدەگەیەنێت.[2]

(١) (صفة الصفوة/ ٤٤٦)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين: ج١/٣٤)



## قورئـان.. ڕۆشـنایی چاوەکانم

ئـەبوحـەمزەی خـزمـەتکاری ئـەبومعاویەی ئـەسـوەد دەڵێـت: ئـەبـومعاویـە ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) بـینایی چـاوەکانی لە دەسـت دابـــوو، هەر کاتێــك بیویسـتایە قـورئــان بخوێنێــت، بە دەستەمـاشـــە قـورئــانــەکەی دەدۆزیــیەوە و دەیکـــردەوە.. لەو ساتانـــەدا پـــەروەردگار بـــینایی چـــاوەکانی بـــۆ دەگێــڕایەوە، هەر کـاتێکیش لێدەبــوویـەوە دووبــارە بـینایی لە دەست دەدایــەوە!!

وە ئـــەبو زاهیــرییە دەڵێــت: لە ســـەردانێکمدا چـوومـــە تـەرســـوس، لـــەوێ ڕۆشــتمە ســەردانی ئـەبـومعاویــەی ئـەســوەد کە بـینایی چـاوەکانی لە دەست دابـــوو، لە مـــاڵەکەیدا قـورئـانێـــك لە شـــوێنێکی بـــەرزدا هەڵـواســرا بـــوو، بە ئـەبومعاویـــەم وت: ڕەحمەتـی خـــوات لێبێــت تــۆ کە چــاوانت نابینێــت ئـــەم قـورئـانەت بــۆ چـییە؟!

وتی: ئـەی بـراکـەم.. بـەڵێن دەدەیت بـاسـم نەکەیت هـەتا دوای مـردنـم؟ وتـم: بـەڵێ. وتی: بــەڕاستی هـــەرکـات دەمـــەوێت قـورئــان بخـوێنمەوە خـوای گـــەورە بـــینایيم بـــۆ دەگێـڕێــتەوە، کە لێدەبـــمەوە و قـورئـانــەکە دادەخــەم.. ڕۆشـــنایی چـاوەکانـیشـم دەبـنەوە بـە تـاریکـستان.[1]

## سـتەمی بەرپرسـان

عەبـدولڕەحمانی کـوڕی مەهـدی دەگێـڕێــتەوە و دەڵێـت: مـوحەممەدی کـوڕی یوسـفی ئـەسـفەهـانی ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) لە بــرایەکی خـۆیـەوە نـامــەیەکی بــۆ هـــات، کە تێــیدا گـلە و گـــازندەی ســــتەمی بـەرپـرســـانی دەکــرد، مـوحەممەدیش لە نامـەیـەکدا بەمجـۆرە وەڵامی دایـەوە: ســەلام ئـــەی بــراکـەم..

نــامـەکـەتـم پێ گــەشــت و لـە گــوزەرانـتان ئـــاگـادار بـــووم، بــەڵام بـــاش بـــزانـە گـــونــاە و ســەرپـێچـی کـردن بــەبــێ ســـزا نـابـێت، ئـەو حـــاڵــەی ئـێـوەش تـێـیدان.. تـــەنها ئـاکـــامی گـونـاهـەکــانی خـــۆتـانــە، خـۆتــان بـــاش بکەن، هــەتا بـەرپـــرســەکـانـیشـتان بـاش دەبـن!![2]

(١) (صفة الصفوة/٨٤٣)

(١) (صفة الصفوة/٧٣٩)



## دنیای پڕ لە غەم

پیاوێك دەڵێت بە ئەحمەدی كوڕی نزار (رحمه الله): ئەی ئەبو مەیسەرە.. نزام بۆ بكە، هەتا پەروەردگار خەم و خەفەتم نەهێڵێت. ئەویش پێی دەڵێت: بێهودەیە..! چونكە هەتا لە دنیادا بمێنیت، دەبێت پشكێك لە خەم و خەفەت و نارەحەتیت بەركەوێت.[1]

## حەزم لە هەنارە

ئەبو حاریسی ئولاسی (رحمه الله) لە سەرەتای لاوێتیدا گۆرانیبێژ بوو، خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە سەردەمی غەفڵەتمدا دەردەدارێكم بینی لەسەر ڕێگایێك كەوتبوو.. لێی نزیك بوومەوە و پێم وت: ئارەزووت لە چشتێكە بۆت بهێنم؟

وتی: حەزم لە هەنارە.. منیش ڕۆشتم هەنارێكم بۆ هێنا و خستمە بەر دەستی، چاوی بەرز كردەوە و وتی: خوای گەورە لێت خۆش ببێت. ئیدی هەر كە ئێوارەم لێهات.. دڵم گۆڕا و تۆبەم كرد، پاشان بە نیازی حەجكردن لە شار چوومە دەر، شەو لە ڕێگەدا گەشتم بە كەسانێك دانیشتبوون شەرابیان دەخواردەوە، لەپڕ كە منیان بینی واقیان وڕما..! منیان دانیشاند بۆ نان خواردن و شەراب خواردنەوە، بەڵام من بە بیانوی میز كردنەوە لێیان دوور كەوتمەوە و جێم هێشتن، هەر بەو شەوە گەشتمە دارستانێك.. لە ناكاو شێرێكم لێ پەیدا بوو!! دەمودەس پاڕامەوە لە پەروەردگار و وتم: ئەی ئیلاهی.. بەڕاستی خۆت دەزانیت من چیم جێهێشت و لە چی ڕامكرد و بە نیازی چی لە ماڵ دەرچووم؟! لێت دەپاڕێمەوە لە شەڕی ئەم شێرە قوتارم بكە، ئیدی شێرەكە تێپەڕی كرد و ڕۆشت، بە سەلامەتی گەشتمە مەككە و لەوێ بە خزمەت كەسانێك گەشتم، كە زۆر سوودمەند بووم لێیان.[2]

---

(١) (ترتيب المدارك ج ٦ /٢٩)
(٢) (صفة الصفوة/٨٤٨)

## خراپی بەسەر هێناوم!!

عومەری کوڕی خەطاب دەڕواتە خزمەت ئەبوبەکری صدیق دەبینێت توند زمانی خۆی گرتووە و ڕای دەکێشێت!! عومەر دەڵێت: وامەکە.. خوا لێت خۆش بێت!! ئەبوبەکر(رضي الله عنه) دەڵێت: وازم لێ بهێنە با ڕایکێشم، ئائەمە.. خراپی بەسەر هێناوم.[1]

## فێربوونی عیبادەت

پیاوێك دەچێتە خزمەت موحەممەدی کوڕی سیرین (رحمه الله) و پێی دەڵێت: فێری عیبادەتم بکە. موحەممەد دەڵێت: زۆرباشە.. جارێ تۆ پێم بڵێ: چەندە نان دەخۆیت؟ پیاوەکە دەڵێت: هێندە دەخۆم هەتا تێر دەبم. موحەممەد دەڵێت: ئەوە خواردنی ئاژەڵانە..!! دەی پێم بڵێ: چەندە ئاو دەخۆیتەوە؟ دەڵێت: ئاویش دەخۆمەوە هەتا تینوێتیم دەشکێت. موحەممەد پێی دەڵێت: ئەوەش ئاو خواردنەوەی وشترەکانە..!! تۆ بڕۆ یەکەمجار خۆت فێری خواردن و خواردنەوە بکە، پاشان وەرە با من فێری عیبادەتت بکەم.[2]

## پشوویەك بۆ ئەبەد

کاتێك عوتبەی غولام تۆبەی کرد و گەڕایەوە، هیچ دڵخۆشی و حەزێکی نەمابوو لەگەڵ خواردن و خواردنەوەدا.
جارێکیان دایکی پێی دەڵێت: ڕۆڵە گیان.. کەمێك بەزەییت بە خۆتا بێتەوە!! عوتبە (رحمه الله) دەڵێت: منیش هەر ئەوەم دەوێت دایە گیان.. بهێڵە با کەمێك ماندووبم، دواتر بۆ ئەبەد پشوو بدەم.[3]

---

(١) (اقوال السلف/٦٤)
(٢) (صفقات رابحة/٩٩)
(٣) (موسوعة الأخلاق ج١/٦٤)

## بە ئاسانی لە دەستی مەدە

ئەیوبی کوڕی نیعمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە جەنگی بەدردا، ئەبوعەزیزی برای موصعەبی کوڕی عومەیر لەناو ئەسیرەکاندا بوو، کەوتە دەستی موحریزی کوڕی فەزلە، موصعەب وتی بە موحریز: جوان دەستی پێوە بگرە و هەروا بە ئاسانی لە دەستی خۆتی مەدە.. ئەوە دایکێکی زۆر دەوڵەمەندی هەیە لە مەککە. ئەبوعەزیز بە موصعەبی وت: براکەم.. ئەمە هەموو قسەیەکت بوو بۆ من؟! موصعەب (رضي الله عنه) وتی: موحریز برای منە، نەوەك تۆیەکی بێباوەڕ و خوانەناس.

ئیدی دایکی لە مەککەوە چوار هەزاری نارد بۆ ئازادکردنی کوڕەکەی.

## بۆ لەوە دروستم نەکردوویت!

یونسی کوڕی سولەیمانی بەڵخی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە خانەوادەیەکی ڕێزدار و بەناوبانگی خوراسان بوو، باوکی خاوەنی سەروەت وسامان و خزمەتکارێکی زۆر بوو، بۆیە ئیبراهیم (رحمه الله) لە ناز و نیعمەتێکی زۆردا دەژیا، ڕۆژێك بە مەبەستی ڕاوکردن لەگەڵ کۆمەڵێك لە خزمەتکارەکانیدا لە ماڵ دەچێتە دەر، کاتێك بە سوار ئەسپەکەیەوە دەبێت، دەنگێك لە سەرووی خۆیەوە بانگی لێدەکات: ئەی ئیبراهیم.. تۆ بۆ ئەو گاڵتە و گەپە دروستی نەکراویت.

﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾[٢]

واتە: ئایا ئێوە وا تێدەگەشتن کە ئێوەمان بەبێ هوودە و بۆ گاڵتە و یاری دروست کردووە، وە واتاندەزانی کە ڕۆژی دوایی نایەت و ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە؟! هەتا لەسەر بیروباوەڕ و گوفتار و کردەوەکانتان لێپرسینەوەتان لەگەڵ بکەین و سزا و پاداشت وەر بگرن. دەی لە خوا بترسە و توویشوویەك بۆ ئەو ڕۆژە کۆ بکەوە، کە کەس بە دادت نارەسێت!

ئیدی ئیبراهیم لەسەر ئەسپەکەی دادەبەزێت و واز لەو هەموو

(١) (حياة الصحابة ج٣/١٢)
(٢) (سورة المؤمنون/ ١١٥)

نیعمه‌ته‌ ده‌هێنێت و ده‌ست ده‌كات به‌ كاركردن بۆ ڕۆژی ئاخیره‌تی.

وه‌ به‌شیری كوڕی مونزر ده‌ڵێت: هه‌ركات ئیبراهیمت ده‌بینی.. واتده‌زانی ڕۆحی تێدا نییه‌، ڕه‌نگی تێكچوو بوو، به‌ عه‌بایه‌ك خۆی داپۆشیبوو، ئه‌گه‌ر ڕه‌شه‌با لێی بدایا ده‌تگوت: هه‌ر ئێستا ده‌كه‌وێت، هێنده‌ لاواز بوو بوو!!

وه‌ عه‌لی كوڕی به‌كار ده‌ڵێت: له‌ شاری مه‌صیصه‌ له‌ خزمه‌ت ئیبراهیمی كوڕی ئه‌دهه‌مدا دانیشتبووین، پیاوێك له‌ خوراسانه‌وه‌ هات و وتی: كێ ئیبراهیمی كوڕی ئه‌دهه‌مه‌؟ دانیشتووان ئاماژه‌یان بۆ ئیبراهیم كرد، پیاوه‌كه‌ وتی: براكانت منیان ناردووه‌ بۆ خزمه‌تت. ئیبراهیم كه‌ گوێی له‌و قسه‌یه‌ بوو، ده‌ستی پیاوه‌كه‌ی گرت و بردیه‌ كه‌ناره‌وه‌ و پێی وت: چی تۆی هێناوه‌ بۆ ئێره‌؟! پیاوه‌كه‌ وتی: من خزمه‌تكار و غوڵامی تۆم، له‌ تەره‌فی براكانته‌وه‌ ئه‌سپ و وڵاخی باركراو و ده‌هه‌زار درهه‌مم بۆ هێناویت. ئیبراهیم وتی: ئه‌گه‌ر ڕاست ده‌كه‌یت.. بڕۆ ئه‌وا تۆم ئازاد كرد و هه‌رچییه‌كیشت پێیه‌ بیبه‌ بۆ خۆت، گه‌ردنت ئازاد بێت، به‌ڵام ئه‌م هه‌واڵه‌ بۆ كه‌س مه‌گێڕه‌وه‌.

ئیدی خزمه‌تكاره‌كه‌ به‌ هه‌موو باره‌كه‌یه‌وه‌.. به‌ ئازادی ڕۆشت.[1]

## دز هاتۆته‌ ماڵه‌كه‌م

پیاوێك ده‌ڕواته‌ لای سه‌هلی كوڕی عه‌بدوڵلا و پێی ده‌ڵێت: دز هاتۆته‌ ماڵه‌كه‌م و كه‌ل و په‌له‌كانی بردووم. سه‌هل (ڕه‌حمه‌ی الله‌) ده‌ڵێت: ده‌ی شوكری خودا بكه‌.. ئه‌گه‌ر دزی گه‌وره‌ (واته‌ شه‌یتان) هاتبایه‌ نێو دڵت و یه‌كتاپه‌رستی لێ شێواندبایت.. ئه‌و كاته‌ چ كارێكت ئه‌كرد؟!![2]

## ده‌رگای مه‌لیك

ئیبن مه‌سعود (ڕەزی الله‌ عنه‌) ده‌ڵێت: هه‌تا له‌ نوێژدا بمێنیته‌وه‌، ئه‌وه‌ تۆ له‌ ده‌رگای مه‌لیك ده‌ده‌یت، ئه‌وه‌ش له‌ ده‌رگای مه‌لیك بدات بۆی ده‌كرێته‌وه‌.

(١) (صفة الصفوة/٧٧٨ ـ ٧٧٩)
(٢) (عدة الصابرين/١٤٤ ـ ١٤٥) .

## سەلام براکەم

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ﷺ) دەڵێت: هەندێ جار بێ ئەوەی کارێکم هەبێت لە ماڵ دەچمە دەر، بەس تەنها بۆ ئەوەی سەلام لە خەڵکی بکەم و ئەوانیش سەلامم لێ بکەن.

## دانەوەی ئەمانەت و خەڵات وەرگرتن

موحەممەدی کوڕی عەبدولباقی کوڕی موحەممەدی بەزازی ئەنساری، ناسراو بە قازی مارستان (رحمه الله) دەڵێت: لە نزیک مەککە دەژیام.. ڕۆژێك برسێتییەکی سەخت ڕووی تێکردم و هیچم شك نە ئەبرد خۆمی پێ تێر بکەم..!! کیسەیەکی ئاوریشمینم دۆزییەوە، کە دەمەکەی بە پەتێکی ئاوریشمین بەسترا بوو، ئیدی هەڵمگرت و گەڕامەوە بۆ ماڵ، کیسەکەم کردەوە دەبینم ملوانکەیەکی تێدایە، کە لە یاقووت دروست کراوە.. لە جوانی و ناوازەییدا شتی وەهام نەدیبوو!! هەڵم گرت و لە ماڵ ڕۆشتمە دەر.. بینیم پیاوێك بانگەواز بۆ کیسە وون بووەکەی دەکات و کیسەیەکی دیکەی پێیە، کە پێنج سەد دیناری تێدایە و دەڵێت: ئەم کیسە پارە بۆ ئەو کەسەیە کە یاقووتەکەم بۆ دەگێڕێتەوە.

منیش لە دڵی خۆمدا وتم: من ئێستا ئاتاجم بە پارەیە و زۆریش برسیمە، یاقووتەکەی بۆ دەگێڕمەوە و پارەکەی لێوەردەگرم، ئیدی ئەو کیسەکەی دەدۆزێتەوە و منیش سوودمەند دەبم.

پیاوەکەم بردەوە بۆ ماڵ و پێم وت: ناونیشانی کیسە وون بووەکەتم پێ بڵێ؟ پیاوەکەش بە دروستی ناونیشانی کیسەکە و پەتەکەی و ملوانکە یاقووتییەکە و ژمارەی یاقووتەکانیشی هەڵدا.. منیش ئەمانەتەکەم بۆ گێڕایەوە و ئەویش پێنج سەد دینارەکەی پێبەخشیم، بەڵام من وەرم نەگرت و پێم وت: ئەوە ئەمانەتێك بوو پێویست بوو لەسەر من کە بیگێڕمەوە بۆت، بۆیە لە بری ئەو کارەدا هیچ پاداشتێك وەرناگرم. پیاوەکە زۆر پێداگیری کرد و دەیویست بە هەر شێوازێك بێت خەڵاتەکەی وەربگرم، بەڵام من وەرم نەگرت، ئیدی پیاوەکە ڕۆشت..!!

پاش مودەتێك منیش مەککەم جێهێشت و ڕۆشتم، سواری کەشتییەك بووم، لە دەریادا کەشتییەکە تێکشکا و خەڵکەکەی ناوی نووقم بوون و

کەلوپەلەکانیان تیا چوون!! من لەسەر پارچە تەختەیەکدا مامەوە و، خوای گەورە پاراستمی، ماوەیەك لە دەریادا مامەوە و نەمدەزانی بەسەر ئەو پارچە تەختەوە بۆ کوێ دەچم؟! پاشان گەشتمە دوورگەیەکی ئاوەدان، ڕۆشتمە مزگەوتێکەوە و، دەستم کرد بە قورئان خوێندن. ئیدی هەرچی لە دوورگەکەدا هەبوو هاتن و دەیانگوت: فێری قورئان خوێندنمان بکە، پاشان لە پاڵ قورئان خوێندنەکەدا، منداڵ و گەنجەکانیان هێنا بۆ ئەوەی فێری نووسینیان بکەم، ئیدی منیش بە هۆی ئەو کارەوە پارەیەکی زۆرم دەست کەوت.

پاش مودەتێك وتیان: کچێکی هەتیوی دەوڵەمەندمان هەیە دەبێت بیخوازیت، منیش نەمویست ئەو کارە بکەم، بەڵام خەڵکەکە هێندە پێداگیرییان کرد هەتا منیان ناچار کرد، کچەیان ئامادە کرد و بۆیان هێنام، کاتێك بینیم.. هەمان ملوانکە یاقوتییەکەم لە ملیدا بینی، کە لە مەککە دۆزیمەوە و دامەوە بە خاوەنەکەی..!! ئیدی لەو لەحزەدا هیچ کارێکم نەبوو سەیر کردنی ئەو ملوانکە نەبێت!! پێیان وتم: یاشێخ.. بەڕاستی دڵی ئەم کچە هەتیوەت شکاند..!! هێندە لەو ملوانکە وورد بوویتەوە و تەماشایەکی ئەمت نەکرد! ئیدی منیش بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕانەوە، هەر لە دۆزینەوەی یاقووتەکەوە، هەتا گەشتنم بە دوورگەکەیان، ئەوکاتە خەڵکەکە بە دەنگی بەرز هاواریان کرد و وتیان: لا إلهَ إلا الله.. أَللهُ أَكبَر، أَللهُ أَكبَر..!!

پێم وتن: بۆچی وا هاوار دەکەن؟!

وتیان: ئەو پیاوەی کە یاقووتەکەی وون کرد و تۆ دۆزیتەوە، باوکی ئەم کچە هەتیوەیە، کە ئێستا بووەتە هاوسەری تۆ، ئەو هەمیشە ئەم بەسەرهاتەی بۆ دەگێڕاینەوە و دەیگوت: هیچ کەسێکم نەدیوە هێندەی ئەو پیاوە موسوڵمان بێت. وە دەپاڕایەوە و دەیگوت: پەروەردگارا.. بۆ جارێکی دیکە لەگەڵ ئەو پیاوەدا کۆمان بکەرەوە، بۆ ئەوەی ئەم کچەی خۆم بکەمە هاوسەری، ئەوەتا ئێستا لە پاش مردنی دۆعاکەی هاتە دی و کچەکەی بوویە هاوسەرت..!!

موحەممەد دەڵێت: ساڵانێك پێکەوە بووین و خوای گەورە دوو کوڕی پێبەخشین، پاشان هاوسەرەکەم مرد و یاقووتەکەی بۆ من و منداڵەکان جێهێشت، پاشان هەردوو کوڕەکەشم مردن و یاقووتەکە بە تەنیا بۆ من مایەوە، منیش فرۆشتم بە سەد هەزار دینار.[1]

(١) (الذيل على طبقات الحنابلة: ج١/ ٤٤٣ ـ ٤٤٤)

## گوزەرانی هەتیوێك!

سیری سەقەتی دەڵێت: ئەم حاڵ و پلە و پایەی منی تێدام، بە هۆی بەرەکەتی دوعایەکی مەعروفی کەرخییەوەیە ( رحمه الله ).
سیری دەڵێت: لە نوێژی جەژن بوومەوە و هاتمە دەرەوە، دیتم مەعروف منداڵێکی سەر و ڕوخسار تۆزاوی لەگەڵدایە، پێم وت: ئەم منداڵە کێیە؟! وتی: منداڵانێکم بینی بۆ خۆیان یاریان دەکرد و، ئەمیشم بینی لە سوچێکدا دوورە پەرێز و دڵشکاوانە وەستا بوو! پێم وت: کوڕە جوانەکە.. ئەی بۆچی تۆش نارۆیت یاری بکەیت؟! وتی: من هەتیوم.. نە جلوبەرگێکی جوانم لەبەردایە و نە پارەیەکم پێیە هەتا شتی پێبکڕم..!!
سیری دەڵێت: وتم: دەی دەتەوێت چی بۆ بکەیت؟! مەعروف وتی: دەیبەم بەڵکو شتێکی بۆ پەیدا بکەم، هەتا گوێزی پێبکڕێت و دڵی خۆش ببێت. وتم: ئەی بۆچی نایدەیتە دەستی من، هەتا لەو حاڵە ڕزگاری بکەم و گوزەرانی باش بکەم؟ مەعروف وتی: بەڵێن دەدەیت کە ئەو کارەی بۆ بکەیت؟ وتم: بەڵێ.. بەڵێن دەدەم، بە پشتیوانی خوای گەورە گوزەرانی باش دەکەم. مەعروف وتی: دەی کەوایە بیبە، خوای گەورە دڵت دەوڵەمەند بکات.
سیری دەڵێت: ئیدی لەو کاتەوە، دنیا زۆر بێ ئەرزش بووە لەلام و، خوای گەورە نزاکەی مەعروفی بۆ گیرا کردم.[1]

## خوا پرسیاری قەزا و قەدەر ناکات

بیلالی کوڕی ئەبی بوردە بە موحەممەدی کوڕی واسع دەڵێت: چی دەڵێیت دەربارەی قەزا و قەدەر؟ موحەممەد ( رحمه الله ) لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی ئەمیر.. خوا لە ڕۆژی دوایدا پرسیاری قەزا و قەدەر لە بەندەکانی ناکات، بەڵکو پرسیاری کردەوەکانیان لێدەکات.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٤٢٤ ـ ٤٢٥)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء ج٤١٦/١)

## نرخەکەی لەوە زیاترە

ئومەیــەی کــوڕی بوســتام دەڵــێت: ڕۆژێــك ئافرەتێــك جبەیــەکی ئاوریشــمینی هێــنا بــۆ دوکانەکــەی یــونسی کــوڕی عوبــەید و پێــی وت: ئــــەم جــبەیــــەم لــێ بکـــــڕە. یـــونس ( رَحِمَهُ اللهُ ) وتــی: بە چـــــەند دەیــفرۆشـیت؟ ئافـرەتەکە وتـی: بـــە پێــنج سەد درهـــەم. یونـس وتـی: خـوشکی مـن، جبەکـەت پـــارەی زیـاتـر دەکـات! ئـافرەتەکـە وتـی: دەی بە شەش سەد درهەم بیبە. یونس وتی: هێشتا لەو نرخەیش زیاترت بۆ دەکات..!!

یونـس هـەر بـەو شـێـوازە نـرخـەکـەی گەیـاندە هــەزار درهـــەم، پێــنج ســـەد درهـــەمی زیـاتـری پێبەخـشی، ئـینجا جبەکـەی لـێ کــڕی!!، جـبە کڕینەکەی کــردە بـەهانـە تـا ئافـرەتەکـە هـەسـت بـە بـەخشـینەکـەی نـەکـات![1]

## مزگەوتێك و.. ئافرەتێکی مەسیحی

ئـافرەتێکی مـەسیحی دەچـێتە خـزمـەت عومـەری کوڕی خـەطاب و شـکاتی ئــەوەی لا دەکـات، کە عەمـــرووی کــوڕی عــاص خـانـــووەکەی ڕووخـــاندووە و زەویـیەکەی خـسـتووەتـە سـەر زەوی مـزگــەوت..!!

عـومـــەر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بـێ دواکــەوتن دەســت دەکــات بە لێکــۆڵینەوە، عـەمــرو لە وەڵامــدا دەڵێــت: ئــەی ئـــەمیری ئیمانــداران.. مـوســـوڵمانەکان زۆر بـــوون و مـزگــەوتــەکەش تـــەنگ بـــوو، ئـــەم ئـافــرەتــەش خـانـــووەکەی بە تەنیشـــت مـزگــەوتەوە بـــوو، داوام لێکـرد کە خـانـووەکــەی بفـرۆشـێت پـێمان، بــۆ ئــەو مـەبـەسـتەش بە چەنـدین قـات پـارەم پێدا، بـەڵام هــەر ڕازی نـەدەبـــوو، منیـش خـانــووەکـەیـم ڕوخــاند و خسـتمە ســەر مـزگــەوت، وە پـارەکـەیـشــم خسـتە بـەیتوماڵ، بـۆ ئــەوەی هـەرکـات ویـسـتی بێت و وەری بگـرێت. عـومەری فــاروق بـەو قـسـانـە ڕازی نـابێت و بە عەمرو دەڵێت: بـینا تـازەکـەی مـزگـەوت بـروخــێنە و.. خـانـووەکـــە وەك خـــۆی دروســـت بکـــەوە و بـیگێـــڕەوە بـــۆ ئـافـرەتـــە مـــەسـیحییەکە.

---

(١) (تهذيب حلية الأولياء ج١/٤٣٥)



## ڕێگامان وون کردووە

ئەصمەعی ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەڵێت: خۆم و هاوەڵێکم بۆ گەشتێك چووینە بیابان و ڕێگامان وون کرد، چادرێکمان بینی و بەرەو ڕووی ڕۆشتین، سەلاممان کرد و ئافرەتێك وەڵامی داینەوە و وتی: ئێوە کێن؟
وتمان: ئێمە ڕێبوارین.. ڕێگامان وون کردووە و ڕوومان کردۆتە ئێوە. ئافرەتەکە وتی: ڕووتان وەرگێڕن، هەتا من میوانداریيەکی شیاوتان بکەم.
فەرشێکی پێداین و وتی: لەسەر ئەو فەرشە دانیشن هەتا کوڕەکەم دێتەوە. ئێمە دانیشتین و ئەو لەودیوی چادرەکەوە زوو زوو لایەکی چادرەکەی هەڵدەدایەوە و چاوەڕێی هاتنەوەی کوڕەکەی دەکرد، دواجار کە چادرەکەی هەڵدایەوە، وتی: خوایە گیان داوای خێر و بەرەکەت لە تۆ دەکەم.. ئەو وشترە هی کوڕەکەمە، بەڵام سوارەکە کوڕەکەم نییە..!! سوارەکە هاتە پێشەوە و بە ئافرەتەکەی وت: ئەی دایکی عەقیل.. خوا جەزای خێرت بداتەوە، عەقیل مرد.
ئافرەتەکە وتی: هۆکاری مردنەکەی چی بوو؟! سوارەکە وتی: وشترەکان لە کاتی ئاو خواردنەوەدا، شلۆغییەکیان دروست کرد و کوڕەکەت کەوتە ناو بیرەکەوە. ئافرەتەکە وتی: دەی تۆ دابەزە و خزمەتی ئەم میوانانەم بۆ بکە.
ئیدی بەرانێکی بۆ سەربڕین و خواردنی لێ ئامادە کرد و بۆی هێناین، ئێمەش نانمان دەخوارد و سەرمان سوڕدەما لەو هەموو ئارام گرتنەی..!! کاتێك لە نان خواردن بووینەوە، بە دڵشکاوی هاتە دەرەوە بۆ لامان و وتی: ئایا کەسێکتان شتێك لە قورئان دەزانێت؟ وتم: بەڵێ. وتی: دەی بۆم بخوێنەوە هەتا سوکنایيم بۆ دێت. وتم: خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ * الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ * أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾[1]

واتە: سوێند بەخوا تاقیتان دەکەینەوە بە هەندێك لە ترس و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و دارایی و کەسوکار و بەرووبووم، جا مۆژدە بدە بە خۆڕاگران، ئەوانەی کە لەگەڵ دووچاری سەختییەك بوون، دەڵێن: ئێمە هەر هی خواین

(١) (البقرة/١٥٥ ـ ١٥٧)



و هەر بـۆ خـــزمەتی ئەویــش دەگەڕێیــنەوە، ئـا ئـەوانـــە درووود و بـــەزەیی پـــەروەردگاریان بە سـەردا دەبارێـت لەلایــەن پەروەردگاریـانەوە وە ئــەوانە ئــەو کەسانەن کە هـیدایـەتیان وەرگرتــووە.[1]

ئـافـرەتەکـە وتی: بلێ وەڵلاهی.. ئـەمـە لە قـورئـانـەکـەی خوادا هـەیـە؟ وتــم: وەڵلاهی ئـەمـە کـەلامی خــوایە و لە قـورئـانـەکـەیدا هـەیـە.

پاشـان ئـافــرەتـەکە ڕۆشــت دوو ڕکـات نــوێـژی ئـــــەدا کـرد و سـێ جــاران وتی: إنـا لله وإنـا إلیـهِ راجعُـون.. ئـارام دەگــرم لەســەر مــردنی عەقیلـی کــوڕم و چـاوەڕێـی پـاداشــت لـە خــوا دەکـەم، ئـەی پــەروەردگــارم.. ئــەوەی فــەرمــانت پێکـردووم جـێبـەجێم کـرد، تـۆش ئــەوەی بـەڵێـنت پـێداوم پـێم بـبـەخـشــە.[2]

## لەناوبەری گەلان

ئـەبـومـوســای ئـەشـعـــەری (رضي الله عنه) دەڵــێت: ئاگـاداربن..!! ئـــەوەی گـــەلانی پـێش ئـێـوەی بـە هـەلاکـەتـا بــرد.. دیـنـار و درهـەم بــوو، هـــەر ئـــەو دیــنار و درهـــەمــە ئـێوەش لـەنـاو دەبـات.

## فەزڵ و چاکە

وتیان بــە عـەبــدوڵڵای کــوڕی مـوبــارەك (رحمه الله): لـەخـــۆ ڕازی بــــــوون چـی یـە؟! عـەبـدوڵڵا وتـی: لـەخــــۆ ڕازی بــــوون.. ئـــەوەیــە کــە وا بــزانیــت تـــۆ شـتـێکـت هـــەیـــە (لـــە فـــەزڵ و چـاکــە) و کــەســـانی تــر ئـــەو شـــتەیــان نـی یـە.[3]

---

(١) (پوختەی تەفسیری قورئان/٢٤)

(٢) (مواقف إيمانية/٣١١ ـ ٣١٢)

(٣) (اين نحن من هؤلاء: ج١١٩/٥)



## لەی عوسمان تینوویان کردیت؟!

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك عوسمانی کوڕی عەفان ئابڵۆقە درا بوو، چوومە سەردانی بۆ ئەوەی سەلامی لێ بکەم، پێی وتم: بەخێر بێیت ئەی براکەم.. ئەمشەو هەر لەم ماڵەدا بە خزمەتی رسول الله (ﷺ) گەشتم، فەرمووی: ئەی عوسمان ئابڵۆقەیان داویت؟ وتم: بەڵێ قوربان. فەرمووی: تینوویان کردوویت؟ وتم: بەڵێ قوربان. ئیدی جامێکی بۆ ڕادێرام کە ئاوی تێدا بوو، لێم خواردەوە هەتا تینوویێتیم شکا و ئێستاش هەست بە فێنکی ئاوەکە دەکەم لە سینگمدا، وە پێی فەرمووم: ئەگەر بتەوێت سەر دەکەویت بەسەریاندا، ئەگەر.. نا، ئەوا سبەی لە لای ئێمە ڕۆژووەکەت دەشکێنیت. منیش ئەوەم هەڵبژارد کە لە خزمەتیدا ڕۆژووەکەم بشکێنم.

ئیمامی عوسمان (رضي الله عنه) هەر ئەو ڕۆژە بە زمانی بەڕۆژووەوە و لە خزمەتی قورئاندا شەهید دەکرێت و خوێنە پاکەکەی دەڕژێتە سەر پەڕەی قورئانەکەی.[1]

وە ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك عوسمان شەهید کرا، ژنەکەی وتی: ئێوە کەسێکتان کوشت، کە هەموو شەوەکەی زیندوو دەکردەوە و.. لە یەك ڕکات شەونوێژدا هەموو قورئانی خەتم دەکرد.[2]

## وەرینی گوناهەکان

مالیکی کوڕی دینار (رحمه الله) دەڵێت: پەشیمان بوونەوە و گریان بۆ گوناهەکان.. خودی گوناهەکان دەوەرێنێت، وەك چۆن ڕەشەبا.. گەڵا زەرد و وشکەکانی خەزان دەوەرێنێت.[3]

---

(١) (حيــاة الصحابة ج٥/٣١٦)
(٢) (حيــاة الصحابة ج٤/١٢٠ ـ ١٢١)
(٣) (أقوال السلف/٣٨)

## پاڵ بە دنیاوە دەنێین!

عەمروی کوڕی موسای کوڕی فەیروز دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بیشری حافیم بینی پیاوێکی لەگەڵدا بوو، پیاوەکە نزیك بوویەوە لە بیرێك بۆ ئەوەی ئاوی لێ بخواتەوە، بیشر ( رحمه الله ) پێی وت: لێرە نا.. دەچین لە بیرێکی دیکەدا ئاوەکەت بخۆرەوە.
ڕۆشتن هەتا گەشتنە بیرێکی دیکە، لەوێش هەمان شت ڕوویدایەوە، هەر بەو شێوەیە سێ بیریان تێپەڕاند و بیشر نەیهێڵا پیاوەکە ئاوەکەی بخواتەوە!
پیاوەکە وتی: ئەی ئەبا نەصر.. من زۆر تینوومە، بۆ ناهێڵیت ئاوەکەم بخۆمەوە؟! بیشر پێی وت: بێدەنگ بە ئەی پیاو.. ئێمە ئاوەها پاڵ بە دنیاوە دەنێین.[1]

## سەردانێك لەبەر خوا

جونەیدی بەغدادی دەڵێت: لەگەڵ کۆمەڵێك هاوەڵمدا ڕۆشتین بۆ سەردانی ئەبو یەعقوبی زەیات ( رحمه الله ) کاتێك تەقولبابمان کرد، لەودیو دەرگاکەوە وتی: هیچ خواپەرستییەك نەبوو ئەنجامی بدەن و مەشغوڵتان بکات، ئەوە نەبێت کە بێن بۆ لای من؟!
منیش وتم: دەی ئەگەر سەردانەکەمان لەبەر خوا بێت و دامان نەبڕێت لە خوا، ئەو کاتە چی دەڵێیت؟!
ئیدی ئەبو یەعقوب دەرگاکەی لێ کردینەوە و چووینە ژوور.[2]

(١) (صفة الصفوة/٤٢٩)
(٢) (صفة الصفوة/٤٦٥)



## یه‌کلابوونه‌وه

بیلالی کوڕی سه‌عد (رحمه الله) ده‌ڵێت: وریابه‌.. نه‌که‌یت به‌ ئاشکرا و به‌ دیار چاوی خه‌ڵکییه‌وه‌ وه‌لی و دۆستی خوا بیت و.. به‌ نهێنی دوژمن و سه‌رپێچیکاری فه‌رمانه‌کانی بیت.[1]

## بۆ ئه‌و ڕوخساره‌ جوانه‌ ده‌گریم!

کۆمه‌ڵێك گه‌نج ویستیان ڕه‌بیعی کوڕی خوسه‌یم (رحمه الله) تاقی بکه‌نه‌وه‌ که‌ له‌ تافی لاوێتیدا بوو، ئافره‌تێکی زۆر جوانیان تێگه‌یاند. که‌ بچێت له‌ سوچێکی چۆڵه‌وانیدا چاوه‌ڕێی بکات، هه‌تا له‌ مزگه‌وت دێته‌وه‌، ئه‌و کاته‌ خۆی بۆ ده‌رخات و به‌ جوانییه‌ ناوازه‌که‌ی له‌ خشته‌ی به‌رێت.

ئافره‌ته‌که‌ به‌ پێی پیلانه‌که‌ ڕۆشت و ڕێی له‌ ڕه‌بیع گرت و ڕوخساره‌ جوانه‌که‌ی بۆ ده‌رخست، که‌ وه‌ك مانگی تابان ده‌دره‌وشایه‌وه‌! وه‌ داوای لێکرد که‌ له‌گه‌ڵیدا چه‌ند ساتێکی خۆش به‌سه‌ر به‌رێت.

به‌ڵام ڕه‌بیع کاتێك ئه‌و ڕوخساره‌ جوانه‌ی بینی ده‌ستی کرد به‌ گریان..!! ئافره‌ته‌که‌ تووشی شۆك هات و لێی پرسی: بۆچی ده‌گریه‌یت ئه‌ی پیاو؟!

ڕه‌بیع پێی وت: بۆ ئه‌و ڕوخساره‌ جوانه‌ ده‌گریم.. که‌ خاوه‌نه‌که‌ی ڕێگه‌یه‌کی خراپی بۆ هه‌ڵبژاردووه‌ و.. سبه‌ی له‌ناو ئاگری دۆزه‌خدا ده‌بێته‌ که‌لله‌ سه‌رێکی ترسناکی خه‌ڵوزاوی!!

قسه‌کانی ڕه‌بیع هێنده‌ کاریگه‌ریان ده‌بێت له‌سه‌ر ده‌روونی ئافره‌ته‌که‌.. که‌ به‌ یه‌کجاری واز له‌ کاره‌ خراپه‌کانی ده‌هێنێت و.. ده‌بێته‌ تۆبه‌کارێکی دڵ وابه‌سته‌ی نوێژ و خواپه‌رستی.[2]

---

(١) (روضة الزاهدين/٥٦)
(٢) (مواقف إيمانية/١٠١)

## لەحمەد.. نایەوێ شازادە بێت!

عەبدوڵلای کوڕی فەرەج دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆژێکیان لە ماڵ چوومە دەر، بۆ ئەوەی وەستایەك ببەمەوە بۆ ماڵ، هەندێ کارمان بۆ بکات، ئاماژەی پیاوێکی ڕوخسار جوانیان بۆ کردم، کە لەبەر دەستیدا گوریسێك و زەمبیلەیەکی گەورەی دانابوو[1].

ڕۆشتم بۆ لای و پێم وت: دەتوانی بێیت لە ماڵەکەمدا هەندێك کارم بۆ بکەیت؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ.. کارت بۆ دەکەم بە درهەم و دانقێك، بەڵام بەشەرتێك. وتم: باشە شەرتەکەت چییە؟! وتی: کاتی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر.. وادەی وەستانمە لە حوزوری پەروەردگارمدا، بۆیە لەو کاتانەدا دەبێت مۆڵەتم بدەیت، کارەکەم بووەستێنم. وتم: ئەوەش بۆ تۆ بێت، دەی هەستە با بڕۆین.

ئیدی هێنامەوە بۆ ماڵ و کارەکەی بۆ کردم، پاشان ڕۆژێکی دیکە ڕۆشتمەوە بە شوێنیدا، بەڵام پەیدام نەکرد، هەواڵیم پرسی، پێیان وتم: ئەو پیاوە لە هەفتەیەکدا تەنها ڕۆژی شەممان دەر دەکەوێت.

منیش ڕۆژی شەممە ڕۆشتمەوە و پیاوەکەم دیت و پێم وت: کارم بۆ دەکەیت؟ وتی: بەڵێ.. بە درهەم و دانقێك کارت بۆ دەکەم. وتم: نەخێر.. تەنها بە درهەمێك. وتی: بە درهەم و دانقێك. وتم: دەی هەستە بابڕۆین.

من ئارەزووی ئەوەم نەبوو کە دانقەکەی لێببڕم، هەر ویستم بزانم ئەو چی دەڵێت؟ ڕۆشتینەوە بۆ ماڵ و هەتا ئێوارە کاری بۆ کردم، ئەوکات درهەمێکم پێدا، وتی: ئەمە چییە؟! وتم: ئەوە درهەمەکەیە، هەقی کار کردنەکەت. وتی: ئەی پێم نەوتیت بە درهەم و دانقێك؟! هاوار لە دەستی تۆ..! کارەکەت لێتێکدام. وتم: ئەی منیش پێم نەوتیت بە درهەمێك؟ پیاوەکە وتی: دەی کە وای لێهات من هیچم لەو پارەیە ناوێت!

ئیدی درهەم و دانقێکم پێدا، بەڵام وەری نەگرت و وتی: سبحان الله..! من دەڵێم هیچم لەو پارەیە ناوێت، تۆش هەر واز ناهێنیت!

پیاوەکە پارەکەی وەرنەگرت و ڕۆشت، ژنەکەم هات و پێی وتم: خوا چیت لێ بکات، تۆ چیت لەو پیاوە ویست وا کارەکەیت لێ تێکدا؟!

پاش ماوەیەك ڕۆشتم بۆ ئەوەی هەواڵێکی بزانم، پێیان وتم: ناساغە و

---

(١) (پیاوەکە ناوی: ئەحمەدی کوڕی هارون بووە (رحمه الله)).

لە مـــاڵەوە کەوتـووە.

ناونیشـانی مـاڵەکەیم وەرگـــرت و کەوتمە ڕێ بــۆ لای، مــۆڵەتم وەرگـــرت و ڕۆشـــتمە ژوورەوە.. دەبیـنم بـــە دەســـت ئـــازاری ســـکیەوە دەناڵـــێنێت و مـــاڵەکەی هیچی تێدا نییە، بێجگە لە گـوریس و زەمبیلەکەی نەبێـت..!! سـڵاوم لێکـــرد و پـێم وت: داوایـــەکم هـەیـــە دەمـــەوێت بـــۆم جێبەجـێ بکەیـت، خـۆیـشــت دەزانیت دڵخـۆشـکردنی کەسـانی تر چـەندە خێری هـەیـە، منیـش پێم خـۆشـە بێیتە مـــاڵەکەم و خـۆم پـەرسـتاری و خـزمـەتت بکەم.

وتی: هەر بەڕاسـتی ئـەوەت پێخـۆشـــە؟ وتم: بەڵێ.. زۆرم پێخـــۆش دەبێـت تـۆ ئـەو کارەم بـۆ بکەیت.

وتـی: باشـــە دێـم.. بەڵام ســـێ دانـــە مـــــەرجم هـەیـــە. وتـم: قبـوڵمە، مـەرجـەکـانتم پـێ بڵـێ. وتـی: خـواردنـــم بـــۆ مـەهێـنە هـــەتا خـــۆم داوات لێدەکەم، وە هــەرکاتێـك مـردم هـەر بـەم بـــەرگ و پـۆشـاکانـەی خـۆمـــەوە کفن و دفـنم بـکە. وتـم: بـەڵێ.. إن شـاء الله وادەکـەم. وتـی: مـــەرجی ســێیەم نارەحەتـترە و لە کاتی خـۆیدا پێت دەڵێم. وتم: هـــەرچـــەن سـەخت بێت بە پێـی توانا بـۆت ئـەنجام دەدەم إن شـاء الله .

ئیـدی هەڵمگـــرت و بـــۆ کـاتی نـیوەڕۆ گەشـــتینەوە مـــاڵ، شــەوێکمان گـــوزەراند و بـــۆ بـەیانییەکـەی بانگی کـــردم، وتـــم: مـــن لە خـزمـــەتتدام.. چـیت دەوێت؟ وتی: وا هەسـت دەکـەم ئـەمـە دوا ســـاتەکانی تـەمـەنمە، لە قـــۆڵی کراســـەکەمدا تـــورەکەیـــەکی بچـوکی تێدایـــە دەری بهێـنە و بـیکەوە. تـــورەکەکەم کـــردەوە.. بـینیم ئـەنگوسـتیلەیەکی نقێمداری ســـــووری تێدایـــە، پێی وتم: ئـــەگەر من مـــردم و دفنت کـــردم، ئـــەم ئـــەنگـــوسـتیلەیـــە ببە بـــۆ هـــارونـــە ڕەشـــیدی ئـــەمـــیری ئیمانـــداران و پێـــی بڵـــێ: خـــاوەنی ئـــــەم ئـــەنگوســـتیلەیە پێـت دەڵێـت: ئـاگاداربـــە.. بـــەو ســەرمـەســـتی و دنیـا ویـستییەتەوە مـەمـرە، چونکە ئـــەگەر بـــەو حـــاڵەوە بمریت زۆر پـــەشـیمان دەبـیتەوە و پـەشـیمانیـش ســـــوودت پێناگـــەیەنێت.

پیـــاوەکە مـــــرد و لەســـــــەر وەســـیەتەکەی خـــۆی کفـــن و دفـــنم کـــرد، بەســـــەرهــاتەکەیم لە پـەڕاوێکدا نـــووسـیـیەوە و ڕۆژێـك کە هـارونـە ڕەشـــید لە کـــۆشــــکەکەی هــاتـــە دەرەوە، بە زەحمـــەت و کـوتـــەك خـــواردن و ئـــازار چـــەشـتنـێکی زۆرەوە، نـــووســـــراوەکەم گـــەیاندە دەســـتی هـارون و خـــۆم لە دەرەوە چـاوەڕێـم دەکـــرد.

کاتێــك هـــــارون لە کـــۆشــکەکەیدا نـــووســـراوەکە دەخوێنـــێتەوە، دەڵێـت: بـــڕۆن خـــاوەنی ئـــەم نـــووســــراوەم بـــۆ بهێنن.

کاتێـك بـــردمـیانە ژوورەوە، هـــارون زۆر تـــوڕە بـــوو لە هـــەڵسـوکـەوتـــەکەم، بـــۆیە منیش یەکســـەر ئـــەنگوســتیلەکـــەیم بـــۆ دەرهێـنا، هـــــارون وتـی: ئـــەم

ئـەنگـوسـتیلەیەت لە کـوێ بـــوو؟!

وتم: پیاوێکی گڵکار پێیدام.

وتی: گڵکـار..!! گڵکـار..!!

وتم: ئـەی ئـەمـیری ئیمانـداران.. وەسـیەتێکیـشم پێیە بـۆت.

هارون وتی: هـاوار لە دەسـتی تـۆ.. بـۆ قـسـە نـاکەیت؟!

وتم: ئـەی ئـەمـیر.. خـاوەنی ئـەم ئـەنگوسـتیلەیە سـەلامی لێدەکـردیت و داوای لێکـردم کە پێـت بڵـێم: ئـاگـاداربـە.. بەو سـەرمـەسـتی و دنیـا ویستییەتەوە مـەمـرە، چـونکە ئـەگەر بـەو حـاڵەوە بمریـت زۆر پەشـیمان دەبیتەوە و پەشـیمانـیش سـوودت پێناگـەیەنێت.

لەو کـاتەدا هـارون هـەسـتایە سـەرپێ و خـۆی خـسـت بەسـەر ڕاخـەرەکـەدا و وتی: ئـەی کوڕەکەم ئـامـۆژگارییەکی باشـی باوکت کـرد.

لە دڵـی خـۆمدا وتـم: پێدەچـێت ئـەو پـیاوە کـوڕی بـوو بێت..!! پاشـان هـارونـە ڕەشـید دانیـشـت و ئـاویان هێـنا دەمـوچـاویـان پـێ تـەڕ کـرد، دواتـر پێـی وتـم: چـۆن خـاوەنی ئـەم ئـەنگوسـتیلەیـەت ناسـی؟! منیش بەسـەرهـاتـەکەیم بـۆ گێڕایـەوە، هـارونیش دەسـتی کـرد بە گـریان و وتـی: ئـەوە یـەکەمین منداڵـم بـوو..!! لە سـەردەمـی خـەلافـەتی مـەهـدی بـاوکمدا، (زوبـەیدە)م بـینی و خـۆشـم ویسـت، پاشـان بـە نهـێنی هـاوسـەرگـیریـمان کـرد و ئـەم منداڵـەی بـوو، دواتـر ئـەم ئـەنگوسـتیلەیـە و زۆر شـتی تـرم پێدان و ڕەوانـەی بـەسـرەم کـردن و بـە زوبـەیدەم وت: بـڕۆن خـۆتـان بشـارنـەوە، هـەر کاتێـك هـەواڵت پێگـەشـت کـە مـن چـوومـەتـە سـەر تـەختی خـەلافـەت وەرن بـۆ لام، کـاتێك بـوومـە خـەلیفە هـەواڵیانـم پرسـی، پێـیان وتـم: هـەردووکـیان مـردوون، ئیدی مـن نـەمـزانـیوە کە لـە ژیـاندا مـاون یـان.. نـا؟!

پاشـان دوای نوێـژی شـێوان لەسـەر بـەڵێنی خـۆی، بە جلوبـەرگێکی سـادەوە هـاتە دەری کـۆشـك و دەسـتی گـرتم، منیش بـردم بـۆ سـەر گـۆڕی کـوڕەکـەی، کە لە گـۆڕسـتانی عـەبدوڵڵای کـوڕی مالیکدا ناشـتبـووم، لـەوێ هـارون هـێندە گـریا.. هـەتا منیش وەك سـۆز و بـەزەیـیەك بـۆ ئـەو دەسـتم کـرد بـە گـریـان، زوو زوو بـە گـریـانـەوە دەیـگوت: ئـەی کـوڕەکـەم.. ئـامـۆژگـارییـەکی باشـی بـاوکـت کـرد.

هـەتا بـەرەبـەیان لەوێ مـاینەوە، دواتـر هـارون بـەر لـەوەی بـڕواتـەوە بـۆ کـۆشـك پێی وتـم: فـەرمـانـم دەرکـردووە کـە دە هـەزار درهـەمت پێبدرێـت و بـە جوانی خـۆت و خێزانـەکـەت خزمـەت بکرێـن، وە وەسـیەتـم نـووسـیووە کە لـە پاش مـردنیـشـم باشـبن بـۆتـان، لە پاداشـتی ئـەوەی کە وەسـێتی کـوڕەکـەمت جێبەجێ کـردووە.

هەروەها پێی وتم: تۆ لێرە لەبەردەم کۆشکدا بمێنەوە، هەتا من دەچمە ژوورێ، ئەوسا بانگت دەکەم بۆ ئەوەی بە جوانی بەسەرهاتەکەیم بۆ بگێڕیتەوە. منیش وتم: إن شاء الله.
بەڵام دوای ئەوەی کە هارون ڕۆشتەوە ناو کۆشکەکەی، منیش ڕۆشتمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم و نەگەڕامەوە بۆ لای هارون.[1]

## بەندەیەکی هەڵاتوو

مالیکی کوڕی دینار ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەڵێت: هات بە خەیاڵمدا وەسیەت بکەم کاتێك مردم.. بە کۆت و زنجیر ببەسترێمەوە و فڕێ بدرێمە بەردەم پەروەردگارم، هەروەك چۆن بەندەیەکی تاوانباری هەڵاتوو.. دەهێننەوە بەردەم گەورەکەی!![2]

## ئەی میوان.. خیانەتت لێکردم!!

ئەبوزەڕی غەفاری (رضي الله عنه) چەند وشترێکی هەبوو، لە نێویاندا وشترێکی نێری بەهێزی تیا بوو، کە خۆشەویسترین ماڵی ئەبوزەڕ بوو، ڕۆژێك میوانێکی هات.. ئەبوزەڕ پێی وت: من سەرقاڵم، تۆ هێندە زەحمەت بکێشە.. بچۆ لەناو ئەو وشترانەدا باشترینیان بهێنە با سەری ببڕین. میوانەکە ڕۆشت وشترێکی لاوازی کەمگۆشتی هێنا، کاتێك ئەبوزەڕ وشترە لاوازەکەی بینی بە میوانەکەی وت: وەڵلاهی ئەی میوان خیانەتت لێکردم..!! من وتم: بڕۆ باشترینیان بهێنە، نەك لاوازترین. میوانەکەش وتی: دەزانم باشترینیان وشترێکی نێر بوو، وتم: با بۆ ئەو ڕۆژە بێت کە خۆتان پێویستتان پێی دەبێت. ئەبوزەڕ وتی: ئەو ڕۆژەی کە من پێویستم پێیەتی ئەو ڕۆژەیە کە دەمنێنە ناو گۆڕەکەمەوە.[3]

(١) (صفة الصفوة/٤١٨ ـ ٤٢٠)
(٢) (قصص الصحابة والصالحين/١١٤)
(٣) (قصص الصحابة والصالحين/١١٤)

## بانگه‌وازی په‌روه‌ردگار

کاتێك ڕه‌بیعی کوڕی خوسه‌یم (رحمه الله) تووشی ئیفلیجی ده‌بێت، دوو که‌س لای ڕاست و چه‌پی ده‌گرن و ده‌یبه‌ن بۆ مزگه‌وت، هاوه‌ڵه‌کانی عه‌بدوڵڵای کوڕی مه‌سعود پێی ده‌ڵێن: ئه‌ی ئه‌با یه‌زید.. تۆ خوا گیان ڕوخسه‌تی داویت، ده‌توانی هه‌ر له‌ ماڵه‌وه‌ نوێژه‌کانت بکه‌یت.

ڕه‌بیع ده‌ڵێت: ئێوه‌ ڕاست ده‌که‌ن، به‌ڵام من گوێم لێبوو له‌ مزگه‌وته‌وه‌ بانگی ده‌کرد: (حي على الفلاح) بۆیه‌ هاتم، ئێوه‌ش هه‌رکات گوێتان له‌ بانگبێژ بوو ده‌یگوت: (حي على الفلاح) ئه‌وا ئه‌گه‌ر به‌ خۆخشاندنیش بووه‌، بچن به‌ده‌م بانگه‌که‌یه‌وه‌.[1]

وه‌ هه‌روه‌ها موصعه‌بی کوڕی عه‌بدوڵلا ده‌ڵێت: عامری کوڕی عه‌بدوڵلا زۆر نه‌خۆش بوو، کاتێك گوێی له‌ بانگبێژ بوو بانگی مه‌غریبی ده‌دا، وتی: ده‌ستم بگرن با بچم بۆ نوێژه‌که‌م. وتیان: تۆ زۆر ناڕه‌حه‌تیت له‌ ماڵه‌وه‌ نوێژه‌که‌ت بکه‌.

عامر (رحمه الله) وتی: گوێم له‌ بانگبێژی خوا گیانه‌وه‌ بێت و نه‌چم به‌ ده‌میه‌وه‌؟! ناچار ده‌ستیان گرت و بردیان بۆ مزگه‌وت، ڕکاتێکی له‌گه‌ڵ ئیمامدا ته‌واو کرد و هه‌ر له‌ نوێژه‌که‌یدا.. دنیای جێهێشت و گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ خزمه‌تی په‌روه‌ردگار![2]

## واده‌ی سه‌فه‌ره‌

حوزه‌یفه‌ی کوڕی یه‌مان (رضي الله عنه) ده‌ڵێت: هه‌موو به‌یانی و ئێوارانێك.. بانگبێژێك بانگ ده‌کات: ئه‌ی خه‌ڵکینه‌.. ئاماده‌بن، کاتی سه‌فه‌ره‌.. کاتی سه‌فه‌ره‌!

(١) (تهذيب حلية الأولياء ج٣١١/١)
(٢) (موسوعة الأخلاق ج٧٠/١)

## سەرخۆشێکی عاشق

موحەممەدی کوڕی قودامە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆژێك سەرخۆشێك گەشت بە بیشری حافی، دەستی کرد بە ماچکردنی و دەیگوت: ئەی گەورەم، ئەی خۆشەویستم.. ئەی ئەبانەصر. بیشریش لە شوێن خۆی وەستا و سەرخۆشەکەی لە خۆی دوور نەخستەوە، دواتر کە سەرخۆشەکە ڕۆشت، بیشر (رحمه الله) بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە وتی: ئەوە مەستێك بوو بە پێی خەیاڵاتی خۆی پیاوێکی باشی خۆشویستووە و عاشقی بووە!! لەوە دەچێت عاشقەکە ڕزگاری بووبێت، بەڵام منی مەعشوق.. هێشتاکە نازانم حاڵم چۆن دەبێت؟![1]

## بەراورد و گومان

سەهلی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: کاتێك بەکری کوڕی عەبدوڵڵای موزنی پیاوێکی پیری دەبینی دەیگوت: ئەم مامە پیرە لە من باشترە، چونکە چەند ساڵێك بەر لە من خواپەرستی کردووە، وە هەر کاتێك گەنجێکی دەبینی دەیگوت: ئەم گەنجە لە من باشترە، چونکە چەند ساڵێك بەر لە ئەو، من دەستم کردووە بە گوناهکردن و.. بێ گومان گوناهم زۆرترە لە ئەو.

وە هەروەها سەهل دەڵێت: بەکر (رحمه الله) وتی: نەکەن نزیکی کارێك بکەونەوە، کە ئەگەر ڕاستیش بکەن هیچ پاداشتێك وەرناگرن، بەڵام ئەگەر ڕاست نەکەن گوناهبار دەبن!! پێیان وت: دەی پێمان بڵێ ئەو کارە چییە؟! وتی: گومانبردنی خراپ بە خەڵکی.. چونکە ئەگەر ڕاستیش بکەن، پاداشتتان نییە، بەڵام ئەگەر ڕاست نەکەن گوناهبار دەبن و سزا وەردەگرن.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٤٢٦)
(٢) (تهذيب حلية الأولياء ج١/٣٧٠)

## • نــەزرێـك بـۆ پـەروەردگـار

ئــەبــو عــەبــدوڵڵای کــوڕی جــەلاء (رحمه الله) دەڵێــت: وتـــم بـــە بـــاوك و دایـکم: پـێمخـۆشــە واز لە مــن بهـێـنن و بـمـبەخـشـــن بــە الـلـه..! بـا هـەمــوو ژیـانم تـەرخـان بکەم بـۆ خـزمـەتی پـەیـامـەکـەی. ئـەوانــیش وتــیان: دەی باشـــە کـوڕم، بـڕۆ.. ئــەوا تــۆمــان کـردە نــەزر و بـەخـشـیـتـمـان بــە الله عزوجل.

مــودەتێـك لێــیان دوور کــەوتـمـــەوە، پــاشـــان لە شـــەوێکی بـــارانـــاویدا هـــاتـمــــەوە بـــــۆ لایـــان و لە دەرگــــامدا، وتیــان: کێـــیە؟! وتـــم: مـــنم.. کــوڕەکـەتـــان. وتـــیان: کـــوڕێکمان هــەبـــوو.. بـەخــشـــیمان بە الله عزوجل.. ئێمـەش لـە قـسـەی خـۆمـان پـاشـگــەز نـابـینەوە.

ئــیدی دەرگــاکـەیـان بــۆ نــەکــردمـــەوە.[1]

## لـەی لـەو کـەسـەی خـۆشـت لـەوێـم

زیننـونی میــســـری دەگـێـــڕێــتەوە و دەڵێــت: ڕەحـــمـــەی نـــوبـــی لـــە مــونـاجــاتــەکـــانیدا دەیــگـوت: پـــەروەردگـــارم.. ئـــەی ئـــەو کـــەســـــەی خــۆشـــت ئـــەوێـم!

لێیان پــرسی: تــۆ لــە کوێ دەزانیـت کە پــەروەردگـــار خــۆشـــیدەوێــیت؟! ڕەحـمـە (رحمها الله) وتی: مــن لە شـــــاری نـــوبــە بـــــووم، دایك و بـــاوکــم مــەسـیـحی بـــوون، دایــکم لـــە بـاوەشـــی دەگـــرتــم و دەیـبـــردم بـــۆ کــەنـیـســــە، پێـی دەوتـــم: کچـەکـــەم خـاچـــەکە مـــاچ بـکە. منیـــش ڕووم وەردەگــێـڕا بـــۆ ئـــەوەی مـــاچی نـەکـــەم، هـــەر بــۆیـــە دەزانـــم کـــە پـــــەروەردگــارم زۆر لــە مـێـژە منی خـــۆشـــدەوێــت.[2]

(١) (صفة الصفوة/٤٧٧)
(٢) (سلوة الأحزان/٨٧ ـ ٨٨)

## بیکە بە بازاڕێك

عەمروی کوڕی عاص هەواڵ دەنێرێت بۆ عومەری کوڕی خەطاب (رضي الله عنه) کە: ئێمە لە نزیك مزگەوتەکەدا نەخشەی ماڵێکمان بۆ کێشاویت. عومەریش بە نامەیەك وەڵامی دەداتەوە و بە سەرسوڕمانەوە پێی دەڵێت: چۆن دەکرێت پیاوێك لە حیجاز بێت و خانوویەکی لە میسر هەبێت؟!
ئیدی عومەر فەرمانی پێدەکات کە جێگای خانووەکە بکات بە بازاڕێك بۆ موسوڵمانەکان[1].

## وەڵامەکەی لای خۆمانە

پیاوێك پرسیار دەکات لە ئیمامی عەلی و پێی دەڵێت: ئایا من ئەهلی دنیام، یان ئەهلی ئاخیرەتم؟!
ئیمامی عەلی (عليه السلام) پێی دەڵێت: وەڵامی پرسیارەکەت لای خۆتە نەوەك من، ئەگەر پیاوێك هاتە لات و پێی بەخشیت، دواتر پیاوێکی تر هات و داوای لێکردیت کە تۆ پێی ببەخشیت، سەیرێکی خۆت بکە و بزانە پێشوازی گەرم لە کامیان دەکەیت و کامیانت خۆشدەوێت؟!
ئەگەر ئەوەیانت خۆشدەوێت کە لێت دەبات، ئەوە تۆ لە ئەهلی ئاخیرەتی، وە ئەگەر ئەوەیانت خۆشدەوێت کە پێت دەبەخشێت، ئەوا تۆ لە ئەهلی دنیایت، چونکە ئەوەی لێت دەبات.. چاکەکانت هەڵدەگرێت بۆ ئاخیرەتت، ئەوەشی پێت دەبەخشێت سامانی دنیات بۆ زیاد دەکات، نەوەك ئاخیرەتت.[2]

---

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/١٤٧)
(٢) (قصص الصحابة والصالحين/٦٠)

## گوێ مەدەیە کە پێم ناخۆشە!

جەعفەری کوڕی بورقان دەڵێت: مەیمونی کوڕی میهران ( رحمه الله ) پێی وتم: ئەی جەعفەر.. ڕووبەڕوو ئەوشتەم پێ بڵێ کە پێم ناخۆشە! چونکە پیاو ناتوانێت ئامۆژگاری براکەی بکات، ئەگەر ئەو شتەی پێ نەڵێت کە پێی ناخۆش دەبێت.

## تۆم خۆشناوێت!

ئەبو مەریەمی حەنەفی لە جەنگی یەمامەدا زەیدی برای عومەری کوڕی خەطابی کوشت، پاشان موسوڵمان بوو، ئیدی هەر کاتێك بە لای عومەردا تێدەپەڕی، عومەر پێی دەوت: ئەو ڕوخسارەت دوور بخەوە لێم، چونکە خۆشم ناوێت. ئەبو مەریەم پێی وت: ئایا دەکرێت بە هۆی خۆشنەویستنمەوە.. مافێك لە مافەکانم پێشێل بکرێت؟! عومەر (رضي الله عنه) وتی: نەخێر.. شتی وەها نابێت.

کەواتە: کێت خۆشدەوێت، خۆشتبووێت و.. ڕقت لە کێ دەبێتەوە ڕقت لێی ببێتەوە، بەڵام وریابە هەرگیز بۆ ئەو کەسەی کە خۆشتدەوێت، ستەم لە کەس نەکەیت و، زوڵم لەو کەسە نەکەیت کە ڕقت لێیەتی.[1]

## پەشیمانی

عومەری فاروق (رضي الله عنه) دەڵێت: بۆ تەنیا جارێکیش پەشیمان نەبووم لە بێدەنگیم، بەڵام زۆر جاران پەشیمان بووم لە قسەکردنم.

(١) (قصص الصحابة والصالحين/٣٨)



## تۆم بدیایه ده‌مکوشتیت!

عه‌بدولڕه‌حمانی کوڕی ئه‌بوبه‌کر (رضي الله عنهما) پاش موسوڵمان بوونی.. به ئه‌بوبه‌کری باوکی ده‌ڵێت: له جه‌نگی ئوحودا من که له ڕیزی بێباوه‌ڕه‌کاندا بووم، تۆم بینی به‌ڵام پشتم تێکردیت. ئه‌بوبه‌کریش پێی ده‌ڵێت: به‌ڵام من ئه‌گه‌ر تۆم بدیایه، ئه‌وا پشتم تێنه‌ده‌کردیت و له‌گه‌ڵت ده‌جه‌نگام.[1]

## جوانترین دیاری

ئه‌بو عومه‌ری ئه‌نماطی ده‌ڵێت: ئه‌بو حوسه‌ینی نوری نه‌خۆش که‌وت، جونه‌یدی به‌غدادیش (رحمهما الله) کیسه‌یه‌کی پڕ له درهه‌می بۆ نارد، ئه‌ویش وه‌ری نه‌گرت و گه‌ڕاندییه‌وه بۆی، پاشان جونه‌ید نه‌خۆش که‌وت.. نوری ڕۆشته سه‌ردانی، ده‌ستی خسته سه‌ر ته‌وێڵی جونه‌ید و نزای بۆ کرد، خوای گه‌وره‌ش هه‌ر له‌و ساته‌دا شیفای دا.. نوری وتی به جونه‌ید: ئه‌گه‌ر چوویته سه‌ردانی برایه‌کی ناساغت، له‌مجۆره دیارییانه‌یان پێ ببه‌خشه.[2]

## مردن زه‌فه‌ری پێ نه‌بات

موته‌ڕیفی کوڕی عه‌بدوڵڵا (رحمه الله) ده‌ڵێت: ئه‌م مردنه، خۆشییه‌کانی ئه‌هلی دنیای شێواندووه، ده‌سا ئێوه به‌دووی خۆشییه‌که‌وه‌بن، که مردن.. زه‌فه‌ری پێ نه‌بات.[3]

---

(١) (حياة الصاحابة ج٣/٩)
(٢) (صفة الصفوة/٤٧٥)
(٣) (روضـة الـزاهـديـن/٥٢)



## له‌گه‌ڵ نه‌فۆشه‌کاندا چۆنیت؟!

ئه‌عمه‌ش له مونزیری سه‌وری یه‌وه ده‌گێڕێته‌وه و ده‌ڵێت: ڕه‌بیعی کوڕی خوسه‌یم (رحمه الله) حه‌ڵوای[1] به گرفتارێك ده‌دا.. پێیان وت: ئه‌و له کوێ ده‌زانێت که چی خواردووه؟! ڕه‌بیع وتی: به‌ڵام خوای عزوجل ده‌زانێت من چیم پێداوه.[2]

## نۆژداری نه‌فۆش

ئه‌بو عه‌مروی کوڕی مه‌ته‌ر ده‌ڵێت: ئاماده‌ی کۆڕێکی سه‌عیدی کوڕی ئیسماعیلی حه‌یری بووم، که لێبوویه‌وه له کۆڕه‌که ڕۆشته شوێنه‌که‌ی خۆی که تێیدا داده‌نیشت بۆ زیکر کردن، ماوه‌یه‌کی تولانی هیچ ده‌نگێکی لێوه نه‌هات..! پیاوێك بانگی لێکرد و پێی وت: له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌موو بێده‌نگییه‌تدا بۆچی ئامۆژگارییه‌کیشمان ناکه‌یت؟! سه‌عید (رحمه الله) به‌م دێڕه هۆنراوه‌یه وه‌ڵامی پیاوه‌که‌ی دایه‌وه و وتی:

وَغَيرَ تَقيٍّ يَأمُرُ الناسَ بِالتُقَى
طَبيبٌ يُداوي وَالطَبيبُ مَريضُ

واته: که‌سێك ئه‌هلی ته‌قوا نه‌بێت و فه‌رمان به ته‌قوا بکات نۆژدارێکی نه‌خۆشه خۆی، که‌چی تیماری بیماران ده‌کات. ئیدی خه‌ڵکه‌که به یه‌کجار هاواریان لێ به‌رز بوویه‌وه و ده‌ستیان کرد به گریان.[3]

(١) (حه‌ڵوا: وشه عه‌ره‌بییه‌که‌ی (الخبيص)ه که تێکه‌ڵه‌یه‌که له هه‌نگوین و ئاردی سپی، یه‌که‌م که‌س له ئیسلامدا عوسمانی کوڕی عه‌ففان دروستی کرد و ناردی بۆ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) که له ماڵی ئوم سه‌له‌مه‌ی دایکی ئیمانداران بوو.)
(٢) (سير اعلام ٢٥٩/٤ ـ ٢٦٠)
(٣) (صفة الصفوة/٧٥٣)



## لـه‌ی كـوڕه‌كـه‌م.. كاتی نوێـژه

عـــه‌ززه‌ی كچـی عـــه‌یازی كـوڕی ئـــه‌بی قیرصـافه ده‌گێـڕێـــته‌وه و ده‌ڵێـت: ڕۆمـــه‌كان كــوڕێكی ئـــه‌بی قیرصافـه‌یـــان بـــه دیلـی گـــرت، ئیـدی لـــه كـــاتی نــوێــژه‌كـــاندا ئـــه‌بی قیرصافـــه (ﷺ) ده‌چـــووه ســـــه‌ر قـــــه‌ڵایه‌ك له عـه‌ســـقـه‌لان و بانگی ده‌كـرد: ئـه‌ی كـــوڕه‌كه‌م.. كاتی نــوێــژه.

دواتـــر ڕوون بـــوویـــه‌وه كه هـــه‌مـــوو جـارێــك كـــوڕه‌كه‌ی له وڵاتـی ڕۆم گـوێی له ده‌نگی بـاوكی بـــــووه و نــوێــژه‌كانی كـردووه.[1]

## پـه‌رده‌كـه‌ت لاده

ئـــه‌بو عه‌بدوڵڵای نیبـاجی (رحمه الله) ده‌ڵێـت: هـــه‌ر كـــه‌س دنـیا بـــێت بـــه خه‌یـاڵیدا بـــۆ كارێـك كه خـــوا فـه‌رمـــانی پـێنه‌كـردبـــێت، ئـــه‌و كه‌ســـه پـــه‌رده‌ی به ڕوودا دائـــه‌درێـته‌وه و.. خـــوا نـابـینێت.

وه ئیبن ئـه‌بی وه‌رد ده‌ڵێت: ڕۆژێـك ئـه‌بو عه‌بدوڵڵای نیباجی ئیمامـه‌تی بـــۆ ئـه‌هلی تـه‌رسـوس ده‌كـرد، له ده‌ره‌وه بانگـــه‌واز كـرا بـــۆ غـــه‌زا كـردن، بـــه‌ڵام ئـــه‌و نـــوێـژه‌كـــه‌ی كـــورت نـه‌كـــرده‌وه، كاتـــێك لـــه نوێـژه‌كـــه بـوونـــه‌وه پـێیان وت: تـــۆ ســـیخـوڕیـــت. ئـــه‌بوعه‌بدوڵڵا وتـی: بـــــۆچی مـــن سـیـخـوڕم؟! وتیان: له ده‌ره‌وه بانگـــه‌وازیان بـــۆ غـــه‌زا كـــرد و تـــۆ نـــوێـــژه‌كـه‌ت كـــورت نـه‌كـــرده‌وه، بـۆ ئـــه‌وه‌ی بچیـن زوو خـۆمـان تـه‌یـار بكـه‌یـن! ئـه‌بـوعـه‌بـدوڵڵا وتی: ده‌ی مـن گـــومـانـم وا نـه‌بـــووه كه كـه‌سێـك له نـوێـژدا بـێت و بـێجگه لـه‌و گـفتوگـۆیـه‌ی نـێوان خـۆی و خـوا.. گـوێی لـه شـتێكی دیكـه بێت!![2]

(١) (حياة الصحابة ج٥/٢١٣)
(٢) (صفة الصفوة/٨٤٧)



## با دوكانداره‌كان نه‌مناسن

یوسفی كوڕی زه‌كه‌ریا ده‌ڵێت: موحه‌ممه‌دی كوڕی یوسفی ئه‌سفه‌هانی هه‌ر جاره‌ی ده‌چووه لای نانه‌واچییه‌ك نانی ده‌كڕی و، هه‌ر جاره‌ی لای به‌قاڵێك میوه‌ی ده‌كڕی، به‌ به‌رده‌وام نه‌ده‌چووه لای دوكاندارێكی تایبه‌ت..!!

له‌و باره‌وه پرسیاریان لێكرد، موحه‌ممه‌د ( رحمه الله ) له وه‌ڵامدا وتی: ئه‌گه‌ر به‌رده‌وام بچمه لای دوكاندارێك، ئه‌وا دوكانداره‌كه ده‌بێته ئاشنام و ئیتر پێده‌چێت به‌ هۆی دیندارییه‌كه‌مه‌وه خاترم بگرێت، منیش نامه‌وێت وه‌ك مشه‌خۆرێك به‌سه‌ر دینه‌كه‌مه‌وه بژیم!![1]

## كامه‌یان جێگای لومه‌یه؟!

مه‌ریه‌می خێزانی ئه‌بو عوسمان ده‌ڵێت: ئێمه قسه و پێكه‌نین و گاڵته و گه‌په‌كانمان هه‌ڵده‌گرت بۆ ئه‌و كاتانه‌ی كه ئه‌بو عوسمان ده‌چووه خه‌ڵوه‌ته‌وه بۆ نوێژ كردن، چونكه له‌و ساتانه‌دا ئاگای له دنیا نه ئه‌ما.

وه هه‌روه‌ها موحه‌ممه‌دی كوڕی نه‌عیم ده‌ڵێت: دایكم وتی: مه‌ریه‌می خێزانی سه‌عیدی كوڕی ئیسماعیلی حه‌یری وتی: ڕۆژێك له‌گه‌ڵ ئه‌بو عوسمانی مێردمدا به ته‌نیا بووین، منیش به فرسه‌تم زانی و لێم پرسی: ئومێدی زیاترت به چ كرده‌وه‌یه‌كت هه‌یه، كه قبوڵكرابێت لای په‌روه‌ردگار؟!

ئه‌بو عوسمان ( رحمه الله ) وتی: كاتێك پێگه‌شتم و ته‌مه‌نی منداڵیم تێپه‌ڕاند، له شاری (ڕه‌ی) بووین، كه‌سوكاره‌كه‌م داوایان لێده‌كردم هاوسه‌رگیری بكه‌م، به‌ڵام من نه‌مده‌ویست، ڕۆژێك ئافره‌تێك هات و پێی وتم: ئه‌ی سه‌عید.. من هێنده تۆم خۆشده‌وێت كه خه‌و و ئارامم نه‌ماوه بۆت، بۆیه هاتووم داوات لێده‌كه‌م به‌و كه‌سه‌ی كه دڵه‌كان ده‌جوڵێنێت، له‌به‌ر خوا هاوسه‌رگیریم

(١) (صفة الصفوة/٧٣٩)



لەگەڵدا بکە. پێم وت: باوکت ماوە؟ وتی: بەڵێ.. لە فلان شوێن خەریکی خەیاتییە.

منیش ڕۆشتمە خزمەت باوکی و خوازبێنیم کرد، باوکەکەی زۆری پێخۆشبوو، بۆیە زۆری نەبرد شایەتمان بانگکرد و مارەم بڕی، کاتێک گواستمەوە و چوومە لای، دەبینم ئافرەتەکە.. چاوێکی کوێرە و.. قاچی شەلە و.. ئەندامەکانی جەستەی تێکچوون..!! لەو ساتە سەختەدا وتم: پەروەردگارم.. ڕازیم بەو بەشەی کە بەمنت بەخشیوە. بەڵام کەسوکارەکەم بەردەوام لۆمەیان دەکردم بۆ ئەو کارەم و دەیانویست لێی جیاببمەوە و ئافرەتێکی دیکە بخوازم، لە بەرامبەردا من زیاتر ڕێزم لە هاوسەرەکەم دەگرت و سات بە سات باشتر دەبووم لەگەڵیدا، هەتا وای لێهات نەیدەهێڵا لە ماڵ بچمە دەرێ، منیش لەبەر دڵی ئەو وازم لە ئامادەبوونی کۆڕەکانیش هێنا و ماوەی پازدە ساڵ بەو حاڵەوە بە دیاریەوە دانیشتم، هەندێ کات وامدەزانی ئەوەتام بەسەر پشکۆی ئاگرەوە، بەڵام بۆ ئەوەی دڵگران نەبێت.. هیچ لە نارەحەتییەکانی خۆمم بۆ دەرنەئەبڕی، هەتا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد، بۆیە زۆرترین ئومێدم بەو کارەم هەیە، کە خوا گیان پارمەتیدام ئەو ئافرەتە بپارێزم کە بە دڵ خۆشیویستم.[1]

## دڵ.. بزوێنەری ئەندامەکان

عومەری کوڕی خەطاب ( رَحِمَهُ اللَّهُ ) لەمزگەوتدا کەسێك دەبینێت نوێژ دە کات و بەدەستی خەریکی ڕیشیەتی، عومەر دەکێشێت بەدەستی پیاوەکەداو دەڵێت: ئەگەر دڵت خشوعی هەبووایە.. ئەوا هەموو ئەندامەکانی جەستە یشت ئارام و بێ جووڵەدەبوون.[2]

(١) (صفة الصفوة/٧٥٢)

(٢) (قصص الصحابة والصالحين/٢٩٨)



## وتەی بەنرخی چەتەیەك

ئەبو حامدی غەزالی (رحمه الله) گەشتێکی زانستی دەکات بۆ جورجان، بەرهەمی گەشتەکەیشی بریتی دەبێت لە چەند کتێبێك بە ناوی "التعلیقه"، لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ شاری تووس، چەتە دێن و ڕێگە لە کاروانەکە دەگرن و هەرچییان پێدەبێت دەیبەن، بە نووسراوەکانی ئیمامی غەزالیشەوە.

ئەبو حامد خۆی باس دەکات و دەڵێت: بۆ گەڕاندنەوەی کتێبەکانم کەوتمە دووی چەتەکان، گەورەکەیان لایەکی لێکردمەوە و پێی وتم: بگەڕێوە بەڵا لێت بدات، ئەگینا بە هەلاکەتا دەچیت! منیش وتم: داوات لێدەکەم بەو کەسەی کە داوای سەلامەتی تەنها لە ئەو دەکەیت، ئەو تەعلیقەم بدەوە، هیچی ترم ناوێت، چونکە ئەوە شتێك نییە هەتا ئێوە سوودی لێ ببینن.

گەورەکەیان وتی: تەعلیقەکەت چییە؟! وتم: چەند کتێبێکە لەناو تورەکەیەکدایە، مودەتێکە لە ماڵ دەرچووم و کۆچم کردووە هەتا ئەو زانستەم وەرگرتووە و نووسیومەتەوە. گەورەکەیان پێکەنی و وتی: چۆن بانگەشەی ئەوە دەکەیت کە تۆ زانستەکەی دەزانیت، لە کاتێکدا ئێمە تەعلیقەکەمان لێبردی، ئیدی تۆ بە بێ زانست مایتەوە، ئەوە چ زانستێکە تۆ هەتە؟! پاشان فەرمانی کرد بە هاوەڵێکی کە تورەکەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە.

ئیمامی غەزالی دەڵێت: لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم پیاوە خوا ناردوویەتی بۆ من، بۆ ئەوەی ئەم قسە جوانەم بۆ بکات و ڕێگام بۆ ڕۆشن بکاتەوە.

ئیدی کاتێك گەشتمەوە تووس، بۆ ماوەی سێ ساڵ خۆم مەشغوڵ کرد بە دەرخکردنی ئەو زانستەوە کە کۆم کرد بوویەوە، پاش ئەوە بۆ هەر کوێیەك دەچووم، زانستەکە لە دەروونمدا بوو، ئەگەر چەتەکان کتێبەکانیشیان ببردمایە، من لە زانستەکەم دانەئەبڕام.[1]

(١) (موسوعة الأخلاق ج١/٢٠١ ـ ٢٠٢)



## ئاوم بۆ بهێنە

شەوێك دایكی عەبدوڵڵای كوڕی مەسعود دەڵێت: كوڕم كەمێك ئاوم بۆ بهێنە. عەبدوڵڵا ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەستبەجێ دەڕوات بۆ هێنانی ئاوەكە، كاتێك دەگەڕێتەوە، دەبینێت دایكی خەوی لێكەوتووە، عەبدوڵڵا دڵی نایەت دایكی بێدار بكاتەوە، وە ئاوەكەشی بۆ دانانێت، لە ترسی ئەوەی نەوەك دایكی خەبەری بێتەوە و ئاوەكەی ئامادە نەبێت، یاخود نەیبینێت.. بۆیە هەتا بەیانی لە ڕاسەری دایكیدا دەوەستێت، بۆ ئەوەی كە لە خەو هەستا ئاوەكەی ئامادە بێت.

## بە شێوەیەكی دروست نەمكڕیوە!

غولامێكی حەسانی كوڕی ئەبی سینان لە ئەهوازەوە، نامەیەك دەنێرێت بۆ حەسان و پێی دەڵێت: گەورەم.. قامیشی شەكر تووشی ئافات بووە، قامیشەكەی ئەوێ بكڕە، خێرێكی باش دەكەیت. حەسانیش ( رَحِمَهُ اللهُ ) دەڕواتە لای پیاوێك و قامیشەكەیی لێ دەكڕێت، پاش ماوەیەكی كەم قامیشەكە سی هەزار قازانج دەكات، ئیدی حەسان دەگەڕێتەوە بۆ لای پیاوەكە و پێی دەڵێت: قامیشەكەم لێوەر بگرەوە، چونكە من غولامەكەم نامەیەكی بۆ ناردم كە قامیشی شەكر ئافات لێی داوە و تۆم لە ناوەڕۆكی نامەكە ئاگادار نەكردەوە. پیاوەكە پێی دەڵێت: ئەوەتا ئێستا ئاگادارت كردمەوە، منیش ڕازیم و بڕۆ نۆشی گیانت بێت.

حەسان دەچێتەوە، بەڵام دڵی ئارام ناگرێت و دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ لای پیاوەكە و پێی دەڵێت: ئەی براكەم.. من لە سەرتاوە ئەم مامەڵەیەم بە دروستی ئەنجام نەداوە، بۆیە پێم خۆشە مامەڵەكە هەڵبوەشێنینەوە. بەو جۆرە حەسان واز ناهێنێت، هەتا قامیشی شەكرەكە دەداتەوە بە پیاوەكە[1].

(١) (تهذيب حلية الأولياء ج١/٤٧٤)



## زیندانە.. یان فەلوەتی یار؟!

مـــاویـەی کچی حوجەیری کوڕی ئـەبی وەهــاب (رضي الله عنها) پـاش ئــەوەی کە مـوسـڵمان دەبێت، دەگێـڕێـتەوە و دەڵێـت: خـوبــەیب (رضي الله عنه) لە مـاڵــەکەی مندا زیندانی کـرا بـــوو، دەسـت و پێی بـە زنـجـیر کـۆت کـرا بـــوو، لە درزی دەرگـاکــەوە سـەیــرم کــرد. دیـتم هێـشــوویــەکی زۆر گـــەورە تــرێی بـــە دەسـتەوەیــە و لێـی دەخــوات، ئــــەو وەخـتـەیــش وەرزی ڕەسینی تـرێ نـــەبــوو و لە هـیچ لایـەکی مـــەککەش تـــرێ دەســـت نـــــەدەکـــەوت!![1]

پـاشـان کـاتێـك دەیـبەنـە دەرەوە بـــۆ ئـەوەی بیکــوژن، خوبەیـب دەڵێـت: ڕێگــام پـێــبدەن کـــە دوو ڕکـــات نـوێـــژ بـکەم، ئـەوانـیــش ڕێگـــای پـــێدەدەن، کـاتێــك دوو ڕکـاتـەکـــە تـــەواو دەکـــات دەڵێــت: ئـەگــەر نـەتـانـوتـایـە: لـە مــردن دەتـرسـێت و خـــۆی دوا دەخـات، پێم خـــۆش بـــوو نـــوێــژی زیـاتـر بکـەم. خـوبـــەیـب شـەهـید کـرا و بـــوویـە یـەکـەم کەسـێـك.. کـە بـەر لـە شـەهـــید کـــردنی دوو ڕکـــات نـوێـــژی کـرد.[2]

وە عەمـــروی کـــوڕی ئـومـــەیە (رضي الله عنه) دەگێـڕێـتەوە و دەڵێـت: پێغــەمبەر (ﷺ) بـە تەنیا نـاردمی بـــۆ چـــاودێــریکردنی قـــورەیــش، لــەوێ بـــە تـرسـێکـەوە کـــە نـــەوەك بـــێــباوەڕەکان بمـبـینن، نـــزیك بـــوومـــەوە لـــە تـــەرمـــەکەی خـــوبــــەیب، کە بـــە دارێـــکەوە هـــەڵیانــــواسی بـــــوو، هـــەڵـزنـــیم بـەســـەر دارەکـــەدا و گـــرێکانـــم کـــردەوە.. تـەرمـەکـــەی خـوبـەیـــب کەوتـــە خـــوارەوە و.. خـــۆم ڕۆشـــتم کـەمێـك لـــە دوورتـــرەوە چـــاودێـــریـــم دەکـرد، پاشـان کاتێـك لام کـردەوە تـەرمـەکـەی خـوبـەیبم نـەبــــینییەوە!! وەك بڵـــێی زەوی قـــــووتی داوە، وە هـەتـــا ئـــێســـتاش نـازانـــرێت تـەرمـــەکـەی لـە کـوێـیە!![3]

(١) (حياة الصحابة: ج٥/٣١٥)
(٢) (مواقف إيمانية/ ٢٤٧)
(٣) (حياة الصحابة:ج٥/٢٥٤)

## وریابه‌ قوڕاوی نه‌بیت

هیشامی کوڕی حه‌سان ده‌ڵێت: ڕۆژێك له‌ دوای عه‌لائی كوڕی زیاده‌وه‌ ده‌ڕۆشتم، ڕێگاكه‌ قوڕ و لیتاو بوو، منیش خۆم ده‌پاراست بۆ ئه‌وه‌ی قوڕاوی نه‌بم، پیاوێك پاڵێكی نا به‌ عه‌لاوه‌ و قاچی كه‌وته‌ ناو قوڕاوه‌كه‌وه‌، ئه‌ویش كه‌ زانی قوڕاوی بووه‌.. بێ گوێ پێدان به‌ ناویدا ڕۆشت.
كاتێك گه‌شتینه‌وه‌ لای ماڵ.. عه‌لاء (رحمه الله) ڕاوه‌ستا و وتی: بینیت ئه‌ی هیشام؟ وتم: به‌ڵێ. وتی: مرۆڤی موسوڵمانیش ئاوه‌هایه‌، خۆی ده‌پارێزێت له‌ گوناه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر كه‌وته‌ ناو قوڕاوی گوناهه‌وه‌.. ئیتر بێ گوێ پێدان ده‌ڕوات به‌ ناویدا.[1]

## نه‌خه‌وتووه‌ و.. تازه‌ له‌ خه‌و هه‌ستاوه‌!!

ئه‌یوبی سختیانی (رحمه الله) هه‌موو شه‌وه‌كه‌ی نه‌ده‌خه‌وت و به‌ عیباده‌ت زیندووی ده‌كرده‌وه‌ و نه‌یده‌هێڵا پێی بزانن، بۆیه‌ به‌یانیان كاتێك ڕۆژ ده‌بوویه‌وه‌.. ده‌نگی به‌رز ده‌كرده‌وه‌ و وا خۆی پیشان ده‌دا كه‌ تازه‌ له‌ خه‌و هه‌ستاوه‌!![2]

## ڕێبواری نامۆ

ده‌ڵێن به‌ ئیمامی شافیعی (رحمه الله): هۆی چییه‌ زۆربه‌ی كات دارعه‌سایه‌كت به‌ ده‌سته‌وه‌یه‌، له‌ هه‌مان كاتدا تۆ هێنده‌ لاواز نیت كه‌ پێویستت به‌ دارعه‌سا بێت؟! ئیمامی شافیعی ده‌ڵێت: بۆ ئه‌وه‌ی هه‌میشه‌ بیرم بێت كه‌ من ڕێبوارێكم و.. دنیا جێده‌هێڵم.[3]

---

(١) (اين نحن من هؤلاء:ج٢/٢٨٦)
(٢) (روضة الزاهدين/٦٤)
(٣) (اين نحن من هؤلاء: ج٢/٢٨٣ ـ ٢٨٤)



## کەی ئیسراحەت دەکەین؟!

کەسێك لە ئەهلی خوراسان دەچێتە خزمەت ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و پێی دەڵێت: ئەی ئەبا عەبدوڵلا.. لە خوراسانەوە هاتووم بۆ ئەوەی پرسیارێکت لێبکەم. ئیمام ئەحمەد (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێت: فەرموو بپرسە. پیاوەکە دەڵێت: چ کاتێك ئینسان ئیسراحەت دەکات؟! ئیمام دەڵێت: ئەو کاتەی کە یەکەم هەنگاوی دەنێتە بەهەشت.(١)

## ڕۆڵەکانی دنیا

ئیمامی عەلی (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەڵێت: مرۆڤەکان.. ڕۆڵەی ئەم دنیایەن، کەسیش لەسەر خۆشویستنی دایکی لۆمە ناکرێت.

## مەحاڵم پێ خۆشترە!!

ئیمامی عەلی (عَلَيْهِ السَّلَامُ) دەڵێت: شۆردنی دوو بەندەی ڕەش پێست هەتا ڕەنگیان دەگۆڕێت بۆ سپی..!! و دەردانی ئاوی بیرێك بە دوو بێژنگ..!! وە گسك دانی ئەرزی حیجاز لە ڕۆژێکی گەردەلوولاویدا بە دوو پەڕی باڵندەیەك..!! خۆشترە لە لام!! هەتا لەبەر دەرگای غەیری خوای (عَزَّ وَجَلَّ) دا بووەستم و ئابڕووم بفرۆشم.

---

(١) (من روائع اقوال الصالحين/ ١٢١ ـ ١٢٢)



## هەموو دەرگاکان دامەفە

سەهلی کوڕی عەبدوڵڵای توستەری (رحمه الله) بە شوێن زانستدا لە ماڵ دەچێتە دەر، لە ڕێگەدا.. دز و جەردە ڕێگەی لێ دەگرن و هەرچییەکی پێدەبێت دەیبەن، تەنانەت توێشەبەری خواردنەکەیشی دەبەن و دەست دەکەن بە نان خواردن، سەهل تەماشا دەکات سەردەستەی دزەکان لە خواردنەکە ناخوات، پێی دەڵێت: ئەی تۆ بۆچی ناخۆیت؟!

سەردەستەکە دەڵێت: ئەمڕۆ پێنج شەممەیە و من بەڕۆژووم. سەهل دەڵێت: سەیرە.. دزی کردن و ڕۆژوو گرتن؟!!

سەردەستەکە (دیارە سەهل دەناسێت) دەڵێت: ئەی سەهل.. من هەموو دەرگاکان لە نێوان خۆم و خوادا داناخەم، بەڵکو ڕۆژێك لە دەرگایەکیانەوە بتوانم بچمە ژوور.

سەهل دەڵێت: پاش تێپەڕ بوونی سێ ساڵ، لە مەککە پیاوێکم بینی بە دەوری کەعبەدا تەوافی دەکرد و دەگریا، پێم وت: ئەرێ ئەوە تۆ فڵانە دز نیت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕێت لێ گرتم و ئەتوت: بەڕۆژووم؟! پیاوەکە وتی: بەڵێ من هەمان دزم، ئەی سەهل.. ئایا نەتزانیوە هەر کەس لە نێوان خۆی و خوادا دەرگایەك بە کراوەیی بهێڵێتەوە، هەر ڕۆژێك دێتە پێش کە لێوەی بچێتە ژوور، هەر چەندە گوناهەکانیشمان گەورە بن، با هەمیشە دەرگایەك بە کراوەیی بهێڵینەوە.

## بچۆرە فزمەت پیرەکان

ئەبوعەمروی کوڕی عەلاء دەڵێت: لەگەڵ کۆمەڵێك گەنجدا بووم، سەعیدی کوڕی جوبەیر (رحمه الله) پێی وتم: چیتداوە لە هاوڕێتی ئەم گەنجانە؟! بچۆرە خزمەت پیرەکان.[1]

---

(١) (أين نحن من هؤلاء: ج٤/٢٣)

## زه‌م كردنی دنیا

كۆمه‌ڵێك خواپه‌رست ده‌چنه‌ سه‌ردانی ڕابیعه‌ی عه‌ده‌ویه‌ و باسی دنیا ده‌كه‌ن، ئیدی ده‌ست ده‌كه‌ن به‌ زه‌م كردنی دنیا، ڕابیعه‌ش بێده‌نگ ده‌بێت و هیچ ناڵێت!!

كاتێك زه‌م كردنه‌كه‌یان تووڵ ده‌كێشێت، ڕابیعه‌ (رحمها الله) ڕوویان تێده‌كات و ده‌ڵێت: هه‌مووتان دنیاتان خۆشده‌وێت و ئه‌هلی دنیان..!! چونكه‌ هه‌ر كه‌س هه‌ر شتێكی خۆشبوێت زۆر باسی ده‌كات، ئه‌ی نه‌تاندیوه‌ پیاوێكی ژیر و ماقوڵ.. چۆن سه‌رسام و شه‌یدای منداڵه‌ بچووكه‌كه‌ی ده‌بێت و هه‌میشه‌ له‌ نێو خه‌ڵكیدا باسی ده‌كات؟!![1]

## ئه‌ی خه‌ڵكینه‌.. بگریه‌ن!

مساوری سه‌عدی ده‌ڵێت: ئه‌و ڕۆژه‌ی كه‌ حه‌سه‌نی كوڕی عه‌لی (عليه السلام) كۆچی دوایی كرد، ئه‌بوهوره‌یره‌م بینی له‌ مزگه‌وتی رسول الله دا (ﷺ) هه‌ستایه‌ سه‌ر پێ، ده‌گریا و به‌ ده‌نگی به‌رز ده‌یگوت: ئه‌ی خه‌ڵكینه‌ بگریه‌ن..!! ئه‌مڕۆ خۆشه‌ویسته‌كه‌ی رسول الله (ﷺ) مرد.[2]

## ڕێزی گه‌وره‌كان

له‌یس ده‌ڵێت: له‌گه‌ڵ ته‌ڵحه‌ی كوڕی موسه‌ڕیف دا (رحمه الله) به‌ ڕێگادا ده‌ڕۆشتین.. ته‌ڵحه‌ پێی وتم: ئه‌ی له‌یس.. ئه‌گه‌ر بمزانیبایه‌ كه‌ تۆ ته‌نها شه‌وێك له‌ من گه‌وره‌تری، ئه‌وا پێشت نه‌ده‌كه‌وتم!!

(١) (مجموعة رسائل ابن الجوزي/٢٦٠)
(٢) (منجد الخطيب:ج١٤٨/٢-١٤٧)



## باسی مەکە.. تا باس نەکرێت!

عەمروی کوڕی عاص (رضي الله عنه) دەڵێت: قەت گلەیی کەسێکم نەکردووە کە خۆم نهێنییەکم بۆ باس کردبێت و ئەویش لای کەسانی تر باسی کردبێت، چونکە ئەویش وەك خۆم نەیتوانیوە لە دەروونیدا بیهێڵێتەوە و نەیدرکێنێت.

## گورگ و مەڕ

شوانێك دەچێتە خزمەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رحمه الله) و پێی دەڵێت: ئەی ئەمیری باوەڕداران.. لەم شەوانەدا شتێکی زۆر سەیر ڕوویداوە..!! عومەر دەڵێت: دەی قسەم بۆ بکە.. بزانم ئەو شتە سەیرە چییە؟!

شوانەکە دەڵێت: شەوانە گورگ دێتە ناو پەچەی مەڕەکانم، دەخەوێت و، هیچ زیانیان پێ ناگەیەنێت..!!

عومەر دەڵێت: ئەوە هیچ سەیر نییە.. چونکە من نێوان خۆم و خودام باش کردووە، ئیدی خوداش نێوان گورگ و مەڕی باش کردووە.[1]

## زیاد لە توانای فۆت

مەیمونی کوڕی مهران (رحمه الله) دەڵێت: ئەگەر میوانت هات.. قورسایی مەخەرە سەرشانی خۆت و هەر لەو خواردنەی پێشکەش بکە کە بۆ خانەوادەکەت ئامادەیە، بەڵام بە ڕوویەکی خۆش و دەم بە خەندەوە، چونکە ئەگەر زیاد لە توانای خۆت مەسروفی بۆ بکەیت.. پێدەچێت ڕووت گرژ بکەیت لەگەڵیدا.[2]

---

(١) (أنيس المؤمنين/٦٣)
(٢) (من روائع اقوال الصالحين: ج١/١٨٩)

## لەهلی بەهەشت

مەعازی کوڕی جەبەل (ﷺ) دەڵێت: لە ڕۆژی دوایـیدا.. ئەهلی بەهەشت تەنها بە حەسرەتی ئەو ساتەوەختەوەن، کە بە سەریاندا تێپەڕیوە و یادی خوای (ﷻ) یان نەکردووە.

## دژیاری نەفام

سەهلی توستەری دەگێڕێتەوەو دەڵێت: یەحیای کوڕی مەعاز ( رحمه الله ) وتی: لەخۆشبەختی مرۆڤ ئەوەیەکەدژیارەکەی تێگەشتوو بێت، بەڵام من دژیارەکەم بێ ئاوەزە و فامی نیە.

پێیان وت: دژیارەکەت کێیە؟! مەعاز وتی: دژیارەکەم نەفسی خۆمە! کە بەهەشت و هەموو نیعمەتە نەبڕاوەکانی دەفرۆشێت.. بە هەوەسبازی ساتێك.[1]

## ناهێڵم دووجار لێم تووڕەبێت

یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیب ( رحمه الله ) دەڵێت: ناهێڵم برایەکم دووجار لێم تووڕە بێت، لە دوای تووڕە بوونی یەکەمجاری بە خۆمدا دەچمەوە تا بزانم چ کارێکم براکەمی تووڕە کردووە، ئیدی ئەو کارە بەرامبەری دووبارە ناکەمەوە.[2]

---

(١) (صفة الصفوة/٧٤٦)

(٢) (رفقاء طريق/ ٣٧)



## دڵی پاڵفتە

ئەبو سولەیمانی دارانی (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێت: نەفسی ئینسان وەهایە کە ئەگەر برسی و تینووی بکەیت.. دڵ ناسك و پاڵفتە دەبێت، بەڵام ئەگەر تێر و پاراوی بکەیت.. دڵ دەمرێت.

## کۆتا پەیام.. میسکە و گوڵاو

پیاوێك دەچێتە خزمەت حەسەنی بەسری (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) پێی دەڵێت: نهێنی زاهید بوونت چییە لەم دنیایەدا؟!!

حەسەن دەڵێت: نهێنی زاهید بوونم چوار شتە: زانیم کە ڕزق و ڕۆزیم، کەس نایبات بێجگە لە خۆم.. بۆیە دڵ ئارام بووم، وە زانیم کە کارەکەم، کەس هەڵناسێت بە ئەنجامدانی خۆم نەبێت.. بۆیە تەنیا خۆم خەریکبووم پێوەی، وە زانیم کە ٱللَّهُ عَزَّوَجَلَّ .. هەمیشە دەمبینێت و سەیرم دەکات.. بۆیە شەرمم کرد لە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانیدا بمبینێت، هەروەها زانیم کە مردن چاوەڕێم دەکات.. بۆیە توێشووم ئامادە کرد بۆ دیداری پەروەردگارم.[1]

✍... هێشتا فرسەتە، براکەم.

هێشتا کات ماوە، خوشکی من،

کاروانی چاکان زۆر لە مێژە بەڕێ کەوتووە و.. من و تۆی بێ توێشە و زادیش، وەك مەحوی خواناس (ڕۆحی شادبێت) دەڵێت:

خەیاڵی پوچی دنیا وا دماغ و دڵمی پێچاوە
قیامەت هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم[2]

(١) ( الف قصة/٤٦٦)
(٢) (دیوانی مەحوی/٢٢١ )

## سـەرچـاوەكـان:

١) أبو حنيفة النعمان: وهبى سليمان غاوجى، الناشر دار القلم دمشق، الطبعة الخامسة ١٤١٣ هـ ـ ١٩٩٣م.
٢) أبو هريرة راوية الإسلام: عبدالستار الشيخ، دار القلم، الطبعة الاولى ٢٠٠٣م.
٣) أبوبكر الصديق: عبدالستار الشيخ، دار القلم، الطبعة الاولى ٢٠١١م.
٤) أبوداوود الإمام الحافظ الفقيه: تقى الدين الندوى المظاهرى، دار القلم، الطبعة الثالثة ١٩٩٦م.
٥) الأتقياء الأخفياء: سعيد عبدالعظيم، دار طيبة الخضراء، الطبعة الاولى ١٩٩٩م.
٦) إحياء علوم الدين: الإمام ابى حامد محمد بن محمد الغزالى، دار الندوة الجديدة.
٧) أسد الغابة: إبن الأثير، دار ابن حزم ـ بيروت، الطبعة الاولى ٢٠١٢م.
٨) اصبر واحتسب: عبدالملك القاسم، دار القاسم للنشر، الطبعة الاولى ـ ١٩٩٤م.
٩) ألف قصة وقصة من قصص الصالحين والصالحات ونوادر الزاهدين والزاهدات: هانى الحاج، المكتبة التوفيقية.
١٠) الإمام البخارى: عبدالستار الشيخ، دار القلم دمشق، الطبعة الاولى ٢٠٠٧م.
١١) أنيس المؤمنين: صفوك سعدالله المختار، الطبعة الاولى ١٤٠٥هـ ـ ١٩٨٥م.
١٢) أين نحن من هؤلاء: عبدالملك القاسم، دار القاسم للنشر.
١٣) التاريخ الاسلامى ج٣/الخلفاء الراشدون: محمود شاكر، المكتب الاسلامى، الطبعة الثامنة، ٢٠٠٠م.
١٤) التبصرة: ابوالفرج عبدالرحمن بن الجوزى، دار الكتب العلمية، الطبعة الاولى ١٤٠٦هـ
١٥) ترتيب المدارك: القاضى عياض بن موسى، الطبعة الثانية ١٩٨٣م.
١٦) التصنيف الموضوعى لتاريخ بغداد: للحافظ أبى بكر أحمد بن على الخطيب البغدادى، جمع و ترتيب د.محمد بن عبدالله الهبدان، المشرف العام على مواقع شبكة نور الاسلام.دار ابن الجوزى للنشر و التوزيع، الطبعة الاولى جمادى الاول ١٤٣٠هـ
١٧) تهذيب حلية الأولياء وطبقات الأصفياء للحافظ ابى نعيم الأصبهانى: اعداد صالح أحمد الشامى، المكتب الاسلامى، الطبعة ألاولى ١٤١٩هـ ـ ١٩٩٨م.
١٨) پوختەی تەفسیری قورئان: ئامادەکردنی محمد مەلا صالح، چاپی چوارەم،

کتێبخانەی وەفایی/ سلێمانی٢٠٠٤ز.
١٩) الجليس الصالح و الجليس الســوء: أبي عبدالله مصطفى بن العدوى، دار إبن رجب.
٢٠) حدآئق الأولياء: الامام سراج الدين عمر بن على بن أحمد، تحقيق/السيد يوسف احمد، دار الكتب العلمية ـ بيروت، الطبعة الأولى ٢٠٠٩م.
٢١) حرمة أهل العلم: محمد بن إســماعيل المقدم، الناشــر دار الإيمان، الطبعة الثانية ٢٠٠٠م.
٢٢) حلية الأولياء و طبقات الأصفياء: الحافظ ابى نعيم احمد بن عبدالله الأصفهــانى، الطبعة الاولى ١٤٠٩هـ ـ ١٩٨٨م.
٢٣) حياة السلف بين القول والعمل: اعداد/احمد بن ناصر الطيار إمام وخطيب جامع عبدالله بن نوفل بالزلفى، دار ابن الجوزى، الطبعة الالى ١٤٣٣هـ
٢٤) حياة الصحابة: الكاندهلوى، مؤســســة الرســالة، الطبعة الاولى، ٢٠١٢م.
٢٥) خلفاء الرسول: خالد محمد خالد، دار المقطم، القاهرة، الطبعة الاولى ١٩٧٠م.
٢٦) ديوانى مەحوى: لێكدانەوەى مەلا عبدالكريمى مدرس، چاپى دووەم، انتشارات كردستان.
٢٧) الذيل على طبقات الحنابلة للحافظ إبن رجب، تحقيق و تعليق د. عبدالرحمن بن سليمان العثيمين، مكة المكرمة، جامعة أم القرى .
٢٨) رجال حول الرسول: خالد محمد خالد، دار المقطم، الطبعة الاولى ٢٠٠٣.
٢٩) رفقاء طريق: عبدالملك القاسم، دار القاسم للنشر.
٣٠) روضة الحبــور و معدن الســرور: العلامة شـــمس الدين محمد بن احمد بن ابى الفتح بن الأطعانى البسطامى، دار الكــرز للنشــر و التوزيع، الطبعة الاولى، ٢٠٠٤م.
٣١) روضة الزاهدين: عبدالملك على الكليب، الناشر/ مكتبة ومطابع دار المطبوعات الحديثة، جدة ــ المملكة العربية السعودية.
٣٢) روضة المحبين: ابن قيم الجوزية، دار الكتب العلمية، الطبعة الثالثة ٢٠٠٣م.
٣٣) زهرة البساتين: جمع وترتيب/ د. سيد بن حسين العفانى، الناشر دار العفانى القاهرة.
٣٤) سلوة الأحزان بما روى عن ذوى العرفان: ابن الجوزى، تحقيق وتقديم/ سهير محمد مختار، آمنه محمد نصير، مراجعة/ الدكتور على السامى النشار.
٣٥) سير أعلام النبلاء: الإمام شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان الذهبى، مؤسســة الرســالة، الطبعة الحادية عشـــرة، ١٤١٧هـ ـ ١٩٩٦م.
٣٦) الشـــيخ عبدالقادر الجيلانى الإمام الزاهد القدوة: د.عبدالرزاق الكيلانى، دار القلم دمشـــق، الطبعة الاولى ١٤١٤هـ ـ ١٩٩٤م.
٣٧) صفة الصفوة: الإمام جمال الدين ابى الفرج ابن الجوزى، تحقيق/ الشيخ خالد

طرطوسی، دار الكتاب العربی، بيروت ـ لبنان ٢٠١٢م.
٣٨) صفقات رابحة: د.خالد ابو شادی، دار البشير للثقافة والعلوم.
٣٩) صور من حياة التابعين: عبدالرحمن رأفت الباشـــا، دار الأدب الإســـلامی، الطبعة الخامســـــة عشــــرة ١٤١٨هـ ـ ١٩٩٧م.
٤٠) صور من حياة الصحابة: عبدالرحمن رأفت الباشا، دار النفائس، الطبعة الأولى ١٩٩٢م.
٤١) طبقات إبن سعد الجزء الخامس: مكتبة الخانجی بالقاهرة، الطبعة الاولى ٢٠٠١م.
٤٢) عائشــــة أم المؤمنين: موســـوعة علمية، اعداد مجموعة من الباحثين، اشـــراف علوی بن عبدالقادر الســـقاف، مؤســـســـــة الدرر الســـنية ـ المملكة العربية الســـعودية www.dorar.net، الطبعة الاولى ١٤٣٤هـ ـ ٢٠١٣م
٤٣) عبدالله بن عمــر الصحابی المؤتســی برسـول الله (ﷺ) محيی الدين مسـتو، دار القلم دمشــــق، الطبعة الخامسة ١٤١٢هـ ـ ١٩٩٢م.
٤٤) عدة الصابــرين و ذخيرة الشـــاكـرين: إبن قيم الجوزية، دار الكتاب العربی، الطبعة الثانية، ١٤٠٦هـ
٤٥) فەرهـەنگی دەریا: ڕزگار كـریم، چاپی دووەم، ٢٠٠٧ز.
٤٦) فەرهـەنگی سـەرچاوە: عەرەبی ـ كوردی، مەجيد ماشـانی، ٢٠٠٨ز.
٤٧) كتاب البر والصلة: للحافظ ابی الفرج عبدالرحمن ابن الجوزی البغدادی، تحقيق وتعليق وتقديم/ عادل عبدالموجود و علی معوض، الطبعة الأولى ١٤١٣هـ ـ ١٩٩٣م، مؤسسة الكتب الثقافية، بيروت ـ لبنان.
٤٨) كتاب التوابين: الإمام موفق الدين أبی محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامة المقدسی، تحقيق وتعليق: عبدالقادر الارناؤوط، دار الكتب العلمية ـ بيروت.
٤٩) كتاب الرضا عن الله: الحافظ إبن أبی الدنيا، دار الســـلفية، الطبعة الاولى ١٩٩٠م
٥٠) مختصر تاريخ دمشـــــق لابن عســـاكـر: للإمام محمد بن مكـرم المعروف بابن منظور، دار الفكـر، الطبعة الاولى ١٤٠٤هـ ـ ١٩٨٤م.
٥١) مدارج الســـالكين: الإمام ابی عبدالله محمد بن ابی بكـر بن ايوب المشــــهور بـــ: ابن قيم الجوزية، دار الكتب العلمية، الطبعة الاولى .
٥٢) المستطرف: شهاب الدين الأبشيهی، الناشر مكتبة الجمهورية العربية ـ مصر.
٥٣) من روائع اقوال الصالحين: الجزء الاول، جمع وإعداد/ محمد بن حمشو معمو.
٥٤) من عجائب الدعاء: جمع وإعداد/ خالد بن سليمان الربعی، دار القاسم للنشــر، الطبعة الاولى ١٤٢٣هـ ـ ٢٠٠٢م.
٥٥) مناقب الإمام ابی حنيفة: الإمام الحافظ ابی عبدالله محمد بن احمد بن عثمان الذهبی، الطبعة الثالثة، بيروت ١٤٠٨هـ
٥٦) مناقب الإمام احمد بن حنبل: عبدالرحمن بن علی بن محمد بن الجوزی.
٥٧) مناقب معروف الكـرخی: عبدالرحمن بن علی بن الجوزی، دار الكتاب العربی.

٥٨) منجد الخطيب: أحمد بن صقر السويدى، دار إبن حزم، الطبعة الأولى ١٤٢١هـ ـ ٢٠٠٠م.

٥٩) مواعظ الصالحين والصالحات: اعداد/ هانى الحاج، المكتبة التوفيقية ـ القاهرة.

٦٠) مواقف إيمانية: جمع و ترتيب د.أحمد فريد، الدار السلفية للنشر و التوزيع اسكندرية، الطبعة الاولى ١٤٢٣هـ ـ ٢٠٠٢م.

٦١) مواقف بكى فيها الرسول و الصحابة: مجدى محمد الشهاوى، المكتبة التوفيقية.

٦٢) موسوعة أسماء الله الحسنى: د. محمد راتب النابلسى.

٦٣) موسوعة الأخلاق: اعداد/ ياسر عبدالرحمن، مؤسسة اقرأ للنشر والتوزيع والترجمة، الطبعة الاولى ١٤٢٨هـ ـ ٢٠٠٧م.

٦٤) نور الأبصار فى مناقب آل بيت النبى المختار: الشيخ مؤمن بن حسن مؤمن الشبلنجى، دار الكتب العلمية، بيروت.

٦٥) والثمن الجنة: عبد الملك القاسم، دار القاسم للنشر، الطبعة الاولى ١٩٩٣م.

# وادەمان فێردەوسن بێت

فەخری عالەم (صلی اللە علیە وسلم) خۆرێکە. دنیا بە بوونی ئەو ڕۆشن و قەشەنگ و زیندوو و پڕ مانایە، ناحەزان و نەیارانیشی چەند پارچە هەورێکی تەنك و چڵکن و پەرش و بڵاو و نەزۆکن. هەر زۆر زوو دەڕەونەوە و هەرگیز بەری خۆریان پێ ناگیرێت، یاران و هاوەڵانیشی مانگ و ئەستێرە و هەسارە بوون، کاتێك ئازیز (صلی اللە علیە وسلم) کاری خۆی تەواو کرد و پەیامەکەی پەروەردگاری بە تەواوەتی گەیاند و بە جەستەی پیرۆزی بەجێی هێشتین. مانگ و ئەستێرە و هەسارەکان دەرکەوتن و شەوی ئەنگوستەچاوی پاش کۆچی خۆریان کردە چراخان و بە نوری وەرگیراوی حەزرەتی خۆرەوە، دنیایان ڕووناك کردەوە و بەیەك دەنگ لە دوای مانگەوە گوتیان: خۆری ئێمە هەرگیز ئاوا نابێت، ئەگەر موحەممەدیش بمرێ. ئەوا خودای موحەممەد زیندووە و هەرگیز نامرێ، هیچ شتێکیش هەرگیز ناتوانێ شوێن پێ پیرۆزەکانی موحەممەد گیان (صلی اللە علیە وسلم) بسڕێتەوە.